02

عەلی باپیر

مەوسووعەی

# ئیمان و ئیلحاد

لەبەر تیشکی: زگماك و عەقڵ و زانست و وەحی دا






چاپی نۆیەم

ئیمـــان و ئیلحـــاد

نووسینی: عەلی باپیـــــر

مافی لە چاپدانەوەی پارێزراوە بۆ نوسینگەی تەفسیر

چاپی دووەم ٢٠٢٠ز - ١٤٤١ك



**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوە

هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر

ئیمـــــان و ئیلحـــــاد ،

عەلـــی باپـیـــر (نووسەر)،

٥٧٣ لاپـــەڕە ،

١٧* ٢٤ سـم ،

بابـەت ، ئـــایینی

تیراژ ، ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ٧٢٤ ) ی ساڵی ٢٠١٨ز پێدراوە.

ISBN: 978-9922-620-23-7

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

**خـەتی بـەرگ : نـــەوزاد کۆیـــی**

**دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی**

www.alibapir.com

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسۡجُدُۤ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ
وَٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلۡجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٞ مِّنَ
ٱلنَّاسِۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيۡهِ ٱلۡعَذَابُۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكۡرِمٍۚ
إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يَشَآءُ ۩ ﴿١٨﴾ ﴾ الحج.


پێشكەش بێ بە سێ جۆرە كەس
١- خـوای بەرزو مــەزنی ناسـیوەو دەیپـەرسـتێ.
٢- هـەمیشە لە هەوڵی باشتر ناسینی خـوای تاك و پـاك و، چاكتر پەرستنی دایـــــە.
٣- بەجیددیی تێدەكۆشـــێ: خـوای بەخـشــەر بنـاسـێ و بیپـەرسـتێ.

# دەستپێك

بەڕێـــزان!

ئەم بەشی سێیەمە لە چوار باس پێك دێ:

باسی یەکەم: سەرگوزشتەی سەرهەڵدانی ئیلحادو بێ دینیی لە ڕۆژئاوا.

باسی دووەم: ئیلحاد لەگەڵ هەرکام لە: زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی دا تێکدەگیرێ و، دژ دەوەستێ.

باسی سێیەم: بیانووە پووچەڵەکانی ئیلحاد.

باسی چوارەم: هۆکارە ڕاستەقینەکانی ئیلحاد.

سەرەتاش دەمەوێ ئەوە ڕابگەیەنم کە بێگومان ئیلحادو بێ دینیی، یان خوانەناسیی و دان نەهێنان بە بوونی خوای بەرزو مەزندا (سبحانه وتعالى)، لەگەڵ مێژووی بەشەردا بووە، بەڵام هیچ کاتێك وەك ئەوەی کە لە ئەورووپا، بە تایبەت لە سەدەی هەژدەو نۆزدەدا، کە بوو بە دیاردەیەك، بوو بە تەوژمێك، هیچ کاتێك بەو شێوەیە زەق دەرنەکەوتوە.

هەڵبەتە ئەو شەپۆل و تەوژمە، کە شەپۆل و تەوژمی ئیلحادە، لە سەدەی هەژدەو نۆزدەدا، لە ئەورووپا و ڕۆژئاوا سەری هەڵدا، کە ئێستاش لەگەڵ دا بێ، ئەورووپا بە تایبەت و ڕۆژئاوا بە گشتی، پشکی گەورەیان تێیدا هەیە، هەرچەندە پڕیشکی پەڕیوەتە زۆر ناوچەکانی دیکەی دنیا و، ڕۆژهەڵات و بۆ جیهانی ئیسلامییش، بەڵام ئایا بۆچی خوانەناسیی، لەوێ بوو بە تەوژمێك، بوو بە دیاردەیەك؟ ئەوە جێی هەڵوەستە لەسەر کردنە.!





بۆیە ئێمە باسی یەکەمی ئەم بەشی سێ یەمەمان، تەرخان کردوە بۆ ئەوە، کە لەوبارەوە بکۆڵینەوە و، بە ڕاستیی ئەم توێژینەوەیە زۆر گرنگە باش سەرنج بدرێ، چونکە وەك عەرەب دەڵێن: (إِذَا ظَهَرَ السَّبَبُ بَطَلَ العَجَبُ)، هەر کاتێك هۆکار دەرکەوت، سەرسوڕمان نامێنێ.

زۆر گرنگە ئێمە بزانین بۆچی لە ئەورووپا[١] ئەو ئیلحادو خوانەناسییە بەو شێوەیە پەرەی ستاند، ئەگەر سەرگوزشتە و بەسەرهاتەکەی بزانین، ئەو کاتە بۆمان دەردەکەوێ، بگرە وەك مانگی چواردە ئاشکرا دەبێ، کە خەڵکی ئەورووپا تا ڕادەیەك بیانوو و پاساویان بەدەستەوە هەبووە، کە لە ئایین دووربکەونەوە، ئنجا کە لە ئایینیش دوورکەوتوونەتەوە، ناچار بوون یەکجاریی لە خواش دووربکەونەوە، چونکە وەك هەندێکیان گوتوویانە: هەرکات دانمان بە بوونی خوادا هێنا، دەبێ دان بە بوونی کڵێساش دابێنین و، کە دانمان بە بوونی کڵێسا داهێنا، دەبێ دان بە بوونی چینی ئەکیلرۆسیش دا بێنین و، هەموو ئەو شتانەی دیکە کە چینی ئەکلیرۆس بەسەر خەڵکی ئەورووپاو ڕۆژئاوای دا فەرز کردوون، دەبنە مۆتەکە و کابووسی سەرسینگمان!



---

(١) ئەورووپای ئێستا، واتە: ڕۆمی پێشووتر، ئنجا کە دەگوترێ: ڕۆژئاوا، واتە: ئەورووپاو ئەمریکاو کەنەداو ئەو وڵاتانەی دیکەش، کە ئیمتیدادی ئەورووپان، لە ڕووی فیکرو بیرو بۆچوونە فەلسەفییەکانەوە.

# باسی یەکەم

## سەرگوزشتەی سەرهەڵدانی ئیلحادو بێ دینیی لە ڕۆژئاوا[١]

بەڕێـــزان!

سەرگوزشتەی تاڵی سەرهەڵدانی ئیلحادو بێ دینیی لە ڕۆژئاوا، هەوڵدەدەین بە کورتیی و پوختی لە دە (١٠) بڕگەدا، بیگێڕینەوە، بەم ناوونیشانانەی خوارێ:

**١)** ئەورووپا چۆن ئایینی نەصڕانیی تەبەننیی کرد؟

**٢)** گۆڕینی ئینجیل، چ کاریگەرییەکی نەرێنیی هەبوو لەسەر سەرهەڵدانی بێ دینیی و ئیلحاد؟

**٣)** گۆڕینی ئیمان و عەقیدە، ئیمان و عەقیدەیەك کە عیسای مەسیح (علیه السلام) وەك هەموو پێغەمبەرەکانی دیکە هێنابووی، کە بریتیە لە ئیمان و عەقیدەی تەنیا خواپەرستیی و خوا بە یەکگرتن.

---

(١) بۆ نووسینی ئەم باسە، سوودێکی باشم لە کتێبی: (العلمانية)ی (سفر الحوالي) وەرگرتوە، لە لاپەڕە (٢٧ تاکو ٢٠٦)، بەڵام دیارە بە نێو پڕکردن و دەستکاریی کردن و کورتکردنەوەو، خستنە سەری خۆمەوە و، بە سوود وەرگرتن لە هەندێك کتێب و سەرچاوەی دیکەش.



٤) گۆڕینی شەریعەت، شەریعەتێك كە عیسا (علیه السلام) هێنابووی، كە هەم لە ئینجیلی خۆیدا، هەم لە تەوراتی مووسادا (علیه السلام) بەرجەستە بوو.

٥) ئەو شتانەی كە كڵێسا لە ئایینی نەصرانییدا دایهێنان، كە حەوت بیدعەتی زۆر كوشندەو بێ ڕەزا بوون.

٦) سەرەنجام: بوغرابوونی كڵێساو سەركێشیی كردنی بەسەر خەڵك و جەماوەردا.

٧) ناكۆكیی نێوان كڵێساو زانست.

٨) شۆڕشی فەرەنساو هۆكارەكانی و دەرهاویشتەكانی.

٩) بیردۆزەی پەرەستاندن(نظرية التطور) و ڕۆڵی لە تەشەنەكردنی ئیلحاددا[1].

١٠) سیكۆلاریزم و شوێنگرتنەوەی دینداریی كڵێسایی.



---

(١) بیردۆزەی پەرەستاندن فراوانترە لە بیردۆزەی داروینیزم، بیردۆزەی پەرەستاندن پێش (داروین)یش هەبووە.

## بڕگەی یەکەم: ئەورووپا چۆن ئایینی نەصڕانیی تەبەننیی کرد؟

زۆر گرنگە ئێمە هەر هەڵوێستێکی فیکریی، یان هەڵوێستێکی سیاسیی دەبینین، پاشخانە مێژوویییەکەی بخوێنینەوە، ئەو کاتە چاك تێ دەگەین، کە ئەو هەڵوێستە فیکریی و فەلسەفییە، یان ئەو هەڵوێستە سیاسییە، یان ئەو هەڵوێستە کۆمەڵایەتییە، بۆچی گیراوەتە بەر؟!.

ئاشکرایە ئەورووپا کە کاتی خۆی پێی گوتراوە: ڕۆم و، پێشتر ئەو ڕۆمەش درێژبوونەوەی گریك (ئیغریق) بووە، هەموو ئەوانەش بتپەرست (وثني) بوون، ئنجا ئەورووپای بتپەرست، هەر لە سەدەی یەکەمی زایینەوە، واتە: سەد ساڵێك کەمتریش، دوای بەرزکرانەوەی عیسا (عليه السلام)، کە نەصڕانییەکان پێیان وایە: عیسا (عليه السلام) کۆچی دوایی کردوە، بەڵام ئێمەی مسوڵمان پێمان وایە بۆ ئاسمان بەرزکراوەتەوە[1]، هەر لەو کاتەوە ئەورووپا ئایینی نەصڕانیی ناسی و، لە سەرەتاوە زۆر دژایەتیی کرد، هەتا ئایینی مەسیح، ئایینی خوا بە یەکگرتن و تەنیا خواپەرستیی بوو، لەلایەن ئەورووپای بتپەرستەوە، زۆر دژایەتیی دەکرا، چونکە ناکۆك بوو لەگەڵ بیرو ڕای بتپەرستانەو فەلسەفەی بتپەرستانەی ئەوان دا.

بەڵام پاش گرێدانی یەکەمین کۆنگرەی مەسیحیی لە (نيقية) لە ساڵی (٣٢٥)ی زایینیدا لەلایەن (قسطنطين) پادشای ئەو کاتی ڕۆمەوە و، بە نەصڕانیی بوونی ئیمپڕاتۆر (قسطنطين)، کە وای دەرخست: بۆتە نەصڕانیی و، بە فەرمیی مەسیحییەت وەك عەقیدەی دەوڵەتی ڕۆم ڕاگەیەنرا، لەو کاتەوە ڕۆم لەگەڵ مەسیحییەتدا جۆرێك لە ئاشتەوایی کرد، بەڵام لەسەر حیسابی گۆڕان، بەڵکو لە نێوەڕۆکی خۆ خاڵی کرانەوەی ئایینی مەسیح (عليه السلام)،

---

(١) کاتی خۆی بە تەفصیلْ باسمان کردوە، لە تەفسیری سووڕەتی (آل عمران) و، سووڕەتی (النساء)دا.

هەر بۆیە مێژوونووسەکان زۆر جوانیان گوتوە، هەڵبەتە بە زمانە ئەورووپییەکان گوتوویانە، بەڵام کە تەرجەمەی عەرەبیی کراوە، گوتراوە: (تَرَوَّمَت النَّصْرَانِية، وَلَمْ يَتَنَصَّر الرُّوم)، واتە: نەصرانیی بوو بە ڕۆمیی و، ڕۆم نەبوو بە نەصرانیی، یانی: نەصرانییەت تەنازولی کرد لە خوا بەیەکگرتن (التوحيد) و، سێ کوچکە(ثالوث)ی قبووڵ کرد و، لەگەڵ ڕۆمدا سازشی کرد.

بەڵێ ئایینی مەسیح (عليه السلام) لەسەر دەستی کڵێساو پیاوانی کڵێسا، دەستبەرداری خوا بەیەکگرتن (توحيد) بوو و سێ پەرستراویی (تثليث)ی قبووڵ کرد، واتە: باب و کوڕو گیانی پیرۆز (الأب، الإبنِ، الروح القدس).

کە ئەویش جۆرێك لە ڕێککەوتن بوو، لە نێوان نەصرانییەت و بتپەرستێتیی (وثنية)ی ئیغریقیی و ڕۆمانیی دا، چونکە ئیغریقیی و ڕۆمانەکان، زۆر پەرستراویان هەبوون، سەدان پەرستراویان هەبوون، بۆ هەر دیاردەیەکی سروشتیی، پەرستراوێکیان دانا بوو، مەسیحییەتیش وەك هەموو شەریعەتەکانی دیکەی پێغەمبەران (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ)، بڕوای بە یەك پەرستراو بوو، کە خوایە (سبحانه وتعالى)، یانی: (ڕۆم) بە زمانی حاڵ گوتوویەتی:

ئەی ئایینی نەصرانیی! نە یەك پەرستراوی تۆ، نە زۆر پەرستراوی ئێمەش، وەرە با لە نێو قەدی ڕێ، ڕێك بکەوین لەسەر سێیان، نە یەکی تۆو نە زۆری ئێمە، سێی هەردووك لامان!

ئنجا ئەگەر فکرو فەلسەفەکانی کە لە ئەورووپادا باو بوون، تەماشایان بکەین، کە بە گشتی دەتوانین بڵێین: ئەورووپا شەش (٦) جۆرە فەلسەفەو بیرو ڕاو ئایینزای لێ بوون، بەڵام نەصرانییەتی دوای کۆبوونەوەی (نيقية)، دوای ساڵی (٣٢٥)ی زایینی، هەموو ئەو تێکەڵەیەی لە بیرو ڕاو فەلسەفە جۆراو جۆرو دژ بە یەکەکانی، کە لە ئەورووپا باو بوون، هەمووی پێکەوە کۆکردوونەوە و، لە هەر شتە شتێکی وەرگرتوە، ئەو شەش فەلسەفەو بیروڕا جۆراو جۆرانەش، ئەمانە بوون:

١) ئایینی جوولەکایەتیی.

٢) عەقیدەی (مەثرائیی) کە جۆرە عەقیدەیەکی بتپەرستانە بووە، بڕوای بە: (هەبوونی کاهین) و (شوێنی سەربڕینی قوربانیی) هەبووە.

٣) بیرۆکەی ئەفلاتوونیی نوێ، کە بڕوایان بە تاکە پەیداکەری یەکەم هەبووە و، عەقڵێك کە لەو پەیدا بووە و، ڕووح و نەفسێکیش کە لەو عەقڵە پەیدا بووە، کە ئەویش هەر سێکوچکەیە، هەروەك چۆن عەقیدەی (مەثرائیی)یش هەر سێکوچکە بوو: ١- کاهین و، ٢- سەر بڕگە (مَذبَح) (شوێنی لێ سەربڕین) و، ٣- قوربانیی (فِداء).

٤) بتپەرستیی میسریی باو بوو، کە ئەویش دیسان لەسەر سێکوچکەیەك بەند بوو:

أ/ (حورس) کە یەکێك لە پەرستراوەکان بووە.

ب/ (سیراییس) پەرستراوی دووەمیان بووە.

ج/ (ئیزیس) کە پەرستراوی سێیەمیان بووە، ئەوانەش سێ پەرستراو بوون و، ئەویش هەر سێکوچکە (ثالوث) بووە.

٥) بتپەرستیی ڕۆمانیی، کە ئایینی فەرمیی ڕۆمانیی بووە، ئەویش لەسەر سێ پایە بنیاتنراوە:

**پایەی یەکەم:** سێکوچکەی (جوبیتەر، مارس، کورنیوس)، کە هەر سێکیان ناوی پەرستراو بوون.

**پایەی دووەم:** پەرستنی ئیمپڕاتۆر.

**پایەی سێیەم:** بە پیرۆز گرتن و پەرستنی وێنەو پەیکەرەکان، کە لە ئەورووپا زۆر باو بووە، ئەویش لەسەر ئەو سێ پایە بنیات نراوە.

٦) چەند بیرۆکەیەکی فەلسەفیی دیکە، بە تایبەت فەلسەفەی ڕەواقیی و ئەبیقۆریی کە دژو پێچەوانەی یەکدی بوون: فەلسەفەی ڕەواقیی، بریتی بووە لە واز لە دنیا هێنان و ڕەبەنیی و پشت لە دنیا کردن، فەلسەفەی ئەبیقۆرییش بریتی بووە لە بەرهەڵدایی و، بێ بەندو باریی و، لەززەت وەرگرتنی ماددیی، یانی: ڕاست پێچەوانەی یەکدی بوون.





## شەش پایەکانی ئایینی شێوێنراوی مەسیحی:

سەرەنجام شەش پایەکانی ئایینی نەصرانیی پەیدا بوون، بە کارتێکراویی، بەم شەش ئایینزاو فەلسەفەو بیرۆکەیەی کە لە ئەورووپادا باو بوون.

شەش پایەکانی (ئایینی نەصرانیی)یش بەم شێوەیە بوون:

**پایەی یەکەم:** بڕوابوون بە تەوڕاتی جوولەکە:

لە ئەسڵدا مەسیح (علیه السلام) - وەك دوایی باسی دەکەین - بۆ خۆی کتێبەکانی پێش خۆی بە ڕاست زانیون، بە تایبەتی تەوڕات، چونکە تەوڕات شەریعەتێك بووە، بۆ هەموو بەنو ئیسرائیل هاتوە، کە عیساش (علیه السلام) بۆ خۆی هەر لە بەنو ئیسرائیل بووە، جوولەکە بووە، بۆیە تەوڕاتی بە ڕاست زانیوە، بەڵام نەصرانییەتی دوای (٣٢٥)ی زایینی، کە تەوڕاتی تەبەننیی کردوە، تەوڕاتەکەی جیا بووە لەوەی کە عیسا (علیه السلام) تەبەننیی کردوە، عیسا تەوڕاتێکی تەبەنیی کردوە، کە نەگۆڕدراوە و، ئەگەر کەم و کوڕییشی تێدا بووبێ، بۆی ڕاست کردوونەتەوە.

کەواتە: ئەوە پایەی یەکەمی ئایینی نەصرانیی، کە لە دوای (٣٢٥)ی زایینی لە ئەورووپا، پەیدابوو، بەڵکو پێش ئەوەش، بەڵام لە دوای (٣٢٥)ی زایینی، بە ڕەسمیی تەبەنیی کرا، ئەگەرنا پێشتریش ئەورووپا، هیچ کاتێك ئایینی مەسیحی (علیه السلام) بە شێوە ڕاستەقینەکەی خۆی نەناسیوە و، هەر لە سەرەتاوە کە ناسیویەتی، کاتێك بە شێوە ڕاستەقینەکەی خۆی بوو، دژایەتیی کرد، دوایی کە ئایینی مەسیح (علیه السلام) تەنازولی کرد بۆ خەڵکی ڕۆم، تەنازولی کرد لە خوا بەیەکگرتن، ئنجا بەم شێوەیەی لێهات و پایەی یەکەم: بریتی بوو لە: بڕوابوون بە تەوڕاتی جوولەکە، بەو شێوە دەستکاریی کراوەی کە هەیە.

**پایەی دووەم:** بڕوابوون بە قوربانیی (فِدَاء) و دەربازبوون، واتە: میانگیریی لە نێوان خواو خەڵکدا، بە هۆی کڵێساوە، بە هۆی پیاوانی ئایینیی و چینی کەهەنووت(ئەکلیرۆس)ەوە.

**پایەی سێیەم:** سێکوچکەی: خوا (الأب): کوڕ (الإبن)، گیانی پیرۆز (روح القدس).

**پایەی چوارەم:** بریتی بوو لە جەستاندنی خوا لە مرۆڤ دا (حلول)، کە خوا هاتۆتە نێو جەستەی مرۆڤەوە و، مەبەستیان لە مرۆڤ عیسا (علیه السلام) بوو.

**پایەی پێنجەم:** بە پیرۆزگرتن و پەرستنی وێنەو پەیکەرەکان، کە لە ڕیشەدا، وەك دواییش باسی دەکەین، ئایینی مەسیحیی وەك هەر ئایینێکی دیکە، دژی پەرستنی پەیکەرو وێنەکان بوو.

بەڵام دوایی وەك ئێستای لێهات کە دەیبینن، هەم خاچ(صلیب) و هەم شتی دیکەش بە گەردن و مل دا دەکەن، هەروەها لە کڵێساکاندا وێنەکان و پەیکەرەکان هەن و بە پیرۆزیان دەگرن و جۆرێك لە پەرستنیان بۆ ئەنجام دەدەن.

**پایەی شەشەم:** ڕەبەنایەتیی و ڕاکردن لە ژیان (رهبانیة)، هاوسەرگیریی نەکردن و ماڵ و حاڵ پێکەوە نەهێنان و، پەنابردن بۆ ئەشکەوت و چیاو چۆڵ.

ئەم شەش پایە: سەرو سیماو فۆڕمی ئایینی مەسیحیی، لە دوای گۆڕان و دەستکاریی کران و تەبەنیی کرانی لەلایەن ڕۆمەوە، دیاریی دەکەن.

هەر بۆیە (برنتن)، کە یەکێکە لە مێژوونووسانی ئەورووپایی، لە کتێبی: (بیرو بۆچوونەکان و پیاوانێك)، (أفكار ورجَال)[1]، کە کتێبەکەی بە یەکێ لە زمانە ئەورووپییەکان، نووسیوە، بەڵام تەرجەمەی عەرەبیی کراوە، قسەیەکی ڕاست دەکات، کە دەڵێ:

---

(١) ص٢٠٧.

(إنَّ المَسِيحِية الظَّاهِرَة فِي مَجْلِس "نيقيّة"، (العَقِيدة الرسمِية)، فِي أَعْظَمِ إمبراطورية فِي العَالَم، مُخَالِفَةٌ كُلَّ المُخَالَفَة لِمَسِيحِيّة المسيحِيين فِي "الجَلِيل"، وَلَو أَنَّ المرءَ اعْتَبَرَ العَهْدَ الجَدِيدَ التَّعبير النِّهَائِيّ عَنِ العَقِيدَةِ المسيحِيَّةِ، لَخَرَجَ مِنْ ذَلِكَ قَطْعَاً لاَ بِأَنَّ مَسِيحية القَرْنَ الرَّابع تَخْتَلِف عَنِ المَسِيحِيَّة الأَولى فَحَسَب، بَلْ بِأَنَّ مَسِيحيَّة القَرْن الرابع لَمْ تَكُنْ مَسِيحِيَّة بتَّاتَاً).

واتە: ئەو مەسیحییەتە زاڵ بووەی لە کۆبوونەوەی (نیقیة)دا تەبەنیی کرا، کە کرا بە عەقیدەی ڕەسمیی دەوڵەتی ڕۆم، لە گەورەترین ئیمپراتۆریەتی ئەوسای دنیادا، بە تەواویی پێچەوانەی مەسیحیەتی مەسیحییەکانی جەلیله، (واتە: کە لە فەڵەستین بوون، ئەسڵی شوێنی دەرکەوتنی مەسیح (علیه السلام))، ئنجا ئەگەر مرۆڤێك پەیمانی نوێ، (کە لە چوار ئینجیلەکان و نامەکانی دیکەدا بەرجەستەیە)، بە دەربڕینی کۆتایی دەربارەی ئایینی مەسیحیی دابنێ، دەگاتە ئەو ئەنجامگیرییەی کە مەسیحییەتی سەدەی چوارەم، نەك لەگەڵ مەسیحییەتی سەدەی یەکەمی زاییندا، دژو پێچەوانەیە، بەڵکو دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە مەسیحییەتی سەدەی چوارەم ئەسڵەن مەسیحییەت نەبوو.

واتە: ئەو ئایینە نەبوو کە مەسیح هێنابووی، مەسیح تەوحیدی هێنابوو، تەنها خواپەرستیی و، خۆی بە بەندەی خوا دانابوو، پاشان ئایینی هێنابوو، کە ژیان ڕێك بخات، بەڵام ئەوەی کە لەوێ تەبەننیی کرا، وەك شەش پایەکانمان باسکردن، ئەو شێوەیە، لە جەوهەرو نێوەڕۆکی دا، پێچەوانەی ئەوەیە کە مەسیح (علیه السلام) وەك هەموو پێغەمبەرانی دیکەی خوا، هێنابووی، وەك هیدایەتی خوا بۆ تاکەکان و، وەك ئایین و بەرنامەی هەق بۆ ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵگا لە هەموو ڕەهەندو بوارەکانیەوە.

ئەوە زۆر زۆر گرنگە بیزانین، ڕۆژئاوا (واتە: ئەورووپاو ئەمریکاو ئەو شوێنانەی دیکە کە بە درێژبوونەوەی ئەورووپا دادەنرێن)، هەر لەسەرەتاوە ئایینی مەسیحییان وەك خۆی نەناسی، بەڵکو ئەو تێکەڵەیان ناسی، کە بە ناهەق پێی دەگوترا: ئایینی مەسیحیی، کە وەك چێشتی مجێور وابوو، هەموو شتی تێدا بوو.

بۆیە (لیکونت دی نوی) کە یەکێکە لە زانایانی ئینگلیز و، کتێبێکی هەیە، ناوونیشانەکەی بە عەرەبیی: (الجَفْوَة المُفْتَعَلة بَيْن الدِّينِ وَالعِلْم)[١]، واتە: (ناتەبایی دروستکراو لە نێوان ئایین و زانستدا)، یانی: لە ئەسڵدا ئایین و زانست، پێکەوە ناکۆك نین، ناتەبا نین، بەڵام ئەوە شتێکی دروستکراوە، لەو کتێبەی خۆیدا زۆر جوان دەڵێ[٢]:

(إنَّ مَا أَضَافَهُ الإنْسَانُ إلى الدِّيَانة المَسيحِيَّة، وَالتَّفْسيرات الَّتي قَدَّمَهَا، وَالَّتي ابْتَدَأَت منذُ القَرْنِ الثَّالث، بالإِضَافَة إلى عَدَمِ الإكْتِرَاثِ بالحَقَائِقِ العِلْمِيَّة، كُلّ ذَلِكَ قَدَّمَ للمَادِّيين والمُلحِدين أَقْوَى الدَّلاَئِل المعَاضِدَة في كِفَاحِهِم ضِد الدين).

واتە: ئەوەی کە مرۆڤ پاڵی دایە لای ئایینی مەسیح، (واتە: لێی زیاد کرد و ختیە سەری) و ئەو لێکدانەوە و بۆچوونانەی بۆ ئایینی مەسیح، کردنی، کە لە سەدەی سێیەمی زایینیەوە دەستیان پێ کرد، وێڕای گوێ نەدانیان بە ڕاستییە زانستییەکان، ئەوە هەمووی بەهێزترین بەڵگەیان خستە دەستی ماددییەکان و مولحیدەکان، کە هاوکارو، پشتگیریان بێ بۆ دژایەتیی کردنی ئایین!

قسەکەی زۆر جوانە، هەر بۆیەش زانایانی ئیسلام بنچینەیەکیان داناوە، دەڵێن: (قَدْ يَبْلُغُ الجَاهِلُ مَنْ نَفْسِهِ مَا لاَ يَبْلغُهُ عَدُّوهُ)، واتە: بابای نەفام جاری وایە، شتی وا بە خۆی دەکات، دوژمنەکەی لەگەڵی پێی ناکرێ.

بەڵێ بابای نەفام جاری وایە زۆر خزمەت بە دوژمن و ناحەزەکانی دەکات، ئنجا لە ڕاستییدا ئەوانەی کە سەرپەرشتیی ئایینی تێکدراوی مەسیحییان دەکرد، لە دوای سەدەی سێیەمەوە، کارێکیان کرد بە ئایینی مەسیحیی، کە دوژمنەکانی نەیاندەتوانی پێی بکەن و، خزمەتێکی زۆریان بە مولحیدەکان و، خوانەناسەکان کرد، کە قسەیان زاڵ بێ بەسەر ئەوانەدا کە پێیان دەگوترێ: ئەهلی دین، لەبەر ئەوەی ئەو ئایینە بەو شێوەیە نەمابوو کە وەحیی خوا بێ

---

(١) ئێمە لە تەرجەمە عەرەبییەکەیەوە نەقڵ دەکەین.

(٢) ص١٥ و ١٦.



(سبحانه وتعالى)، چونکە وەحیی خوا، هەمیشە لەگەڵ فیترەتی ساغی مرۆڤ و عەقڵی سەلیم و واقیع و بەرژەوەندیی و زانست دا، تەبایەو گونجاوە، بەڵام وەختێك دەگۆڕێ: ئەگەر دژی عەقڵ بوو، دژی فیترەت بوو، دژی واقیع بوو، دژی بەرژەوەندیی مرۆڤ بوو، دژی زانست بوو، ئەوە مانای وا نیە کە ئایینەکە وایە، بەڵکو بە هۆی ئەو دەستکارییکران و گۆڕانەوە، وای بەسەر هاتوە.

## بڕگەی دووەم: گۆڕینی ئینجیل:

بێگومان خوا (سبحانه وتعالى) یەك ئینجلی بۆ عیسا (علیه السلام) ناردوە[1]، ئنجا ئینجلیش کە بە عیسا (علیه السلام) دراوە، وەك تەواوکەری تەوڕات دابەزێنراوە، وەك خوا (سبحانه وتعالى) لەسەر زمانی عیسای مەسیح (علیه السلام) لە ئایەتی ژمارە (٥٠) لە سووڕەتی (آل عمران)دا فەرموویەتی:

﴿وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ﴾.

واتە: هاتووم ئەو تەوڕاتەی لە پێش منەوە بووە، بە ڕاستی دادەنێم و، هەندێك شت کە لێتان قەدەغە کراوە، (ئەی جوولەکەکان! بە هۆی تاوان و سەرپێچیی و لادانەکانتانەوە) بۆتان ڕەوا دەکەمەوە.

یانی: ئەو باجانەی کە داوتانن و، ئەو قورساییانەی کە خراونە سەرشانتان و، ئەو سزایانەی کە دراوتانن، بە هۆی لادانەکانتانەوە، ئەوانەتان لەسەر لادەبەم.

هەروەها کتێبەکەی عیسا (علیه السلام) تەنیا یەك (ئینجیل) بووە، نەك چوار ئینجیل یان زیاتر، شایانی باسیشە ئێستاش لە ئینجیلی (مَرقُص)دا لە (إصحاح)ی (١)، ئایەتی (١٥)دا، لە (پەیمانی نوێ)دا، ئەم قسەیە کە بە ناوی عیساوەیە، هەر هەیە:

(قَدِ اكْتَمَلَ الزَّمَانُ، وَاقْتَرَبَ مَلَكُوتُ اللهِ، فَتُوبُوا وَآمِنُوا بِالإِنْجِيلِ)[2]، واتە: ڕۆژگار تەواو بووە و مەلەکووتی خوا نیزیك بۆتەوە، بگەڕێنەوەو بڕوا بە ئینجیل بێنن.

نەیفەرمووە: بڕوا بە چوار ئینجیلەکان بێنن، ئەمە لە خودی (الکتاب المقدس)دا هاتوە.

---

(١) ئنجیل، یانی: موژدە، مژگێنیی، دڵخۆشیی.

(٢) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد الجديد، إنجيل مرقص، الإصحاح: ١، ص١٩٨٠.

کەچی دوایی ئەو تاکە ئینجیلە دیار نەما، ئەو ئینجیلەی کە عیسا (علیه السلام) فەرمووی: (وَآمِنُوا بِالإِنْجِيلِ) بڕوا بێنن بە ئینجیل، ئەو ئینجیلە دیار نەما و بە پێی قسەی: (دائرة المعارف البريطانية)، (ئینسکلۆپیدیای زانستەکانی بەریتانیی)، دەڵێ: (لَمْ يَبْقَ مِن أَعْمَالِ السيدِ المَسْيِح شَيءٌ وَلاَ كَلِمَةٌ وَاحِدَةٌ مَكْتُوبَة)[1].

واتە: لە کردەوەکان و لە وشەکانی سەییدی مەسیح، هیچ نەما، تەنانەت یەك وشەی نووسراویش!

هەڵبەتە ئێمە وا ناڵێین، ناڵێین یەك وشەشی تێدا نەماوە، بەڵام ئەوان کە وایان گوتوە، دیارە هێندەیان شتی پڕوپوچ و ئەفسانەی لەگەڵ عیلم و عەقڵ دا نەگونجاو، تێدا بینیوە، بۆیە ئەو قسەیان کردوە و، پێم وایە زێدەڕۆییان کردوە، ئەگەرنا ئێمە پێمان وایە ئینجیل دەستکاریی زۆری کراوە و، خوا یەك ئینجیلی ناردوە، ئێستا بوونە چوار (٤) ئینجیل، ئەویش ئەوانەی کە بە ڕەسمیی تەبەننیی کراون، ئەگەرنا ئەو چوار ئینجیلەش لە نێو پەنجا (٥٠)، یاخود حەفتا(٧٠) ئینجیلدا هەڵبژێردراون!

هەروەها (ئادم کلارك) یەکێك لە ڕوونکەرەوەکانی ئینجیلەکان، دەڵێ:

(مُحَقَّقٌ أَنَّ الأَنَاجِيلَ الكَثِيرَةَ الكَاذِبَة كَانَت رَائِجَة فِي أَوَّلِ القُرُونِ المَسيحِيَّةِ، وَكَثْرَةُ هَذِهِ الأَحْوَال "الكَاذِبَة" غَير الصَّحِيحَة هَيَّجَتْ لُوقَا عَلَى تَحْرِيرِ الإِنْجِيل، وَيُوجَدُ ذكر أَكْثَرَ مِنْ سَبعِينَ "٧٠" مِنْ هَذِهِ الأَنَاجِيلِ الكَاذِبَة)[2].

واتە: گومانی تێدانیە کە ئینجیلە زۆرە درۆینەکان لە سەدەی یەکەمی مەسیحیی دا (واتە: لە سەدەی یەکەمی زایینیدا) زۆر باو بوون و، ئەو هەموو ئینجیلە زۆرانە، وای کردو پاڵنەر بوو بۆ لووقا[3]، کە ئینجیلێك بنووسێتەوە، (بە

---

(١) الجَفْوَة المُفْتَعَلَة بَيْنَ الدِّينِ وَالعِلْمِ، ص١٣، لیکونت دی نوی، کە لە (دائرة المعارف البريطانية)وە، نەقڵی کردوە.

(٢) إظهار الحق، ص٢٩٢.

(٣) چونکە (لووقا)ش ئینجیلێکی هەیە و، چوار ئینجیلەکان بریتین لە: (متَّى)، (لُوقا)،

حیساب ئەوە ئینجیلێکی ڕاستە) و لەو کاتەدا زیاتر لە حەفتا (٧٠) ئینجیل لەو ئینجیلە درۆیینانە هەبوون.

(غوستاف لوبون) فەیلەسووف و کۆمەڵناسێکی ناوداری فەڕەنسایی، لە بارەی چوار ئینجیلەکانەوە، لە کتێبێکی خۆیدا بە ناوی: (حَيَاةُ الحَقَائِق)[1]، (ژیانی ڕاستییەکان)دا دەڵێ: (هِيَ مَجْمُوعَةٌ مِنَ الأَوْهَامِ وَالذكْرَيَات غَيْرَ المُحَقَّقَة الَّتِي بَسطَهَا خَيَالُ مُؤَلِّفِيهَا).

واتە: چوار ئینجیلەکان بریتین لە کۆمەڵێك ئەفسانە و، یادەوەریی ساغ نەکراوە، کە ئەندێشەو خەیاڵی نووسەرەکانی بەرهەمیان هێناون.

گومانی تێدا نیە، ئەگەر چوار ئینجیلەکان بخوێنیەوە، بە ئاشکرا دیارە و، ئێستا نەصرانییەکانیش دانی پێدا دێنن، کە ئەوانە هەر چواریان یادەوەریین و، هیچیان دەقی قسەی مەسیح (علیه السلام) نین.

یانی: (متَّى) یادەوەرییەکانی خۆی نووسیونەوە: عیسا (علیه السلام) فڵان ڕۆژە وای گوت و فڵان ڕۆژە وای کرد، هەروەها (لووقا) بە هەمان شێوە و، هەرکام لە: (مَرْقُص) و (یوحنَّا)ش بە هەمان شێوە.

ئەوە چوار ئینجیلەکە، ئنجا نامەکانی (بۆڵس)و، نامەکانی دیکەش، بە هەمان شێوە، هەموویان یادەوەریی و یادداشتن و، حیکایەت و بەسەرهاتن.

**چۆنیەتی هەڵبژاردنی چوار ئینجیلەکە:**

با بزانین ئەو چوار ئینجیلە، چۆن هەڵبژێردران؟

پێشتر باسمان کرد، لە ساڵی (٣٢٥)ی زایینی دا، ئیمپڕاتۆری ڕۆمانیی (قسطنطین) کۆبوونەوەی (نیقیة)ی ساز کرد، ئەو کۆبوونەوەیەش بەو شێوەیە بوو:

---

(مرقُص)، (یوحنَّا).

(١) ص٦٢.





دوو هەزارو چل و هەشت (٢٠٤٨) کەسی لە بەتریکەکان و ئوسقوفەکان (البطارکة والأساقفة)[١]، کۆکردەوە لە مەشرەبی جیاواز و دژ بە یەك و ناکۆك، بەڵام دوو کۆمەڵیان لە نێو ئەو هەموو دوو هەزارو چل و هەشت کەسەدا، لە هەمووان زەقتر بوون، بەهێزتر بوون:

**یەکەمیان:** خوا بەیەکگرەکان (الموحِّدون)، ئەوانە شوێنکەوتووانی (ئاریوس) بوون، کە ژمارەیان دەوری حەوتسەد (٧٠٠) کەس دەبوو، لەو دوو هەزارو چل و هەشت (٢٠٤٨) کەسە.

**دووەمیان:** شوێنکەوتووانی (بۆڵس) بوون، کە ئەوانیش ژمارەیان دەوری سێ سەدو هەژدە (٣١٨) کەس بوون، ئەوانی دیکەش گرووپ و تاقمی جۆراو جۆری دیکە بوون، بەڵام گچکەتر بوون و کەمتر بوون لەو دووانە، کەچی سەرەنجام (قسطنطین)، - چونکە بۆخۆشی بتپەرست بوو و، بڕوای بە سێ پەرستراوان هەبوو، وەك پێشتر باسمان کرد، کە ئایینی ڕەسمیی ڕۆم، لەسەر سێ پایە بنیاتنرابوو - ڕای سێ کوچکە (ثالوث)ی هەڵبژارد، واتە: (باب، کوڕ، گیانی پیرۆز) و ئەم تەعبیرەی گوت: (قَدْ سلَّطتكُم اليَوْمَ عَلَى مَمْلَكَتِي)[٢]، ئەمڕۆ من دەستی ئێوەم ئاوەڵا کرد لە وڵاتی خۆمدا، واتە: ئێوە بە ڕەسمیی دەناسم، ئنجا هەر لەو کۆبوونەوەیەدا نەفرینیش کرا، لە هەر کەسێ پێچەوانەی ئەو بڕیارە بجووڵێتەوە.

ئنجا زۆر جێی سەرسووڕمان بوو، کە ئەوانەی بڕوایان بە سێ پەرستراوان بوو، کە شوێنکەوتووانی (بولس) بوون، ژمارەیان سێ سەدو هەژدە (٣١٨) کەس بوو، لەو کۆبوونەوەیەدا، بەڵام ئەوانەی شوێنکەوتووانی (ئاریوس) بوون، ژمارەیان حەوتسەد (٧٠٠) کەس بوو، دوو هێندەی ئەوان زیاتر بوون، کەچی (قسطنطین) چونکە بۆ خۆی بتپەرست بوو، سێکوچکەکەی زاڵ کرد بەسەر ئەوانی دیکەدا و، دوایی دەست کرا بە چەوساندنەوەو ئازاردان و ڕاوەدوونانی ئەوانەی بڕوایان بەوە بوو کە تەنیا خوا (سبحانە وتعالى) بپەرسترێ[٣].

---

(١) (البطارکة) کۆی (بطريك)ە، (أساقف) کۆی (أسقف)ە، ئەوانە نازناوی زانایانی نەصرانیی بوون.

(٢) بێگومان ئەوە مانای تەرجەمە عەرەبییەکەیەتی، ئەگەرنا، ئەو بە زمانی عەرەبیی نەیگوتوە.

(٣) مُحَاضَرَات فِي النَّصْرَانية، ص١٤٤، محمد أبو زهرة.

## بڕگەی سێیەم: گۆڕینی ئیمان و عەقیدە:

بێگومان عیسا (علیه السلام) وەك سەرجەم پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بە خوا بەیەكگرتنەوە ڕەوانە كراوە، وەك لە سووڕەتی (آل عمران) ئایەتی ژمارە (٥١)دا - هەمان شت لە سووڕەتی (مریم)یشدا ئایەتی ژمارە(٣٦)دا، دەڵێتەوە و، لە سووڕەتی (الزخرف)یشدا ئایەتی (٦٤)دا دەیڵێتەوە - دەفەرمویٚ:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦٤﴾﴾.

بە دڵنیایی بەس خوا پەروەردگاری من و ئێوەشە، كەواتە: تەنیا ئەو بپەرستن، ئا ئەوە ڕێی ڕاستە.

بەڵام دوای خۆی، ئیمان و عەقیدەكە، گۆڕدرا، ئنجا ئەو گۆڕانە، وەك مێژوونووسانی ئەورووپایی دەڵێن، ماوەی دە (١٠) سەدەی پێچوون، هەر لە سەردەمی حەوارییەكانی عیساوە[1]، گۆڕینی عەقیدەی مەسیح (علیه السلام) دەستی پێ كرد و تاكو دە (١٠) سەدەی خایاند، ئەویش لەوەوە دەستی پێ كرد كە گوتیان: عیسا (علیه السلام) سروشتێكی خوایی هەیە.

ئینسكلۆپیدیای زانستەكانی بەریتانیی (دائرة المعارف البريطانية)، وەك: (لیكونت دی نوی)، خاوەنی كتێبی: (الجفوة المفتعلة بين العلم والدين)[2]، لێی دەگوازێتەوە دەڵێ:

(لَمْ تَصْدُرْ عَنْهُ "أَي: عِيسَا"، أَيُّ دَعَوى تُفِيد أَنَّهُ مِنْ عُنْصُرٍ إلهِيٍ، أَو مِنْ عُنْصُرٍ أَعْلَى مِنَ العُنْصُرِ الإِنْسَانِي المُشْتَرَك).

---

(١) حەوارییەكانی عیسا علیه السلام (١١-١٢) كەس بوون، ئەوانە هاوەڵە دانستەكانی بوون و، وەك خۆی ئەهلی ئیمان و خوا بەیەكگرتن بوون، جگە لە یەهووذای ئەسخەریوتیی، كە خیانەتی پێكردو بە گرتنی دا، نازانین ئەو لەسەر چ عەقیدەیەك مردوە.

(٢) ص١٥.

واتە: لە عیساوە (علیه السلام) هیچ دەعوایەکی وا نەکراوە، ئەوە بگەیەنێ کە لە توخمێکی خواییە، یاخود لە توخمێکی بەرزترە لە توخمی هاوبەشی بەشەر.

واتە: عیسا خۆی جیا نەکردۆتەوە لە مرۆڤەکان و، هیچ قسەیەك لەو بارەوە لە عیساوە (علیه السلام) نەهاتوە.

بەڕێـــــــزان!

(ئینسکلۆپیدیای زانستەکانی بەریتانیی) وا دەڵێ، یانی: هەمان شت کە قورئان دەیفەرموێ و، هەمان شت کە ئێمەی مسوڵمان عەقیدەمان پێیەتی، ئنجا نەك هەر (لیکونت دی نوی) وا دەڵێ، بەڵکو زانا مێژوونووسە ئەورووپاییەکان بە گشتی وا دەڵێن.

ئنجا مێژوونووسان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە ئەوەی ڕۆڵی سەرەکیی گێڕا لەو بارەوە، کە عەقیدەی عیسا (علیه السلام) لە تەنیا خواپەرستییەوە، گۆڕدرا بۆ سێکوچکەی (باب، کوڕ، گیانی پیرۆز)، بۆڵس بوو، کە پێی گوتراوە: بۆڵسی نوێنەر(بولس الرسول) و ناوی (شائوول) بووە و، لە ئەسڵدا کابرایەکی جوولەکە بووە و یەکەمین کەس بوو، کە گوتی: عیسا کوڕی خوایە، وەك ئێستاش لە پەیمانی نوێ (العهد الجديد)، (الرسالة إلى مؤمني روما)دا هاتوە[١]:

(أَنَّهُ ابْنُ اللهِ بالقِيَامَةِ مِنْ بَيْنِ الأَمْوَاتِ، إِنَّهُ يَسوعُ المِسيح رَبُّنَا..).

واتە: ئەو، (یانی: عیسا) کوڕی خوایە، لەبەر ئەوەی کە لە نێو مردووان دا هەڵسێنراوەتەوە[٢]، یەسووعی مەسیح پەروەردگاری ئێمەیە.

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد الجديد، الرسالة إلى مؤمني روما، الإصحاح: ١، ص٢٣٧٤.

(٢) کە ئەوەش ئەفسانەیەکی دیکەی نەصرانییەکانە، کە گوایە عیسا لە قەبر هاتۆتەوە دەرێ! بەڵام لە ئەسڵدا عیسا هەر لە سێدارە نەدراوە و هەر نەنێژراوە، بەڵکو خوا بەرزی کردۆتەوە،

وەك گوتمان: ئەو كابرایە لە ئەسڵدا ناوی (شائوول) بوو، دوایی ناوی لێنرا (بوڵس) و نازناوی (الرسول)ی هەبووە، یانی: ڕەوانەكراو، نێردراو، بە حیساب نوێنەر بووە بۆ لای خەڵك، لە ڕۆژگاری حەوارییەكان دا بووە و عیسا (علیه السلام)ی نەبینیوە، سەرەتا زۆر دژی مەسیحییەكان بووە، بەڵام دوایی نەصرانیی بوونی خۆی ڕاگەیاندوە و، دەستی كردوە بە گۆڕینی ئایینی مەسیح.

لەو سێ (٣) سەدەیەدا كە كڵێسا پێیان دەڵێ: چاخی لادان و زەندەقە (عصر الهرطقة)، لە نێوان (بولس) و (ئەثانسیوس) لەلایەك، كە لایەنگرانی سێكوچكەیی (ثالوث) بوون و، (ئاریوس) و شوێنكەوتووانی، كە لایەنگرانی خوا بەیەكگرتن بوون، ناكۆكییەكی زۆر توند هەبووە، بەڵام لە كۆبوونەوەی (نیقیة)دا، وەك باسمان كرد، هەر چەندە سێكوچكەییەكان كەمینە بوون و، خوا بەیەكگرەكان زۆرینە بوون، بەڵام بە هۆی دەسەڵاتەوە زاڵ بوون و، (قسطنطین) بە هۆی پاشخانە بتپەرستییە ڕۆمییەكەی خۆیەوە، سێكوچكەیی (ثالوث) تەبەننیی كرد.

ئنجا ئەم مەسەلەیەی سێ پێكهێنەرەكان (الأقانیم الثلاثة)، كە نەصرانییەكان دەیڵێن، سێ ئوقنووم، سێ توخم، یان سێ پێكهێنەر: (باب، كوڕ، گیانی پیرۆز) ئەمە گرێ كوێرەیەكی گەورە بووە، هەر لە سەرەتاوە و، بەرگریی لێكەرانی جگە لە نكوولْیی لێكردنی عەقڵ و لۆژیك، هیچیان پێ نەماوە بۆ پاساودانەوەی ئەوە كە، یەك، كۆ یەك، كۆ یەك، هەر دەكاتە یەك (١ + ١+ ١ = ١)!!

چونكە ئەوان دەڵێن: خوا و عیسا و گیانی پیرۆز، كە بە خوا دەڵێن: باب (أب) و بە عیسا دەڵێن: كوڕ (إبن) و گیانی پیرۆز (الروح القدس)یش، ئایا مەبەستیان پێی جبریلە؟ وا پێدەچێ، دەڵێن: ئەوانە سێ پێكهێنەرن، كەچی هەر یەكیشن! واتە: یەك، كۆ یەك، كۆ یەك، یەكسانە بە یەك: (١ + ١+ ١= ١)!

---

وەك بە تەفصیلْ باسمان كردوە، هەم لە تەفسیری سوورەتی (آل عمران)دا و، هەم لە تەفسیری سوورەتی (النساء)دا، واتە: لە بەرگی (٢)و (٣)ی تەفسیرە كوردییەكەماندا.



کە بێگومان ئەمە دژی عەقڵ و مەنتیقە! بۆیە نەصرانییەکان بۆ پاساودانەوەی ئەو ئەفسانەیە، ئەو بیرۆکە دژی عەقڵە، هیچیان بۆ نەماوەتەوە، ئەوە نەبێ بڵێین: ئەوە نهێنییەکە عەقڵ تێی ناگات!!

وەك هەر کام لە (قیددیس ئوغسطین)، کە لە (٤٣٠)ی زایینیدا کۆچی دوایی کردوە، هەروەها (قیددیس توما ئەکوینی) کە لە (١٢٧٤)ی زایینیدا کۆچی دوایی کردوە، - پێشتر باسمان کردن - گوتوویانە: ئەمە نهێنییەکە کەس تێی ناگات[١].

فەیلەسووفی فەرەنسایی (ئەرنست ڕینان) وەك (محمد أبو زهرة) لە کتێبی (محاضرات في النصرانية)، لێی نەقڵ دەکات، گوتوویەتی: (إِنَّهُ يَنْبَغِي لِفَهْمِ تَعَالِيمِ يَسوع المسيح الحقيقي، كَمَا كَانَ يَفْهَمُهُ هُوَ، أَنْ نَبْحَثَ فِي تِلْكَ التفاسِيرِ وَالشرُوحِ الكاذِبَة الَّتِي شَوَّهَت وَجْهَ التعْلِيم المَسيحِيِّ، حَتَّى أَخْفَتْهُ تَحْتَ طَبَقَةٍ كَثِيفَةٍ مِنَ الظَّلاَم، وَيَرْجِعَ بَحْثُنَا إِلى أَيَّامِ بولس الَّذِي لَمْ يَفْهَم تَعْلِيمَ المَسيح..)[٢].

واتە: بۆ تێگەیشتن لە ئایینی یەسووعی مەسیحی ڕاستەقینە، وەك خۆی تێیگەیشتوە، دەبێ بپشکنین، بگەڕێین لەو هەموو لێکدانەوەو ڕوونکردنەوە درۆزنانەدا کە ڕووی ڕاستەقینەی ئایینی مەسیحیان شێواند، تاکو لە ژێر چینێکی چڕو پڕ لە تاریکاییدا شاردیانەوە و، دەبێ لێکۆڵینەوەکەمان بگاتەوە سەردەمی بوڵس، کە هەرگیز لە ئایینی مەسیح حاڵی نەبوو.

(دەڵێم: ئەگەر لێشی تێگەیشتبێ، گرنگ ئەوەیە ویستوویەتی بیگۆڕێ و دەستکاریی بکات و، بەدەردێکی بەرێ، کە هیچ پەیوەندیی نەمێنێ بە مەسیحەوە (علیه السلام) و بە سەد و هەشتا (١٨٠) پلە، لێی جیاواز بێ)[٣].

---

(١) قِصَّةُ النزاع بين الدّين والفلسفة، توفيق الطويل، ص٨٣.

(٢) ص٢١٥.

(٣) نێوان کەوانەکان زێدەی خۆمە.

## بڕگەی چوارەم: گۆڕینی شەریعەت:

ئەم بڕگەیە لە پێنج خاڵان دا ڕوون دەكەینەوە:

**خاڵی یەكەم:** كاتی خۆی كۆمەڵگای ڕۆمانیی، ئایینێكی نەبووە كە عیبادەتی تێدابێ بۆ خوا (سبحانه وتعالی)، هەروەها فەلسەفەیەكی دیارییكراویشی نەبووە - وەك پێشتر باسمان كرد - بەڵكو تێكەڵەیەكی لە بیرۆكە بتپەرستییەكان هەبووە و بڕوایان بە چەند پەرستراوێتیی (تعدُّد الآلهة) هەبووە و، ئەو كاتە كۆمەڵگای ڕۆمانیی لە تاریكایی فەلسەفەو فیكرە جۆراو جۆرەكاندا نغرۆ بووە و هەمیشەش قەناعەتی وابووە، كە دەبێ پەرستراوەكان (آلِهَة) دەست وەرنەدەنە كاروباری ژیانیان.

بۆ وێنە: (سیسرون) كە یەكێكە لە مێژوونووسانی ئەورووپا، لەو بارەوە دەڵێ:

(وَلَمَّا كَانَ الْمُمَثِّلُون يُنْشِدونَ فِي دُورِ التمثِيل أَبْيَاتَاً مَعْنَاهَا أَنَّ الآلِهَة لاَ دَخْلَ لَهُمْ فِي أُمُورِ الدُّنيا، يصغي إليهَا النَّاسُ وَيَسْمَعُونَهَا بكُلِّ رَغْبَة)[١].

واتە: كاتێك كە ئەكتەرەكان لە شوێنی نواندندا، لەسەر شانۆ، هەندێك شیعریان دەگوتن، ماناكەیان ئەوە بوو كە پەرستراوەكان نابێ دەست وەردەنە كاروباری دنیا، خەڵك زۆر ئارەزوومەندانە گوێیان بۆ دەگرت (كە پەرستراوەكان هەقیان نیە دەست وەردەنە كاروباری خەڵك).

(ئوغسطین)یش، گوتوویەتی: (إن الروم الوثنيين كانوا يعبدون آلهتهم في المعابد ويهزؤون بهم في دور التمثيل)[٢].

---

(١) الإسلام على مفترق الطرق، ص٣٨، محمد أسد (ليبولدفايس).

(٢) ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين، ص١٦٣، أبو حسن الندوي.





واتە: ڕۆمە بتپەرستەکان، پەرستراوەکانی خۆیان لە پەرستگاکاندا دەپەرستن، بەڵام لە شوێنی نواندن و لەسەر شانۆ گاڵتەیان پێ دەکردن، (واتە: ڕێزێکیان بۆ دانەدەنان).

**خاڵی دووەم:** ئینجیل لە بنەڕەتدا بۆیە دانەبەزێنرابوو کە بەرنامەیەکی تێرو تەواو و گشتگیری ژیان و گوزەران بێ، بەڵکو ئینجیل دابەزێنرابوو، کە ئەو شتانەی وەك سزادان لە جوولەکە قەدەغەکرابوون، بۆیان حەڵاڵ بکاتەوە، وەك عیسا (علیه السلام) فەرموویەتی، کە خوای پەروەردگار لێی دەگێڕێتەوە:

﴿ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى حُرِّمَ عَلَيْكُمْ ﴾ آل عمران: ٥٠.

واتە: ئەو تەوراتەی لە پێش منەوە بووە، بە ڕاستیی دادەنێم و هەندێك شت لەوەی لێتان قەدەغە کراوە، بۆتان ڕەوا دەکەمەوە.

چونکە لەسەر هەندێ غەڵەت و پەڵەت، جوولەکەکان سزا درابوون و، هەندێك شت کە پێیان خۆش بوو، لێیان قەدەغە کرا بوون، وەك سزادانێك.

بەڵێ عیسا (علیه السلام) ئەو شتانەی کە جوولەکە بە هۆی غەڵەت و پەڵەت و لادان و تاوانەکانەوە، لێیان قەدەغە کرابوون، بۆی حەڵاڵ کردنەوە، هەڵبەتە عیساش (علیه السلام) تەنیا بۆ وەچەی ئیسرائیل هاتبوو، وەك لە سووڕەتی (الصف)دا هاتوە:

﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ٦ ﴾.

واتە: یاد بکەوە، کاتێك عیسای کوڕی مەڕیەم، گوتی: ئەی وەچەی ئیسرائیل! (واتە: نەوەی یەعقووب، جوولەکەکان)، من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لای ئێوە، تەوراتی پێش خۆم بە ڕاست دەزانم و موژدەشتان دەدەمێ بە پێغەمبەرێك لە دوای منەوە دێ، ناوی ئەحمەدە، (یانی: موحەممەد (صلى الله علیه وسلم)).

کەواتە: عیسا (علیه السلام) لە ڕاستییدا تەنیا بۆ گەلی جوولەکە نێررا بوو، کە پێیان دەگوترێ: نەوەی ئیسرائیل.

بۆیەش ئەوەی لە دووتوێی (ئینجیل)دا بوو، ئایینێکی تێرو تەواو نەبوو، شەریعەتێکی سەربەخۆی هەبێ، بەڵکو ئیعتیمادی عیسا (علیه السلام) لە ڕووی ڕێکخستنی کۆمەڵگاوە، لەسەر تەوڕات بوو، بەڵام ئەو لادان و کەم و کورپییانەی کە تێی خزێنرابوون، ڕاستی دەکردنەوە، ئەگەرنا عیسا تەوڕاتی[1] تەبەننیی کردبوو، بەڵام ئینجیل زیاتر بریتی بوو لە ئامۆژگاریی ڕووحیی و ئاکاریی و ڕەوشتیی و ئیمانیی و عەقیدەیی، وێڕای ڕەواکردنەوەی هەندێ لەو شتانەی لە جوولەکەکان قەدەغە کرابوون.

**خاڵی سێیەم:** جوولەکەش خۆیان بە هاندانی ڕۆمانەکانیش، زۆر مەسیحییەکانیان ئازار دەدا و، یەکێك لە جوولەکەکان کە مەسیحییەکانی زۆر ئازار دەدا (شائوول) بوو، کە دوایی بووە نەصرانیی و ناوی لە خۆی نا: (بۆڵس)، دواییش کە بوو بە مەسیحیی، لە نێوەودا مەسیحییەتی بنکۆڵ کرد و، کرمۆڵی کرد و لە خوا بەیەکگرتن (توحید) خاڵی کردەوە و، لە شوێنی خوا بەیەکگرتن: سێکوچکە (ثالوث)ی دانا، سێکوچکەی: (باب، کوڕ، گیانی پیرۆز) کە گەورەترین زیان لە ئایینی مەسیح درابێ، لەلایەن (بۆڵس)ەوە بووە، وەك مێژوونووسە ئەورووپاییەکان خۆشیان دەڵێن و پێشتر لێمان نەقڵ کردن، کە ئەوەی لە سەر دەستی (بۆلس) بە مەسیحییەت کرا و، دوایی تەبەننیی کرا لەلایەن پادشا (قسطنطین)ی ڕۆمەوە، لە ساڵی (٣٢٥)ی زایینی دا، لە سەدا سەد (١٠٠٪) جیا بوو لەو ئایینەی کە مەسیحییەکانی جەلیل، واتە: ناوچەی فەڵەستین و دەوروبەری کە عیسا (علیه السلام) بۆ خۆی خەڵکی ئەوێ بووە، پەیڕەوییان لێ دەکرد.

---

(١) دواتر بە درێژیی قسە لەسەر(تەوڕات و ئینجیل) دەکەین، کە ئێستا - لەلای خاوەن کتێبەکان: جوولەکە و نەصرانیی، تەوڕات کراوەتە چەقی پەیمانی کۆن (العهد القدیم) کە سی و نۆ و چل نۆ (٣٩ - ٤٩) کتێبە و، (ئینجیل)یش کراوەتە چەقی پەیمانی نوێ (العهد الجدید) کە ئەویش ژمارەیەك کتێب و نامەی دیکەش، وێڕای چوار ئینجیلەکان، دەگرێتە خۆی.

**خاڵی چوارەم:** هەروەها ڕۆمەکانیش بەر لە (قسطنطین)یش، زۆر بە سەختیی ئازاری مەسیحییەکانیان دەدا، واتە: مەسیحییە خوا بەیەکگرەکان (الموحِّدين)، بە تایبەت ئەم چوار ئیمپڕاتۆرە:

١- (نیرون): کە لە ساڵی شەست و چوار (٦٤)ی زایینی دا مردوە، واتە: نزیك بووە لە سەردەمی عیساوە (علیه السلام).

٢- (تراجان): کە لە ساڵی سەد و شەش (١٠٦)ی زایینی دا مردوە، یانی: سەدو شەش ساڵ دوای لە دایك بوونی عیسا (علیه السلام).

٣- (ریسیوس): کە لە ساڵی دوو سەد و پەنجا و یەك (٢٥١)ی زایینی دا مردوە.

٤- (دقلدیانوس)، کە لە ساڵی دوو سەد و هەشتا (٢٨٠)ی زایینی دا مردوە.

ئەمانە هەموویان پێش (قسطنطین) بوون، پێش ئەوەی (قسطنطین) بە فەرمیی مەسیحییەت تەبەننیی بکات، مەسیحییەتی سێکوچکەیی (ثالوث)، ئەوانە زۆرترین ئازارو جەزرەبەی مەسیحییەکانیان دەدا و، لە کتێبە مێژووییەکاندا زۆر شت باسکراوە، بەڵام تەنیا دوو نموونان دێنمەوە:

**یەکەم:** مەسیحییەکانیان دەهێنا (واتە: مەسیحییە تەنیا خواپەرستەکان، خوا بەیەکگرەکان کە لەگەڵ عەقیدەی بتپەرستیی ڕۆمەکان دا تێکدەگیرا)، دەیانخستنە پێستی ئاژەڵەوە و بۆ سەگەکانیان فڕێیان دەدان، سەگەکانیان برسی دەکردن و ئەوانەشیان بە زیندووی دەخستنە پێستی ئاژەڵ: مەڕ، بزن، گا، هەڵبەتە پێستەکانیشیان لەسەر درووون، تاکو نەیەنە دەرێ و سەگەکانیان بە زیندوویی بیانخۆن!

**دووەم:** پۆشاکی بە قیر داپۆشراویان لەبەر دەکردن، قیری گەرم و داغ، پۆشاکەکە بە قیر سواغ کرابوو، ئنجا ئەو پۆشاکەیان لەبەر دەکردن، دوایی وەك چرا ئاگریان تێ بەردەدا لەو پۆشاکە قیرە، کابراش لە نێوی دا و لە سەماخانەکان (مراقص) دا، دایان دەنان و سەماخانەکانی خۆیانیان پێ ڕۆشن دەکردنەوە![1]

---

(١) تأريخ العالم، فصل: ٢١، هاملتون.

**خاڵی پێنجەم:** دوو قسە پاڵدراونە لای مەسیح (علیه السلام) کراون بە بیانوو و پاساوی دابڕین و دوورخستنەوەی ئەو شەریعەتەی عیسای مەسیح تەبەننیی کردبوو، کە زیاتر لە تەوڕاتدا خۆی دەبینیەوە و پاشان لە تەواوکەرەکەی دا کە ئینجیلە، ئەو دوو قسەیەش ئەمانەن:

**١)** قسەی یەکەم: ئەو قسەیەی کە دەڵێ: (إِذَن أَعْطِ مَا لِلقَيْصَرِ لِلقَيْصَر، وَمَا للهِ للهِ)[1]!

گوایە ڕۆژێك جوولەکەکان دەچنە لای عیسا تاکو بە تەڵەوەی بکەن، دەڵێن: تۆ پێمان بڵێ: ئێمە باج (ضريبة) بدەین بە کێ؟ بیدەین بە پادشای ڕۆم، یان نەیدەینێ؟ ئەویش دەڵێ: دینارێکم پێشان بدەن! دینارێکی پێشان دەدەن، دیارە وێنەی پادشای ڕۆم (قەیسەر)ی لەسەر بووە، دەڵێ: ئەو وێنەیە هی کێیە؟ ئەوانیش دەڵێن: ئەو وێنەیە هی پادشای ڕۆمە، ئەویش دەڵێ: کەواتە: ئەوەی هی قەیسەرە، بیدەن بە قەیسەر و، ئەوەش کە هی خوایە، بیدەن بە خوا.

هەڵبەتە ئەمە دەنگونجێ تەئویلێکی ڕاستیش بکرێ، بەڵام ئەوان مەبەستیان پێی ئەوەیە، کەواتە: نوێژو تاعەت بۆ خوا بکە، بەڵام لە ڕووی کاروباری دنیاییەوە: کاروباری سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و...هتد، مل بۆ قەیسەر کەچ بکە!

کە هەرگیز هیچ پێغەمبەرێك وای نەفەرمووە و، عیسا ئەگەر وای فەرمووبایە، بۆچی لەگەڵ قەیسەری ڕۆژگاری خۆی دا تێك دەگیرا؟! بۆچی هەوڵیان دەدا لە سێدارەی بدەن؟! کە ئێستاش مەسیحییەکان کڵاویان چۆتە سەر و وا دەزانن: عیسای مەسیح (علیه السلام) لە سێدارە دراوەو، ناشتووشیانە، بەڵام دوایی زیندوو بۆتەوە، کە ئەوان پێی دەڵێن: هەڵسانەوەی نێو مردووان (القِيَامَة بَيْنَ الأَمْوَات)! کە ئەوە ئەسڵ و ئەساسی نیە و، حەقیقەتەکەی ئەوەیە کە خوا لە سووڕەتی (آل عمران) ئایەتی (٥٥)دا دەفەرموێ:

---

(١) إنجيل لوقا، الإصحاح: ٢٠/٢٥، العهد الجديد، التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، ص٢١٤١.





﴿ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّى مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَىَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾.

واتە: کاتێك خوا فەرمووی: ئەی عیسا! من وەرگری تۆم {نەیفەرمووە: (مُمیتك) مرێنەری تۆم}، هەروەها بەرزت دەکەمەوە بۆ لای خۆم و پاکت دەکەمەوە لەوانەی بێبڕوان.

واتە: لە نێو ئەوان دەرت دێنم و بۆ ئاسمانێ بەرزت دەکەمەوە، وەك لە فەرمایشتی صەحیحی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)دا هاتوە[1]، کە لە ئاخیرزەمان دا عیسا لە ئاسمانێ دێتە خوار و دەججاڵ دەکوژێ.

لە سووڕەتی (النساء)دا ئایەتەکانی: (١٥٦) و (١٥٧) خوا (سبحانه وتعالى) زۆر بە ڕۆشنیی دەفەرموێ:

﴿ وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَٰنًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ ﴾.

واتە: (خوا نەفرینی لە جوولەکەکان کرد) بە هۆی کوفریان و بە هۆی گوتنی بوختانێکی مەزنیانەوە لە بارەی مەڕیەمەوە، هەروەها بە هۆی ئەو قسەیانەوە کە گوتیان: ئێمە عیسای کوڕی مەڕیەمی ڕەوانە کراوی خوامان کوشت.

بەڵام خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ ﴾، نە کوشتیان نە هەڵیشیان واسی، ئەدی چۆن بوو؟ ﴿ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ﴾، بەڵام وێنەی عیسایان بۆ برایە سەر یەکێکی دیکە و ئەویان لە جیاتی عیسا هەڵواسی، ئەو جاسووس و خائینەش یەکێك بوو لە دوازدە حەوارییەکانی خۆی، کە ناوی یەهووزای ئەسخەریوطیی بوو، کە بە گرتنی دا لە بەرانبەر چەند درەمێك دا کە لە ڕۆمەکان وەریگرتن و، شوێنی عیسای پێشان دان.

---

(١) لە درێژەی ئەو فەرموودەیەدا هاتوە: {. فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ بَعَثَ اللَّهُ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ فَيَنْزِلُ عِنْدَ الْمَنَارَةِ الْبَيْضَاءِ شَرْقِيَّ دِمَشْقَ بَيْنَ مَهْرُودَتَيْنِ..} رواه مسلم: ٢٩٣٧.

دیارە حەوارییەکان دوازدە (١٢) کەس بوون و هەموویان لەو کاتەدا لە ژوورەکەدا بوون، بە عیساوە دەبوونە سێزدە (١٣) کەس، بەڵام کە (یهوذا الأسخریوطي) چووە ژوورەکە، پێش ئەوەی ڕۆمەکان بێنە ژوورێ، وێنەی عیسا (علیه السلام) برایە سەر (یهوذا) و عیساش بە کلاوڕۆژنە (كوّة السَّقف)دا سەرخرا، خوا بەرزی کردەوە، هەڵبەتە حەوارییەکان هەموویان دەیانزانی کە عیسا بەرز کرایەوە، بەڵام (یهوذا)ش هەستی بە خۆی نەکردوە کە گۆڕاوە، دوایی ماوەیەك پێ چوو هەر لە ژوورەکەدا بوون، هەتا هەندێك لە زانایان دەڵێن: هەندێك لە حەوارییەکان کە شێوەی عیسا چووە سەر (یهوذا) وایانزانی عیسایە، بەڵام ئەوە پێناچێ ڕاست بێ، چونکە ئەوان بینیویانە کە عیسا بەرز کراوەتەوە بۆ سەرێ.

ئنجا ڕۆمەکان گوتیان: بۆ نایەنە دەرێ؟ کە لێیان وەژوور کەوتن، دیارە (یهوذا) وەك عیسا دەچوو، وایان زانی عیسایە، هەرچەندە هاواری کرد، من ئەونیم و عیسا بەرز کرایەوە! ئیدی ئەوە بوو - بەپێی ئەوەی لە چوار ئینجیلەکان دا هاتوە - تاجێکی لە دڕکیان بە ئیهانە لەسەر نا و، بردیان بۆ بەر پەتی سێدارە، هەر چەند زۆر هاواری کرد: من عیسا نیم و ئیعدامم مەکەن!![١]

ئێستاش لە ئینجیلەکاندا هەندێ قسەی بێهێز گێڕدراونەوە، کە گوایە عیسا (علیه السلام) کردوونی، ئنجا من پێم وایە ئەو قسانە هەر هی یەهووذای ئەسخەریوطیی هەڵگەڕاوە و سیخوڕن، نەك هی عیسا (علیه السلام)، بۆ نموونە یەکێك لەو قسانە:

(أَلُوي أَلُوي، لما شَبَقْتَنِي)، پەرستراوم! پەرستراوم! بۆچی دەممرێنی؟ یان: خوایە با ئەمجارە نەمرم![٢] کە بێگومان ئەو قسانە قسەی عیسا (علیه السلام) نین و،

---

(١) لە ئینجیلی (بەرنابا)دا بەدرێژیی ئەو بەسەرهاتە هاتوە، وەك ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (النساء) و (المائدة)دا هێناومانەو دواتریش لە کاتی توێژینەوەکەمان لەبارەی کتێبە ئاسمانیەکانەوە، قسەی لەبارەوە دەکەین.

(٢) بڕوانە: التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد الجديد، إنجيل مرقس، الإصحاح: ١٥، ص٢٠٤٦، هەروەها: الإصحاح: ١٤، ص٢٠٣٨.

مسوڵمانێکی تۆزێك ئیمان بەهێزیش قسەی وا ناکات، چ جای پێغەمبەرێکی پایە بەرزی وەك عیسا (علیه السلام)، وەك لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)، (الكتاب الرابع)دا کە باسی ئیمان بە کتێبەکانی خوا دەکەم، لەوێ دا بە تەفصیلْ باسم کردوە، ناگونجێ عیسا (علیه السلام) قسەی وا بکات و، ئەگەر گریمان ئەو جۆرە قسانەی کردبان، لەگەڵ قەیسەری ڕۆم و دەسەڵاتدارانی ڕۆم دا تێك نەدەگیرا.

٢)- قسەی دووەم: کە پاڵ دەدرێتە لای عیسا، دەڵێ: (مَمْلَكَتِي لَيْسَتْ مِنَ هَذَا العَالَمْ)[1]، واتە: وڵاتی من لەم جیهانەدا نیە، یان شوێنی من لەم جیهانەدا نیە.

ئەو قسەیەش بۆیە دەڵێین هی عیسا (علیه السلام) نیە، چونکە ئەگەر شوێنی ئەو لەم دنیایەدا نیە، بۆچی خوا هێناویەتی بۆ ئەم دنیایە، بۆچی ئەرکی پێ سپێردراوەو کراوە بە پێغەمبەرو، وەحیی بۆ نێردراوە، کتێبی بۆ دابەزێنراوە؟!

ئەو قسانە کە پاڵدراونە لای عیسا (علیه السلام)، ناگونجێ پێغەمبەرانی خوا (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت) ئەو جۆرە قسانە بکەن، کە ئەو زاتانە (علیهم السلام) لە ئەسڵدا بۆ ئەوە هاتوون: ژیانی خەڵك چاك بکەن، پاکسازیی تێدا بکەن، چاکسازیی تێدا بکەن، ڕاستکردنەوەی تێدا بکەن، دادگەریی تێدا بچەسپێنن، زوڵم و گەندەڵیی و خراپەی تێدا لابەرن، هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە ئەسڵدا بۆ ئەوە هاتوون، ئیدی چۆن ڕازی دەبن بە عەلمانیيەت، ئاخر دوایی کە لە ئەورووپا سیکۆلاریزم تەبەننیی کرا، زۆر پشتی بەو قسەیە بەست کە دەڵێ:

(أَعْطِ مَا للقَيْصَرِ لِلقَيْصَر، وَمَا للهِ للهِ)، ئەوەی هی قەیسەرە بیدە بە قەیسەر و، ئەوەی هی خوایە، بیدە بە خوا.

کە ئەمە وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰٓ ﴿٢٢﴾ ﴾ النجم.

---

(١) سەرچاوەی پێشوو: ص٢٢٣٢، إنجيل يوحنَّا، الإصحاح: ١٨، ص٢٧.

واتە: ئەوە دابەشکردنێکی زۆر نا دادگەرانەیە، کە لایەنی ڕووحیی و شەخسیی و ئەوەی کە هیچ پەیوەندیی بە دنیاوە نیە، عایدی خوابێ، بەڵام کاروباری دنیاو سیاسەت و حوکمڕانیی و ئابووریی و .. هتد، عایدی مرۆڤێك بێ! نەخێر، خوا (سبحانە وتعالی) ئاییینی خۆی ناردوە، کاڵای پڕ بە باڵا بێ، سێبەرو سایەی ژیان بێ و، هەموو ڕەهەندو لایەنەکانی ژیانی مرۆڤ بگرێتەوە، بە تاك و خێزان و کۆمەڵگاو دەوڵەتەوە.





## بڕگەی پێنجەم: ئەو شتانەی کڵێسا لە ئایینی مەسیح دا دایهێنان:

کڵێسا حەوت بیدعەتی کوشندەی لە ئایینی مەسیح دا داهێنان، کە ئێمە بە ڕیز باسیان دەکەین:

### بیدعەتی یەکەم: چینی ئەکلیرۆس (طبقة الكهنوت):

یەکەم داهێنراو لە ئایینی مەسیح دا، کە کڵێسا دایهێنا، بریتی بوو لە چینی پیاوانی ئایینی (ئەکلیرۆس).

شایانی باسیشە کە دوایی (ئوجەست کونت) و ژمارەیەك لە مێژوونووسانی ئەورووپایی، لە کاردانەوەی ئەوەدا گوتوویانە: مرۆڤایەتیی بە سێ قۆناغ دا تێپەڕیوە:

أ/ قۆناغی جادوو و ئەفسانە.

ب/ قۆناغی ئایین.

ج/ قۆناغی زانست.

لە ڕاستییدا ئەو بیرۆکەیە لە کاردانەوەی ئەو جۆرە شتانەدا بوو، کە کڵێسا دایهێنان و، یەکێك لەوانە چینی (پیاوانی ئایین)بوو.

ئەو مێژوو زانانە گوتوویانە: پێشێ خەڵك جادوو و ئەفسانە، ئایین و بەرنامەی بووە، دوایی کە گەشەی زیاتری کردوە، ئایینی خوایی تەبەننیی کردوە، بەڵام ئێستا ئێمە گەیشتووینە قۆناغی زانست، کەواتە: وەك چۆن نابێ پەنا بەرینە بەر جادوو و ئەفسانە، نابێ پەنا بەرینە بەر ئایینیش، هەڵبەتە مەبەستیان پێ ئەو ئایینە بووە کە خۆیان بینیویانە، کە دیتوویانە: چینێك، خۆیان بەسەر خەڵك دا فەرز کردوە بە ناوی ئایینەوە، دوایی باسی دەکەین چییان بەسەر خەڵك هێناوە!

بێگومان ئەمە ئەوەش دەگەیەنێ، کە پیاوانی ئایینی، پاشماوەی قۆناغی جادوو و ئەفسانەن.

(وێلز) لە کتێبێکی ناوداری دا، تەرجەمە عەرەبییەکەی بە ناوی: (معالم تأريخ الإنسانية)، واتە: (قووچکەکانی مێژووی مرۆڤایەتیی)[1]، دەڵێ:

(إنَّ تَعَالِيم يَسُوع الناصِري تَعَالِيمُ نبويَّةٌ مِنَ الطِّرَازِ الجَدِيدِ الَّذِي ابْتَدَأَ بظهُورِ أَنْبيَاءِ عِبْرَانِين، وَهِيَ لَمْ تَكُنْ كَهَنوتيةً، وَلَمْ يَكُن لَهَا مَعْبَدٌ مُقَدَّسٌ حَبْساً عَلَيْهَا، وَلاَ هَيْكَلٌ وَلَمْ يَكُنْ لَدَيْهَا شَعَائِر وَلاَ طقوس وَكَانَ قُرْبَانُهَا قَلْبَاً كَسيراً خَاشِعَاً، وَكَانَتِ الهَيْئَةُ الوَحِيدَة فِيهَا، هَيْئَةٌ مِنَ الوعَّاظِ، وَكَانَ رَأس مَا لَدَيهَا مِنْ عَمَلٍ هُوَ المَوْعِظَة...).

واتە: ئایینی یەسووعی ناصریی (عیسا خەڵکی (ناصرە) بووە کە شوێنێکە لە فەڵەستین)، ئایینێکی پێغەمبەرانە بوو، لە شێوازێکی نوێ دا، کە دەستی پێکرد بوو بە دەرکەوتنی پێغەمبەرانی عیبرانیی (واتە: بەنو ئیسرائیلیی) و ئایینێکی کەهەنووتیی نەبوو، (کە چینێکی تایبەتی ئایینی هەبێ) و پەرستگایەکی پیرۆزی نەبوو، کە لەسەری قەتیس بکرێ، هەروەها هەیکەل و پەیکەری نەبوو، شوێنێکی وای نەبوو و سرووتەکان (طقوس)ی نەبوون، (کە ئێستا هەن)، قوربانییەکەی بریتی بوو لە دڵێکی شکاوی ملکەچ بۆ خوا و، تاکە دەستەیەك کە هەیبوو، کۆمەڵێك بوون لە ئامۆژگارییکارەکان، دەستمایەی ئامۆژگارییکارەکانیش بریتی بوو لە ئامۆژگارییکردن و دڵی خەڵك نەرمکردن بە لای خوادا.

بەڵێ ئەمە یەکێك لە بیدعەتەکانی ئایینی نەصرانیی تێکدرا و بوو: داهێنانی چینی پیاوانی ئایینی (ئەکلیرۆس)، کە بە داخەوە ئێستاش هەندێ لە مسوڵمانان، بە زانایان و بە شێخەکان دەڵێن: پیاوانی ئایینی، دوعاگۆ، لە ئێرانێ پێیان دەڵێن: ڕووحانیی! ئایا ئەوانە تەنیا ڕووحن و خەڵکی دیکە تەنیا جەستەیە؟ هەمووومان لە ڕووح و جەستە پێك هاتووین! لە ڕاستییدا ئەو تەعبیرو زاراوە و وشانە، هەموویان لە ئایینی تێکدراوی نەصرانییەوە دزەیان کردوە، هەروەها زۆر شتی دیکەش بۆ وێنە: کەسێ بە ناوی دینەوە حوکم بکات و

---

(١) ج٣، ص٧٢٠.





خۆی بە وەکیلی خوا دابنێ، خۆی بە سێبەری خوا دابنێ، لە ئیسلامدا شتی وا نیە، لە ئیسلامدا مرۆڤەکان هەموویان جێنشینی خوان، هەموویان نوێنەری خوان، دەبێ تێکڕا و وێکڕا ئەم سەر زەوییە بە شەریعەتی خوا پاك و چاك بکەن و، کۆمەڵگای خۆیان بە شەریعەتی خوا بەڕێوەبەرن، هەموویان وەك یەك بەو ئەرکەوە پابەند کراون.

### بیدعەتی دووەم: میانجیگەریی لە نێوان خواو خەڵکدا:

واتە: خەڵك بۆی نیە ڕاستەوخۆ خوا بپەرستێ و بەندایەتیی بۆ خوا بکات و، دەبێ واستەیەك لە بەیندا هەبێ، دەبێ میانجییەك هەبێ لە بەیندا، وەك خوا (سبحانە وتعالی) لە ئایەتی (٣١)ی سوورەتی (التوبة)دا، لە بارەی نەصرانییەکانەوە دەفەرموێ:

﴿ اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ ﴾[1].

خوا دەفەرموێ: زانا و ڕەبەنەکانی خۆیان و مەسیحی کوڕی مەریەمیشیان لە جیاتی خوا کردنە پەرستراوی خۆیان.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَٰهًا وَاحِدًا لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾.

هەرچەندە فەرمانیشیان پێ نەکرابوو کە جگە لە یەك پەرستراو بپەرستن (کە خوایە)، جگە لەو هیچ پەرستراو نیە، پاکیی بۆ خوا لەوەی کە دەیکەنە هاوبەش (بۆ خوا).

---

(١) (أحبار) کۆی (حَبْر)ە، یان کۆی (حِبر)ە، بە مانای زانا، (رُهْبان)یش کۆی (راهب)ە، واتە: گۆشەگیر، ڕەبەن، زێدەڕۆییکەر لە خواپەرستییی دا، بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن، ص١٢٠، لفظ (حبر)و ص ٢٢١ لفظ: (رهب).

کەواتە: نەصرانییەکان: هەم زانایەکانی خۆیان و، هەم ڕاهیبەکانی خۆیان، لە جیاتی خوا پەرستوون و، حەڵاڵ و حەڕامیان بۆ دەستکاریی کردوون.

بیدعەتی سێیەم: ڕەبەنایەتیی (الرهبانية):

وەك خوا (سبحانه وتعالى) لە سووڕەتی (الحديد) ئایەتی (٢٧)دا، لە بارەی مەسیحییەکانەوە دەفەرموێ:

﴿ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْإِنجِيلَ وَجَعَلْنَا فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَـٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ۖ فَـَٔاتَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾.

ئەوەی مەبەستمە ئەم دێڕەیە: ﴿ وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا ﴾، ڕەهبانییەتێك کە خۆیان دایانهێنا، ﴿ مَا كَتَبْنَـٰهَا عَلَيْهِمْ ﴾، ئێمە لەسەرمان نەنووسیبون، ئێمە لەسەرمان پێویست نەکردبوون، ئەدی بۆچی دایانهێنا؟ ﴿ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ ﴾، بۆ ئەوەی لەو ڕێیەوە بگەنە ڕەزامەندیی خوا، دایانهێنا، بەڵام: ﴿ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ﴾، کەچی وەك پێویست ئەوەشیان بۆ چاودێریی نەکراو نەپارێزرا.

ئنجا ئەو ڕەبەنایەتییە زەربەیەکی زۆر کوشندەی لە ئایینی ڕاستەقینەی عیسادا (علیه السلام)، شایانی گوتنیشە کە ئەو گۆشەگیریی و ڕەبەنایەتییە چوار هۆکار و ڕیشەی هەبوون:

١- ئەو گوناهە ئەسڵییەی کە بە میرات گیراوە، کە بریتیە لەوەی ئادەم (علیه السلام) - وەك لە پەیمانی کۆندا هاتوە - گوایە لە درەختی (زانست)ی خواردوە، ئنجا مادام لە درەختی (زانست)ی خواردوە، گوناهو تاوانی کردوە و، خواش سزای داوە! لە حاڵەتێکدا کە خوا لە قورئاندا پێمان دەفەرموێ:





﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ ﴾ البقرة.

خوا هەموو ناوەکانی فێری ئادەم (علیه الصلاة والسلام) کردن، دوایی پێشانی فریشتەکانی دان، فەرمووی: ئەگەر ڕاست دەکەن (ئێوە شایستەترن بە جێنشینایەتیی من لەسەر زەوی)، ناوی ئەوانەم پێ بڵێن! ئەوانیش گوتیان: پاکیی بۆ تۆ، ئەوەی تۆ فێرمان نەکەی، ئێمە نایزانین، هەر تۆ زانای کارزانی.

﴿ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ﴾ (خوا) فەرمووی: ئەی ئادەم! ناوەکانیان پێ بڵێ، ﴿ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ﴾، کاتێك (ئادەم) هەواڵی پێدان بە ناوەکانیان.
﴿ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴾، البقرة ٣٣.

واتە: (خوا) فەرمووی: ئایا پێم نەگوتن: من نهێنیی ئاسمانەکان و زەوی دەزانم، ئەوە دەزانم کە دەیشارنەوەو، ئەوەش کە ئاشکرای دەکەن!

واتە: بۆیە ئادەمم کردۆتە جێنشینی خۆم لەسەر زەوی، چونکە توانایەکی هەیە، ئەی فریشتەکان! ئێوە ئەو توانایەتان نیە.

واتە: لە قورئانداو، لە ئیسلام دا، خوا (سبحانه وتعالى) زانایی ئادەم دەکاتە بەڵگەو پاساوی ئەوە کە جێنشینی خوا بێ لەسەر زەوی، بەڵام لە (پەیمانی کۆن) و لە ئایینی تێکدراوی جوولەکەو نەصرانیی دا، ئەوە کە گوایە: ئادەم لە درەختی زانستی خواردوە، کراوە بە پاساوی ئەوەی خوا سزای بدات!![1]

ئنجا لێرەوەیە دەبێ بگەڕێین: بۆچی ئەورووپا بەرەو ئیلحاد چوو؟ کتێبە موقەددەس (Bible)ەکەی، پێی دەڵێ: هەر کەس فێری زانست بێ، خوا

---

(١) بڕوانە: التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح: ٣، ص(١٢-١٦)، (سقوط الإنسان، عقاب الإنسان).

(سبحانه وتعالى) سزای دەدا، بەڵام لە ئیسلامدا بەپێچەوانەوە ئادەم(علیه السلام) بوو بە مامۆستای فریشتەکان و فەرمان بە فریشتەکان کرا کڕنووشی ڕێز گرتنی بۆ بەرن، لەبەر ئەوەی بوو بە شارەزاکەریان، بوو بە مامۆستایان، یانی: ئیمتیازی مرۆڤ لە ئیسلامدا، ئەوەیە کە زانا بێ، بەڵام دیارە لە پەیمانی کۆندا، لە ئایینی جوولەکەو نەصرانییەکاندا، لەو ئایینە تێکدراوو شێوێنراوەدا، زانست گوناهێکەو تاوانێکە، کە خوا مرۆڤی لەسەر سزا دەدات!! بەڵێ لێرەوە دەبێ بگەڕێین بۆ هۆکاری ناکۆکیی نێوان ئایین و زانست، لێرەوە هاتوە لەو ئایینە تێکدراو و لەو ئەفسانەو بیرۆکە پڕوپووچانەوە!

٢- هۆکار و ڕیشەی دووەمی ڕەبەنایەتیی، بریتی بوو لەو کاردانەوە پەرگیرانەیەی، ئەو حاڵەتە ماددییە نەوسنییە، کە هەم جوولەکەکان، هەم ڕۆمانییەکان پیادەیان دەکرد، کە زۆر ماددیی بوون و تەنیا خەریکی لەززەتە ماددییەکان بوون و، لایەنی ڕووحییان پشتگوێ خستبوو، ئەو ڕەهبانییەتە کاردانەوەیەك بوو بۆ ئەو حاڵەتە ماددییە، کە وەك چۆن حاڵەتە ماددییەکە، تێپەڕاند بوو بە لایەك دا، ئەوانیش بەو لادا تێیان پەڕاند، وەك چۆن بارێك کە لەسەر پشتی وڵاخێکە بەلایەکدا خوار دەبێ، دوایی وڵاخدار هێندە بە توندیی پاڵی پێوەدەنێ، ئەوجارە بەولادا خوار دەبێتەوە، هەمیشە هەر وایە، کارو کاردانەوە، تێپەڕاندن و بە زایەدانیان تێدایە.

٣- هۆکار و ڕیشەی سێیەمی ئەو بیرۆکەی ڕەبەنایەتییە، بریتی بوو لەو فەلسەفە ڕەشبینییە ڕاکردنەی لە ژیان، کە لە نێو خەڵکێکی زۆری ئەورووپادا تەشەنەی کردبوو و نائومێد و بێ هیوای کردبوون لە ژیانی دنیا، کە بێگومان ئەویش دیسان، ئەو بیرکردنەوانەی کڵێسا دایهێنابوون، کاریگەرییان لەسەری هەبوو.

٤- ڕیشەو هۆکاری چوارەمی ڕەبەنایەتیی: بارودۆخی ئابووریی و ژیان و گوزەرانیی کۆمەڵایەتیی قورسی خەڵك، ئەمیش وای کردبوو کە خەڵکێك بیر لە بیرۆکەی ڕەبەنایەتیی بکەنەوە.



## مەرجەكانی سیستمی ڕەبەنایەتیی (نظام الرهبنة):

سیستمی ڕەبەنایەتیی بەگشتی چوار مەرجی هەبوون:

**مەرجی یەكەم:** ئەوە بووە كە دەبێ ئەو ئینسانە هاوسەرگیریی نەكات، پیاو بێ، یان ئافرەت.

**مەرجی دووەم:** دەبووایە بە تەواویی واز لە دنیا بێنێ، هیچ شتێكی دنیایی نەبێ.

**مەرجی سێیەم:** دەبووایە بەردەوام خواپەرستیی بكات، بەبێ پسانەوە.

**مەرجی چوارەم:** دەبووایە خۆی ئەزیەت بدات، جەستەی خۆی سزا بداو ناڕەحەت بكات.

لە كتێبەكاندا زۆر شت لەو بارەوە هاتوە، بۆ وێنە:

أ/ ڕاهیبەكان هەیانبووە گوتوویەتی: شەش (٦) مانگان لە زەلكاوێكدا نوستووم، بۆ ئەوەی ئەو مێشوولەو زیندەوەرانەی كە لەوێ دان، پێم وە بدەن و ئەزیەتم بدەن!

ب/ هەیانبووە - بەقسەی خۆی - سێ (٣) ساڵان لەسەر یەك لاق، لەسەر یەك قاچ، خواپەرستیی كردوە!

ج/ هەیانبووە گوتوویەتی: من لە ئەشكەوتێكی تەسكدا بە بەردێكەوە، خۆم بەستۆتەوە، داخۆ چەند هەفتە و چەند مانگان، خۆی بەستۆتەوە!

د/ خۆ نەشۆردن و خۆ پاك نەكردنەوە لە قڕو موو و ئەوانە.

بیدعەتی چوارەم: نهێنییە پیرۆزەکان (الأَسْرَار المقَدَّسَة):

هەڵبەتە هەر کامێك لەو باسانە، پێویستیی بە قسە لێکردنی زۆر دەکات و من دەمەوێ ئاماژەیەکی کورتی پێ بکەم:

١) سێکوچکە (ثالوث)ە: (باب، کوڕ، گیانی پیرۆز)، کە پێشتریش چەند جارێك لە بارەیەوە دواین.

٢) لە ئاو هەڵکێشان (تعمید)، کە ئەویش جۆرە سرووت (طقْس) و خواپەرستییەکی نەصرانییەکانە.

٣) ئێوارە خوانی خوایی (العَشَاء الربَّاني)، کە پێشی دەگوترێ: (القُرْبَانُ المُقَدَّس)، قوربانیی پیرۆز.

٤) دان بە هەڵەو گوناهی خۆدا هێنان (الإعْتِرَاف).

ئنجا ئێمە تەنیا ئاماژە بە یەکێکیان دەکەین، کە ڕیشەکەی هەر لە ئینجیلەوە هاتوە، بۆ وێنە: لە ئینجیلی (متَّى)، ئیصحاحی: (٢٦)، ئایەتەکانی: (٢٧-٢٩)، (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس)دا هاتوە[١]:

(وَفِيمَا هُمْ يَأْكُلُونَ، أَخَذَ يَسُوعُ الْخُبْزَ، وَبَارَكَ وَكَسَّرَ وَأَعْطَى التَّلاَمِيذَ، وَقَالَ: خُذُوا كُلُوا، هذَا هُوَ جَسَدِي، وَأَخَذَ الْكَأْسَ وَشَكَرَ وَأَعْطَاهُمْ قَائِلاً: اشْرَبُوا مِنْهَا كُلُّكُمْ، لأَنَّ هذَا هُوَ دَمِي الَّذِي لِلْعَهْدِ الْجَدِيدِ الَّذِي يُسْفَكُ مِنْ أَجْلِ كَثِيرِينَ لِمَغْفِرَةِ الْخَطَايَا).

واتە: لە کاتێکدا کە ئەوان دانیشتبوون، خۆراکیان دەخوارد، یەسووع (عیسا) نانەکەی دەست دایە و دوعای لێ خوێند، بەرەکەتی بکەوێتێ و نانەکەی پارچە پارچە کرد، (شکاندی) و دای بە قوتابییەکان و گوتی: بخۆن! ئەوە جەستەی منە (بۆچی جەستەی وییە؟ نازانین، دەبێ ئایینی کڵێسا جواب بداتەوە)،

---

(١) ص١٩٥٨.



پاشان پەرداخەکەشی دەستدایە، (یاخود قاپەکەی دەست دایە، کە گوایە شەڕابی تێدا بووە) و سوپاسی خوای کرد، دوایی وێی دان و پێی گوتن: هەمووتان لێی بخۆنەوە، چونکە ئەمەش خوێنی منە، بۆ ئەو پەیمانە نوێیەی کە خوێنی من دەڕژێنرێ لە پێناوی لێبوردنی گوناهی زۆراندا.

(واتە: بۆیە عیسا لە قەنارە دەدرێ تاکو خوا، (کە عیسا بە حیساب کوڕی خوایە)، خوا تاقانە کوڕەکەی خۆی بکاتە بەلاگێڕەرەوەی گوناهی ئەو خەڵکانە کە گوناهیان کردوە! ئنجا تۆ وەرە تەماشای ئەو عاجباتییە بکە! خەڵك گوناهان دەکات، عیسا لەدار دەدرێ! ئاخر چ عەقڵێك شتی وا قبووڵ دەکات؟!

## بیدعەتی پێنجەم: پەرستن و بە پیرۆزگرتنی وێنەو پەیکەرەکان:

(ویل دیوڕانت) مێژوونووسی ناودار، لە کتێبە ناودارەکەی خۆی (چیرۆکی شارستانییەت) (قصة الحضارة)دا لە بارەی ڕەواج دانی نەصرانییەت بەوێنە و پەیکەرانەوە، گوتوویەتی: (هەڵبەتە من دەقە عەرەبییەکەی دێنم، لەبەر ئەوەی کتێبەکە بە عەرەبییە، دواییش بە خێرایی تەرجەمەی کوردیی دەکەم)،

(كَانَتِ الكَنِيسَةُ أَوَّلَ أَمْرِهَا تَكْرَهُ الصُّوَرَ والتَّمَاثِيل وَتَعُدُّهَا بَقَايَا مِنَ الوَثَنِية، وَتَنْظُر بعَيْنِ المَقْتِ إلى فَنِّ النَّحْتِ الوَثَنِي الَّذِي يَهْدُفُ إلى تَمْثيل الآلِهَة، وَلَكِنْ انتصار المَسيحيّةِ في عهد قسطنطين، وَمَا كَانَ للتَقَاليد وَالتَمَاثِيل اليونانية من أَثَرٍ، كُلُّ هَذَا قَدْ خَفَّفَ مِنْ حِدَّةِ مُقَاوَمَةِ هَذِهِ الأَفْكَار الوَثَنِيَّة، وَلَمَّا أَنْ تَضَاعَفَت عَدَدُ القِدِّيسِينَ المعبودِين، نَشَأت الحَاجَةُ إلى مَعْرِفَتِهِم وَتَذَكُّرِهِم، فَظَهَرَتْ لَهُمْ وَلِمَرْيَم العَذْرَاء كَثِيرٌ مِنَ الصُّوَر، وَلَمْ يُعَظِّم النَّاسُ الصُّوَرَ الَّتِي يَزْعُمُونَ أَنَّهَا تُمَثِّلُ المَسيح فَحَسْبُ، بَلْ عَظّموا مَعَها خَشَبَةَ الصَّلِيب، حَتَّى لَقَدْ أَصْبَحَ الصَّلِيبُ فِي نَظَر ذَوِي العُقُولِ السَّاذِجَة، طِلَّسْمَاً ذَا قُوَّة سحرية عَجِيبة)[1].

---

(١) قصة الحضارة، ج٢٤، ص١٥٤.

واتە: کڵێسا لە سەرەتاوە زۆر ڕقی لە وێنەو پەیکەرەکان بوو و، بە شوێنەواری بتپەرستیی دادەنان و، بە چاوی سووکەوە تەماشای بت تاشینی بتپەرستیی دەکرد، کە دەیویست پەرستراوەکان لە پەیکەردا بەرجەستە بکات، بەڵام زاڵ بوونی ئەو مەسیحییەتە کە قسطنطین تەبەننیی کرد، پاشان بە هۆی کلتوورو پەیکەرە یۆنانییەکانەوە، ئەوە شوێنەوار و کاریگەریی هەبوو و وایکرد کە لە کارتێکردنی بەرهەڵستییکردنی ئەو بیرۆکە بتپەرستانەیە، کەم بکاتەوە، پاشان لەبەر ئەوەی ژمارەی قیددیسەکان کە دەپەرستران، زۆر بوو، (واتە: چینی ئەکلیرۆس)، ئەوانەی پێویست بوو بناسرێن و یاد بکرێنەوە، بۆیە هەم بۆ ئەوانیش و هەم بۆ مەریەمی کچیش، زۆر وێنە دروستکران و پەیکەر داتاشران، ئنجا خەڵك تەنیا وێنەکانی بە مەزن نەدەگرت، کە پێیان وا بوو ئەوە پەیکەری مەسیحە، (یان هی مەریەمە)، بەڵکو ئەو تەختەیەش کە گوایە عیسای لەسەر هەڵواسراوە: {خاچ (صلیب)}، ئەویشیان بە بەرز دەگرت، هەتا وای لێهات لەلای هەندێك لەوانەی عەقڵێکی سادەیان هەیە، پێیان وا بوو ئەو خاچە هێزێکی جادوویی سەرسوڕهێنەری هەیە.

## بیدعەتی شەشەم: موعجیزەو ئەفسانەی زۆر:

لەبەر ئەوەی ئایینی تێکدراوو شێوێنراوی مەسیح، لە ڕووی عەقڵییەوە، ئیقناعکەر نەبوو بۆ خەڵك، دەویسترا ئەوە بە شتێکی دیکە قەرەبوو بکرێتەوە، بۆیە شتی سەیرو عەجایبیان هەڵدەبەست، وەك چۆن هەندێك صۆفیی و دەروێشی ناحاڵیی، بۆ هەندێك لە شێخەکانی خۆیان شتی سەیرو عەجایب، کە نە لە شەرعدا جێی دەبێتەوە، نە لە عەقڵدا و، نە لەگەڵ واقیعدا دەگونجێ، بۆیان هەڵدەبەستن، بە هەمان شێوە: مەسیحییەکانیش بۆ قیددیسەکان و بۆ ڕاهیبەکانی خۆیان، بۆ گەورە پیاوانی ئایینیی خۆیان، شتی سەیرو عەجایبیان هەڵدەبەست، لە قاڵبی موعجیزەو کەرامەت و شتی سەرسوڕهێنەردا.

کە ئەمەش شتێکی دیکە بوو نەصرانییەکان دایانهێنا، بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە قەناعەت پێ بێنن، لەبەر ئەوەی کە ئایینەکەیان نەیدەتوانی عەقڵی خەڵك



بدوێنێ و ئیقناعیان بکات، دەیانگوت: دەبێ بە شتی دیکەی سەرسوڕهێنەر و سۆز جووڵێنەر، ئەوە قەرەبوو بکەینەوە! یانی: ئەگەر نەشتوانین عەقڵیان ئیقناع بکەن و بدوێنن، با بەلای کەمەوە هەست و سۆزیان بجووڵێنن!

## بیدعەتی حەوتەم: پسوولەی لێخۆشبوون (صكُّ الغُفْرَان):

که ئەویش لە دوو شتدا بەرجەستە دەبوو:

**یەك:** گوایە: کڵێسا دەسەڵاتی لێبوردنی هەیە لە جیاتی خوا، کڵێسا، (واتە: چینی ئەکلیرۆس و پاپا و قەشەکانی خوار پاپا)، وەکیلی خوان و، ئەوانە لە جیاتی خوا، دەتوانن لە گوناهی خەڵك ببوورن، ئەمە لە حاڵێکدا کە خوا لە سوورەتی (آل عمران)، ئایەتی (١٣٥)دا دەفەرمویٰ:

﴿وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾، واتە: جگە لە خوا، کێ لە گوناهان دەبووریٰ؟

هەروەها لە سەرەتای سوورەتی (غافر)دا خوای میهرەبان دەفەرمویٰ:
﴿حمٓ ۝١ تَنزِيلُ ٱلْكِتَـٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ۝٢ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوْبِ شَدِيدِ ٱلْعِقَابِ ذِى ٱلطَّوْلِ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ إِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ۝٣﴾.

واتە: حا، میم، دابەزێنرانی کتێب لەلایەن خوای زاڵی زاناوەیە، (خوا) لێبوردەی گوناه و وەرگری تۆبەیە، سزای سەختە، خاوەن بەخششە، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە سەرەنجام تەنیا بۆ لای ویە.

**دوو:** دەبووایە بابای گوناهبار بچێ لەبەردەم کڵێسادا، یان لەبەردەم قەشەیەکی کڵێسادا، ساڵی جارێك ئە و ئیعتیراف و دانپێداهێنانە بکات، بەم دەقەی خوارەوە، دەبوو بیڵێ:

(رَبُّنَا يَسُوع يَرْحَمُكَ يَا فُلَان (إسم الرجل، أو المرأة) وَيَشْمُلُكَ باستِحَقَاقَاتِ آلامه الكُلِّية القُدْسِيَّة، وَأنا بالسُّلْطان الرَّسُولي المُعْطَى لِي، أُحِلُّكَ مِنْ جَمِيعِ القِصَاصَاتِ وَالأحْكَام

والطَّائِلاَتَ الكَنَسِيَّة الَّتِي استَوجَبْتَهَا، وَأَيْضاً مِنْ جَمِيع الإِفْرَاطِ وَالخَطَايَا وَالذُنُوبِ الَّتِي آرْتَكَبْتَهَا مَهْمَا كَانَت عَظِيمَة وَفَظيعة...)[١].

واتە: یەسووعی پەروەردگارمان (یەسووع یانی: عیسا)، لێت خۆش بێ، ئەی فلان کەس(ناوی پیاو یان ئافرەت) تۆ بگرێتە نێو خۆی بە هۆی ئەو ئازارە گشتییە پیرۆزانەوە کە چێژتوونی و، منیش بەو دەسەڵاتە ڕەسوولییەی {ڕەسوول: کە لە (بولس الرسول)ەوە هاتوە، یان لە (بطرس)ەوە، کە بە حیساب ئەو دامەزرێنەری کڵێسایە}، کە پێم دراوە، ئەوە من لە هەموو ئەو تۆڵانەی کە لەسەرتن و لە هەموو ئەو یاسایانەی کە ڕووت تێ دەکەن و، لە هەموو ئەو بەرپرسیاریەتییانەی کە کڵێسا خستوونیەتە سەر تۆ، ئەوە لە هەموویان تۆم عەفوو کرد، هەروەها لە هەموو تێپەڕاندن و لە هەموو گوناهەکان و لە هەموو هەڵەکانی کە کردووتن، هەرچەندە زۆر مەزن بن و زۆریش ناقۆڵا بن.

ئنجا پسوولەکەی داوەتێ و، ئەندازەیەك پارەی لێ وەرگرتوە!

**بەسەرهاتێك لەو بارەوە:**

دەڵێن: جارێك یەکێك لە دەوڵەمەندەکان، بەڵام پیاوێکی زۆر زیرەك و وریا بووە، زانیویەتی کە ئەوە هەمووی درۆو دەلەسەیە، (ئاخر بەهەشت، چۆن عەبدێك دەتوانێ کڕین و فرۆشتنی پێ بکات و، چۆن مرۆڤ دەتوانێ لە خەڵك ببوورێ لە جیاتی خوا؟!)، دەچێ بۆ لای پاپا.

(دەوڵەمەندەکە) دەڵێ: من هاتووم، دۆزەخت لێ بکڕم.

پاپا دەڵێ: خەڵك بەهەشتێ دەکڕێ، تۆ دۆزەخت بۆ چییە؟

کابرا دەڵێ: ئیشم پێیەتی.

پاپا دەڵێ: چەندەت دەوێ؟

---

(١) محاضرات في النصرانية، ص١٩٤، محمد أبو زهرة.





کابرا دەڵێ: من هاتووم هەموویت لێ بکڕم.

پاپا دەڵێ: ئاخر ئەوە زۆر دەکات و پارەیەکی زۆری دەوێ!

کابرا دەڵێ: هەرچەندی بێ ئەوە کێشە نیە، ڕێك دەکەوین، هەموو دۆزەخت لێ دەکڕم.

بەهەر حاڵ، هەموو دۆزەخی لێ دەکڕێ و لەگەڵی ڕێك دەکەوێ و، بێگومان پارەیەکی زۆری دەداتێ، دوایی ئەو کابرا دەوڵەمەندە، بەنێو خەڵك دا بڵاوی دەکاتەوە، دەڵێ: خەڵکینە! لەمەودوا کەس بەهەشتێ نەکڕێ!

(چونکە دەزانێ خەڵکەکە فەقیرو هەڵخەڵەتاو و چەواشەکراون، وەك چۆن ئێستاش زۆر جاران خەڵکی ساختەچیی پەیدا دەبێ، بە ناوی دینەوە، بە خەڵکی سادە دەڵێ: دوعاتان بۆ دەکەم و پارەیان لێ دەستێنن، یان فڵان کارەتان بۆ دەکەم و پارەیان لێ دەستێنن، ئەو ساختە چییانە بەناوی دینەوە هەر هەن، خەڵکی فەقیرو ڕەش و ڕووت کڵاو لەسەر دەنێن، پارەیان لێ دەکێشنەوە، بەبێ ئەوەی هیچ گرفتێکیان بۆ چارەسەر بکەن).

هەڵبەتە خەڵکەکەش لەو کابرایە دەپرسن:

بۆچی نەچینە لای پیاوانی ئایینی و پسوولەی لێخۆشبوون و چوونە بەهەشت نەکڕین؟!

ئەویش دەڵێ: چونکە دۆزەخ عایدی خۆمە، بە پارەی خۆم کڕیومە لە پاپا، ناشهێڵم کەس بچێتە نێوی، مانای وایە پێویست ناکات بەهەشتێ بکڕن، کە من نەمهێشت کەس بچێتە دۆزەخ، بۆ خۆتان دەچنە بەهەشتێ، گوناهبار بن، یان بێ گوناه بن، تازە دۆزەخ عایدی خۆمەو ناهێڵم کەسی بچێتێ!

## بڕگەی شەشەم: سەرەنجام بوغڕابوونی کڵێساو سەرکێشیی کردنی، لە ڕووی دینیی و سیاسیی و داراییەوە:

پێشتر باسمان کرد: چۆن ئایینی مەسیح (علیه السلام) لەسەر دەستی پیاوانی کڵێسا، چینی کەهەنووت، تێکدراو شێوێنرا و، کۆمەڵێك داهێنراو (بدعة)ی کوشندەی تێدا پەیدا کران، کە ئاماژەمان بە حەوت (٧) دانەیان کرد، ئنجا هەموو ئەوانە، ئەوەی لێکەوتەوە و دەرهاویشتەکەی ئەوە بوو کە: کڵێسا کە بە ناوی ئایینی مەسیحەوەو، بە ناوی خواوە، حوکمی دەکرد، لە ئەورووپاو ڕۆژئاوا، زۆر بوغڕا بوو و لە کەوڵی خۆی دەرچوو، لە هەر سێ بواری: دینداریی و سیاسیی و دارایی دا:

### یەکەم: لە ڕووی دیندارییەوە:

کڵێسا بە کەیفی خۆی دەستکاریی کارەکانی ئایینی دەکرد، وەك ئێستا ئاماژەیان پێ دەکەین، ئاماژە بە دە (١٠) کار دەکەین، هەر کەسێکیش ڕەخنەی لە کڵێسا گرتبایە، دەیانگوت: ئەوە ڕەخنەی لە خوا گرتوە و، ڕەخنەی لە مەسیح گرتوە و، ڕەخنەی لە ئایین گرتوە، ئەو ئایینەی کە خوا دایبەزاندوە، بۆیە: لە دنیادا ڕووبەڕووی سزادانی کڵێسا دەبووەوە و، دەیانگوت: لە ڕۆژی دواییشدا دووچاری سزای سەختی خوا (سبحانه وتعالى) دەبێتەوە، بۆ نموونە لە ڕووی دیندارییەوە، کڵێسا ئەو دە (١٠) کارەی کردن کە هەموویان لادان و تاوان بوون، بەپێی ئایین و بەرنامەکەی عیسای مەسیح (علیه السلام):

١) خەتەنەکردن پێویستە، بەڵام کڵێسا قەدەغەی کرد، عیسا (علیه السلام) بۆ خۆی جوولەکە بووە و، جوولەکە ئێستاش لەگەڵدا بێ نێرینەکانیان خەتەنە دەکەن، بەڵام کڵێسا بۆ ئەوەی خۆی جیا بکاتەوە لە جوولەکەکان، یان بە هەر هۆکارێکی دیکە، خەتەنەکردنی قەدەغە کرد.





٢) مردار(مَـيْـتَـةَ) حەڕام بوو، بەڵام کڵێسا حەڵاڵی کرد، ڕەوای کرد.

٣) وێنە و پەیکەرەکان، بە شیرك و بتپەرستیی لە قەڵەم دەدران، بەڵام کڵێسا کردنی بە ڕەمز و هێمای تەعبیرکردن لە تەقواو پارێزکاریی و دینداریی و، پەیکەریان بۆ عیسا دروستکرد، کە چۆن لە خاچ دراوە، پاشان بۆ مەریەم و، بۆ زۆر لەوانەی کە پێیان دەگوتن: (قِدِّيس) واتە: بە پیرۆز گیراو.

٤) ژن هێنانی پیاوانی ئایینی، قەدەغە کرد، ئەوان دەیانگوت: (پیاوانی ئایینی)، ئەگەرنا لە ئیسلامدا هەموو پیاوان، پیاوانی ئایینیین و هەموو ئافرەتانیش، ئافرەتانی ئایینیین، ئەوە زاراوەیەکی کڵێساییە، کە بە داخەوە نەك خەڵکی عەوام، هەندێك لە مامۆستاو مەلایەکانیش هەر بە کاری دێنن دەڵێن: ئێمە دوعا گۆین، ئێمە پیاوی ئایینیین! نا، پیاوانی ئۆممەت هەموویان پیاوی ئایینیین و ئافرەتەکانیش هەموویان ئافرەتی ئایینیین، لە ئایینی شێوێنراوو گۆڕدراوی نەصرانییدا، چینێکی دیارییکراو، کران بە عایدی ئایین، یانی: خەڵکەکەی دیکە هیچ پەیوەندیی بە ئایینەوە نیە.

هەڵبەتە سەرەتا ژن هێنانی ئەوانەی پێیان دەگوتن: پیاوانی ئایین، چینی ئەکلیرۆس، حەڵاڵ بوو، بەڵام لەلایەن کڵێساوە ئەوەش قەدەغە کرا و بڕیاردرا: کە هەر کەسێك پیاوی ئایینی بوو، نابێ ژن بێنێ و هاوسەرگیریی بکات.

٥) سامان لە خەڵك وەرگرتن شتێکی قەدەغەو خراپ بوو، بەڵام دوایی باج و سەرانە لەلایەن کڵێساوە لەسەر خەڵك فەرز دەکرا، چەندان جۆرە باج و سەرانە لەسەر خەڵك پێویست کران.

٦) پسوولەی لێبوردن (صَكُّ الغفران) ئەوە لە هەمووی خراپتر بوو، پێشتر دەیانگوت: خوا لە خەڵك دەبووری، بەڵام دوایی کڵێسا بە ناوی خۆیەوە، کە گوایە وەکیلی خوایە، پسوولەی لێخۆشبوونی بۆ خەڵك دەردەکرد و، دەبوو لە بەردەمی دا، بەلای کەمەوە ساڵی جارێك، هەر کەسێك بێ ئیعتیراف بکات بە گوناهەکانی و پسوولەیەکی بدەنێ و لە بەرانبەردا پارەی لێ وەربگرن!

٧) بێ بەشکرانی بە کۆمەڵ، بێ بەشکرانی بە کۆمەڵ ئەوەبوو کاتێك کلێسا ڕقی لە خەڵکێك داگرتبایە، لە عەشیرەتێك، لە نەتەوەیەك، لە دەڤەرێك، دەیگوت: ئەوە هەمووتانم بێ بەش کرد لە بەرەکەتی مەسیح، یان لە بەهەشت، یان ئەوە هەمووتانم لە بەزەیی خوا بێ بەریی کرد، وەك لە نێوان پاپاو پادشای ئینگلیزدا، ڕوویدا، ئەوە دیارە بەسەرهاتێکی هەیە لە مێژوودا.

٨) کلێسا دادگاکانی پشکنینی عەقیدە (محاكم التفتيش)ی دامەزراندن، سانسۆری عەقیدە کە پێشتریش باسمان کرد.

٩) جەنگی کلێسا لەلایەن پاپا (ئەنۆسنت)ەوە دژی دوو گەل، یاخود دوو کۆمەڵە خەڵك، یەکەمیان پێیان دەگوتن: کاپارییەکان (الكاپاريون)، دووەمیان پێیان دەگوتن: والدۆنییەکان (الوالدونيون)، کە ئەو دوو کۆمەڵە خەڵکە دەیانویست: بەپێی کتێبی پیرۆز (الكتاب المقدس) دینداریی بکەن، بەڵام وەك (وێلز) دەڵێ: زۆر دڕندانە هەموویان قەلاچۆ کران، لەلایەن کلێساو ئەوانەوە کە لەگەڵی بوون[1].

١٠) قۆرخکاریی و داخراویی و دەمارگیریی:

(برنتن) کە مێژوونووسێکە لە کتێبەکەی خۆی: (پیاوانێك و بیرۆکانێك)، (أفكار ورجال)دا[2]، دەڵێ: لە ماوەی هەزار ساڵی سەدەکانی نێوەڕاستدا، (واتە: لە سەدەی پێنجەمەوە تاکو سەدەی پازدەیەم، بەپێی ڕای هەندێك لە مێژوو نووسان، هەندێکیش دەڵێن: لە سەدەی شەشەمەوە تاکو شازدەیەم)، هیچ کەس بۆی نەبوو جگە لە نەصرانییەتی کلێسا، باسی هیچ ئایینێکی دیکە بکات، جگە لەوەی کلێسا دیاریی دەکرد وەك ئایین، هیچ کەسی دیکە بۆی نەبوو هیچ بیرو ڕاو بۆچوونێکی دیکەی هەبێ، لە ڕووی دینداریی و خواپەرستییەوە.

سەرەڕۆیی و بوغرابوونی کلێسا لە ڕووی دیندارییەوە، لەم دە (١٠) کارەدا کە وەك نموونە، هێنامانەوە بەرجەستە بوو بوو.

---

(١) معالم تأريخ الإنسانية، ص٩٠٥.

(٢) ص٢٠٧.

## دووەم: لە ڕووی سیاسییەوە:

لە ڕووی سیاسییەوە شەڕو کێشەیەکی گەورە لە نێوان کڵێساو ئیمپڕاتۆڕو پادشاکانی ڕۆم، (ئەورووپای ئێستا)دا، هەبوو، کە ئێمە تەنیا دوو نموونە دێنینەوە:

**نموونەی یەکەم:**

پاپا نیقۆلای یەکەم، (پاپا سەرۆکی هەموو مەسیحییەکان بووە)، گوتوویەتی: {کە من دەقەکەی بە عەرەبیی دێنم، لە: (قِصَّة الحَضَارَة)ی (ویل دیورانت)ەوە}:

(إِنَّ آبْنَ اللهِ أَنْشَأَ الكَنِيسَة بأَنْ جَعَلَ رَسُول بُطْرُس أَوَّل رَئِيس لَهَا، وَإِنَّ أساقِفَة رُومَا وَرِثُوا سُلْطَانَ بطرس فِي تَسَلْسُلِ مُسْتَمِرٍ مُتَّصِل ..، وَلِذَلِكَ فَإِنَّ البَابَا مُمَثِّلُ اللهِ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ يَجِب أَنْ تَكُونَ لَهُ السِّيَادَةُ العُلْيَا وَالسُّلطَانُ الأَعْظَم عَلَى جَمِيع المسيحيين حُكَّامَاً كَانُوا أَو مَحْكُومِين)[1].

واتە: کوڕی خوا کڵێسای دامەزراندوە (مەبەستیان پێی عیسایە، پاکیی بۆ خوا و دووریی بۆ عیسا کە ئیددیعاو سەهووی وا بکات) کە بەترۆسی ڕەسوول (بطرُس الرسول) یەکەمین سەرۆکی کڵێسا بووە، ئوسقوفەکانی ڕۆما، دەسەڵاتی بەترۆسیان بە میرات گرتوە لە زنجیرەیەکی بەردەوامی نەپساوەدا...، بۆیە پاپا نوێنەری خوایە لەسەر پشتی زەوی و دەبێ سەروەریی باڵا و دەسەڵاتی مەزن، هی ئەو بێ، بەسەر هەموو مەسیحییەکانەوە، چ حوکمڕان بن، چ حوکم بەسەردا کراو (واتە: خەڵك و جەماوەر).

بەترۆسی ڕەسوول ناوی: (سەمعانی کوڕی یۆنا)یەوە، لە ساڵی (١٠)ی پ.ز دا، لە دایك بووە و، یەکەمین سەرۆکی کڵێسا بووە، ماسییگر بووە، بەڵام عیسا (علیه السلام) کردوویەتی بە سەرۆکی هەموو نوێنەرەکانی خۆی کە ناردوونی بۆ

---

(١) قصة الحضارة، ج١٤، ص٣٥٢.

شوێنەکان و، لە شاری (أنطاكية) یەکەمین پەرستگای، وەك کڵێسا دامەزراندوە و، لە ڕۆما لە سەردەمی ئیمپڕاتۆر (نیرون)دا، کە زۆر ستەمکار بووە، شەهید کراوە[1] (پیاوێکی زۆر بە دین و چاك بووە و، متمانە پێکراوی مەسیح بووە).

نموونەی دووەم:

پاپا (گریگۆری حەوتەم)، وەك (ویل دیورانت) لە مەوسووعەکەی خۆی: چیرۆکی شارستانیی (قصة الحضارة)دا، کە من دەقەکەی بە عەرەبیی دێنم، دەڵێ:

(أَعْلَنَ أن الكَنِيسَة بوَصْفِهَا نِظَامَاً إِلَهياً خَلِيقَةٌ بأَنْ تَكُونَ صَاحِبَة السُّلْطَة العَالمِيَةِ وَمِنْ حَقِّ البَابا وَوَاجبهِ بصِفَتهِ خَلِيفَة اللهِ فِي أَرْضِهِ، أَنْ يَخْلَعَ المُلُوكَ غَيْرَ الصَّالِحِين، وَأَنْ يُؤَيِّدَ أَوْ يَرْفُض اخْتِيَارَ البَشَرِ للحُكَّامِ أَوْ تَنْصيبهُم، حَسْبَ مُقْتَضِيَات الأَحْوَال...)[2].

واتە: (ئەم پاپا گریگۆری حەوتەمە) ڕایگەیاندوە کە کڵێسا بەو سیفەتە کە سیستمێکی خواییە، شایستەی ئەوەیە کە خاوەنی دەسەڵاتی جیهانیی بێ و هەقی پاپایە، بەڵکو ئەرکیشیەتی بەو سیفەتە کە جێنشینی خوایە لەسەر زەوی: دەسەڵاتدارە خراپەکان لە دەسەڵات دابڕنێ و دووریان بخاتەوە و، پشتگیریی یاخود ڕەفزی دانان و هەڵبژاردنی خەڵك بکات بۆ حوکمڕانەکانیان، {واتە: ئەگەر خەڵك دایانان و هەڵیبژاردن، دەتوانێ ڕەفزیان بکات و، ویستی خەڵك پێشێل بکات، یاخود دەتوانێ قبووڵیان بکات} بە گوێرەی پێداویستیی هەلومەرجەکان.

کە بە داخەوە ئێستا لە نێو زۆرێك لە مسوڵماناندا، ئا ئەوە مومارەسە دەکرێ بە ناوی ئیسلامەوە[3]، کە لە ڕاستییدا ئەوە ڕەنگدانەوەی ئەو لادانەیە کە کاتی خۆی کڵێسا لە ئایینی مەسیحدا پەیدای کردوە، چونکە لە ئیسلامدا، سوڵتەی

---

(١) المنجد في الأعلام، ص١٢٧.

(٢) قصة الحضارة، ج١٤، ص٣٩٤.

(٣) ویڕای ئێرانی شیعە، مەبەستم ژمارەیەك قەوارەی سیاسیی دیکەشە، کە لەسەر ئەهلی سوننەتی مێژوویی حیساب دەکرێن و حوکمڕانیی تێیاندا میراتیی و بنەماڵەیی یەو، حوکمی ئیسلامییان لە (أمرهم شورى بينهم)ەوە گۆڕیوە بۆ (أمرهم شوربة بينهم)! سەر بارەش بە پەیوەندیی و کەین و بەین، بگرە وابەستەییان، بە جوولەکە و زلهێزانەوە، بوونە پەڵەیەکی ڕەش بە نێوچەوانی مسوڵمانانەوە!!

سیاسیی هی خەڵك و جەماوەرە و کاتێك خەڵك و جەماوەر کەسێك هەڵدەبژێرن، چۆن دەبێ دەسەڵاتێکی دیکە هەبێ ئیرادەی خەڵك و جەماوەر پێشێل بکات وەك تاکێك! بێجگە لە دەسەڵاتی خوا، هیچ دەسەڵاتێکی دیکە لە سەرووی دەسەڵاتی خەڵك و جەماوەرەوە نیە، هیچ حیزبێك، چینێك، هیچ بنەماڵەیەك، هیچ کەسێك.

با ڕووداوێکی دیکەش بە نموونە بێنینەوە بۆ ئەوە کە چۆن کڵێسا دەسەڵاتێکی سیاسی ڕەهای بە خۆی دابوو:

ڕووداوی نێوان ئیمپڕاتۆری ئەڵمانیی (هنری چوارەم) و (پاپا گریگۆریی):

(پاپا گریگۆریی) لە ئیمپڕاتۆری ئەڵمان (هنری چوارەم) تووڕە دەبێ و دەڵێ: ئەوە دوورم خستیەوە لە دەسەڵات، ئیمپڕاتۆریش لە کاردانەوەدا، دەڵێ: ئەوە منیش تۆم لێ خست لە پاپایەتیی، بەڵام دوایی هەر خەڵکەکەی خۆی لە ئیمپڕاتۆر هەڵدەگەڕێنەوە و، سەرەنجام خۆی ناچار دەبینێ، کە بچێ بۆ لای (پاپا گریگۆریی)، ئەویش مۆڵەتی نادات و سێ ڕۆژان لە نێو بەفرێ دا دەمێنێتەوە لەبەر دەرگا و زۆر تکا و تەکلیف دەکات، هەتا دوایی پاپا دەڵێ: باشە ئەوە عەفووم کردی، بەڵام جارێکی دیکە سەهووی وا نەکەی[١].

## سێیەم: لە ڕووی دارایی یەوە:

(ویل دیورانت) لە مەوسووعەکەی خۆی: (چیرۆکی شارستانیی)دا، دەڵێ[٢]:

کڵێسا بوو بە گەورەترین موڵکدارو دەرەبەگی ئەورووپا، بۆ وێنە: (دێر)ی (فلدا)[٣]، پازدە هەزار(١٥٠٠٠) کۆشکی گچکەی هەبووە، {واتە: پازدە هەزار (١٥٠٠٠) کۆشك لە ژێر کۆنترۆڵی ئەو دێرەدا بووە}.

---

(١) تأريخ أوربا العصور الوسطى، ج٢، ص١٤٧، فيشَر.

(٢) قصة الحضارة، ج١٤، ص٤٢٥.

(٣) (دێر): شوێنێك بووە کە ڕەبەنەکان، ڕاهیبەکان خواپەرستییان تێدا کردوە، بە عەرەبیی پێی دەڵێن: (صومعة)، بە کوردیی پێی دەڵێن: دێر.

هەروەها (دێری سانت گول) دوو هەزار (٢٠٠٠) کۆیلەی زەوی هەبووە، {دوو هەزار کەسی هەبووە پێیان گوتراوە: کۆیلەی زەوی (جوتیار) کەسابەتیان کردوە بۆ ئەو دێرە}.

هەروەها پیاوێکی ئایینی بە ناوی (کوین ڤیتۆر) بیست هەزار (٢٠٠٠٠) کۆیلەی زەوی، بیست هەزار جوتیاری لەبەردەستدا هەبووە.

(فیشەر)یش گوتوویەتی: کڵێسا بە ناوی ئەوقافەوە، پانتاییەکی زۆری زەوی کشتوکاڵیی هەبووە و، تەنانەت (ویکلف) کە لە چاکسازیی خوازەکانی سەرەتایەکانە لە ئەورووپا، گوتوویەتی: کڵێسا یەك لەسەر دووی (٢/١)ی زەمینەکانی ئینگلتەڕای لەبەردەست دایە و، باجێکی زۆریش وەردەگرێ[١].

هەروەها کڵێسا سۆغرەو بێگارێکی زۆری بە خەڵکی دەکرد و زەخت و فشارێکی زۆری لە خەڵك و جەماوەر دەکرد، بۆیەش پادشا (لویس)ی نۆیەمی فەرەنسا، نامەیەك بۆ پاپا دەنووسێ، نامەیەکی ڕەخنەگرانە، گلەیی تێدا دەکات، تێیدا هاتوە: بێگومان ئەوەی کە بە سەختیی گوانی ئاژەڵەکان دەدۆشێ، سەرەنجام لە سەری گوانەکان، خوێنی دەست دەکەوێ، (چونکە گوان کە شیری تێدا نەما خوێنی لێ دێ)[٢].



---

(١) تأريخ أوربا العصور الوسطى، فيشر، ج٢، ص٣٦٢-٣٦٤.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ج١،ص٢٥٩، کە ئەمە تەرجەمەی عەرەبیی قسەکەیەتی: (إِنَّ الَّذِي يَشْتَدُّ فِي إِدْرَارِ الأَضْرَاعِ، لا بُدَّ أَنْ يُصِيبَ الدَّمَ مِنْ حُلُمَاتِها).





## بڕگەی حەوتەم: ناکۆکیی نێوان کڵێساو زانست:

بەڕێـــزان!

ئەم سەرهەڵدانی ناکۆکیی لە نێوان کڵێساو زانست دا - کە پێشتریش هەر ئاماژەمان پێداوە - لە چوار (٤) خاڵدا باس دەکەین:

### خاڵی یەکەم: دەســتپێك:

دەستپێکی سەرهەڵدانی کێشەو ناکۆکیی نێوان زانست و کڵێسا، بەم شێوەیە بوو:

لە سەرەتاوە - وەك پێشتر باسمان کرد - کڵێسا فەلسەفەی ئەڕەستۆو، گەردووناسیی (بەطلیمۆس) و (ئیقلیدس)و، پزیشکیگەریی (جالینۆس) و ئەوانەی تەبەننیی کردبوو و وەك بەشێك لە ئایین، مامەڵەی لەگەڵ ئەو فیکر و کەلەپوورەدا دەکرد، پاشان هەندێك بیرو ڕای دیکەی هەرکام لە: (قیدّدیس ئوغسطین) و (کلیمان ئەسکەندەریی) و (توما ئەکوینیی)، ئەوانەش کە سێ زانای نەصرانیی بوون لە کاتی جیا جیادا، کڵێسا بیر و ڕایەکانی ئەوانەشی ئاوێتەی مەسیحییەت کرد و بە فەرمیی تەبەننیی کردن، وەك (ویلز) لە کتێبەکەی خۆی: (قووچکەکانی مێژووی مرۆڤایەتیی)دا[1]، گوتوویەتی:

أ/ کڵێسا ئەوەی تەبەننیی کرد کە خوا دەستی کردوە بە دروست کردنی گەردوون لە ساڵی: چوار هەزار و چوار (٤٠٠٤)ی پێش زاییندا، دوایی خوا دروستکردنی گەردوونیی شکۆدار کردوە، بەوە کە مرۆڤێکی دروست کرد لە باغی عەدەن دا، کە ڕێك دوو ڕۆژە ڕێ لە شاری بەسرە دوورە!

---

(١) معالم تأريخ الإنسانية، ج١، ص١٦.

ئنجا جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کە کڵێسا لەسەر ئەو بیرو ڕایەی خۆی سوور بوو، تاکو سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمی زایینی، چونکە کتێبی ئوسقوف (ئاشەر)[1] کتێبەکەی خۆی کە ئەو بیردۆزەی تێدایە، لە ساڵی (١٧٧٩)زدا، چاپ کردوە.

**ب/** مێژووی تۆفانی (نووح (علیه السلام))یان بە پێی زاڵترین ڕا لەلای کلێسا، کە ئەو ڕایە لە (پەیمانی کۆن)دا هاتوە، ئەوەیە کە: دوو هەزارو دوو سەدو شەست و دوو (٢٢٦٢) ساڵ لە دوای دروستکرانی ئادەم، تۆفانی نووح ڕوویداوە، واتە: لە ساڵی (١٧٤٢)ی پێش زایین دا!.

ئنجا ئەم جۆرە بیروبۆچوونانە زۆر کێشەیان دروست دەکردن، کاتێك زانست بەرەو پێشەوە دەچوو: گەردووناسیی، شوێنەوارناسیی، مێژوو، سروشتناسیی، دەیانگوت: ئەم گەردوونە لە مێژە دروستکراوە، ملیۆنان ساڵە، کەچی بە پێی (پەیمانی کۆن) کە کلێسا تەبەننیی کردوە، دەڵێ: چوار هەزار و چوار (٤٠٠٤) ساڵ پ. ز، واتە: چوار هەزار و چوار (٤٠٠٤) ساڵ پێش ئەوەی کە عیسا لە دایك بێ، گەردوون دروستکراوە و، تۆفانی (نووح)یش دوو هەزارو دوو سەدو شەست و دوو (٢٢٦٢) ساڵ لە دوای دروستکرانی ئادەمەوە، بووە، واتە: هەزارو حەوت سەدو چل و دوو (١٧٤٢) ساڵ پێش زایین! سەرەنجام لە ئایین دەکەوتنە گومانەوە و لێرەوە تێکگیرانی زانست و ئایینی مەسیحیی سەری هەڵدا، نەك ئەو ئایینەی کە خوا بۆ عیسای ناردبوو، بەڵکو ئایینی کلێسای دەستکردی (بۆڵس) و چینی ئەکلیرۆس.

---

(١) (ئوسقوف) ناوونیشانی پلەیەکی ئایینییە لە نەصرانییەت دا.





## خاڵی دووەم: بڵاو بوونەوەی فیکرو کلتووریی مسوڵمانان:

لە نێوەڕاستی سەدەکانی نێوەڕاست (القرون الوسطى)[1] بەملاوە، گۆڕانکارییەکی تازە لە ئەورووپا ڕووی دا، لە ئەنجامی ئەوەدا کە فیکرو کلتووری مسوڵمانان وردە وردە بە وڵاتانی ڕۆژئاوادا بڵاوبۆوە، بەڵام کڵێسا زۆر قەڵس بوو بە بڵاوبوونەوەی زانست و بیرو ڕای مسوڵمانان و، حاڵەتی نائاسایی (حالة الطوارئ)ی، ڕاگەیاند و دادگاکانی پشکنین (محاكم التفتيش) کە پێك هات، زیاتر بۆ ئەوە پێك هات، تاکو بزانن داخۆ کێ کەوتۆتە ژێر کاریگەریی فیکری مسوڵمانان؟ بۆ ئەوەی سزا بدرێ: بە سووتاندن و ئەشکەنجەدان!.

کڵێساییەکان دەیانگوت: هەر کەسێ بە دوای ئەو زانست و بۆچوونانە بکەوێ کە لەلایەن کافرانەوە (واتە: مسوڵمانان) دێ، ئەوە دەبێ بە سەختترین شێوە سزا بدرێ.

ئنجا هاوکات لەگەڵ ئەوەش، ژمارەیەك لە کتێب و بەرهەمی زانا مسوڵمانەکان بۆ زمانەکانی وڵاتانی ڕۆژئاوا وەرگێڕران، وەك: کتێبەکانی: (رازي) و (إبن سينا) لە (طبّ)دا و، (جابر بن حيان الكوفي) لە (كيميا)دا و، هی (ابن الهيثم) لە (فيزيا)دا و، هی (ابن رشد) لە فەلسەفەدا و، (المقدمة)ی (إبن خلدون) لە کۆمەڵناسییدا و.. هتد، ئیدی سەرەنجام هەتا بیر و زانستی مسوڵمانان زیاتر بڵاودەبۆوە بە ئەورووپادا، خەڵکەکە زیاتر دەکەوتنە ژێر کاریگەرییان و کڵێساش بەوە قەڵس دەبوو، هەڵبەتە ئەو زانستەی کە لەلای مسوڵمانانیش بوو، لەگەڵ ئەو ئەفسانانەی کە لەلایەن کڵێساوە تەبەننیی کرابوون، بە ناوی ئایینەوە، تێك دەگیران، ئنجا چونکە لە ئەورووپاش جگە لە ئایینی نەصرانیی و یەهوودیی شتێکی دیکە بە ناوی ئایین (ئایینی خوایی) نەناسرا بوو، وا دەزانرا هەر قسە و بیروڕایەك لەگەڵیاندا دژ بوەستێ، ئەوە دژی ئایینی خوایە.

---

(١) سەدەکانی نێوەڕاست دە (١٠) سەدەن: (٥-١٥) یان: (٦-١٦)ی زایینی.

خاڵی سێیەم: سەرهەڵدانی بیردۆزە گەردوونییەكان:

ئەویش دیسان ڕەوتی دژایەتیی نێوان كڵێساو زانستی، زیاتر بە هێز كرد، ئنجا ئەوەی مێژوو بۆی تۆمار كردووین، یەكەمین كەس كە لەو بارەوە، لە بارەی گەردوونەوە بیردۆزەیەكی تازەی پێشكەش كردبێ، كە تێكدەگیرا لەگەڵ ئەو بیرو بۆچوونەی كە كڵێسا تەبەننیی كردبوو لەبارەی گەردوونەوە (نیكۆلاس كۆپەر نیكۆس) بووە، ئەوەش كە كڵێسا تەبەننیی كرد بوو، ئەوە بوو كە بەپێی گەردووناسیی (بەطلیمۆس) و هەندەسەی (ئیقلیدس)، دەیانگوت:

{زەوی سینییەكە لەسەر ئاو دانراوە و، ئاسمان گومبەزێكی شینە، ئەستێرەكان وەك گڵۆپ تێی چەقێنراون، زەوی ناجووڵێ و چەقی گەردوونە}.

كە بە تەئكید (كۆپەر نیكۆس) و ئەوانی دیكەش، كەم و زۆر كارتێكراو بوون بە بیرو ڕای مسوڵمانان و، بەو ئایەتە موبارەكانەی كە لە قورئاندا باسی گەردوون دەكەن، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار (سبحانه وتعالى) دەفەرمویێ:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ الأنبياء.

واتە: (خوا) ئەو كەسەیە كە شەوگارو ڕۆژگار و خۆر و مانگی دروستكردوون (بۆی دەستەمۆ كردوون)، هەر كامێك لەوانە، {واتە: هەم خۆرو مانگ و هەم ئەوەی كە ڕۆژو شەوی بەسەردا دێن، كە زەوییە}، لە سووڕگەیەكی تایبەتی دا دەخولێتەوە.

بەڵێ یەكەمین زانا كە لەو بارەوە لە ڕۆژئاوا لەو بارەوە قسەی كرد: (نكیۆلاس كوپەر نیكۆس) بوو، كە لە ساڵی (١٣٧٣)ی زایینی دا لە دایك بووە و لە ساڵی (١٥٤٣)دا مردووە و، بە دامەزرێنەری گەردووناسیی تازە دادەنرێ، كتێبێكی نووسیی بە ناوی: (جووڵەكانی تەنە ئاسمانییەكان)[1] و چاپ و بڵاویش كرایەوە.

---

(١) (حركات الأجرام السماوية)، ناوە عەرەبییەكەیەتی.

کەواتە: هەر لە سەدەی شازدەیەمەوە لە ئەورووپا چاپ کردن هەبووە، بەڵام دوای چاپ کردنی کتێبەکەی بە ماوەیەکی کەم، مرد، بۆیە کڵێسا فریای سزادانی نەکەوت، بەڵام کتێبەکەی قەدەغە کردو، بە وەسوەسەی شەیتان و دژی ڕووحی ئینجیلی دانا.

بەڵام دوای وی بە ماوەیەك (جوردانو بڕونو) بیردۆزەکەی (کۆپەر نیکۆس)ی زیندوو کردەوە و کڵێساش لەسەر ئەوە شەش ساڵان زیندانیی کرد، بەڵام هەر سوور بوو لەسەر قسەکەی خۆی، بۆیە لە ساڵی (١٦٠٠)ی زایینی دا کڵێسا (جوردانو برونو)ی سووتاند، چیخێکیان تێپێچاو نەوتیان پێداکردو قرچ قرچ بە زیندوویی سووتاندیان و، خۆڵەمێشەکەشیان بە بادا کرد، بۆ ئەوەی گۆڕێکیشی نەبێ، خەڵك یادی بکات!.

بەڵام لە دوای مردنی (جوردانو برونو) کە ئیتاڵیی بوو، (گالیلۆ گالیلی) کە لە ساڵی (١٥٦٤ز)دا لە دایك بووە و لە ساڵی (١٦٤٢ز)دا مردوە، کە قسەیەکی زۆر مەشهووری هەیە، دەقەکەی بە عەرەبییە[1]، دەڵێ: (الرِّيَاضَاتُ: هي اللُّغَةِ الَّتِي كَتَبَ الله بِهِ الكَوْن)، واتە: ماتماتیك ئەو زمانەیە کە خوا گەردوونیی پێ نووسیوە[2].

هەروەها (کوپەر نیکۆس)یش، قسەیەکی جوانی هەیە، کە سەرچاوەی پێشوو لێیەوە گواستۆتەوە، دەڵێ:

(مَعْرِفَةُ عَظَمَةِ اللهِ وَحِكْمَتِهِ وَجَلاَلَتِهِ وَقُوَّتِهِ وَمَعْرِفَةُ القَوَانِينِ الَّتِي وَضَعَهَا وَتَقْدِيرُهَا، وَكَمَالُهَا، تَجْعَلُهُ المَعْبُودَ بحَق)[3].

واتە: زانینی مەزنیی خوا و حیکمەتەکەی و شکۆ و دەستەڵاتەکەی و، پەیبردن بەو یاسایانەی کە دایناون و ئەندازەگیریی و تەواویی ئەو یاسایانە، خوا (سبحانه وتعالى) وا لێ دەکات، کە تەنیا ئەو پەرستراوی ڕاستەقینە بێت.

---

(١) سەرچاوەکەی کە لێم وەرگرتوە، بە زمانی عەرەبییە.

(٢) التطور: نظرة تأريخية وعلمية، محمد صالح الهُبَيلي، ص٢٤.

(٣) سەرچاوەی پێشوو، ص٢٤.

ئنجا (گالیلۆ گالیلی)یش بەسەرهاتێکی هەیە، پوختەکەی ئاوایە: ئەوە بوو کە کلێسا بانگی کرد و بەندی کرد، دوایی تۆبەیان پێ کرد و، (گالیلۆ گالیلی) وەك (جۆردانۆ برۆنۆ) ئازا نەبوو کە ئیعتیراف نەکات، بەڵکو تۆبەی کردو گوتی: پەشێمانم، هەرگیز زەوی خڕ نەبووەو نەسووڕاوەتەوە! بەڵام لێی گێڕدراتەوە کە لە کاتی هاتنە دەردا لە دادگا، گوتوویەتی: زەوی خڕە و دەشسووڕێتەوە. (هەڵبەتە لەبەر خۆیەوە وایگوتوە)!!.

ئنجا لە دوای ویش (یۆهانیس کیپلەر)هات، کە لە ساڵی (١٥٧١)ی زایینی دا لە دایك بووە و، لە ساڵی (١٦٣٠)دا مردوە، ئەویش دیسان ئەوەی کە (گالیلۆ گالیلی) و (جۆردانۆ برۆنۆ) و (نکیۆلاس کوپەر نیکۆس) دەیانگوت، هەر زیاتر جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، کە ئەویش قسەیەکی ناوداری هەیە، دەڵێ:

(وَقَدْ وَهَبَ اللهُ عِلْمَهُ لِلإِنْسَانِ لِيَكُونَ عَلَى صُورَتِهِ)[1]، واتە: خوا زانیاریی بە مرۆڤ داوە تاکو مرۆڤیش شێوەی خوای هەبێ (سبحانه وتعالى)، واتە: لە زانیارییدا وەك چۆن خوا سیفەتی زانیاریی هەیە، مرۆڤیش لە قەدەر خۆی بەشێك لە زانیاریی هەبێ.

شایانی باسیشە: بۆیە کلێسا تۆبەی بە (گالیلۆ گالیلی) کرد، لە سۆنگەی ئەوەوە کە قسەیەکی کردوە پێچەوانەی ڕای کلێساو کتێبی پیرۆزی کلێسایە، کە لە (پەیمانی کۆن) و (پەیمانی نوێ) پێکهاتوە و دەڵێ: زەوی چەقی گەردوونە، چونکە (ئوقنووم)ی دووەم لەسەر زەوی ژیاوە و پرۆسەی فیداو لە سێدارەدانی (عیسا)ش کە ئوقنوومی دووەمە، هەر لەوێ ڕوویان داوە، بۆیە دەبێ زەوی چەقی گەردوون بێ.

پێشتریش باسمان کرد کە: نەصرانییەکان دەڵێن: خوا (سبحانه وتعالى) لە سێ (ئوقنووم)[2]، پێکهاتوە:

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ص٢٥، هەڵبەتە ئەو قسەکەی بە زمانی خۆی کردوە، کە زمانێکی ڕۆژئاوایی یە، بەڵام من تەرجەمە عەرەبییەکەیم هێناوە.

(٢) (أُقنوم) کۆیەکەی (أَقانيم)ە، وشەیەکی داتاشراوە لە زمانی (سریانیی) و، چەند مانایەك

١)- ئوقنوومی یەکەم: خوا، کە ئەوان دەڵێن: باب (الأب).

٢)- ئوقنوومی دووەم: کوڕ (الإبن).

٣)- ئوقنوومی سێیەم: گیانی پیرۆز(الروح القدس).

ئنجا دەڵێن: ئوقنوومی دووەم کە عیسایە و بە حیساب کوڕی خوایە (پاکیی بۆ خوا)، لەسەر زەوی ژیاوە، بۆیە ناگونجێ زەوی وەك گەردووناسیی تازە دەڵێ، شتێکی بچووك بێ لە گەردووندا، بەڵکو دەبێ چەقی گەردوون بێ و، ئەستێرەکان و خۆرو مانگ و ...هتد، بە دەوری زەوی دا بخولێنەوە، کە ئەوەش پێچەوانەی زانست و واقیعە[1].

بەڵگەیەکی دیکەی کلێسا، لەسەر ئەوە کە زەوی خڕ نیە، بەڵکو وەك سینییەك لەسەر ئاو دانراوە و ناشخولێتەوە، ئەوە بوو دەیانگوت: ئەگەر زەوی خڕ بووایە و دیوێکی دیکەشی هەبووایە، دەبووایە مەسیح (علیه السلام) بچێت لەوێش لە سێدارە بدرێ، بۆ ئەوەی گوناهی خەڵکەکەی ئەو دیویش بسڕێتەوە، وەك لەم دیوە لە سێدارە دراوە، دەبێ بچێتە دیوەکەی دیکەی زەویش، لەوێش لە سێدارە بدرێ![2].

بە ڕاستیی ئینسان بەزەیی بە عەقڵی ئەوانەدا دێتەوە، کە ئەو ئەفسانانەیان بە ناوی خواو دینەوە لە نێو خەڵکدا بانگەشە بۆ کردوە، پاشان خەڵکیشیان لەسەر ئەوە سزا داوە، کە بڕوای بەوانە نەبێ!

ئنجا دوای ئەوانە (ئیسحاق نیوتن) هات، کە لە ساڵی (١٦٤٣)ی زایینی دا، لە دایك بووە و لە ساڵی (١٧٢٧)ی زایینی دا کۆچی دوایی کردوە و، بە دامەزرێنەری

---

دەگەیەنێ: سروشت، خود، قەوارە، چییەت، ئەم وشەیە لە زمانی عەڕەبیی دا هاو واتای نیە، بڕوانە: فەرهەنگی (ویکیپیدیا) کە ئەویش لە چەند سەرچاوەیەکەوە هێناویەتی، بە تایبەت: (المهد العربي)، سمیع غنادری/٢٠١٠ م/ صنعاء.

(١) قصة النزاع بین الدین والفلسفة، توفیق الطویل، ص٢٥٠.

(٢) سەرچاوەی پێشووتر، هەمان لاپەڕە.

فیزیای کلاسیك دادەنرێ، ئەو بوو هێزی کێشندە (قوة الجاذبية)ی دۆزیەوە، ئەویش قسەیەکی ناوداری هەیە لە بارەی خواناسییەوە و، ئەوانە هەموویان خواناس بوون و لە ڕاستییدا هیچ زانایەکی موعتەبەر نیە، بەڕاستیی زانا بێت و خواناس نەبووبێ، (نیوتن) لە قسەکەیدا دەڵێ:

(جَمَالُ وَرَوعَةُ الشَّمْسِ وَكَوَاكِب النِّظَام الشَّمْسِي، لايمكن أَنْ يَصْدُرَا إِلاَّ مِنْ وَعِيٍ وَقُدْرَةٍ عَظِيْمَة)[1].

واتە: جوانیی و بەرچاویی خۆرو کۆمەڵەی خۆر، ناگونجێ پەیدا بووبن، مەگەر لە زاتێکەوە کە خاوەنی ئەو پەڕی زانایی و دەسەڵاتێکی مەزن بێ، (کە خوایە (سبحانه وتعالى)).

هەڵبەتە بیردۆزەکەی نیوتن، گەورەترین کاریگەریی فیکریی لە مێژووی تازەی ئەورووپادا هەبوو و، گەلێك چەمك و بیرو ڕای کڵێساو کتێبە پیرۆزەکەی کڵێسای لەبەرچاوی خەڵك سپات کردەوە و، چەمك و بۆچوونەکانی خەڵکی زۆر گۆڕین.



---

(١) سەرچاوەی پێشووتر، هەمان لاپەڕە.





## خاڵی چوارەم: پەرەستاندنی جەنگی نێوان زانست و ئایینی شێوێنراوی کڵێسا:

لە ئەنجامی ئەوەدا کە کۆمەڵێك بیرمەند و زانای ڕەخنەگر لە ئایینی نەصرانیی لە ڕۆژئاوا پەیدابوون، وەك: (دیکارت) و (سپینۆزا) و (پاسکال) و (جۆن لۆك)، کە ئەوانە کۆمەڵێ بیرمەندی ئەورووپایی زەبر دەستن و، ڕەخنەیان لە کتێبی پیرۆزو بیرو ڕایەکانی کڵێسا گرت، کە جگە لە (جۆن لۆك) ئەوانی دیکە، هەموویان خواناسیش بوون، بەڵام ڕەخنەیان لە بیرو ڕایەکانی کڵێسا دەگرت، بە هۆی ئەوەوە، وردە وردە شەڕی نێوان کڵێساو زانایان و بیرمەندان گەرمتر بوو، زانایانیش ڕۆژ بە ڕۆژ ئەو قەناعەتەیان زیاتر لەلا ڕۆچوو و بەهێز بوو، کە دەڵێ: زانیاریی تەنیا ئەوەیە کە لە ڕێی ئەزموونەوە وەدەست دێ، چونکە تەماشایان دەکرد: ئەوەی کە لە ڕێی وەحییەوە، بەناوی وەحییەوە، وەك زانستە نەقڵییەکان پێیان گەیشتوون، پڕە لە شتی ئەفسانەیی و ناڕاست و نادروست و، لەگەڵ عەقڵ و عیلم و واقیعدا نەگونجاو، بۆیە متمانەیان نەما، بە کتێبی پیرۆزو، بەو زانستانەش کە بە ناوی کتێبی پیرۆزەوە بڵاو دەکرانەوە.

دواتریش لە سەدەی هەژدەیەمدا (ڤۆڵتێر) زۆر بە ڕەقیی ڕەخنەی لە سێکوچکەی (باب و کوڕ و گیانی پیرۆ) گرت و، ڕەخنەی لەوە گرت کە خوا (سبحانە وتعالی) هاتبێتە نێو جەستەی مەسیحەوە و، ئەوەی گێڕایەوە بۆ هەڵەو خەتای (بۆڵس) و گوتی: ئەو قسەیە هیچ پەیوەندیی بە عیساوە (علیە السلام) نیە و عیسا هەرگیز ئەو ئیددیعایەی نەکردوە کە کوڕی خوایە، یاخود خوا هاتۆتە نێو جەستەی ئەوەوە، ئەوە ئەسڵ و ئەساسی نیە و، بۆڵس ئەوەی داهێناوە.

بێگومان قسەکەشی زۆر ڕاستە.

## برگەی هەشتەم: شۆڕشی فەڕەنسا لە ساڵی (١٧٨٩)ی زایینیدا و، هۆکارەکانی:

هۆکارەکانی شۆڕشی فەڕەنسا زۆرن، بەڵام سێ هۆکاریان سەرەکیین و، کۆکەرەوەی زۆربەی هۆکارەکانی دیکەشن:

### هۆکاری یەکەم: تەوژمی فیکریی بێ دینیی:

ئەویش لە سێ وردە تەوژم پێکهاتبوو:

**١)** تەوژمی یەکەم: مۆرکێکی زانستیی و فیکریی هەبوو، کە (دیدرۆ) دەم ڕاستیان بوو و کۆمەڵێك ئینسکلۆپیدیا (دائرة المعارف)یان نووسین، وەك (ویلز) مێژوونووسی ناودار دەڵێ: ئەوانە دژایەتیی ئایینیان دەکرد، بە دژایەتیی کردنێکی کوێرانە.

**٢)** تەوژمی دووەم: مۆرکێکی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی هەبوو، کە (جان جاك ڕۆسۆ)ی فەڕەنسیی دەم ڕاستیان بوو، خاوەنی کتێبی گرێبەستی کۆمەڵایەتیی (العقد الإجتماعي)، کە دوایی ناو لەو کتێبە نرا: (ئینجیلی شۆڕشی فەڕەنسیی) لەبەر ئەوەی زۆر ئیعتیمادیان لەسەری بوو.

هەروەها (مونتسیکو) کە کتێبێکی نووسی بە ناوی: (گیانی یاسایەکان) (روح القوانین)، ئەوانە زیاتر لە ڕووی کۆمەڵایەتیی و سیاسییەوە، لەگەڵ کڵێسادا تێکدەگیران.

**٣)** تەوژمی سێیەم: مۆرکێکی فەلسەفەی وێرانکەری هەبوو، هەر کام لە: (سپیۆنزا)و (ڤۆڵتێر)و (لایبنتز)و (ئۆجست کۆنت)، ڕۆڵی گرنگیان تێدا گێڕا و، بیرۆکەی ئایینی دانراو (الدین الوضعي)یان ئایینی سروشتی (الدین





الطبيعي)داناوه، گوتیان: پێویستییمان بەوە نیە ئایین هەبێ و خوا بپەرسترێ و بەندایەتیی بۆ ئەنجام بدرێ، بەڵکو ئێمە دەڵێین: هێزێك هەیە ئەم سروشتە بەڕێوە دەبات، با ئێمە سەرگەرمی دنیای خۆمان بین و، پێویست ناکات پێی کڵێسا و سرووتەکان (طقوس) بێنینە مەیدانەوە!.

ئنجا ئەوانیش دوو ڕێڕەو بوون:

أ- ڕێڕەوێکیان: دانیان بە بوونی خوادا دەهێنا (سبحانه وتعالى)، بەڵام دەیانگوت: خوا عزوجل پێغەمبەرانی نەناردوون و وەحیی نەناردوە و پێویستیی بە کڵێسا نیە.

ب- ڕێڕەوێکیشیان: هەر ڕەفزی بوونی خوای پەروەردگاریشیان دەکرد، بەڵام ئەوانە کەمینە بوون، بۆیەش وایان دەکرد، تاکو یەکجاریی دەربازیان بێ لە کڵێسا، چونکە دەیانگوت: ئەگەر بڵێین دین هەیە، دەبێ کڵێساش هەبێ - لەلای وان وابوو – ئنجا کە کڵێسا هەبوو، پیاوانی کڵێسا (ئەکلیرۆس)یش دەبن و، کە پیاوانی کڵێساش هەبوون، هەموو ئەو بەزم و بازاڕەی دیکەش بە دوای خۆیاندا دێنن، کە بریتیە لە قۆرخکردنی سیاسەت و دارایی و دەسەڵات و ئابووریی و هەموو شتێك بۆخۆیان و، دەست وەردانە ئایینیش بە کەیفی خۆیان!

## هۆکاری دووەم: وەستانی کڵێسا دژی داخوازییەکانی جەماوەر:

ئەوەش هۆکاری دووەمی سەرهەڵدانی شۆڕشی فەڕەنسا بوو، لە ساڵی (١٧٨٩)زدا، ئنجا ئێمە پێشتر باسی ئەوەمان کرد و دووبارەی ناکەینەوە، کە چۆن کڵێسا دژی داخوازییەکانی جەماوەر بوو و لە ڕاستییدا، کڵێسا لەگەڵ پادشا و دەرەبەگەکان (خاوەن زەوییەکان)دا، سێکوچکەیەکی شوومیان دروستکرد بوو، لە دژی خەڵك و جەماوەر، بۆ زەوتکردنی مافەکانی خەڵك و جەماوەر و بۆ پێشێل کردنی ئیرادەیان.

## هۆکاری سێیەم: هێزە تێکدەرە پەنهانەکان:

چەند هێزێکی شێردراوەی پەنهان هەبوون، کاریگەریی گەورەیان هەبوو لەسەر بەلاڕێدابردنی شۆڕشی فەڕەنسادا، بۆ وێنە: لە سەرەتاوە خەڵك تەنها دروشمەکەی ئەوەبوو کە دەبێ (نان)مان هەبێت، بەڵێ شۆڕشی فەڕەنسا کە دەستی پێکرد، خەڵك داوای نانیان دەکرد و دەیانگوت: برسیمانە، بۆچی پادشاکان و، پاپاو پیاوانی کڵێسا و، دەرەبەگەکان، خاوەنی هەموو شتێك بن و ئێمەی جوتیاری ڕەش و ڕووت و جەماوەر، برسیی و ڕووت و ڕەجاڵ و بێ حاڵ بین، پێشێ دروشمەکەیان ئەوەبوو، بەڵام دوایی بەبێ ئەوەی بە خۆیان بزانن، خەڵکەکە هەمووی دروشمی: (ئازادیی، برایەتیی، یەکسانیی)، (الحرية، الإخاء، المساواة)یان، دەگوتەوە، بەڵێ خەڵك و جەماوەر ئەگەر ناهۆشیاربن، زۆر قابیلیەتی ئەوەیان هەیە، هەڵخەڵەتێن و، بە لاڕێدا ببرێن، هەر وەك زۆر جار دەبینین: خۆپیشاندان دەکرێ بۆ مەبەستێك، دوایی بە لاڕێدا دەبردرێ و مەبەستێکی دیکەی پێ تەحقیق دەکرێ، هێزێکی پەنهان دێ، دەیجووڵێنێ بەلایەکی دیکەدا، بە تایبەت خەڵکی سادەو، ناهۆشیار و خوێن گەرم و کەم ئەزموون، زوو هەڵدەخەڵەتێنرێن.

ئنجا دوایی ئەو دروشمەشیان بەرز کردەوە: با کۆنەپەرستیی بڕووخێ (لتسقُط الرجعية).

هەروەها یەکێك لە دروشمەکانی شۆڕشی فەڕەنسا ئەوە بوو دەیانگوت: دوایین پادشا بە ڕیخۆڵەی دوایین قەشە ئیعدام بکەن، واتە: پێشێ قەشەکە بکوژن و ڕیخۆڵەکانی دەربێنن، ئنجا ڕیخۆڵەکەی لە ملی پادشا بئاڵێنن و ئیعدامی بکەن! چونکە کڵێسا و پادشا و دەرەبەگ (الكنيسة والملك والإقطاع)، ئەو سێیە بوو بوونە سێکوچکەیەکی شووم (ثالوث مشئوم) و کەوتبوونە وێزەی خەڵك و جەماوەر.

هەڵبەتە جوولەکەش لافی ئەوە لێ دەدەن، لە کتێبەکانیاندا، کە ئەوان هەڵگیرسێنەری شۆڕشی فەڕەنسیی بوون، بەڵام وا پێ دەچێ ئەوان زیاتر



ئاگر خۆشکەرو، چنەرەوەی بەرهەمەکەی بووبن، ئەگەرنا لە ئەسڵدا شۆڕشی فەڕەنسا بایی ئەوەندە هۆکاری بابەتیی هەبوون، کە پێویست بەوە نەکات، جوولەکە ئەو لافە لێبدەن: کە ئەوان ئەو شۆڕشەیان هەڵگیرساندوە!

بەڵێ بەڕێــــزان!

کە ئەورووپا بە تایبەتیی و ڕۆژئاوا بەگشتیی ئاوا لە خوا عاصیێ بوو و ڕووی کرد لە ئیلحاد و بێ دینیی، ئەوانە هۆکارە ئەسڵییەکانی بوون.

بەڵام هۆکارێکی دیکەش، کە لە بڕگەی نۆیەمدا دەیتوێژینەوە، کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەسەر تەشەنەکردنی ئیلحاد و پەرەستاندنی لە ڕۆژئاوادا.

## بڕگەی نۆیەم: بیردۆزەی پەرستاندن و ڕۆڵی لە تەشەنەکردنی ئیلحاد!:

بیردۆزەی پەرەستاندن (نظرية التطور) دەڵێ: ژیانداران، بە مرۆڤیشەوە، هەموویان لە ژیاندارو زیندەوەرێکی یەك خانەییەوە، کە (ئەمیبا)ی پێ دەڵێن، لەوێوە هاتوون و، لەو زیندەوەرە یەك خانەییەوە، هەموو ئەو ژیاندارانەی دیکە پەیدا بوون بە مرۆڤیشەوە.

هەڵبەتە ئێمە دوایی بە درێژیی قسە لەبارەی بیردۆزەی پەرەستاندن و بە گشتیی و بە تایبەت بیردۆزەی (داروێن)ەوە دەکەین، بەڵام لێرەدا باسی ئەوە دەکەین کە: بیردۆزەی پەرەستاندن بەگشتیی و داروینیزم بە تایبەتیی، چ کاریگەرییەکی هەبووە لەسەر ئەوە کە لە ئەورووپاو ڕۆژئاوادا، ئیلحادو بێ دینیی زیاتر تەشەنە بکات و پەرە بستێنێ؟

دەڵێین: هەرچەندە پووچەڵکرانەوەی بیرو ڕای کڵێسا بە ناوی ئایینی مەسیحەوە، لە بارەی گەردوونەوە و، سەرهەڵدانی ئایینی سروشتیی (الدين الطبيعي)، ئەو هەموو گۆڕانکارییە فیکریی و زانستیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییانەی کە لێیانەوە بەدی هاتن، زۆر جێ پێیان بە کڵێسا و بە ئایینی کڵێسا لێژ کرد، بەڵام ڕوانین بۆ مرۆڤ کە دروستکراوێکی ڕاستەوخۆی خوایە(سبحانە وتعالى) و دروستکراوێکی ڕێز لێگیراوی خوایە، ئەو بۆچوونە جارێ لە ئەورووپاو ڕۆژئاوادا هەر بەهێز بوو، بەڵام دوای ئەوەی (چارلز داروین)، لە ساڵی (١٨٥٩)زدا کتێبێکی نووسی بە ناوی: بنەچەکەی جۆرەکان (أصل الأنواع)، کە مەبەستی پێی جۆرەکانی ژیاندارانە و دوایی باسی مرۆڤیشی کرد، کە ئەویش هەر لە ئەنجامی پەرەستاندنی زیندەوەران و ژیاندارانداا پەیدابووە، ئەو کتێبەی (چارلز داروین) بە جۆرێك دەنگدانەوەی هەبوو کە لە مێژووی ئەو کاتەی ئەورووپادا، هیچ کتێبێکی دیکە ئەو هەراو هۆریایەی لێ نەکەوتۆتەوە




و، کۆمەڵێك شوێنەواری بە دوای خۆیدا هێنان، کە ئێمە دەتوانین ئاماژە بە چوار(٤) لەو شوێنەوارە خراپانە بکەین، کە بیردۆزەی داروین، بە دوای خۆیدا هێنانی:

### ١) ڕووخانی عەقیدەی ئایینیی (إنهيار العقيدة الدينية):

چونکە ئایینی مەسیحیی بە فۆڕمی (بۆڵس الرسول) پێی وایە کە خوا ئادەم و حەووای دروستکردوون و لێشی قەدەغە کردوون لە درەختی زانست بخۆن، بەڵام ئەوان ئەو گوناهەیان کرد و لە درەختی زانستیان خوارد و، لە ئەنجامی ئەو گوناهەشدا، خوا (سبحانه وتعالى) سزای داون.

بەڵام بیردۆزەی پەرەستاندن، گوتی: نەخێر، بەڵکو مرۆڤیش یەکێکە لە ئاڵقەکانی گەشەسەندن و پەرەستاندنی زیندەوەران و ئاژەڵان، کەواتە: خوا ڕاستەوخۆ دروستی نەکردوە! بەمەش عەقیدەی مەسیحیی، - لە فۆڕمی (بۆڵس)دا - هەرەس دێنێت! هەرچەندە - وەك دوایی باسی دەکەین - هەندێك لە زانایانی ئیسلام دەڵێن: گریمان و لە فەرزی مەحاڵدا: بیردۆزەی پەرەستاندن ڕاستیش بێ، ئێمە دەڵێین: ئەوە میکانیزمێکە خوا (سبحانه وتعالى) دایناوە بۆ گەشەکردن و پەیدا بوونی ژیانداران، هەروەك چۆن خوا (سبحانه وتعالى) هێزی کێشندەی داناوە، کە هەموو کەهکەشانەکان و ئەستێرەکان و خڕۆکەکان ڕادەگرێ، میکانیزمێکیشی داناوە بۆ پەیدا بوونی ژیانداران لەسەر زەوی، کە بریتیە لە گەشەسەندن.

کەواتە: بە یەك پیت ئەو بیردۆزەیە ڕاست دەبێتەوە و لە جیاتی بڵێین: گەشەکردن (تَطوّر)، دەڵێین: گەشەپێکردن (تطوير) و لە جیاتی بڵێین: پەرەستاندن (إرتقاء)، دەڵێین: پەرەپێستاندن (ترقية)!

واتە: خوا(سبحانه وتعالى) بەو سیستمە ژیاندارانی دروستکردوون.

بەڵام وەك دوایی باسی دەکەین، ئەسڵەن بیردۆزەی داروینیزم، ئێستا شایانی باس نەماوە لەلای زانایانی موعتەبەر و، دوایی لەو بارەوە چەندان بەڵگە دەخەینە ڕوو، خوا پشتیوان بێت.

## ٢) نکووڵیی کردن لە هەبوونی ئامانج لە ژیانی مرۆڤ دا:

زۆربەی خەڵکی ڕۆژئاوا ئەوەیان لە بیردۆزەی گەشەسەندن و داروێنیزم فامیەوە کە:

ئەگەر مرۆڤ لە ئەمیباوە - کە ژیانداریکی یەك خانەییە - هاتبێ، ڕاست نیە کە ئامانجێك لە ژیانیدا هەبێ و، بۆیە دروستکرابێ خوا بناسێ و، خوا بپەرستێ و بەندایەتیی بۆ بکات و، ڕەوشتی بەرزی هەبێ و بەهای جوانی هەبێ، ئەگەر مرۆڤ لە ئەنجامی گەشەسەندنی زیندەوەرانەوە هاتبێ و، دوا ئاڵقەی گەشەسەندنی زیندەوەران و ژیانداران، بریتی بووبێ لە مەیموون و، مرۆڤیش هەر لەوێوە وەدی هاتبێ، کەواتە: وەك چۆن مەیموون ئامانجێك لە ژیانیاندا نیە و، ئاژەڵانی خوار مەیموونیش بە هەمان شێوە، ئەو ژیاندارەش کە لە سەرووی مەیموونەوە دێ، کە مرۆڤە، ئەویش بە هەمان شێوە، هیچ ئامانجێك لە ژیانی دا نیە، ئەمەش دیارە دەرهاویشتەیەکی دیکەی زۆر خراپ بوو، کە نەك هەر لەگەڵ ئایینی کڵێسا، بەڵکو لەگەڵ وەحیی پەروەردگارییش دا کە لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، تێك دەگیرێ.

## ٣) تەنیا ماددیی بوونی ژیان و ئاژەڵ بوونی ئینسان:

هەروەها ئەم دەرهاویشتەیەش لە بیردۆزەی داروینیزمەوە پەیدا بوو، کە ژیان تەنیا لایەنە ماددییەکەیەتی و، مرۆڤیش تەنیا ئاژەڵێکە، هیچی لە ئاژەڵەکانی دیکە زیاد نیە!

بەڵێ بیردۆزەی پەرەستاندن و (داروینیزم)، مەگەر بەو شێوەیە کە پێشتر باسمان کرد، بڵێین: میکانیزمی خوایە (سبحانە وتعالی) ئەگەرنا ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ژیان تەنیا لایەنە بەرهەست و ماددییەکەیەتی و، مرۆڤیش تەنیا ئەو جەستەو کەلەشەیە و تەنیا لایەنە ئاژەڵییەکەیەتی، یانی: ئەو لایەنەی کە خاڵی هاوبەشی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ و ژیاندارانە.





هەڵبەته هەر كام لە: (ماركس و فرۆید و دوركایم و نیتشه و فیۆرباخ)، كه هەموویان مولحید بوون و ماددییش بوون، زۆر ڕۆڵیان هەبوو له گەشەپێدان و ڕەواج پێدانی ئەو بیرۆكەیەدا، كه ژیان تەنیا ماددەیه و مرۆڤ تەنیا جەستەیه.

## ٤) بیرۆكەی گۆڕان و گەشەكردنی ڕەها:

(ئوجست كومت) بیردۆزەیەكی دانا به ناوی (گەشەسەندنی عەقڵیی له ئەفسانەوه بۆ ئایین و، بۆ گەڕانەوه بۆ سروشت) (التطور العَقْلِي مِنَ الخرَافَة إِلى الدِّين إِلى الوَضْعِيَّة)، كه مەبەستی پێ ئەوەیه: مرۆڤ دەبێ تەنیا سروشت بپەرستێ و تەنیا سروشت ببینێ، ئەو پێی وا بووه كه مرۆڤ پێشێ ئەفسانەی پەرستوه، دواتر ئایین، ئایینی ئاسمانیی، بەڵام ئێستا بەدوای زانست، دەكەوێ، ئەو زانستەی كه له ناسینی سروشتەوه پەیدا دەبێ! ئەوەش هەر له دەرهاویشتەكانی بیردۆزەی پەرەستاندن و داروێنیزم بوو.

ئنجا ئەو بیردۆزەیەی (ئوجست كومت)، ئەوەی لێ هەڵدەهێنجرا كه دەبێ هەموو شتێك بگۆڕدرێ و، هیچ شتێك چەسپاو نەبێ، كه بێگومان ئەوەش ڕاستەوخۆ هەم لەگەڵ ئایینی كڵێسادا به پلەی یەكەم و، هەم لەگەڵ هەموو بەرنامەكانی خوادا به گشتی، تێكدەگیرێ، هەرچەنده ئیسلام ناڵێ هەموو شتێك دەبێ نەگۆڕ بێ، وەك پێشتر باسمان كردوه و دواتریش باسی دەكەین، بەڵكو ئیسلام دەڵێ: شتی گۆڕاو (مُتَغيِّر) هەیه و، هی چەسپاو (ثابت)یش هەیه، هەم له مرۆڤیشدا و هەم له ژیانیشدا، نه له مرۆڤدا هەموو شتێك دەگۆڕێ و، نه هەموو شتیش چەسپاوه، هەروەها نه له ژیانیشداو له گەردوونیشدا هەموو شتێك دەگۆڕێ و، نه هەموو شتێكیش چەسپاوه، بەڵكو چەسپاویش هەیه و گۆڕاویش هەیه.

## بڕگەی دەیەم: سیكۆلاریزم و شوێن گرتنەوەی دینداریی كڵێسا:

لە ئەنجامی هەموو ئەو شتانەدا كە باسمان كردن و ڕوونمان كردنەوە: ڕەوتی سیكۆلاریزم، عەلمانییەت، سەری هەڵدا و، ئەو بۆشاییەی كە پاڵ پێوەنرانی كڵێساو، كتێبی پیرۆزی كڵێساو، دەستەو دائیرەی كڵێسا، پەیدای كردبوو، بە سیكۆلاریزم ئەو بۆشاییە پڕكرایەوە، بۆیە من لە كتێبەكانی خۆمدا، وەك:

١- (چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم)، {لە باسی سیكۆلاریزم دا}.

٢- هەروەها: (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەكانیان).

٣- هەروەها: (دیموكڕاسیی و سیكۆلاریزم لە ئەزموونی كوردستاندا) باسم كردوە، كە بە نسبەت ڕۆژئاواییەكان و ئەوروپاییەكانەوە، تا ڕاددەیەك بیانوویان بە دەستەوە هەبوو، پاساویان بەدەستەوە هەبوو، پەنا بەرن بۆ سیكۆلاریزم، بۆ ئەوەی ئەو بۆشاییەی كە پاڵ پێوەنرانی ئایینە شێوێندراو و تێكدراوەكەی مەسیح (علیە السلام)، دروستیكرد بوو، ئەو بۆشاییەی پێ پڕ بكەنەوە، بەڵام لە نێو مسوڵمانانێكدا كە قورئانیان لەبەردەست دایە و، ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) و شەریعەتی ئیسلامیان لەبەردەست دایە، لە ڕاستییدا هەرگیز جێ پێیەك بۆ سیكۆلاریزم و بۆ جگە لە سیكۆلاریزمیش: لیبراڵیزم و سۆشیالیزم و كۆمۆنیزم و كاپیتالیزم و...هتد نابێ، چونكە ئیسلام بۆشاییەك ناهێڵێتەوە تاكو پێویست بكات بە شتی دیكە پڕ بكرێتەوە و، زۆر جار لە كتێبەكانی خۆمدا گوتوومە:

(ئیسلامی تێرو تەواو، مسوڵمانان بێ نیاز دەكات لە سواڵ و صەدەقەی وڵاتانی ئەملاولا، وڵاتانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، كە بچن لەملا و لاڕا بیردۆزەو ڕێچكەو، كوێرە ڕێی مرۆڤ كرد بێننەوە، تاكو ئەو كەلێن و بۆشاییانەی پڕ بكەنەوە، كە ئیسلام لە ژیانیان دا دروستیكردوون).



ئیسلام ئەگەر وەك خوا ناردوویەتی، كە لە قورئان و سوننەت دا بەرجەستەیە، فام بكرێ، هەم كاروباری مزگەوت بۆ خەڵك ڕێك دەخات، هەم كاروبار و ژیان و گوزەرانی كۆمەڵگا، هەم پێت دەڵێ: لە دوانگەدا چ بڵێی، هەم لە فەرمانگەدا و هەم لە كێڵگەدا، چی بكەی و چۆن بكەی؟! دینداریی و دنیادارییت فێر دەكات، هەم لە ژیانی دنیات تێدەگەیەنێ، هەم دواڕۆژت پێ دەناسێنێ، ئایینێكە هەم ڕووحت پەروەردە دەكات و، هەم جەستەت تێر دەكات، ئیسلام ئایینێكە: هەم هیدایەتە بۆ تاك، هەم بەرنامەیە بۆ كۆمەڵگا، مزگەوت و بازاڕ پێكەوە گرێ دەدا، عەقڵ و وەحیی پێكەوە جووت دەكات و، سۆزو مەنتیق پێكەوە دەستە ملان دەكات و، دنیاو دواڕۆژ پێكەوە ئاوێتە دەكات، بۆیە ئایینێكی ئاوا، شوێنكەوتووانی خۆی ناچار ناكات، بەملاولادا بڕۆن تاكو ژیانی خۆیان ڕێك بخەن و، گرفتەكانی ژیانی دنیایان چارەسەر بكەن.

بەڵێ سیكۆلاریزم و شوێنگرتنەوەی بۆ ئایینی كڵێسا لە ئەورووپادا، تا ڕاددەیەك، كۆمەڵێ هۆكاری بابەتیی هەبوون، ئنجا بەداخەوە خەڵكی ئەورووپاو ڕۆژئاوا، ئەو كاتە كە لە ئیسلام بێ ئاگا بوون و تا ڕاددەیەك بیانوو و پاساویان هەبووە، كە هەڵسان بە لە لێك جیاكردنەوەی ئایین لە دەوڵەت، بەڵكو ئایین لە ژیان، هەڵبەتە نێوەڕۆكی سیكۆلاریزم، عەلمانیەتیش بریتیە لەوە كە تۆ ژیانی خۆت ڕێكبخەی، بەبێ پرس كردن بە خوا، وەك لەو سەرچاوانەدا كە ئاماژەم پێ دان، بە وردیی باسم كردوە: نێوەڕۆك و كرۆك و جەوهەری سیكۆلاریزم ئەوەیە كە مرۆڤ ژیانی دنیای خۆی بە هەموو ڕەهەندەكانیەوەو، لە ڕووی تاكیی، خێزانیی، كۆمەڵایەتیی، سیاسیی، ڕێك بخات، بەبێ پرس كردن بە خوا، بەبێ حیساب كردن بۆ وەحیی خوا، بەبێ لاكردنەوەی بە لای خوادا، بەبێ سەرهەڵبڕین بەرەو ئاسمان، تەماشای پێش خۆت بكەو، تەماشای دەوروبەری خۆت بكەو، ژیانی خۆت ڕێكبخە، ئا ئەمە جەوهەورو كرۆكی سیكۆلاریزمە!!

بەڵام بە داخەوە، زۆرێك لە ڕۆڵەی مسوڵمانان بەو ئایینە زەمینیی (الدين الأرضي)یە، بەو بیرۆكەیە، كڵاویان لەسەر نراوەو هەڵخەڵەتێنراون، پێشیان وایە، كە هیچ زیان بە دینداریی و مسوڵمانەتییەكەیان نەگەیشتوە! كە لە ڕاستییدا

سیکۆلاریزم - بە چەمکە ڕاستەقینەکەی خۆی - لە دڵێکداو لە عەقڵێکدا دەچەسپێ، ئیسلامی تێدا نەمابێ، ئیسلامێك کە بۆت باسی جەنگ و ئاشتیی دەکات، بۆت باسی حوکم و سیاسەت دەکات، بۆت باسی حەڵاڵ و حەڕام دەکات، بۆت باسی چاکەو خراپە دەکات، ئیسلامێك کە بوونناسیی (معرفة الوجود - ontology)یەکی تێرو تەواوی تێدایە، ئیمان و عەقیدەیەکی ڕاست و دروستی تێدایە، باسی پەرستن دەکات، باسی ڕەوشت و بەهاکان دەکات، باسی باری کەسێتیی دەکات، باسی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا دەکات، باسی ئابووریی و ژیان و گوزەران دەکات، باسی پەیوەندییە سیاسییەکان دەکات، ئیسلامێکی تێرو تەواو و گشتگیری وا، ئەگەر بڕوات پێی هەبێ، ئەو بڕوا پێ بوونەت بە ئیسلام ڕێت لێ دەگرێ، بڕوا بە شتێکی دیکەی وەك سیکۆلاریزم، یان لیبراڵیزم، یان کاپیتاڵیزم، یان سۆسیالیزم، یان هەر شتێکی دیکەی ئیزمدار بێنی، کە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە هاتوون.

ئێمە لێرە کۆتایی بەم باسی یەکەمە دێنین، واتە: سەرگوزشتەی سەرهەڵدانی ئیلحاد لە ئەورووپاو ڕۆژئاوادا.





## باسی دووەم



# ئیلحاد لەگەڵ هەر کام لە:
# زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی دا، ناکۆکە

بەڕێـــزان!

ئێمە لە چوار بڕگەدا ئەم باسە دەخەینە ڕوو، بەم ناوونیشانانەی خوارێ:

بڕگەی یەکەم: ناکۆکیی و تێکگیرانی ئیلحاد لەگەڵ زگماك (فطرة)دا.

بڕگەی دووەم: ناکۆکیی و تێکگیرانی ئیلحاد لەگەڵ عەقڵ دا.

بڕگەی سێیەم: ناکۆکیی و تێکگیرانی ئلیحاد لەگەڵ زانستدا.

بڕگەی چوارەم: ناکۆکیی و تێکگیرانی ئیلحاد لەگەڵ وەحیی دا.

## بڕگەی یەکەم: ناکۆکیی و تێکگیرانی ئیلحاد لەگەڵ زگماك (فطرة)دا:

ئێمە پێشتر باسمان کرد: کە هەموو مرۆڤێك لە قووڵایی ناخی دا، تینوێتیی و عەودالْیی هەیە بەرەو خوا، کە تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنیەتی، هەموو مرۆڤێك کە سروشتی تێك نەچووبێ، فیطرەتی نەگۆڕا بێ، شەیدایی و عەودالْیی و تینوێتیی، بۆ پەروەردگارو بەدیهێنەرو خاوەنی خۆی هەیە.

ئنجا وەنەبێ ئیلحاد تەنیا لەو لایەنەوە لەگەڵ فیطرەتدا دژو ناکۆك بێ، واتە: خوانە ناسیی تەنیا لەلایەنی خواناسییەوە، لەگەڵ خوارسك و زگماکدا ناکۆك نیە، بەڵکو لە پێنج لای دیکەشەوە، لەگەڵی دا تێك دەگیرێ، چونکە مرۆڤ پێنج لایەنی دیکەشی هەن، کە بە هەموویان ئەو خوارسك و زگماك (فطرة)ەی مرۆڤ پێك دێنن.

سەرەتاش دەمەوێ ئاماژە بەوە بکەم، کە ئێمە بۆ نووسینی ئەم باسە، سوودمان لە کتێبی (شموع النهار)ی (عبدالله بن صالح العجيري) وەرگرتوە[1]، بەڵام دیارە هەم شتی خۆم زۆر خستۆتە نێوی و، هەم زۆرجار کورتم کردۆتەوەو دامرشتۆتەوە، بێ ئەوەی دەستکاریی نێوەڕۆکی قسەکانی وی بکەم.

ئەو پێنج لایەنەی دیکە، کە زگماك (فطرة)، تێیان دا لەگەڵ ئیلحاددا، تێك دەگیرێ، ئەمانەن:

### ١)- لە ڕووی سەرەتا عەقڵییە یەکەمەکان (المَبَادِيء العَقْلِيَّة الأَوَّلِيَّـة)ەوە:

ئێمە پێشتر باسمان کردوە، کە ئەوانە مەبەست پێیان، ئەو ڕاستییانەن کە عەقڵ یەکسەرو بەبێ لام و جیم، قبووڵیان دەکات، سەرەتا عەقڵییە یەکەمەکان، ئەوانەن کە عەقڵ یەکسەر قبووڵیان دەکات و هیچ لام و جیمیان لە بەرانبەردا ناکات.

**چەند نموونەیەك لەو یاسا عەقڵییانە:**

**یاسای یەکەم:** بەش لە هەموو کەمترە (الجُزْءُ أَقَلّ مِنَ الكُلِّ).

بۆ وێنە: تۆ کتێبخانەیەکت هەیە، ئەوە هەموویە، یەك کتێب لەو کتێبخانەیەدا، بەشێکە، بێگومان کتێبخانەکە لە کتێبەکە زۆرتر و گەورەترە، ئەمە بەڵگەنەویستێکی عەقڵییە، کە خوا لە عەقڵی هەموو مرۆڤەکاندا دایناوە.

---

(١) شموع النّهار، ص٣٩-٨٤.





**یاسای دووەم:** دوو کۆ دوو دەکاتە چوار: (٢ + ٢ = ٤) یان سێ کۆ سێ دەکاتە شەش: (٣ + ٣ = ٦).

بێگومان هیچ کەس نکوولّیی لەوە ناکات.

**یاسای سێیەم:** دوو شتی دژ بە یەك، لە یەك کات و شوێندا، پێکەوە کۆنابنەوە (عدم اجتماع النَّقيضَين)،:

وەك: بوون و نەبوون (الوجود والعدم)، ناگونجێ ئەم دەفتەرە کە بە دەستمەوەیە و ئەم ئالّقانەم تێدا ئامادە کردوون، بلّێم: ئەم دەفتەرە هەیەو نیە، لە یەك کاتدا، بەلّێ، دەتوانم: بلّێم ئێستا هەیە، دوایی ئەگەر لامبرد، نیە، بەلاّم لە یەك کاتداو، لە یەك شوێندا، هەشەو نیشە، ئەوە پێی دەگوترێ: (تَنَاقُض) دژ یەکیی، ئەوەش لە بەلّگە نەویستە عەقلّییەکانە، کە ئەوە شتێکی مەحالّە.

**یاسای چوارەم:** هەموو پەیدابوویەك پەیداکەرێکی هەیە (لِكُلِّ حَادِثٍ مُحْدِث).

ئەمیش یەکێکە لە سەرەتا عەقلّییەکان، هەر شتێك پەیدا ببێ، دەلّێی: چۆن پەیدا بووە؟ منداڵێکی گچکە لە پشتەوە نەتبینێ، گوێی ڕاکێشە، یەکسەر ئاوڕ دەداتەوە، کە تۆی بینی، یەکسەر دەزانێ گوێت ڕاکێشاوە، جاری وا هەیە ئینسانی گەورە سوعبەت و گاڵتە دەکات لەگەڵ منداڵ، دوایی دەلّێ: من نەبووم، ئەو منداڵە بڕوا ناکات، ئاوڕ دەداتەوە: ئایا کەسی دیکەی لێیە؟ ئەگەر کەسی دیکەی لێ هەبێ، لەوانەیە گومانی بۆ بچێ، ئەوی دیکەیان بووبێ، بەلاّم ئەگەر بەس تۆ بی، دەلّێ: نەخێر، هەر تۆی، هەرچەندە ئەو منداڵە جارێ هیچ دەرسی نەخوێندوەو، کەس هیچی فێر نەکردوە، بەلاّم ئەوە سەرەتایەکی عەقلّییە، خوا لە مێشکی هەموو کەسدا دایناوە، کە هەموو پەیدابوویەك، پەیداکەرێکی هەیە و، هەموو شوێنەوارێك خاوەنێکی هەیە.

**یاسای پێنجەم:** هەموو ڕێکخراوێك ڕێکخەرێکی هەیە (لکل نظام منظم):

هەر کاتێك سیستممان بینی، ڕێك و پێکییمان بینی، یەکسەر زەینمان بۆ ڕێکخەرێك و بۆ پەیداکەرێکی ئەو ڕێکخستنە دەچێ.

ئێستاش با قسەی سێ لە زانایان لەبارەی (سەرەتا عەقڵییەکان)ەوە بێنینەوە:

١)- (إِبْنُ حَزَم الاَنْدَلُسي) لە بارەی ئەو سەرەتا عەقڵییانەوە قسەیەکی جوان دەکات، دەڵێ:

(مَا كَانَ مُدْرَكاً بِأَوَّل الْعَقْلِ وَبالحَوَاسِّ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ اسْتِدْلاَلٌ أَصْلاً، بَلْ مِنْ قِبَلِ هَذِهِ الْجِهَاتِ يَبْتَدِيءُ كُلّ أَحَد بالإِسْتِدْلاَلِ وَبالرَدِّ إِلَى ذَلِكَ، فَيَصِحّ اسْتِدْلاَلُهُ أَو يَبْطُلُ)[١].

واتە: ئەو شتانەی کە یەکسەر بە سەرنجدانی عەقڵ و بە هەستەکان دەزانرێن، بەڵگەیان لەسەر ناهێنرێتەوە (ئەوە دەفتەرەو دەیبینی، ئەوە دەنگەو دەیبیستی، ئەوە بۆنەو بۆنی دەکەی، ئەوە تامەو تامی دەکەی، ئەوە تەنێکە دەستی لێ دەدەی، ئەوە پێنج هەستەکان، یان: (٢ + ٢ = ٤)، یان کەم لە زۆر کەمترە، زۆر لە کەم گەورەترە، ئەوانە سەرەتای عەقڵییان پێ دەڵێن و بەڵگەیان لەسەر ناهێنرێتەوە)[٢]، بەڵکو بە هۆی ئەو سەرەتا عەقڵییانەوە هەر کەسێ بیەوێ بەڵگە بهێنێتەوە، بەڵگە بەوان دێنێتەوە و بۆ لای وان دەگەڕێتەوە، ئنجا بە ئەندازەی ئەوە کە پشت بەو سەرەتا عەقڵییانە دەبەستێ، بەو بەڵگە نەویستە عەقڵییانە، بەڵگە هێنانەوەکەی لێ دەسەلمێنرێ، یان لێی ناسەلمێنرێ.

٢)- هەروەها (المُعَلِّمِي) کە یەکێکە لە زانایان لەو بارەوە دەڵێ: (وَأَمَّا القَضَايَا الضَّرُورِيَةَ وَالبَدِيهِيَّةُ، فَقَدِ اتَّفَقَ عُلَمَاءُ المَعْقُولِ، أَنَّهَا رَأْس مَالِ العَقْلِ، وَأَنَّ النَّظَرَ إِنَّمَا يُرْجَى مِنْهُ حُصُولُ المَقْصُود، ببنَائِهِ عَلَيْهَا وَإِسْنَادِهِ إِلَيْهَا)[٣].

واتە: بەڵام بابەتە بەڵگە نەویستەکان و بە ئاشکرا زانراوە عەقڵییەکان، زانایانی ژیریبێژیی و زانایانی کە کاری عەقڵیی دەکەن، لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە ئەوانە سەرمایەی عەقڵن و، بیرکردنەوەو تێڕامان کاتێك ئومێدی

---

(١) الفِصَلُ فِي المِلَلِ والأَهْوَاء وَالنِّحَل، ج٥، ص٢٤٢.

(٢) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست.

(٣) القَائِد إِلى التَّصْحِيحِ العَقَائِد، ص ٣٨.

ئەوەی لێ دەکرێ بە ئامانج بگات، کە پشت بەو بەڵگە نەویستە عەقڵییانەو، بەو سەرەتا عەقڵییانە ببەستێ.

٣)- (إبْنُ تَيمِية)ش، ڕەحمەتی خوا لەویش و هەموو زانایان بێ، لەو بارەوە قسەیەکی جوان دەکات، دەڵێ: (وَالأُمُورُ الفِطْرِيَةُ، مَتى جُعِلَ لَهَا طُرقٌ غَيْرِ الفِطْرِيَة، كَانَتْ تَعْذِيباً للنّفُوسِ بلاَ مَنْفَعَة لَهَا)(١).

واتە: شتە خوارِسەکەکان و بەڵگە نەویستەکان، هەر کاتێك ڕێی ناخوارِسکمان بۆ گرتنەبەر، (ڕێی نائاسایی)، ئەو کاتە ئەو کارە ئازاردانێکی نەفسە، بەبێ ئەوەی کە سوودێکی لێ ببینێ.

بۆ وێنە: یەکێك لە بەڵگە نەویستەکان، ئەوەیە کە: شتێك ناگونجێ هەشبێ و نەشبێ، تۆ بە کەسێك بڵێی: وەرە بۆم بسەلمێنە! ئاخر چۆنی بسەلمێنێ!

یان یەکێك بڵێ: بۆم ئیسپات بکە کە ئەوە خۆرە بە ئاسمانەوە! ئاخر چۆن بیسەلمێنێ؟ ئەوە خۆرەو دیارە، یان ئەم بۆنە بۆنێکی خۆشە، یەکێك بڵێ: بۆم بسەلمێنە کە بۆنێکی خۆشە، ئاخر هەر کەسێ هەستی بۆنکردنی ساغ بێ و بۆنی بکات، دەزانێ کە بۆنی خۆشە، هەروەها بۆنی ناخۆشیش لەلای خەڵك، دیارە، کە بۆنی ناخۆشە، یان: ئەو گوڵە دیمەنێکی جوانی هەیە، چۆن دەیسەلمێنی کە دیمەنێکی جوانی هەیە؟! ئاخر چونکە جوانە، بۆیە جوانە و .. هتد!

بەڵێ شتە بەڵگە نەویستەکان، شتە ڕۆشنەکان، ئەگەر بتەوێ ڕۆشنیان بکەیەوە، لێڵیان دەکەی، چۆن دەیسەلمێنی ئەمە خۆرە، لەبەر ئەوەی خۆرەو بە ئاسمانەوەیەو هەموو کەس دەیزانێ، یانی: هەر بەڵگەیەك بێنیەوە، لە خۆی ئاشکراتر نیە.

هەروەها (٢ + ٢) چۆن دەیسەلمێنی دەکاتە چوار (٤)، مەگەر بۆ کەسێك دوو پرتەقاڵان لەوێ دانێ و، دوو پرتەقاڵانیش لێرە و، ئنجا بڵێی فەرموو: کۆیان بکەوە، دەکاتە چوار! بەڵام ئەگەر بڵێ: چۆن دەزانی ئەوە چوارە؟! ئایا ئەوە چۆنی بۆ بسەلمێنی؟!!

---

(١) الرَدُّ عَلَى المَنْطقيين، ص ٢٤٩.





قسەکەی (إبن تيمية) زۆر ڕاستە، ئەو شتانەی کە ڕۆشنن و، سەرەتای عەقڵیین، هەر کاتێك بویسترێ ڕۆشنتر بکرێنەوە، لێڵ دەبن.

ئنجا تێکگیرانی ئیلحاد لەگەڵ ئەو سەرەتا عەقڵییە یەکەمانەدا، بەمجۆرەیە:

ئەگەر خوا (سبحانه وتعالى) نکووڵیی لە بوونی بکرێ، دەڵێین: ئایا ئەو ڕاستییانە ئەو یاسا عەقڵییانە لە عەقڵ و بوونی تێکڕای مرۆڤەکاندا، کێ دایناون؟! مرۆڤ بۆخۆی نەبووە، تاکو دایاننێ، هەموو مرۆڤەکانیش ئەو یاسا و سەرەتا عەقڵییانە و ئەو بەڵگە نەویستە عەقڵییانەیان هەن، ئنجا کاتێك کەسێك نکووڵیی لە بوونی خوا دەکات، پرسیارێك بەرۆکی دەگرێ: کێ ئەو یاسایانەی لە عەقڵی مرۆڤدا داناون؟ کە بێگومان ئەمە پرسیارێکی بێ وەڵامە و بابای مولحید لە ئاستی دا زاری دەبێتە تەڵەی تەقیو.

## ٢)- لە ڕووی ڕەوشت و بەهایەکانەوە:

هەروەها لایەنێکی دیکە لەلایەنەکانی زگماکی مرۆڤ، کە لە سروشت و ناخیی مرۆڤدا دانراون و، هەموو کەس لە خۆیدا هەستیان پێ دەکا، بریتییە لە هەستی ڕەوشت و بەها، چونکە هەموو مرۆڤێك ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسند لەلایەك و، هی نزم و ناپەسند لەلایەکی دیکەوە، لێك جیا دەکاتەوە.

بۆ وێنە:

هەموو مرۆڤێك دەزانێ درۆ خراپە و ڕاستگۆیی چاکە، دادگەریی باشە و ستەم خراپە، چاکەکردن باشە و خراپەکردن شتێکی بەدە، بەزەیی و میهرەبانیی شتێکی باشە و دڵڕەقیی و بێ ڕەحمیی شتێکی خراپە .. هتد.

ئنجا دەپرسین: ئایا کێ ئەو هەستە زگماك و سروشتییانەی لە ناخی مرۆڤدا داناون؟

بۆ نموونە: چ شتێك وا لە مرۆڤان دەکات، کە حەز بە دادگەریی بکەن و، ڕقیان لە زوڵم بێ، ڕاستگۆیانیان خۆشبوێ و، درۆزنانیان ڕق لێ بێتەوە،





چاکەکارانیان خۆش بوێ و، ڕقیان لە خراپەکاران بێ، میهرەبانان و بەبەزەییانیان خۆش بوێ و، ڕقیان لە دڵڕەقان و بێ ڕەحمان بێ،؟

بەدڵنیاییی: بەبێ بڕوا بە خوا هێنان، هیچ پاساوێك بۆ ڕەوشت و بەها بەرزەکان نابێ، بە تایبەت لە کاتێکدا کە مرۆڤ بەرژەوەندیی لە پێچەوانەکانیاندا بێ، کاتێك مرۆڤ بەرژەوەندیی لە درۆکردندا بێ، چی وای لێ دەکات ڕاستگۆ بێ، کاتێك بەرژەوەندیی لە دڵڕەقییدا بێ، چی وای لێ دەکات لێبوردەو بە ڕەحم بێ، کاتێك بەرژەوەندیی لە زوڵم و ستەمدا بێ، چی وای لێ دەکات دادگەر بێ، کاتێك بەرژەوەندیی لە قۆرخکاریی و گەندەڵیی دا بێ، موڵك ماڵی خەڵك بۆ خۆیی و بۆ بنەماڵەکەی و بۆ حیزبەکەی زەوت بکات و، دەست بەسەردا بگرێ، چ شتێك وای لێ دەکات بڕوای بە یەکسانیی هەبێ و وا ڕەفتار بکات کە خەڵکی دیکەش بەشەرەو، هەقی هەیە لە خێرو بێری ئەو وڵاتەدا؟!

کەواتە: بەبێ بڕوا بە خوا هێنان، بەها بەرزەکان، ڕەوشت و ئاکارە پەسندەکان، پشتیوانەیان نامێنێ، ڕەصیدێکیان نامێنێ.

ئنجا شایانی باسە، مولحیدە ناودارەکانی وەك:

(١- ریتشارد داوکینز، ٢- کریستوفەر هیتشنز، ٣- لۆرنس کراون، ٤- سام هارس، ٥- دانیل تینیت).

هەڵبەتە هی دیکەش هەن، بەڵام ئەم پێنجە زۆر ناودارن لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، ئەوانە هەموویان لە چاوپێکەوتنەکانیاندا، لە بەرانبەر پرسیارە ڕەوشتییەکاندا، دەمیان دەبێتە تەڵەی تەقیو، (هەڵبەتە بە ئینگلیزیی بۆیان هێناوم لە گرتە ڤیدیۆییدا، بەڵام دوایی بۆیان تەرجەمە کردووم، بە تایبەت کوڕەکانم)، بۆ وێنە:

زینا لەگەڵ مەحرەمدا، مادام ڕازی بێ، ئنجا دایکە، خوشکە، کچە، پوورە[1]، پلکە، ئەو مەحرەمانە، پرسیاریان لێکرا: ئەوە چۆن دەبینن؟!

---

(١) من (پوور) بۆ (عمة) خوشکی باب، بەکاردێنم و (پلك)یش بۆ (خالة) خوشکی دایك.





لە وەڵامدا زاریان بوو بە تەڵەی تەقیو، چونکە ئەگەر بڵێ: خراپە، ئاخر بۆچی خراپە، مادام ئافرەتەکە ڕازی بێ و پیاوەکەش پێی چاك بێ؟! ئەگەر بە ڕاستیی مرۆڤ مولحید بێ، ناتوانێ بڵێ: خراپە، ئاخر بۆچی خراپە؟ بۆیە خراپە چونکە خوا قەدەغەی کردوە، ئەگەرنا مادام مرۆڤ لە ئەمیباوە هاتبێ، کەواتە: وەك چۆن لە لای ئەمیباو زیندەوەران و ڤایرۆس و میکرۆب و، دوایی دێ تاکو دەگاتە مەیموون، ئەخلاق و ڕەوشت لە گۆڕێ دا نیە، کامیان چۆنی بەرژەوەندیی بوێ، وا دەکات، مرۆڤیش دەبێ هەر وا بکات و، ئەگەر ئیمان لە ئارادا نەبێ، ئەخلاق هیچ واتایەکی نامێنێ.

ئنجا تۆ تەماشا بکە قسەیەکی (ریتشارد داوکینز) لە کتێبێکی دا بە ناوونیشانی: (the Goldilocbs Enigama)دا[1]، کە تەرجەمەی عەرەبیی کراوە، دەڵێ:

(الجنْسُ البَشَرِي هُوَ مُجَرَّد وَسْخ كِيمَائِي مَوجُود عَلَى كَوْكَبٍ مُتَوَسّط الحجم).

واتە: مرۆڤ هەمووی تەنیا بریتیە لە چڵکێکی کیمیایی کە لەسەر خڕۆکەیەکی قەبارە میانجیی پەیدا بووە.

ئیلحاد ئاوا تەماشای مرۆڤ دەکات، (چڵکێکی کیمیایی)! لە حاڵێکدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ لَكَ ﴾ الإسراء.

واتە: بە دڵنیایی ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوە.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِيٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ يَعْلَم ﴾ التين.

واتە: بە ڕاستیی مرۆڤمان لە باشترین پێکهاتەدا خوڵقاندوە.

هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾ البقرة: ٣٠.

واتە: من جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێم.

---

(١) لاپەڕە: ٢٥١.





بەڵێ: لە ڕوانگەی ئیمانەوە: مرۆڤ جێنشینی خوایە و، لە باشترین شێوەدا دروست کراوە و، لەلایەن خواوە ڕێزی لێگیراوە و، سپاردەی خوا(أمانة الله)ی پێ سپێردراوە، کە نە بە ئاسمانەکان، نە بە زەمین و نە بەچیایەکان، هەڵنەگیراوە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴾ الأحزاب: ٧٢.

واتە: ئێمە سپاردەمان ڕانواند، پێشانماندا، هی ئاسمانەکان و زەوی و چیایەکان، بەڵام ئامادەنەبوون هەڵیبگرن و لیێ ترسان، بەڵام مرۆڤ هەڵیگرت، بێگومان ئەویش زۆر ستەمکار و زۆر نەفامە.

بەڵێ مرۆڤ ئەمانەتێکی پێ سپێردراوە، نە بە ئاسمانەکان هەڵگیراوە، نە بە زەوی، نە بە چیایەکان، ئەو ئەمانەتەش ئەوەیە کە: بە ویستی خۆی بە ڕێیەدا بڕوا و، بە ویستی خۆی خوا بپەرستێ، یان نەیپەرستێ، ئا ئەو حاڵەتە، تەنیا لە مرۆڤدا هەیە.

ئنجا بە ڕاستیی ئەو قسەیەی (دوستویفسکی)[1]، زۆر ڕاستە کە لەسەر زمانی (میتا) دەیکات، لە ڕیوایەتە ناودارەکەی دا، بە ناوی: (برایانی کاڕامازۆف)[2]، کە تەرجەمە عەرەبییەکەی دێنم، دەڵێ:

(وَلَكِن مَا الَّذِي سَيَصِير إِلَيْهِ الإِنْسَان فِي هَذَا كُلِّهِ بغَيْرِ إِلَهٍ وَبغَيْرِ حَيَاةٍ آخِرَةَ؟ وَإِذَن فَمَعْنَى هَذَا: أَنَّ كُلَّ شَيءٍ سَيَكُونُ مُبَاحَاً بَعْدَ الآن، وَأَنَّ فِي وِسْعِ الإِنْسَانِ أَنْ يَفْعَلَ مَا يَشَاء).

لە سیاقی چەند قسەیەکدا دەڵێ:

بەڵام دوای ئەمە هەمووی، مرۆڤ بەبێ پەرستراوو بەبێ ژیانی ڕۆژی دوایی، چی لێ دێتەوە؟ ئەمە مانای وایە کە لەمەودا هەموو شتێك ڕەوایە و، مرۆڤ هەرچی بوێ، بۆی هەیە بیکات.

---

(١) ڕۆمان نووسێکی ناوداری ڕووسییە.

(٢) ج٤، ص١٦١.

یانی: ئەگەر خوا نەبێ و ڕۆژی دوایی نەبێ، مرۆڤ ڕێی لەبەردەمدا تەخت و ئاچووغ دەبێ، چی دەکات بیکات، ئەوەی کە ڕێ لە مرۆڤ دەگرێ، لابدات و پێی دەڵێ: ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەرامەو، وا بکەو وا مەکە، تەنیا و تەنیا بڕوا بە خوا بوونە و، بڕوا بوونە بە ڕۆژی دوایی و پاداشت و سزا.

بۆ وێنە: یەکێك لەو سەرچاوانە کە زۆرێك لەو وتووێژانە دێنێ کە لەگەڵ ئەو مولحیدانەدا کراون: (منتدى التوحيد)ە، بە تایبەت نووسەرێك بەناوی: (محمد الباحث) بابەتێك دێنێ، بە ناوونیشانی: (فضائح إلحادية وأخلاق داروينية إجرامية)، واتە: (شوورەییە ئیلحادییەکان و ڕەوشتە داروینییە تاوانییەکان)، کە لەو سەرچاوەیەدا کە ئاماژەم پێدا: (شموع النهار) لینکە ئەلیکترۆنییەکەشی هێناوە، لەوێ دا زۆرێك لەو وتووێژانە دێنێ، کە ئەوانە چۆن لە ڕووی ڕەوشت و ئاکارەکانەوە، هیچ بەڵگەو پاساوێکیان پێ نیە: خەڵك ڕەوشت و ئاکاری هەبێ، هەروەها باسی زۆر لە مومارەسەو کردەوە دوور لە ڕەوشت و بەهایەکانی مولحیدەکانیش دەکات.

### ٣)- لە ڕووی غەریزەکان بە گشتیی و، سۆزی دایکایەتییەوە بە تایبەتی:

ئەمیش زۆر بە سەختیی لەگەڵ ئیلحاد دا دژ دەوەستێ، بۆ نموونە:

أ- ئایا کێ منداڵی کۆرپەی فێری مژینی مەمکی دایکی کردوە؟! چونکە یەکێ لە غەریزەکان ئەوەیە کە کۆرپە هەر لە دایك دەبێ، دەزانێ مەمکی دایکی بمژێ و، مژینی مەمکی دایکییش پرۆسەیەکی ئاسان نیە.

ب- کێ وای لە دایك کرد، چ دایکی مرۆڤ، چ هی ژیانداران لەگەڵ، بەچکەو ڕۆڵەکانیاندا هێندە بەسۆز و بە بەزەیی بن و، ئامادەبن خۆیانیان لەسەر بە کوشت بدەن، مریشکێکی کورك کە لەسەر هێلکانە، یان لەسەر جووچکانە، ئەگەر فیلێك بەلایدا بچێ، مریشکەکە پێیهەڵدەپڕژێ و خۆی پێ دا دەدات و، ئامادەیە خۆی فیدای جووجکەکانی بکا، خۆی لە بەین بەرێ، بەڵام





جووجکەکانی سەلامەت بن، کێ وای لێ کردوە؟! کێ وای فێر کردوە؟! چونکە دەزانێ ئەو جووچکانە بێ هێز و بێ دەسەڵاتن، ئەگەر دایکەکەیان بەرگرییان لێ نەکات، دەخورێن.

ج- کێ باڵندەکانی فێر کردوە بۆ شوێنی تایبەت و لەکاتی دیاریی کراودا کۆچ بکەن، کە وەك دواتر باس دەکەین: جۆرێك لە باڵندە هەیە، بەچکەکەی لێرە دادەنێ، بۆ خۆی دەڕوا شەش مانگ دوور دەکەوێتەوە، شەش مانگە ڕێ، دوایی ئەو بەچکانە کە دایناون، خۆیان فێر دەبن و دەچنە ئەو شوێنەی کە دایك و بابیانی لێ بوون، کێ فێری کردوون؟!

بێگومان تەنیا وەڵامی ڕاست ئەوەیە کە: ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ۝٥٠ ﴾ طه.

واتە: (مووسا) فەرمووی: پەروەردگارمان ئەو کەسەیە کە بوونی بە هەموو شتێك داوە، پاشان فێریشی کردوە، ڕێنمایی کردوە (چۆن بەڕێوە بچێ و چۆن بژیێ).

### ٤)- لە ڕووی هەستکردن بە ئامانجداریی (الشعور بالغائية)یەوە:

ئەمیش یەکێکی دیکەیە لە هەستە زگماکەکانی مرۆڤ، مرۆڤ بە پێچەوانەی ژیاندارانی دیکەوە، هەمیشە بە دوای ئامانجدا وێڵە:

١- من کێم؟

٢- کێ هێناومی؟

٣- بۆ کوێ دەچم؟

٤- بۆچی هێنراوم؟

٥- دەبێ چی بکەم و چۆن بکەم؟

٦- ئەم گەردوونە کێ خاوەن و مشوور خۆریەتی؟

٧- سەرەنجامی ئەم گەردوونە چۆن دەبێ و، چی بە دوادادێ؟!

هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: {أَصْدَقُ الأَسْمَاءِ: حَارِثٌ وَهَمَّام}، (أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٩٥٢)، وصحَّحَه الألباني).

واتە: ڕاستترینی ناوەكان (حارِث وَهَمَّام)ن، (حارث)، واتە: كێڵەر، ئەوەی زەوییەك دەچێنێ و دەكێڵێ، (همام)یش، واتە: خەمخۆر، خەفەتخۆر، كە دیارە مرۆڤ كار دەكات و خەمیش دەخوا، هەڵبەتە بۆیە كار دەكاو زەوی دەكێڵێ، چونكە ئامانجێكی هەیە، هەروەها بۆیە خەفەت دەخوات، چونكە ئامانجێكی هەیە.

ئنجا ئایا كێ ئەو پرسیارانەی لە ناخی مرۆڤدا داناون؟ بەدڵنیایی هەبوونی ئەو پرسیارانە - كە فەلسەفە هەمووی هەوڵێك بووە، بۆ دۆزینەوەی وەڵامی ئەو پرسیارانە - ڕێك لەگەڵ ئیلحاددا دژو ناكۆكە، بۆچی مرۆڤ دەپرسێ: من كێم؟ لە كوێوە هاتووم؟ كێ هێناومی؟ بۆچی هێناومی؟ بۆ كوێ دەچم؟ دەبێ چی بكەم؟ ئەو پرسیارانە بۆچی لە ناخی مرۆڤدا هەن، ئەگەر خوا (سبحانە وتعالی) لە ناخی دا داینەنابن، كێ لە ناخیدا دایناون؟!

كەواتە: هەستكردن بە ئامانجدارییش لەگەڵ ئیلحاد دا تێك دەگیرێ، كە هەست كردن بە ئامانجداریی پێكهێنەرێكی ناخ و زگماك و خوارِسكی مرۆڤە.

٥)- لە ڕووی هەستكردن بە ویستی ئازاد و سەربەستەوە:

بواری پێنجەم كە لە زگماك و خوارِسكی مرۆڤدا هەیە و، لەگەڵ ئیلحاددا دژ دەوەستێ، ئەوەیە كە مرۆڤ هەست بە ویستی ئازادیی و سەربەستیی خۆی دەكات، هەموو مرۆڤێك زۆر بە سێنایی جیاوازیی دەكا لە نێوان كردارو هەڵسوكەوتە ئازادو سەربەستەكانی و، ڕەفتارو جووڵە ناچارییەكانی دا، یانی: كەسێك كە دێت بۆ لات و تەوقەت لەگەڵدا دەكات، زۆر بە ئاسانیی دەزانی كە ئەوە دەستی هێناوەو بەویستی ئازادانەی خۆی دەست درێژ دەكاو تەوقە دەكات، بەڵام كەسێك كە دێ بۆ لات، بەڵام جەڵتە لێی داوە، دەستی دەجووڵێ، تۆ هیچ گلەیی لێ ناكەیی، بڵێی: بۆچی دەستت دەجووڵێنی! یان كە سەری

دەجووڵێنیی، ناڵێی: بۆچی سەرت دەجووڵێنی! هەروەها کە لاقی دەجووڵێ بە شێوەیەکی ناویستیی (لاإرادي)، گلەیی لێ ناکەی، چونکە دەزانی بە دەست خۆی نیە، هەموو مرۆڤێك هەست دەکات جووڵە ئازادو سەربەستەکان، جیان لە جووڵە ناچارییەکان، چ هی خۆی چ هی خەڵك.

ئنجا ئەمیش شتێکی ڕیشە دارە لە فیطرەتی مرۆڤدا و، لەگەڵ ئیلحادیشدا دژو ناکۆکە، چونکە ئەگەر وەك ئیلحاد دەڵێ، کردارو جم و جۆڵەکانی مرۆڤ، تەنیا بەرهەم و زادەی کارلێکە فیزیایی و کیمیاییەکان و، لێدانە کارەباییەکانی خانە مێشکیی و دەمارییەکان (النَّبَضَات العَصَبِّية والذِّهنية)بوونایە، کە ئەوانە مەحکوومی یاسا سروشتییەکانن، هیچ واتایەك بۆ ئازادیی و ویست و خواستی مرۆڤ نەدەمایەوە و سەرەنجام: هیچ واتا و پاساوێکیش بۆ گلەیی و گازندە و لێپرسینەوە و سزا و پاداشت نەدەمایەوە، چونکە بەبێ ویستی ئازادانەی مرۆڤ، سزا و پاداشت بناغە و پاساویان نیە.

بەڵێ، لە ڕاستییدا لە سایەی شوومی ئیلحاددا، هیچ واتایەك بۆ ئیرادەو ئازادیی مرۆڤ نابێ، بێگومانیش هەبوونی هەست و ئیرادەی ئازادو سەربەست، بەڵگەی هەبوونی بەدیهێنەرێکی کارزانە، کە لەو سیفەتی ویست (إرادة)ەی خۆی، بە مرۆڤیشی داوە، تاکو پێی تاقی بکرێتەوە، وەك زانایانی زانستی کەلام و ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی دەڵێن:

ئەگەر خوا (سبحانه وتعالى) ویستێکی گشتیی و بێ سنوور و ڕەها (إرادة عامة لا محدودة مطلقة)ی هەیە، مرۆڤیش بەشە ویستێك (إرادة جزئية)ی هەیە، بایی ئەوەندە پێی تاقی بکرێتەوە.

بەڵێ مرۆڤ ویستێکی گشتیی و ڕەهای نیە، بۆ وێنە: ناتوانێ وای کردبایە لێرە لە دایك نەبێ، یان ڕەگەزەکەی ڕەگەزێکی دیکە بێ، ڕەنگی ڕەنگێکی دیکە بێ، زمانی زمانێکی دیکە بێ.

بەڵام دەتوانێ: چاك بكا و خراپ نەكا، ڕاست بڕوا و چەوت نەڕوا، سوود بە خەڵك بگەیەنێ و زیانیان پێ نەگەیەنێ، واتە: بایی ئەوەندە كە پێی تاقی بكرێتەوە، خوا ویستێكی ئازادی پێداوە.

ئنجا لە ڕاستییدا نكووڵییكردن لە بوونی خوا و، ئیلحاد، لەگەڵ هەبوونی ویستی ئازادی مرۆڤدا، كە شتێكی واقیعەو بەرهەست و بەرچاوە، تێك دەگیرێ، كەواتە:

مرۆڤ خاوەن ویستێكی ئازادە و، لە دنیا و دوارۆژیشدا، بە هۆی ئەو ویستە ئازادەیەوە، شایستەی سزا و پاداشتە و، ئەم ڕاستییەش ڕێك لەگەڵ ئیلحاددا دژ دەوەستێ، چونكە لەسەر بناغەی ئیلحاد: ئازادیی مرۆڤ و، سزا و پاداشت و، چاك و خراپ و، ڕاست و چەوت و، حەلاڵ و حەرام..هتد هیچ واتایەكیان نیە.





## بڕگەی دووەم: ناکۆکیی و تێکگیرانی ئیلحاد لەگەڵ عەقڵ دا:

سەرەتا دەڵێین: ئیلحاد و خوانەناسیی، زۆر بە سەختیی لەگەڵ عەقڵ و یاسا ڕوون و ئاشکرایەکانی دا تێکدەگیرێ و دژ دەوەستێ، ئنجا لەبەر ئەوەی ئێمە لە بەشی دووەمدا بە درێژیی لە بارەی شایەدیی دانی عەقڵەوە لەسەر بوونی خوا (سبحانه وتعالى) قسەمان کرد و، حەوت یاسای عەقڵییمان خستنە ڕوو، بۆ چۆنیەتی شایەدیی دانی عەقڵ و، ئیسپاتی عەقڵ بۆ بەدیهێنەرێتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتیی خوا، بۆ مرۆڤ و ژیان و گەردوون، ئەو حەوت یاسا عەقڵییەش، ئەمانە بوون:

١) سروشتی بوون (طبيعة الوجود).

٢) هەموو پەیدابوویەك پەیداکەرێکی هەیە (لِكُلِّ حَادِث مُحْدِث).

٣) هەر شتێك بوون و نەبوونی یەکسان بن، بەبێ زاڵکەرێك لایەکیان زاڵ نابێ (يَسْتَحِيلُ رَجْحَانُ أَحَد طَرَفِي المُمْكِن بدون مُرَجِّح).

٤) نەداری شتێك، پێی نابەخشرێ (فَاقِدُ الشَّيءِ لاَ يُعْطِيهِ).

٥) هەموو ڕێکخراوێك ڕێکخەرێکی هەیە (لِكُلِّ نِظَامٍ مُنَظِّم).

٦) مشوورخۆریی و سەرپەرشتیاریی، بەڵگەی هەبوونی مشوورخۆرو سەرپەرشتیارە.

٧) وەڵامدانەوەی سەرجەم داخوازییەکانی دروستکراوەکان، بەڵگەی هەبوونی وەڵامدەرەوەیەکە.

ئنجا ئێمە لێرەدا بۆ زانینی چۆنیەتیی تێکگیران و دژ وەستانی خوانەناسیی (إلحاد) لەگەڵ عەقڵ و هۆشی مرۆڤ و یاساکانیدا، هەر ئەوەندە بە بەس دەزانین، کە جارێکی دیکە سەرنجی ئەو حەوت یاساو بنچینە عەقڵییە بدەینەوە و تەماشا بکەین! چۆن هەر کام لەو حەوت یاسا عەقڵییە، ڕێك دژ دەوەستێ و ناکۆکە و تێکدەگیرێ لەگەڵ خوانەناسیی (إلحاد)دا؟

## یاسای یەکەم: سروشتی بوون (طبیعة الوجود):

پێشتر ڕوونکردنەوەمان لەسەرداوە، بۆیە لێرە هەر بە کورتیی دەڵێین: بوون (الوجود) ڕاستەوخۆ خوازیاری بەدیهێنەرە، هەر کاتێك بوونمان بینی، دەبێ پەیداکەرێك، بەدیهێنەرێك بۆ ئەو بوونە بخوازین، چونکە لە سەرەتا ڕۆشن و بەڵگە نەویستەکانی عەقڵە، کە هەرگیز بوون (وجود) بەبێ بەدیهێنەرو، خاوەن پەیدا نابێت.

ئنجا پێشتر باسمان کرد، کە بوون لە ئەسڵدا سێ جۆرە:

أ) بوون گونجاو (ممکن الوجود).

ب) بوون مەحاڵ (مستحیل الوجود).

ج) بوون پێویست (واجب الوجود).

ئەم گەردوونەش لە جۆری: بوون گونجاو (ممکن الوجود)ە، واتە: دەگونجا ببێ و دەشگونجا نەبێ، ئەگەر نەشبووبایە هیچ نەدەبوو، هەمیشە (بوون گونجاو) پەکی لەسەر (بوون پێویست) (واجب الوجود) کەوتوە، بەڵام بیرۆکەی خوانەناسیی و ئیلحاد، پێی وایە کە بوون گونجاو (ممکن الوجود) پێویستیی بە دەرەوەی خۆی نیە و، هەر لە خۆوە پەیدا دەبێ، کە ئەوەش مەحاڵێکی عەقڵییە و ڕێك لەگەڵ عەقڵدا دژ دەوەستێ.

## یاسای دووەم: هەموو پەیدابوویەك پەیداکەرێکی هەیە:

ئەمیش یەکێکە لە یاسا عەقڵییە بەڵگە نەویستەکان و، مەسەلەی (هەر بوویەتیی مادده) (أزلیة المادة)، یاخود (هەر بوویەتیی گەردوون) (أزلیة الکون)، کە لە ئەفسانەیەك بەولاوە هیچی دیکە نیە، پێشتر ئاماژەیەکمان پێدا و لە باسی سێیەمی ئەم بەشەشدا: (بیانووە پووچەڵەکانی ئیلحاد) قسەی تێرو تەسەلی لە بارەوە دەکەین.



ئنجا ئەوە كە پەیدابوو و دروستكراو (مُحَدث ومخلوق)، دەبێ پەیداكەرو بەدیهێنەرو دروستكەر (مُحْدِث وخالق وصانع)ی هەبێ، ئەمە یەكێكە لە یاسا ڕوون و بەڵگە نەویستەكانی عەقڵ.

بەڵام بیرۆكەی خوانەناسیی دەڵێ: بوون (وجود)، شتێكە لەخۆوە پەیدا بووە و هیچ پەیداكەرو بەدیهێنەرێكی نیە، كە ئەوەش وەك گوتمان: ڕێك لەگەڵ یاسا عەقڵییەكاندا تێكدەگیرێ، ئنجا ئەوەش، وەنەبێ پەكی لەسەر ئەوە كەوتبێ، ئەو مرۆڤە فێر كرابێ، بەڵكو هەر منداڵێكی گچكە، بۆ وێنە: شتێكی پێ بێ، تۆ شتەكەی لێ ببەی، بەبێ ئەوەی ئاگای لێ بێ، یەكسەر فیكری بۆ تۆ دەچێ، دەزانێ كە ئەو شتە ون بووە، تۆ دەستت داوەتێ و ئەگەر بڵێی: من نیم، چاو دەگێڕێ بزانێ داخۆ كێی دیكەی لێیە، ئەگەرنا هەر یەخەی تۆ دەگرێ، دەزانێ كە ئەو شتەی لەو شوێنە بزر بووە، بزركەرێك بزری كردوە و كەسێك لای بردوە.

هەروەها ئەگەر منداڵێكی زۆر گچكە كە جارێ هیچ فێر نەبووە، پێی بڵێی: چاو بنووقێنە، دوایی سێوێكی بۆ لەوێ دابنێی، یاخود پرتەقاڵێكی بۆ لەوێ دابنێی، هیچ گومانی نابێ و دوو دڵیی نابێ، لەوەدا كە تۆ داتناوە و ئەگەر بڵێی: من دامنەناوە، سەری سوڕدەمێنێ، چونكە بەپێی عەقڵی سادەی خۆی، دەزانێ كە یەكێ لە یاسایەكانی عەقڵ، ئەوەیە كە هیچ پەیدابوویەك بەبێ پەیداكەر نابێ.

## یاسای سێیەم: هەر شتێ بوون و نەبوونی یەکسار بن، بەبێ زاڵکەرێك لایەکیان زاڵ نابێ:

پێشتر بەوە وێنەمان بۆ هێناونەوە: دوو تای تەرازوو کە وەك یەك بن، لایەکیان داناکەوێ، بەبێ ئەوەی پارسەنگێك، قورساییەك بخرێتە لایەکیانەوە، ئنجا ئەم ژیان و گەردوونەش دیارە بوون و نەبوونی یەکسان بوون، لەبەر ئەوەی لە جۆری بوون گونجاوە، بەڵام ئێستا کە بوونی بەسەر نەبوونیدا زاڵ کراوە، دەبێ زاڵکەرێك زاڵی کردبێ، بەڵام بیرۆکەی ئیلحاد دەڵێ: نەخێر هەر لە خۆوە، لایەکیان بەسەر لایەکیاندا زاڵ بووە! کە ئەوە دژی عەقڵ و لۆژیکە و وەك ئەوە وایە: دوو تای تەرازوویەك بڵێی: هیچ کەس دەستکاریی نەکردوون، کەچی لە کاتێکدا یەکسان وەستاون، هەر لەخۆوە لایەکیان دادەکەوێ و لایەکیان لە سەرێ دەمێنێتەوە! کە بێگومان ئەوە هەموو خاوەن عەقڵێك ڕەفزی دەکات.

## یاسای چوارەم: نەداری شتێك ئەو شتەی پێ نابەخشرێ:

وەك زۆر جار گوتوومانە: کەسێك پارەی نەبێ، ناتوانێ پارە بدات بە خەڵك و، کەسێك میوەیەکی پێ نەبێ، بۆ وێنە: سێو، پرتەقاڵ، ناتوانێ لێی بدات بە خەڵك، ئەمەش یاسایەکی عەقڵیی و بەڵگە نەویستێکی عەقڵییە.

ئنجا ئێمە بەلای کەمەوە، لە گەردووندا لە دەوروبەرماندا، دە (١٠) حاڵەت و دیاردە هەن کە هیچ پەیوەندییان بە ماددەوە نیە، هەڵبەتە شتی زۆرتر هەیە، بەڵام ئێمە دە (١٠) شتمان وەك نموونە هێناونەوە، کە هیچ پەیوەندییان بە ماددەوە نیە، بەڵام لە نێو جیهانی ماددەدا، ئەو دە(١٠) شتانە پەیدا بوون، لە حاڵێکدا کە سروشتی ماددە، هیچ کام لەو دە (١٠) شتانە ناخوازێ:

### ١- (ڕێك و پێكیی و سیستم):

ئێمە پێشتر باسی ماددەمان كرد و گوتمان: بچووكترین یەكەی ماددە، بریتیە لە گەردیلە و گەردیلەش بۆ خۆی لە چەند تەنۆلكەیەكی گچكە (جُسَیمات) پێك دێ، كە (نیۆترۆن و پرۆتۆن)ن، لە نێوكەكەیدا و (ئەلیكترۆن)ە، لە سووڕگەكەیدا، كە پرۆتۆن بارگەی موجیبی هەیە و ئەلیكترۆن بارگەی سالیبی هەیە، نیۆترۆنیش بێ بارگەیە، ئنجا هەر كام لە نیۆترۆن و پرۆتۆنیش لە چەند تەنۆلكەیەكی بچووكتر پێك دێن، كە كواركەكان (kuarks)ن.

بەڵام ئێمە ئەو سیستمەی كە دەیبینین، ئەم هەموو ڕێك و پێكیی و یاساداریی و وردەكارییە، هیچ پەیوەندیی بە سروشتی ماددەوە نیە، كەواتە: لە دەرەوەی ماددەوە بەسەر ماددەدا فەرز كراون.

### ٢- (ئامانج و مەبەست):

ئێمە تەماشا دەكەین: هەر لە زیندەوەرێكی یەك خانەیی (ئەمیبا)یەوە، بگرە تاكو زیندەوەرانی دیكە، پەڕەوران، ئاژەڵان، ژیانداران، دڕندەكان، هەتا دەگاتە مرۆڤ، هەر كامێك لەوانە ئامانجێك لە بوونی هەیە، هەروەها فراوانتر لە ژیاندار، بچۆ بۆ كەهكەشانەكان، ئەستێرەكانیان و خڕۆكەكانیان، هەموویان مەبەستێك لە پشتییانەوە هەیە، ئنجا ئەو مەبەست و ئامانجەی دانراوە بۆ ئەو دروستكراوانە، بە تەئكید دەبێ لە دەرەوەی خۆیانەوە بۆیان دانرابێ، ئەگەرنا خودی خۆیان ئەوە ناخوازێ.

### ٣- ژیان (الحیاة):

ژیان (حیاة)یش دیسان هیچ پەیوەندیی بە ماددەوە نیە، هەر بۆیەش تا ئێستا زانایانی زیندەوەرزان، کە لە ژیان دەکۆڵنەوە، لەبەردەم مەتەڵی ژیاندا دەستە پاچەو دەستەوسانن، چونکە دیاردەیەکی سەروو ماددیی (میتافیزیك)ە.

### ٤- غەریزەکان:

ئاژەڵ، پەڕەوەر، دڕندە، بەزەییان بە بەچکەی خۆیاندا دێتەوە، بەخێوی دەکەن، پەروەردەی دەکەن، بەرگریی لێ دەکەن، هەروەها هەموو غەریزەکانی دیکە، غەریزەی خۆشەویستیی نێوان باب و دایك و ڕۆڵە، پاشان غەریزەی جینسیی، غەریزەی شت هەبوون، غەریزەی بەرگریی لەخۆکردن، هەموو ئەو غەریزانە، هەم لە مرۆڤدا هەن، زۆر بە زەقیی، هەم لە زۆرێك لە ئاژەڵان و ژیاندارانی دیکەشدا هەن، ئەو غەریزانەش هیچ پەیوەندییان بە ماددەوە نیە و، لە دەرەوەی ماددەوە بە بەشێك لە دیاردە ماددیەکان، دراون، کە بریتین لە زیندەوەران و ژیانداران.

### ٥- ویستی ئازاد (الإرادة الحرة):

مەبەست لە ویستی ئازاد ئەوەیە، بۆ وێنە:

شتێك بە ویستی خۆی بەملاولادا بڕوات، کە ئەو حاڵەتەش بە گشتیی، لە ژیانداراندا هەیە و هیچ پەیوەندییشی بە سروشتی ماددەوە نیە و لە دەرەوەی خۆیەوە پێیدراوە، واتە: لەسەرچاوەیەکی ناماددییەوە، کە خوای بێ وێنە و هاوتایە.





## ٦- عەقڵ و هۆش:

عەقڵ و هۆش هیچ پەیوەندیی بە ماددەو پێکهاتەکانی ماددەوە نیە، کەواتە: لە دەرەوەی ماددەوە لە ماددەدا دانراوە و، بە هەندێك لە دیاردە ماددییەکان دراوە، کە مرۆڤەکانن.

## ٧- دینداریی و پەرستن و، بە مەزنگرتنی شتێك لە دەرەوەی خۆ:

لێرەدا مەبەستم دینداریيە بە گشتیی، یانی: دینداریی و پەرستشی بتپەرست و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش، هەر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەستی پەرستن لە مرۆڤدا هەیە، ئنجا ئەگەر خوا بپەرستیٚ، ئەوە شوێنی شیاوی خۆی پیٚ گرتوەو، ئەگەر جگە لە خواش بپەرستیٚ، کە (جگە لە خوا) هەموو پەرستراوەکان دەگرێتەوە: چ ژیاندار بن، وەك: مرۆڤەکان و جند و فریشتەکان، چ بیٚ ژیان بن، وەك: خڕۆکە و ئەستێرەکان و هەموو ئەو شتانەی دیکە، بۆ وێنە: پەیکەرو دارو بەردەکان، ئەوە ئەو هەستە بەرزەی بەلا ڕێدا بردووە، گرنگ ئەوەیە دیاردەی دینداریی و پەرستن، هیچ پەیوەندیی بە ماددەوە نیە.

کەواتە: دیارە ئەو هەستە بەرزە لە دەرەوەی ماددەوە، لە بەشێکی ماددەدا دانراوە، کە مەبەستم پێی مرۆڤە، مرۆڤ بەڵیٚ خاوەنی جەستەیەکی ماددییە، بەڵام خاوەنی ڕووحێکی مەعنەوییشە، ڕووحێکی سەرووی ماددیی و پشت ماددە (ماوراء الطبیعة).

## ٨- حەز کردن بە شت زانین:

ئەوە کە مرۆڤ حەز دەکات شت بزانیٚ - وەك پێشتر باسمان کرد، لە باسی فیطرەتدا - مرۆڤ حەز دەکات شت بزانیٚ، ئنجا ئەو حەزە لە دەرەوەی ماددەوە

بە مرۆڤ دراوە، لە دەرەوەی جیهانی ماددە و سروشتەوە و لە پشت سروشت و ماددەوە.

## ٩- حەز کردن بە چاکەکاریی و، ڕۆیشتن بەرەو تێریی و تەواویی:

ئەوە کە مرۆڤ حەز دەکات تێرو تەواو بێ و، چاکە بکات و، خەڵك لێی بەهرەمەند بێ، ئەو هەستەش، هیچ پەیوەندیی بە ماددەوە نیە و هەستێکی مەعنەویی و نامادییە.

## ١٠- حەز کردن بە جوانیی و، هونەر، بە ڕازاوەیی:

ئەمیش هاندەر و خەسڵەتێکی نامادییە، لە زگماکی مرۆڤەکاندا دانراوە، مرۆڤەکان حەز بە جوانیی دەکەن و ڕقیان لە ناشرینییە، حەز بە ڕازاوەیی دەکەن و ڕقیان لە بێسەرو بەرەییە.

ئنجا دەپرسین: ئایا ئەم دیاردانە چۆن لە ماددەدا پەیدا بوون؟!

چونکە نەداری شتێك ئەو شتەی پێ نابەخشرێ، ماددەش ئەو شتانەی هیچ کامیان نیە، کەواتە: دیارە لە دەرەوەی ماددەوە، بە هەندێ لە دیاردە مادییەکان، هەندێ لە دروستکراوەکان، بەخشراون.

ئنجا لە ڕاستییدا ئیلحاد هیچ وەڵامێکی عەقڵیی و زانستیی بۆ ئەو پرسیارە نیە، کە ئایا ئەو دیاردە مادییانە، ئەو حاڵەتە نامادییانەیان لە کوێ هێنا؟ ئایا دروستکراوە مادییەکان، ئەو دە (١٠) دیاردەو حاڵەتە نامادییانەیان، لە کوێوە هێنان؟ بە تەئکید دەبێ لە دەرەوەی ماددەوە پێیان درابن.

## یاسای پێنجەم: هەموو ڕێکخراوێك ڕێکخەرێکی هەیە:

ئێمە پێشتر بەگشتیی لە بارەی ڕێك و پێکیی گەردوونەوە و، بە تایبەت لەبارەی ڕێك و پێکیی جەستەی مرۆڤەوە، قسەمان کرد و پانتاییەکی زۆرمان بۆ تەرخان کرد، لە ژێر ناوونیشانی: (سەرنجێکی ورد لە جەستەی مرۆڤ)دا، خستمانە ڕوو کە: ئەو پەڕی وردەکاریی، ئەو پەڕی یاساداریی، ئەو پەڕی ڕێك و پێکیی، هەیە، لە جەستەی خۆماندا بە تایبەت و، لە دەوروبەرو گەردووندا بە گشتیی، هەر بۆیەش خوا (سبحانە وتعالى) لە سوورەتی (الذاريات)دا دەفەرموێ:

﴿ وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِي أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾.

واتە: لە زەویدا نیشانە هەن بۆ کەسانێك کە زانیاریی جێی دڵنیاییان هەبێ، (زانیارییەکی وردو بە ئامانج گەیەنەریان هەبێ)، هەروەها لە خۆشتاندا، بۆچی سەرنج نادەن!

هەڵبەتە ئێمە لەبەشی دووەم دا و لە کاتی شیکردنەوەی شەشەمین یاسای عەقڵییدا، کە مرۆڤی ژیر ناچار دەکەن خوا بناسێ و، دان بەبوونی و مشوورخۆریی و سەرپەرشتیاریی بۆ ژیان و مرۆڤ و گەردووندا بێنێ، وەك جێبەجێکردنی ئەو فەرمانەی خوا (سبحانە وتعالى): سەرنجمان لە زەوی دا و، لە بەرگە هەوای دەوری زەوی و، بەرگە ئاوی دەوری زەوی، پاشان سەرنجماندا لە خۆر و مانگ، کە پەیوەندییان بە زەوییەوە هەیە، هەروەها سەرنجێکی خێرامان لە هێزەکانی گەردوون دا، دوایی سەرنجێکی وردیشمان لە جەستەی مرۆڤ دا و، سەلماندمان کە لە هەمولایەکەوە و لە هەموو شتێکدا، ئەو پەڕی ڕێك و پێکیی دەبینین، ئنجا بێگومان ئەو ڕێك و پێکییە کە لە جەستەی مرۆڤ و لە دەوروبەری مرۆڤ و لە گەردووندا هەیە، دەبێ ڕێکخەرێکی هەبێ.

ئنجا ئێستا: لێرەش چەند قسەیەکی دیکە لەو بارەوە دەکەین، تاکو دەربکەوێ تێکگیرانی ئیلحاد، لەگەڵ ئەم یاسا عەقڵییەدا، چەند زەق و ڕەقە!







**یەکەم:** با سەرەتا قسەی یەکێ لە مولحیدەکان بێنمەوە، مولحیدی فیزیایی ناودار: (ستیفن واینبرغ)، لە کتێبێکیدا کە تەرجەمەی عەرەبیی کراوە بە ناوی: (أحلام الفيزيائيين بالعثور على نظرية نهائية جامعة شاملة) (خەونی فیزیاییەکان بەوەوە: کە بیردۆزەیەکی کۆتایی و کۆکەرەوەو گشتگیر بدۆزنەوە)[1].

(ستیفن واینبرغ) دەڵێ: (عَلَيَّ أَنْ أَعْتَرِفَ أَنَّ الطَّبِيعَةَ تَبْدو لي أَحْيَاناً جَمِيلَةً أَكْثَرَ مِمَّا يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تَكُون)،

واتە: پێویستە دانی پێدا بێنم، کە سروشت هەندێ جار بۆ من وا دەردەکەوێ، زۆر لەوە جوانترە کە پێویست بوو لەسەری بێ.

واتە: ئەم گەردوون و سروشتە، زۆر لەوە جوانترە، زۆر لەوە سەرنج ڕاکێشترە، کە دەبووایە لەسەری بێ، کە ئەمە لە ڕاستییدا دانپێداهێنانێکی پەنهانە، بەوەدا کە دەبێ گەردوون خاوەنێك و ڕێکخەرێکی لە پشتەوە بێ، ئەگەرنا لەخۆوە بۆچی وایە؟!

**دووەم:** شایانی باسە: ئەو زانایانەی کە بڕوایان هەیە بە یاساداریی و ڕێك و پێکیی لە گەردووندا، زۆر زۆرن، چ خواناس بن، چ خوانەناس بن.

کە کتێبی (شموع النهار)[2]، ژمارەیەکیان لێ دێنێ، بۆ وێنە:

١- (باڕۆ).

٢- (کاڕ).

٣- (کارتر).

٤- (دیفیز).

٥- (دوکینز).

٦- (دیتش).

---

(١) ئەو کتێبە (أدهم السَّمَّان) وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبیی، بڕوانە: ص١٩٥.

(٢) ص٢١٣.

٧- (ئیلیز).

٨- (جرین).

٩- (جوث).

١٠- (هاریسۆن).

١١- (هۆکینگ).

١٢- (لند).

١٣- (بیج).

١٤- (نبرۆز).

١٥- (بلکخهورن).

١٦- (ریز).

١٧- (زویج).

١٨- (سمۆلین).

١٩- (سۆسکەند).

٢٠- (تەجمارك).

٢١- (تبلر).

٢٢- (فلنکن).

٢٣- (وینبرج).

٢٤- (وێلەر).

٢٥- (ویلزك).

هەڵبەتە ئەوانە هەموویان زانای ناوداری گەردوونناس و فیزیازان و کیمیازان و زیندەوەرزانی، پسپۆڕو شارەزاو ناودارن، ئنجا هەموو ئەوانە بڕوایان بەوە هەیە کە ئەم گەردوونەی ئێمە ڕێك و پێك و یاسادارە، هەڵبەتە زۆرێك لەوانە خواناسن و هەندێکیشیان دان بەبوونی خوادا ناهێنن، بەڵام دەڵێن: ئەم گەردوونە ئەو پەڕی ڕێك و پێکیی و وردەکاریی تێدایە.

**سێیەم:** با لێرەدا بۆ زیاتر دەرخستنی یاساداریی و ڕێك و پێكیی گەردوون، دوو وێنە بهێنینەوە:

کە بریتین لە:

١- هێزی ڕاکێشان (قوة الجاذبية).

٢- چوار هێزەکەی گەردوون (قوى الكون الأربع).

هەڵبەتە پێشتریش هەر ئاماژەمان پێداون، بەڵام بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی مەبەست، لێرەدا قسەی زیاتر و وردتریان لەسەر دەکەین:

**وێنەی یەکەم: هێزی کێشندە:**

هێزی کێشندە (قوة الجاذبية)، کە ئێمە بە زەوییەوە دەنووسێنێ، هەروەها هێزی کێشندە ئەو هێزەیە کە هەموو کەهکەشانەکانی ڕاگرتوون و، هەموو ئەستێرەکان و خڕۆکەکانیانی لە نێو کەهکەشانەکاندا بە هۆی هێزی کێشندەوە، دەخولێنەوە و ڕاوەستاون و بەملاولادا نارۆن.

ئنجا ئەو هێزی کێشندەیە کە پێمان وایە هێزێکی زۆر بەتین و زەبەلاحە، لەچاو هێزە سروشتییەکانی دیکە، هێزێکی کەمە، بۆ نموونە:

هێزی کێشندە، لە هێزی نێوکیی بەهێز (القوة النووية الشديدة)، کەمترە بە ئەندازەی: دە توان سی و شەش سالب ($10^{-36}$) بە پێی ڕای هەندێك لە فیزیکزان و، گەردوونناسەکان[1].

بە پێی ڕای هەندێکیانیش بە ئەندازەی: دە توان سی و نۆ سالب ($10^{-39}$)، کەمترە[2].

---

(١) شموع النّهار، ص١٧٩.

(٢) السماء، د. زغلول النّجار، ص٣٢٠.

بەڵام (ستیفن هۆكینگ) دەڵێ: بە ئەندازەی: دە توان چل و دوو سالب (١٠-٤٢)، كەمترە[١].

واتە: ژمارەیەك چل و دوو سفری هەبێ، ئنجا یەك بەشی ئەوە، بریتیە لە هێزی كێشندە و ئەوی دیكە هەمووی بریتیە لە هێزی نێو گەردیلە، كە پێی دەگوترێ: هێزی نێوكیی بەهێز (القوة النووية القوية)، ئەویش ئەو هێزەیە تەنۆلكەكانی نێو گەردیلە پێكەوە گرێ دەدا: ئەو ژمارەیەش ئاوا دەنووسرێ: (١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠ ٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠).

ئنجا ئەو ئەندازەیە لە هێزی كێشندە كە ئەم گەردوونەی هەموو پێ كۆنترۆڵ كراوە، گەردووناسان دەڵێن: ئەگەر یەك تۆز كەمتر بووایە، بێهێزتر بوایە، یاخود یەك تۆز بەهێزتر بووایە، ئێمە ئەم گەردوونەی ئێستامان بەو شێوەیە نەدەبینی.

بۆ وێنە: گۆڤاری: (new scientist)، (زانای نوێ)، لە وتارێكدا بەناوونیشانی: مەتەڵی هێزی كێشكردن، بۆچی هێزی كێشكردن بەو شێوە وردەكارییە كۆنترۆڵ كراوە؟ دەڵێ: پێویستە ئێمە مەمنوون و سوپاسگوزاری ئەو بێهێزییەی هێزی كێشندە بین، چونكە ئەگەر لەوە بەهێزتر بووایە، بە ئەندازەیەكی زۆر زۆر كەم، ئەو كاتە ئێمە بوونمان نەدەبوو، تاكو گاڵتە بەو لاوازیی و كەم هێزییەی هێزی ڕاكێشان بكەین[٢].

ئنجا شایانی باسە ئەو نەگۆڕە گەردوونییە، (هێزی كێشندە پێشی دەڵێن: نەگۆڕی گەردوونیی (الثابت الكوني))، هێندە بە شێوەیەكی سەرسووڕهێنەر دانراوە، كە ئەگەر كەمتر یان زیاتر بووایە بە ئەندازەی: یەك لەسەر دە توان شەست (١/١٠^٦٠)، كە بەمجۆرە دەنووسرێ:

(١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠ ٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ئەگەر توانای هێزی كێشكردن لەو ئەندازەیەی

---

(١) تأريخ موجز للزمن، ستیفن هۆكینگ، ص٦٩و٧٢.

(٢) شموع النهار، ص١٧٩.

ئێستای هێندەی: یەك لەسەر ئەو ژمارەیە جیاواز بووایە، نە ئێمە دەبووین، نە ئەم گەردوونە بەم شێوەیە دەبوو.

چونکە:

أ- ئەگەر هێزی کێشندە لەوەی ئێستای زیاتر بووایە، ئەستێرەکان زۆر خێراتر لەوەی ئێستا، دەسووتان و وزەکانیان خێراتر سەرف دەکرد.

ب- ئەگەر کەمتریش بووایە، هەوڵ و سەرفکردنی وزەیان سستتر و کەمتر دەبوو لە حاڵەتی ئێستایان و دۆخەکە تێك دەچوو.

بۆ وێنە: با باسی خۆری خۆمان بکەین: ئەگەر هێزی کێشندەی خۆر، دوو هێندەی ئێستای بووایە - کە هێزی کێشندەی خۆر لەسەر ڕووبەری خۆر و لەسەر دیوی دەرەوەی خۆر: بیست و نۆ (٢٩) هێندەی هێزی کێشندەی سەر زەوییە - ئنجا ئەگەر دوو هێندە بووایە: تەمەنی خۆر، سەد یەك (١/١٠٠) ی ئێستای دەبوو، کە ئێستا: چوار ملیارو شەشسەد ملیۆن (٤٦٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵە، یانی: ئەوەندە ساڵە لە تەمەنی خۆر ڕابوردوە، بەڵام ئێستاش بایی پێنج ملیار (٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ هیدرۆجینی عەنبارکراوی تێدا ماوە، کە بسووتێ و بگۆڕدرێ بۆ هیلیۆم.

شایانی باسە: - وەك لە بەشی دووەمیش دا باسمان کردوە - خۆر لە هەر چرکەیەدا: شەشسەدو پەنجاو پێنج ملیۆن (٦٥٥٠٠٠٠٠٠) طەن هیدرۆجین دەگۆڕێ، بۆ شەشسەدو پەنجا ملیۆن (٦٥٠٠٠٠٠٠٠) طەن هیلیۆم، ئەو پێنج ملیۆن (٥٠٠٠٠٠٠) طەنە کە جیاوازە، ئەوە دەگۆڕێ بۆ وزەو تیشك، یانی: لە هەر چرکەیەکدا: پێنج ملیۆن (٥٠٠٠٠٠٠) طەن لە خۆر کەم دەبێتەوەو، دەبێتە وزەو تیشك، ئەگەرنا ئەوی دیکەی دەگۆڕدرێ بۆ هیلیۆم[1].

بەڵێ ئەگەر هێزی کێشندەی خۆر ئێستا چەندە، دوو هێندە بووایە، تەمەنی کەم دەبۆوە بۆ کەمتر لە سەد توان شەش (١٠٠^٦)، واتە: سەد ملیۆن

---

(١) السماء، د. زغلول النجار، ص٤٤١،٤٤٢.

(١٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ، واتە: سەد یەك (١/١٠٠)ی تەمەنی ئێستای، چونکە: (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠÷١٠٠،٠٠٠،٠٠٠=١٠٠) یانی: ئێستا نزیکەی پێنج ملیار (٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵی تەمەن بەڕێ کردوە، بەڵام ئەو کاتە تەمەنی خۆر هەمووی دەبوو بە سەد ملیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ، یانی: زۆر لە مێژ بوو تەواو بوو بوو، سەد ملیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠)ساڵ دەکاتە: یەك لەسەر پەنجا (١/٥٠)ی پێنج ملیار ساڵ.

ئنجا خڕۆکەکانی دەوری خۆریش، ئەگەر هێزی کێشندەی خۆر ئێستا چەندە، دوو هێندە بووایە، زۆر گچکە دەبوونەوە و، ژیاندارانیش بەهۆی ئەو هێزە زۆرەی ڕاکێشانەوە، لە قەبارەی زیندەوەران گەورەتر نەدەبوون، واتە: ژیانداران بە گشتیی، ئێستا زیندەوەرە بچووکەکان قەبارەیان چەندە، ئەوانیش قەبارەیان هەر ئەوەندە دەبوو، یانی: بە هیچ جۆرێك نەدەگونجا مرۆڤ دروست ببێ.

**وێنەی دووەم: چوار هێزەکانی گەردوون:**

شایانی باسە ئێمە پێشتریش باسی چوار هێزە سەرەکییەکانی گەردوونمان کردوە، بەڵام با ئێستاش چاوێکیان پێدا بگێڕینەوە، بزانین خوای زانا و توانا چ وردەکارییەکی لەم گەردوونەدا داناوە و، ئەو هێزانە چۆن هەر کامیان ڕێژەی تایبەتیی خۆی پێدراوە:

بەڕای فیزیازان و گەردووناسان:

چوار هێزی بنەڕەتیی ئەم گەردوونەی ئێمەیان ڕاگرتوە:

١) هێزی نێوکیی بەهێز (القوة النووية الشديدة).

٢) هێزی گەردیلەیی بێهێز (القوة الذرية الضعيفة).

٣) هێزی کەهرۆموگناتیسیی (القوة الكهرومغناطيسية).

٤) هێزی کێشندە (ڕاکێشان)، (قوة الجاذبية).

**١) هێزی نێوکی بەهێز (القوة النووية الشديدة):**

ئەم هێزە لە هەر سێ هێزەکانی دیکە بەهێزترە و، هەڵدەستێ بە پێکەوە پەیوەستکردنی تەنۆلکە سەرەتاییەکانی نێو ماددە، لە نێو نێوکی گەردیلەدا، یانی: پڕۆتۆن و نیۆترۆنەکان، پێکەوە دەبەستێ، هەروەها نێوکی گەردیلەکان هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیاندا جاری وایە پێکەوە ئاوێتە (دمج) دەبن لە نێو ئەستێرەکاندا، لە ئەنجامی ئەو تەقینەوە نێوەکییانەدا کە لە نێو ئەستێرەکاندا ڕوو دەدەن، ئەم هێزە بەهێزترینە لە گەردووندا.

**٢) هێزی گەردیلەیی بێهێز (القوه الذرية الضعيفة):**

ئەم هێزەی دووەم یەکسانە بە: دە توان سێزدە سالب: (١٠^-١٣)ی، هێزی نێوکیی بەهێز، واتە: یەك بەش لە سەد تریلیۆن (١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) بەشی هێزی نێوکیی بەهێز(القوة النووية الشديدة).

کە بە هۆی ئەم هێزەوە تەنۆلکە سەرەتاییەکانی ماددە(الجُسَيمات الأولية للمادة) لە نێو گەردیلەکاندا لە یەك جیادەبنەوە و هەڵدەوەشێن، وەك ئەوەی لە توخمە تیشکدەرەوەکان (العناصر المُشِعَّة)دا ڕوودەدات.

**٣) هێزی کەهرۆموگناتیسیی (القوة الكهرومغناطيسية):**

ئەمیان ئەندازەکەی بریتیە لە: یەك لەسەر سەدو سی و حەوت (١/١٣٧)ی هێزی نێوکیی بەهێز، واتە: هێزی نێوکی بەهێز سەدو سی و حەوت (١٣٧) هێندەی هێزی کەهرۆموگناتیسیی بەهێزە. کە بە هۆی ئەو هێزی کەهرۆموگناتیسییەوە، تیشکی کەهرۆموگناتیسیی پەیدا دەبێ، بە شەپۆلی جیا جیا و لەسەر شێوەی فۆتۆنات، کە کورتترین شەپۆلی تیشك بریتیە لە تیشکی (گاما)، کە یەك لەسەر یەك تریلیۆنی (١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠)ی مەترێکە، یانی: مەترێك بکەی بە یەك تریلیۆن بەش، ئنجا یەك بەشی بریتیە لە درێژیی تیشکی گاما.

لەدوای ویش تیشکی (سینیی) دێ، ئنجا تیشکی سەرووی بنەوشەیی (فوق البنفسجي) دێ، پاشان تیشکی بینراو (المرئي) دێ، دوایی تیشکی




ژێر سوور (تحت الحمراء) دێ و، دوا تیشك لە درێژییدا، بریتیە لە تیشكی (ڕادیۆیی)، كە لە مەترێكەوە تاكو كیلۆمەترێك و، تاكو چەند كیلۆمەترێكیش دەڕوات.

**٤) هێزی كێشندە، ڕاكێشان (قوة الجاذبیة):**

هێزی ڕاكێشان، وەك پێشتریش باسمان كرد، بە دە توان سی و نۆ سالب: ($١٠^{-٣٩}$)، یاخود دە توان چل و دوو سالب: ($١٠^{-٤٢}$)، بێهێزترە لە هێزی نێوكیی بەهێز[١].

بە دڵنیاییش ئەو هاوسەنگییە زۆر وردە كۆنترۆڵكراو (مضبوط)ەی لە نێوان ئەو چوار هێزە بنەڕەتییەی گەردووندا دانراوە، هیچ خاوەن عەقڵ و ویژدانێك ڕێ بە خۆی نادات كە نەیگێڕێتەوە بۆ بەدیهێنەر و مشوورخۆر و سەرپەرشتیارێكی خاوەنی ئەو پەڕی: زانایی و كارزانیی و كارامەیی و شارەزایی، ئەویش تەنیا خوای بەرز و مەزن و بێ وێنە و هاوەڵە.



---

(١) السماء في القرآن الكريم، د.زغلول النجار، ص٣١٩-٣٢٠.





## یاسای شەشەم: مشوورخۆریی و سەرپەرشتیاریی، بەڵگەی هەبوونی مشوورخۆرو سەرپەرشتیارە:

ئێمە پێشتر - لە بەشی دووەم دا - باسمان کرد: کە لەم گەردوون و دەوروبەرەی ئێمەدا و، لە ژیانی خۆماندا، ئەو پەڕی مشوور لیَ خوران و سەرپەرشتییکران دەبینین، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئێمە و گەردوون و دەوروبەرمان: مشوورخۆرێك و سەرپەرشتییکارێك و تەگبیرکارێکمان هەیە، کە خوایە (سبحانە وتعالی).

بەڵام بیرۆکەی خوانەناسیی (إلحاد) خۆی لە ئاست ئەو هەموو نەخشەو بەرنامە قووڵ و وردانەی نێو گەردووندا، دەکاتە کەڕەی شەربەت و، خۆییان لیَ گێل دەکات، وەك خوا (سبحانە وتعالی) فەرموویەتی:

﴿وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ١٠٥﴾ یوسف.

واتە: زۆر نیشانە هەن لە ئاسمانەکان و زەویدا، (بێبڕوایەکان) بە لایاندا ڕەت دەبن، بەڵام ڕوویان لیَ وەردەگێڕن. واتە: سەرنجیان نادەن و بە چاوی عەقڵ و دڵ تێیان نافکرن.

پێشینانی خۆشمان دەڵێن: (کەسێك بە تۆبزیی بینێریە مازووان، لە داریَ هەڵناڕوانیَ).

(مازوو) شتێکی خڕیلەی بچووکە بۆ خۆشکردنی پێستە و، بۆ دروستکردنی هەندێ داوو دەرمانیش بەکاردیَ، (مازوو) بە دارەبەنەوە[1] وەیە، ئنجا ئەگەر کەسێك بە تۆبزیی بنێری بڵێی: بچۆ مازووانم بۆ بکە، ئەگەر کەیفی لە

---

(١) دارەبەن: جۆرە درەختێکی شاخاویی بە هێز و سەخت و خۆڕاگرە و، بەگشتیی گەورە و زەبەلاحە و، بە قەبارەی جۆرا و جۆریش هەیە، بە پێی جیاوازیی ژینگەکان.





مازوو کردن نەبێ، تەماشای درەختەکان ناکات و تێیان هەڵناڕوانێ، لە دارەکان هەڵناڕوانێ، ئنجا کە تێی هەڵنەڕوانین و[1] تەماشای نەکردن، هیچ نابینێ!

پیرەمێردی شاعیریش ڕەحمەتی خوای لێ بێ، جوانی گوتوە، کە دەڵێ:

خوایە! ئەوانەی کە بێ باوەڕن  هیچیان نەدیوە وا هەڵەوەڕن
ئەگەرنا سەیری باغێکی گوڵ کەن  تەماشایەکی بە عەقڵ و دڵ کەن

بەڵێ مرۆڤ ئەگەر بەعەقڵ و دڵ تەماشای شتان نەکات و سەرنجیان نەدات و تێیان ڕانەمێنێ، بێگومان شتێکی وایان تێدا نابینێ.

کەواتە: خوانەناسیی و ئیلحاد لەگەڵ ئەم یاسا عەقڵییەشدا دژ دەوەستێ و ناکۆکە، چونکە ئێمە زۆر بە زەقیی و درەوشاوەیی، هەم لە خۆماندا، هەم لە دەوروبەرماندا، هەم لە دروستکراوەکاندا، هەم لە گەردووندا، مشوور لێ خوران دەبینین، سەرپەرشتییکران دەبینین، تەگبیر بۆ کران دەبینین، ئەوەش هەمووی بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە دەبێ ئێمە و گەردوون و دروستکراوەکان بە گشتیی: مشوورخۆرو سەرپەرشتیارێکمان هەبێ، بەڵام ئیلحادو خوانەناسیی خۆی لەو هەموو مشوور لێخوران و سەپەرشتییکران و تەگبیر بۆ کرانە، گێل دەکات، بۆیە گوتمان: ئیلحاد لەگەڵ عەقڵ و بنەما و یاساکانی عەقڵدا، ناکۆك و ناتەبایە.



---

(١) تێهەڵڕوانین: سەر بەرزکردنەوە و تەماشاکردنی سەرەوە.







## یاسای حەوتەم: وەڵامدانەوەی سەرجەم داخوازییەکانی دروستکراوەکان، بەڵگەی هەبوونی وەڵامدەرەوەیەکە:

کاتێك کە دەبینی هەر دروستکراوێك، چی پێویستە و پەکی لەسەری کەوتوە، بۆی دەستەبەرکراوە، بە تایبەتی لە نێو ژیانداران ئەوە زۆر چاك دەبینریٚ: لە نێو ئاژەڵاندا، لە نێو پەڕەوڕاندا، لە نێو زیندەوەراندا، وەك پێشتر - لە بەشی دووەم دا - باسی مێشوولەمان کرد، باسی هەنگمان کرد، باسی مێروولەی سپییمان کرد، باسی چەند جۆرە ماسییەکمان کرد، باسی حوشترمان کرد، هەروەها باسی چەند جۆرە باڵندەیەکمان کرد.

ئنجا کاتێك دەبینی هەموو ئەو ژیاندارانە، هەرچی کە پێویستیانە، بۆیان دابین کراوە و، داخوازییەکانیان هەموو جێبەجیٚ کراون، ئەوە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراو حاشا هەڵنەگرە، لەسەر ئەوەی کە وەڵامدەرەوەیەك بۆ ئەو داخوازییانەی ئەو ژیاندارانە هەیە، وەك خوا (سبحانە وتعالی) دەفەرمویٚ:

﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ١ ٱلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ٢ وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ٣﴾ الأعلى.

واتە: ناوی پەروەردگاری مەزنت بە پاك بگرە، کە هەموو شتێکی هێناوەتە دی و ڕێکی خستوە، هەروەها هەموو شتێکی ئەندازەگیریی کردوە و، ڕێنمایی کردوە.

ئێمە کاتی خۆی چەند نموونەیەکمان هێنانەوە، بۆ چۆنیەتی هیدایەتدانی خوا بۆ دروستکراوەکان، ئەو دوو ئایەتەشمان هێنانەوە، کە پرسیار و وەڵامێکی کورتی نێوان مووسا و هاڕوونی برای و، فیرعەونە: فیرعەون لە مووساو هاڕوون دەپرسیٚ:

﴿قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ٤٩﴾ طە.

واتە: پەروەردگارو خاوەنی ئێوە کێیە ئەی مووسا؟





﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾ طه.

(مووسا) فەرمووی: پەروەردگاری ئێمە ئەو کەسەیە کە بوونی بە هەموو شتێك داوە (لە نەبوون هێناویەتە دی)، دوایی ڕێنمایشی کردوە، یانی: سیستمی بۆ داناوە و ڕێی بۆ داناوە، چۆن بەڕێوەبچێ و، چۆن لە بوونی دا بەردەوام بێ!

لێرەش نموونەیەك دێنینەوە:

زانایان کە لە ژیانی پەڕەوڕو باڵندەکان دەکۆڵنەوە، دەڵێن:

باڵندەیەکی ئوستوڕاڵیی هەیە بە ناوی (موتۆن بێرد) (Muttan Bird) واتە: باڵندەی موتۆن، کە ئەو باڵندەیە لە ئوستوڕاڵیا دەژی، دوای سێ مانگ لە تڕووکاندنی هێلکەکانی، هێلکەکانی دەتڕووکێنێ و لەسەریان کورك[1] دەبێ، ئنجا هێلانەکەی بەجێ دەهێڵێ و، سەفەرێکی دوورو درێژ لە ئوستوڕاڵیاوە بۆ ئەمریکا دەکات، شەش مانگی پێ دەچن، یانی: ئەو ماوە (مسافة)یە کە بیست و پێنج هەزار کیلۆمەتر (٢٥،٠٠٠ کم)ە، بە شەش مانگان دەیبڕێ، بەڵام دوو هەفتە دوای خۆی، دوای ئەوەی کە سەفەر دەکات و بەچکەکانیشی تەمەنیان بۆتە سێ مانگ، ئنجا دوو هەفتە دوای سەفەرەکەی، بەچکەکانیشی هێلانەکەیان بەجێ دێڵن و هەمان سەفەر دەکەن! هەڵبەتە ئەو بەچکانە تا ئەو کاتە ئەمریکایان نەبینیوە، کەچی لە ئوستوڕالیاوە سەفەرێکی شەش مانگیی دەکەن و، ماوەی بیست و پێنج هەزار کیلۆمەتر (٢٥،٠٠٠کم) دەبڕن، بەبێ دەلیل، کە بێگومان و بەمسۆگەریی تێکڕای زانیارییەکانی ئەو سەفەرە و، زۆری دیکەش لەسەر ترشەلۆکی (DNA) ئەو پەڕەوورەدا تۆمار کراون، کە پێشکەوتووترین کەشتی ئاسمانیی و ڕۆکێتی دوور هاوێژ، لەو ئاستەدا نیە! ئاوا بە وردیی لەوێوە ئەو سەفەرە بکات، قۆناغ بە قۆناغ، چونکە هەر بە ئاسمانەوە

---

(١) کورك بوون: لەسەر هەڵنیشتن و مانەوەی باڵندەیە لەسەر هێلکەکانی، تاکو دەتڕووکێن و جووجکەکان دێنەدەرێ.

نابێ، شوێن هەیە لێی دەنیشێ، پشوویەك دەدا، ئەگەرنا مەعقووڵ نیە شەش (٦) مانگان بە ئاسمانەوە بێ، بەڵام ئەو باڵندەیە بەبێ ئەوەی کە هیچ کەس فێری کردبێ، بەو ڕێیە دوورەدا ئەو سەفەرە پڕ خەتەرە دەکات.

بە دڵنیایی ئەمە نموونەیەکە لەوە کە خوا دەفەرموێ:

﴿رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ۝٥٠﴾.

پەروەردگارمان ئەو زاتەیە بوونی بە هەموو شتێك داوە، دوایی ڕێنمایشی کردوە، ڕێی پێشان داوە.

هەڵبەتە شتی زۆر سەرسوڕهێنەری دیکەش هەیە لە ژیانی ژیانداراندا[1].

کەواتە: ڕاستە ئیلحاد زۆر لەگەڵ عەقڵ و لۆژیکدا دژو ناکۆکە و، هەر حەوت (٧) یاسا عەقڵییەکەی کە ناچارمان دەکەن خواناس بین، ئیلحاد و خوانەناسیی لەگەڵ هەر حەوتیاندا تێك دەگیرێ و دژو ناکۆکە.



---

(١) بڕوانە: (أصل الإنسان بين العلم والعقل)، کە خاوەنی: (البحث عن الحقيقة الكبرى) المهندس: عصام قصاب، لێی وەرگرتوە، ص٨٢.





## برگەی سێیەم: ناکۆکیی و تێکگیرانی ئلیحاد لەگەڵ زانستدا:

بەڕێـــزان!

هەتا زانست بەرەو پێش دەچێ و نهێنییەکانی خوا (سبحانه وتعالى) لە نەفسی مرۆڤ و لە ئاسۆیەکاندا ئاشکراتر دەبن، حەقێتیی ئیمان و قوڕئان زیاتر دەدرەوشێتەوە، وەك خوا (سبحانه وتعالى) لە سووڕەتی (فصلت)دا فەرموویەتی:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾.

واتە: لەمەودوا نیشانەکانی خۆمانیان لە ئاسۆیەکان و لە خودی خۆشیاندا، پێشان دەدەین، تاکو بۆیان دەربکەوێ کە هەقە، (دەگونجێ ڕاناوەکە بۆ خوا بچێتەوە و، دەشگونجێ ڕاناوەکە بۆ قوڕئان بچێتەوە)، ئایا بەس نیە بۆ پەروەردگارت کە چاودێرە بەسەر هەموو شتێکەوە، یان: کە چاودێر بێ بەسەر هەموو شتێکەوە و سەرپەرشتیاری هەموو شتێك بێ!

بەڵێ بێگومان هەموو شتێك هەتا زیاتر لە جەوهەرەکەی، لە چییەتەکەی حاڵی بین، زیاتر خاوەنەکەی دەناسین.

ئنجا جێی سەرنجە کە خوا (سبحانه وتعالى) نەیفەرموە: (سَنُرِيكُمْ)، بەڵکو فەرموویەتی: ( سَنُرِيهِمْ )، کە ئەمە - پێم وایە - ئاماژەیە بەوە کە نهێنییەکانی بوون، مەتەڵەکانی بوون، زیاتر لەلایەن نامسوڵمانانەوە کەشف دەبن:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾.

نیشانەکانی خۆمانیان پێشان دەدەین لە ئاسۆییەکانداو لە خودی خۆشیاندا، تاکو بۆیان دەربکەوێ کە خوا هەقە، یاخود بۆیان دەربکەوێ کە قوڕئان هەقە.

ئەو قورئانەی کە (١٤٥٣)[١] ساڵ لەمەوپێش دەستی بەدابەزین کردوە و، باسی زۆربەی ئەو نهێنییە مەزنانەی کردوە کە لە گەردووندا دەردەکەون: سەرەتای گەردوون چۆن بووە و چۆن دروست بووە؟ سەرەتای ژیان چۆن بووە و لە چییەوە هاتوە؟ مێژوو و ڕاستییەکانی مێژوو،...هتد، قورئانێك هەموو ئەو نهێنییانەی تێدابن، دیارە پەروەردگارێك ناردوویەتی کە ئاگاداری نهێنییەکانی گەردوونە، وەك خوا (سبحانه وتعالى) لە وەڵامی کافرەکاندا کە دەیانگوت:

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ ٱفْتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيْهِ قَوْمٌ ءَاخَرُونَ ۖ فَقَدْ جَآءُو ظُلْمًا وَزُورًا ﴿٤﴾ وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ٱكْتَتَبَهَا فَهِىَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٥﴾ ﴾ الفرقان.

واتە: کافرەکان گوتیان: ئەوە هەر درۆیەکە (موحەممەد) هەڵیبەستوە، (خوا دەفەرموێ:) قسەیەکی ستەمکارانە و درۆ دەکەن، هەندێکیشیان گوتیان: ئەوە ئەفسانەی پێشینانە نووسیویەتەوە، بەیانیان و ئێواران بەسەریدا خوێنراوەتەوە.

لە وەڵامیاندا خوای زانا و شارەزا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٦﴾ ﴾ الفرقان.

واتە: بڵێ ئەو کەسەی نهێنیی نێو ئاسمانەکان و زەمین دەزانێ، دایبەزاندوە، بە دڵنیاییی ئەو لێبوردەی بەبەزەییە.

لە حاڵێکدا کە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) نە خوێندنەوەی هەبووە، نە نووسینی هەبووە، وەك خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (العنكبوت)دا دەفەرموێ:

﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُواْ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾.

واتە: تۆ نە هیچ کتێبێکت پێش قورئان خوێندۆتەوە، {خوێندنەوە (قراءة)ت نەبووە} و بە دەستی ڕاستیشت هیچت نەنووسیوە، {واتە: نووسین (کتابة)یشت نەبووە}.

---

(١) چونکە: ئێستا ساڵی: (١٤٤٠ك + ١٣) ساڵی پێش کۆچکردن بۆ شاری مەدینە (= ١٤٥٣) ساڵ.

ئنجا ئایا بۆچی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم)، خوا وای ڕەخساند، کە خوێندنەوەو نووسینی نەبێ؟ خوا دەفەرموێ: ﴿إِذًا لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ﴾، چونکە ئەگەر خوێندنەوەو نووسینت هەبووایە، ئەو کاتە ئەوانەی لەسەر ناهەقن، بۆیان هەبوو بکەونە دوو دڵیی و گومانەوە، بەڵام تۆ کە خوێندنەوەت نەبێ و نووسینت نەبێ، چۆن دەگونجێ لە غەیری خۆتەوە، شت بنووسی و فێر بی؟

بۆیە خوا فەرموویەتی: ﴿قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ إِنَّهُ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٦﴾﴾ الفرقان.

واتە: بڵێ: ئەو کەسە قورئانی دابەزاندوە و ناردوویەتە خوار، کە نهێنیی نێو ئاسمانەکان و زەوی دەزانێ، بۆیەش قورئان نهێنیی ئاسمانەکان و زەوی گرتوونە نێو خۆی، بایی ئەوەندەی مرۆڤ حاڵی بێ، کە ئەو زاتەی ئەو نهێنییانەی خستوونە نێو ئەو قورئانەوە، بەدیهێنەرو پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە و، شارەزاو ئاگاداری هەموو مەتەڵ و نهێنییەکانی بوونە.

ئنجا لەبەر ئەوەی بیرۆکەی خوانەناسیی و ئیلحاد، بە سەختیی لەگەڵ زانست و دۆزراوەکانیدا، دژو ناکۆکە، بۆیە هەتا زانست بەرەو پێشەوە بچێ، ئیلحاد پاشەکشە دەکات، وەك مولحیدە سەرسەختەکان دان بەوەدا دێنن و دەڵێن:

بەڕاستیی کە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەردەکەوێ، ئەم گەردوونە: سیستماتیکە و دیزاینی بۆ کراوە، ڕێك و پێك کراوە، ئەوە ئیشکالێکی گەورەمان بۆ دروست دەکات و بەڵگەیەکی بەهێز کەرەستەیەکی باش دەخاتە دەستی خواناسانەوە، کە بیکەنە بەڵگە لە دژی ئێمە.

وەك دوای تۆزێکی دیکە، قسە و دانپێداهێنانی ژمارەیەك لەو زانایانە دەخەینە ڕوو.

بەڵێ لە ڕاستییدا: ئیلحاد لەگەڵ نەزانیی و بێ سەروبەرەیی و ناڕێك و پێکییدا تەبایە، بەڵام ئیمان لەگەڵ زانست و، لەگەڵ ڕێك و پێکیی و سیستمدارییدا تەبایە، بۆیە تاکو حاڵەتی سیستەماتیکیی و ڕێك و پێکیی و وردەکاریی گەردوون، باشتر دەربکەوێ، بەڵگەی زیاتر دەکەونە بەردەست، لەسەر بوونی ئەو خاوەن و بەدیهێنەرە و ئەو پەروەردگارەی، ئەم گەردوونەی بەم ڕێك و پێکییە دروستکردوە.

## قسەی چەند زانایەکی مولحید لە بارەی ڕێك و پێکیی و یاساداریی گەردوونەوە:

ئێستاش با قسەی چەند زانایەکی پسپۆڕی زانستە سروشتییەکان بێنینەوە، کە هەموویان فیزیازانی مولحید (فیکتۆر ستینگەر) هێناونی، کە کتێبی: (شموع النهار)[1]، لێی خواستوونەوە لە کتێبەکەی خۆیەوە، کە بە زمانێکی ئەورووپایی نووسراوە، ئەو قسەیەش هی ویە کە دەڵێ: کە هەتا زیاتر زانست بەرەو پێشەوە بچێ، کەرەستەی زیاتر دەکەوێتە بەردەستی خواناسان، بۆ ئیسپاتی دەعوای خۆیان کە: ئەم گەردوونە بە دیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنێکی هەیە، کە خوایە (سبحانه وتعالی):

١- **(فرانسیس کۆڵنز)**، کە پسپۆڕە لە زانیاری بۆماوەیی (علم الوراثة)داو سەرۆکی پرۆژەی دەرخستنی جینۆمی بەشەرییە، دەڵێ:

ئەو کۆنترۆڵە وردەی کە بۆ نەگۆڕەکان و یاسا فیزیاییەکان کراوە، تاکو ژیانێکی هۆشیارانە پەیدا بێ، ئەمە ناگەڕێتەوە بۆ ڕێکەوت، بەڵکو بە پێچەوانەوە: شایەد و بەڵگەیە بۆ کاری کەسێك، کە هەر لە سەرەتاوە، ئەم گەردوونەی بە ڕێك و پێکیی دروستکردوە.

٢- **(مایکل ئەنثونی کوریی)** کە پزیشکێکی ناودارە، دەڵێ:

ئەو ئەندازە سەرسووڕهێنەرە هاوسەنگ و پێوراوە وردەی، کە لە پێکهێنەرە بنەڕەتییەکانی ئەم گەردوونەدا دەبینرێ، کە لە دوای تەقینەوەی گەورە (big bang) پەیدا بووە، هەتا ڕاددەی موعجیزە، ئەو ئەندازیارییە وردەکارییە دەردەخات، کە لە گەردووندا هەیە و، هەرگیز ناگونجێ ئەوە پەیدا ببێ، لە حاڵێکدا کە دیزاینکەرێکی خاوەنی ئەو پەڕی توانای ماتماتیکیی و زانیاریی نەبێ.

---

(١) شموع النهار، ص٢١٣ - ٢١٤.

واتە: بەبێ بوونی خوا (سبحانه وتعالی) ناتوانی ئەو هەموو وردەکارییەی لە گەردووندا هەیە، تەفسیر بکەی.

٣- **(جۆرج جریستین)**، کە زانایەکی گەردووونناسە، دەڵێ:

کاتێك ئێمە لە بەڵگەکان ورد دەبینەوە، هەبوونی زاتێکی بەرز خۆی پێویست دەکات، ئایا دەگونجا بە شێوەیەکی کت و پڕو بەبێ ویستن، ئێمە بکەوینە سەر ئەو بەڵگە زانستییانەی کە ناچارمان دەکەن دان بە زاتێکی بەرزدا بێنین؟! (کە مەبەستی پێ خوایە)، ئایا ئەو زاتە ئەو خوایە نیە کە ئەو بەڵگانەی خستوونە بەردەستی ئێمە و، گەردوونی بەو شێوەیە لە بەرژەوەندیی ئێمەدا دروست کردوە؟!

لە وەڵامدا دەبێ بڵێین: با.

٤- **(تۆنی ڕۆثمان)** زانای فیزیای تیۆریی، قسەیەکی جوان دەکات، دەڵێ:

زانای لاهووتیی (واتە: خواناس)، لە سەدەکانی نێوەڕاستدا، تەماشای ئاسمانی دەکرد لە شەوی تاریکدا، لە میانی چاوەکانی ئەرستۆوە تەماشای ئاسمانی دەکرد و، بە چاوی عەقڵ و دڵ فریشتەکانی دەبینین، کە خڕۆکەکانیان بە شێوەیەکی هاو ئاواز دەجووڵاند، بەڵام ئێستا لە جێی ئەو زانا لاهووتییە، (لە جێی ئەو زانا خواناسە)، زانای گەردووونناس هەر تەماشای هەمان ئاسمان دەکات، بەڵام لە میانی چاوەکانی (ئاینشتاین)ەوە، دەستی خوا دەبینێ، نەك بەهۆی فریشتەکانەوە، بەڵکو بە هۆی نەگۆڕە سروشتییەکانەوە.

ئێمە کە جوانیی گەردوون دەبینین، ئەوە هاندەرمان دەبێ کە بازێکی ئیمانیی بدەین لە زانستەوە بۆ ئایین.

واتە: زانست ناچارمان دەکات: ئایینمان هەبێ و، ناچارمان دەکات دان بە بوونی خوادا بێنین و خوا بناسین.

هەڵبەتە ئەم قسەیەی وی، لێشی وەرناگیرێ کە بەگوێرەی تێڕوانینی زانستیی نکووڵیی لە بوونی فریشتەکان بکرێ، چونکە لە ڕاستییدا ئەوەی

کە ئێمە بە هەستەکانمان پەی پێ دەبەین، هەمووی سیستماتیکە و، هیچ شتێکی سروشتیی نیە، یاسایەکی سروشتیی و هۆکارێکی سروشتیی نەبێ، ئەگەر باران و بەفرو تەرزەن، دەبارن، ئەگەر هەورە تریشقەیە چەخماخە دەکات، ئەگەر بایە کە هەڵدەکا، ئەگەر خۆر و مانگن دەگیرێن، هەموو ئەوانە هۆکاری سروشتییان هەیە، بەڵام ئەمە لەگەڵ ئەوەدا تێك ناگیرێ، کە لەو دیو ئەو هۆکارە سروشتییانەوە، هۆکاری ناسروشتییش هەبن و، کاریگەرییشیان هەبێ لەسەر ئەو هۆکارە سروشتییانە، کە فریشتەکانن و خوای پەروەردگار باسی کردوون، وەك لە هەندێ لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە، بۆ وێنە: باسی (میکائیل) دەکرێ کە ئەو سەرپەرشتیی دابارینی ئاو بۆ سەر زەویی دەکات[1]، یان باسی فریشتەکانی دیکە دەکرێ، بەڵام بێگومان زانست کە بە چراو شەداوی خۆی و لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە، زانیارییە بچووکەکان، یان زانراوە بچووکەکان (المعلومات الجزئية) کۆ دەکاتەوە، هەر سەروکاری لەگەڵ ماددەو ئەو شتانەدا هەیە، کە دەکەونە بەر چراو شەداوی پێنج هەستەکان.

٥- **(ئیدوار ڕوبەرت هاریسۆن)**، زانایەکی گەردووونناسە، ئەویش دەڵێ:

ئا ئەوە بەڵگەی گەردوونییە لەسەر بوونی خوا، کە بریتیە لە بەڵگەی دیزاین (دليل التصميم)، واتە: ڕێك و پێکیی، کە زانای ناودار (بیلی) لە وێنەیەکی تازە کراوەدا پێشکەشی کردوە، کە بریتیە لە کۆنترۆڵکردنی زۆر وردی گەردوون، کە ئەمە بەڵگەیەکی ئاشکرا، لەسەر بوونی پەروەردگارێکی دیزاینکەرو ڕێك و پێککەر و یاسا دانەر، پێشکەش دەکات.

-----------------------------

(١) {قال اليهود للنبي (صلى الله عليه وسلم): إنه ليس نبي من الأنبياء إلا يأتيه ملك من الملائكة من عند ربه بالرسالة وبالوحي، فمن صاحبك حتى نتبعك؟ قال: جبريل، قالوا: ذالك الذي ينزل بالحرب وبالقتال، ذالك عدونا، لوقلت: ميكائيل الذي ينزل بالقطر وبالرحمة لتابعناك}، أخرجه أحمد (٢٧٤/١)، والنسائي في الكبرى: ٩٠٧٢، والطبراني: (٤٥/١٢) من حديث ابن عباس رضي الله عنهما.

تۆ ئێستا سەر پشك بە: یان ڕێکەوتێکی کوێر(صدفة عمیاء) هەڵبژێرە، کە پێویستیی بە ژمارەیەکی زۆر لە گەردوونەکان (أکوان) دەکات، یاخود: یەك بەدیهێنەرو ڕێکخەرو دیزاینکار، بۆ گەردوون.

هەڵبەتە ڕێکەوتی کوێر هیچ مەدارێکی بە گەردوونە زۆرەکان (الأکوان المتعدِّدة) ساز نابێ، وەك دوایی باسی دەکەین، کە ئەوە - بیردۆزەی گەردوونە زۆرەکان - قسەیەکە (ستیفن هۆکینگ) کردوویەتی و (ستیفن هۆکینگ) خۆی یەکێکە لەوانەی دان دەنێن بە هەبوونی ئەو پەڕی وردەکاریی و ڕێك و پێکیی لە گەردووندا، کە لە کتێبی: (دیزاینی مەزن - التصمیم العظیم - the Grand Desing)دا[1]، دەڵێ: کاتێك ئەو هەموو ڕێك و پێکییە دەبینین، ئێمە ناچارین، یان بڵێین: دیزاینکارێکی مەزن لە پشت ئەوەوەیە، یاخود ناچارین پەنا بەرینە بەر گەردوونە زۆرەکان (الأکوان المتعددة).

**دەڵێین:** لە ڕاستییدا پەنا بردنە بەر گەردوونە زۆرەکان، بریتی نیە لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە ئەم ڕێك و پێکییە لەم گەردوونەدا چۆن پەیدا بووە؟ بەڵکو ئەوە بە کوردیی پێی دەڵێن: (حەواڵە بە گەواڵە)[2]، تۆ جارێ چۆنیەتی پەیدابوونی ئەم گەردوونەم، بۆ لێك بدەوە، ئەمە چۆن پەیدا بوو؟ ئەو دەڵێ: ئەم گەردوونە یەکێکە لە تریلیۆنان گەردوون، دەڵێین: چۆنت زانی ئەو هەموو گەردوونانە هەن؟! چونکە بەپێی زانستی فیزیای تازە، تیرەی گەردوون، ئەو پەڕەکەی، سێزدە تا پازدە ملیار (١٣،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠ - ١٥،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) ساڵ تیشکیی دوورە، واتە: ئەو تیشکەی لەو پەڕی گەردوونەوە دێ و ئێستا دەگاتە ئێمە، پازدە ملیار ساڵە بەڕێوەیە[3]!.

کەواتە: تۆ ئەوپەڕی گەردوونت چۆن بینی؟! چونکە ئەو گەردوونە زۆرە گریمانەییانە (الأکوان الکثیرة المفترضة) تاکو تیشکەکەیان نەگاتە تۆ، هەر ناتوانی بزانی کە هەن! بۆیە ئەو قسەیە جگە لە بەگۆترە دانان، هیچ شتێکی

---

(١) ص١٩٨.

(٢) گەواڵە هەور: هەورێکی تەنیا، هەورێکی جوولاو.

(٣) الکون بین العلم والقرآن، ص٥٣.

دیکە نیە و، جگە لە ڕاکردن لە دانهێنان بە بوونی خوادا (سبحانه وتعالی) هیچ شتێکی دیکە نیە و، ئەوە تەنیا گاڵتە کردنە بە وشە.

چونکە بەڕاستیی زۆر شتێکی نامەنتیقییە کەسێك بڕوای بە: دیزاینی مەزن (التصميم العظيم) هەبێ، کە ئەوە ناوی کتێبێکی (ستیفن هۆکینگ)ە: (the grand desinge) کەچی نکوولّیی بکات لە دیزاینەر(مُصَمِّم)ی ئەو دیزاینە مەزنە؟!

چونکە: (دیزاینی مەزن) یانی: (ڕێك و پێکیی و سیستمکاریی گەورە)، بەڵێ بەڕاستیی سەیرە: بڕوات بە دیزاین و سیستم هەبێ، کەچی دان نەهێنی بە دیزاینکار و ڕێکخەر و سیستمکاریی مەزندا، کە خوایە (سبحانه وتعالی).

چونکە (طبيعة) دەبێ کەسێك (طبع)ی کردبێ، (طبيعة) (فعيلة)یە بە مانای (مفعولة)، وەك (غرفة مضيئة) ژوورێکی ڕووناك، (مضيئة) لەسەر کێشی (فعيلة)یە، بەڵام بە مانای (مفعولة)یە، واتە: ڕووناککراوە، ژوورەکە هیچ ڕووناك ناکاتەوە، بەڵکو ژوورەکە ڕووناك کراوەتەوە، (طبيعة)ش (فعيلة)ی بە مانای (مفعولة)یە، کەواتە: (طبيعة) یانی: طەبع کراو، سروشتێنراو، ئنجا ئایا کێ تەبعی کردوە؟! هەر تەبع کراوێك دەبێ تابیعێکی هەبێ، هەر سروشتێنراوێك، دەبێ سروشتێنەرێکی هەبێ، هەر دیزاینکراوێك، دەبێ دیزاینکەرێکی هەبێ، هەر ڕێك و پێکییەك، دەبێ ڕێکخەرێکی هەبێ!

**شایانی باسە:** (ستیفن هۆکینگ) یەکێ لەو زانایانەیە کە جار جار سەری بۆ ئیلحاد دەخورێ، بەڵام جار جاریش باسی خوا (سبحانه وتعالی) دەکات، زانیارییەکەی ناچاری دەکات، بەڵام کە ڕۆیشت نازانین داخۆ بە چ حاڵەتێکەوە ڕۆیشت! بە خوانەناسیی ڕۆیشت، یان بە خواناسیی؟! بەڵێ بەڕاستیی جێی سەرسووڕمانە: بڕوات بەوە بێ کە ئەم گەردوونە ئەو پەڕی وردەکاریی و دیزاینکاریی و ڕێك و پێکیی تێدایە، کەچی داننەهێنی بەو زاتەدا کە ڕێکی خستوە، دیزاینی بۆ داناوە، یاسا و سیستمی بۆ داناوە؟!

کەواتە: ڕوونبۆوە و سەلمێنرا کە بەڕاستیی خوانەناسیی و ئیلحاد، لەگەڵ زانست و بەرهەمی زانستدا، ناکۆك و ناتەباو دژە.





## بڕگەی چوارەم: ناکۆکیی و تێکگیرانی ئیلحاد لەگەڵ وەحیی دا:

ئەم بڕگەیەش لە سێ خاڵی کورت دا، شی دەکەینەوە:

١)- پێکەوە دژ و ناکۆك بوونی خوا نەناسیی (إلحاد) و وەحیی، شتێکی ئاشکرایە، چونکە وەحیی پەیامی خواو بانگکردنی خوایە بۆ مرۆڤ، بەڵام خوانەناسیی و ئیلحاد، نکووڵیی کردنە لەوەی مرۆڤ و گەردوون، خاوەنێکیان هەبێ، چ جای ئەو خاوەنەی مرۆڤ و گەردوون، بانگیان بکا و پەیامیان بۆ بنێرێ و، ڕێنماییان بکات و ئامۆژگارییان بکاو بڵێ: وا بکەن و وا مەکەن.

کەواتە: ئیلحادو خوانەناسیی لەگەڵ وەحیی خواو، لەگەڵ پەیامی خوادا، ڕێك تێکدەگیرێ، بەڵام لێرەدا پێوستە ئاگادار بین، وەك پێشتر باسمان کرد و لە باسی یەکەمی ئەم بەشی سێیەمەدا، (سەرگوزشتەی سەرهەڵدانی ئیلحادو خوانەناسیی لە ئەورووپاو ڕۆژئاوادا)، باسمان کرد کە بۆچی ئەو خەڵکە بێزار بوون لە وەحیی و لە دین؟! باسمان کرد: ئەو دینە چی لێ کرابوو! چۆن دەستکاریی کرابوو! چۆن شێوێنرابوو! چۆن پڕکرابوو لە ئەفسانە! چۆن لە دژی بەرژەوەندییەکانی خەڵك بوو! چۆن لەگەڵ عەقڵدا تێك دەگیرا! چۆن لەگەڵ زانستدا تێك دەگیرا! چۆن بوو بوو بە کۆسپ و لەمپەرێك لەبەردەم بەرەو پێش چوونی ژیاندا!

کەواتە: دەبێ بزانین کە ئەو وەحییەی خەڵکی ڕۆژئاوا لەگەڵی ناکۆك و دژ بوون، جیایە لەو وەحییەی کە لە بەردەستی ئێمەدا هەیە، کە بە داخەوە زۆرێك لە لائیك و سیکولاریستەکانی ئێمە (قیاسی کەشکێ لە مەشکێ دەکەن) و دەڵێن: ئەوە نیە ئەورووپا وازی لە ئایینەکەی خۆی هێنا!

کە بیگومان ئەو ئایینەی ئەوان لەگەڵ ئەو ئایینەی ئێمە، هەر خوایان یەکە، ئەوەی ئەوان دژی عەقڵ، دژی زانست، دژی بەرەو پێش چوون، دژی







بەرژەوەندیی خەڵك، ئنجا لەگەڵ نەزانیی، لەگەڵ ئەفسانە، لەگەڵ هێشتنەوەی کۆمەڵگا وەك خۆی و، ڕێگرتن لەبەرەو پێش چوونی بوو.

بەڵام ئیسلامی ئێمە، بە پێچەوانەی هەموو ئەوانەوەیە، وەك دوایی باسی دەکەین.

٢)- پێویستە ئەوە بزانرێ: ئەو وەحیی و پەیامەی خوا، کە ئێستا بە ساغ و سەلامەتیی لە بەردەستی مرۆڤدا ماوەتەوە و پابەندکەر (مُلْزِم)ە، بۆ مرۆڤ، تەنیا وەحیی خوای بەرجەستەیە لە قورئاندا بە پلەی یەکەم، دواتریش لە ڕێبازی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، کە بێگومان ڕێبازی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) جگە لە بەرجەستە کردنی قورئان لەسەر ئەرزی واقیع و لە ژیانی کردەیی: تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)، شتێکی دیکەی جیاواز نیە.

ئنجا لەبەر ئەوەی ئێمە لە باسی سێیەمی ئەم بەشی سێیەمەدا، خوا پشتیوان بێ، بە وردیی لەو بارەوە قسە دەکەین، لە بارەی ئەو تاکە وەحییە ساغ و سەلامەت و دەستکاریی نەکراوەی خواوە، کە قورئانە و ڕێبازی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، لێرە لەوە زیاتر لەسەری ناڕۆین.

٣)- شایانی گوتنە کە: تێکگیرانی ئیلحاد لەگەڵ وەحییدا، هاوکات تێکگیران و دژ وەستانیشە لەگەڵ هەر کام لە فیطرەت و عەقڵ و زانستیشدا، چونکە وەحیی خوا، کە قورئانەو ڕێبازی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، هەر کام لە زگماك و عەقڵ و زانستیش، پێکەوە کۆدەکاتەوە و پێکەوەیان ڕیز دەکات.

کەواتە: خوا نەناسیی و ئیلحاد، کاتێك لەگەڵ وەحیی دەستکاریی نەکراوی خوا، وەحیی ساغ و سەلامەتی خوادا، کە قورئان و سوننەتە، دژ دەوەستێ، هاو کات لەگەڵ عەقڵیشدا دژ دەوەستێ و لەگەڵ زگماکیشدا و لەگەڵ زانستیشدا دژ دەوەستێ، چونکە وەحیی ڕاست و ساغ و نەشێوێنراوی خوا عزوجل، هەر کام لەو سێیانەش لە بن باڵی خۆی دەگرێ و هاوکار و پشتگیریانە.





## باسی سێیەم



# بیانووە پووچەڵەکانی ئیلحاد

بەڕێـــــزان!

ئەم باسی سێیەمەمان زۆربەی پانتایی ئەم بەشی سێیەمە دەگرێتەوە، ئەم باسەمان لە دە (١٠) بڕگەدا پێشکەش دەکەین، چونکە زۆرێك لە کتێبەکانی مولحیدەکانم خوێندنەوە، هی خۆماڵیی کە زۆر کەمن، چونکە خۆماڵییەکان وەك تووتی هەر قسەی مولحیدە بیانییەکان دووبارە دەکەنەوە، ئنجا هی بیانییەکان، هی ڕۆژهەڵات، هی ڕۆژئاوا، هی کۆن، هی تازە، چونکە وەك پێشتر ئاماژەم پێدا: چەند مانگێك زۆر بە خەست و خۆڵیی سەرگەرمی تێفکرین و موتاڵا بووم لە بارەی خواناسیی و ئیلحادەوە، جگە لەوەی کە پێشتر لە زەینمدا هەبوو، لە ئەنجامی موتاڵاو خوێندنەوەی زۆرم بۆ کتێبە فەلسەفیی و فیکریی و مێژووییەکان و، ئەو کتێبانەی کە لە بارەی ڕەوتی فیکریی بەشەرەوە دەدوێن، لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای دنیادا.

ئنجا دوای لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی زۆرو تەماشا کردنی کتێب و بەرهەمی زۆرێك لە مولحیدەکان، ئەوەی کە کەوتۆتە بەردەستم بە تەرجەمە کراویی، بە عەرەبیی و بە فارسیی، بە کوردیی، یاخود ئەوەی کە کوڕەکانم ڕاستەوخۆ لەسەر ئەنتەرنێت بۆیان تەرجەمە کردووم، سەرەنجام: ئەم دە (١٠) بیانووەم کەوتوونە





بەرچاو، کە ناوم لێناون: (بیانووە پووچەڵەکانی ئیلحاد)، کە مولحیدەکان پەنایان پێ دەبەن، بۆ نکوولّیی کردن لە بوونی خوا (سبحانه وتعالی):

**بیانووی یەکەم:** بەرهەست (محسوس) نەبوونی خوا (سبحانه وتعالی)، کە بە پێنج هەستەکان دەرك ناکرێ.

**بیانووی دووەم:** هەبوونی نارێك و پێکیی لە گەردووندا.

**بیانووی سێیەم:** هەبوونی شەڕو خراپە لە ژیانی مرۆڤدا.

**بیانووی چوارەم:** مادام گەردوون یاسادار (منظم) و سیستماتیك و ڕێك و پێکە، پێویستیی بە بەدیهێنەر نیە.

**بیانووی پێنجەم:** گەردوون یان ماددە هەر بوو (أَزلي)ەو، پەکی لەسەر بەدیهێنەر نەکەوتوە.

**بیانووی شەشەم:** گەردوون بە ڕێکەوت پەیدا بووە.

**بیانووی حەوتەم:** ئەگەر هەموو شتێك خوا دروستیکردوە، ئەدی خوا کێ دروستیکردوە؟

**بیانووی هەشتەم:** مرۆڤ لە ئەنجامی پەرەسەندن و گەشەسەندنی ژیاندارانەوە دروست بووە و پێویستیی بە خوا نیە.

**بیانووی نۆیەم:** خوا چ پێویستییەکی بە بەندایەتیی مرۆڤەکان هەیە، کە داوای لێکردوون بیپەرستن؟

**بیانووی دەیەم:** گریمان خوامان ناسی، کوا ئایینەکەی؟ شوێن کام ئایین بکەوین؟

ئێستاش یەك لە دوای یەك، پووچەڵیی (زَیف)ی هەر کام لەو دە(١٠) بیانووە، دەخەینەڕوو:

## بیانووی یەکەم: بەرهەست نەبوونی خوا (سبحانه وتعالی):

سەرەتا دەڵێین: لەڕاستییدا بە بیانووی بەرهەست نەبوون (عدم محسوسیة)ی خوا (سبحانه وتعالی)وە، بڕوا نەهێنان بە خوا، بیانوویەکی پووچەڵە، بۆیەش ناوم لە هەموو ئەو دە (١٠)یانە ناوە: پاساوو بیانوو.

ئنجا با سەرنج بدەین: بۆچی لەبەر بەرهەست نەبوونی خوا، داننەهێنان بە بوونی دا، بیانوویەکی پووچەڵە؟ من لە حەوت (٧) بڕگەدا ئەو وەڵامە دەخەمە ڕوو:

**یەکەم:** مادام زگماك (فطرة) و عەقڵ و زانست و وەحیی، بەڵگەو شایەدی بوونی خوا بن، وەك لە بەشی دووەمدا بە درێژیی باسمان کرد، شتێکی بێ جێیە، بە بیانووی بەرهەست نەبوونی خواوە، دانی پێدا نەهێنرێ، چونکە ئەو کاتە مانای وایە، حوکم و بڕیاری هەر کام لە: زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی، ڕەتکراوەتەوە.

**دووەم:** بەرهەست نەبوونی شتێك، بەڵگەی نەبوونی نیە، ئەگەرنا دەبوو هیچ کەس بڕوای بە زۆرێك لە دروستکراوە نابەرهەستەکان نەبێت، وەك: ڕووح، هۆش (وعي)، سۆز (عاطفة)، هێزی کێشندە، هێزی موگناتیسیی، تیشکی ژێر سوور، تیشکی سەرووی وەنەوشەیی و جۆرە تیشکەکانی دیکە، کە نابینرێن، وەك: تیشکی سینیی و تیشکی گاما، هەروەها بەها بەرزەکانی وەك: دادگەریی، ئازادیی، یەکسانیی، چاکیی، دڵسۆزیی، جوانیی، هیچ کام لەمانە نابینرێن، ئنجا ئەگەر لەبەر بەرهەست نەبوون، بڕوا بە خوا نەهێنین (سبحانه وتعالی)، دەبێ بڕوا بە هەموو ئەو شتانەش نەهێنین، لەبەر هەمان هۆکار، بەڵام هەر کەسێ بڕوا بەو شتانە نەهێنێ، دەیبەنە شێتخانە، چونکە شوێنەواریان هەیە، ئنجا خواش (سبحانه وتعالی) ئەو هەموو شوێنەوارانەی هەن، کە بەشێك لە شوێنەوارەکانی خوا، ئەو شتانەن کە باسمان کردن: ڕووح و هۆش و عاتیفەو

هێزی ڕاکێشان و هێزی موگناتیسیی و تیشکەکان و، ئەو بەها بەرزانەی کە خوا لە زاتی مرۆڤدا دایناون.

**سێیەم:** ئێستا زانیاری فیزیا دەری خستوە، کە پێکهاتە سەرەکییەکانی ماددە، هیچ کامیان بەرهەست نین، واتە: نەك هەر تەنۆلکەکانی وەك کوارکەکان (kuarks)، بەڵکو گەردیلەکان، تەنانەت بەشۆکەکان (جزیئات - Molecules)یش ئەوانیش هەر بەرهەست نین، کە دیارە تەنۆلکەکانی وەك: کوارکەکان، پرۆتۆن و نیۆترۆن پێك دێنن و، ئەلیکترۆنیش لە سورگەکەدا دەخولێتەوە، ئنجا ئەوانە بە هەموویان گەردیلە پێك دێنن: (نیۆك و ئەلیکترۆن)، ئنجا بە چەند گەردیلەیەك، مۆڵکۆلێك پێك دێنن و، مۆلکۆلەکانیش تەنی لە خۆیان گەورەتر پێك دێنن، کە ئەوانە هیچیان بەرهەست نین، نە دەبینرێن، نە دەبیسترێن، نە تام دەکرێن، نە بۆن دەکرێن، نە دەست لێ دەدرێن.

**چوارەم:** پێنج هەستەکانی مرۆڤ: (دیتن، بیستن، تامکردن، بۆنکردن، دەستلێکوتان) هەموویان سنووردارن، هەروەها عەقڵیش هەر سنوورداره و، مرۆڤ بۆ خۆشی بە جەستەو ڕووحەوە، هەر سنوورداره، بۆ نموونە باسەرنج بدەینە بیستن و دیتن:

١) **(بیستن):** زانایان دەڵێن: لە بیست (٢٠) لەرینەوە (ذبذبة)، (هرتز - Hertz)ەوە، تاکو بیست هەزار (٢٠،٠٠٠)، گوێ توانای بیستنی هەیە، نە کەمتر لە بیست (٢٠) هرتز، دەبیستێ - هەندێکیش دەڵێن: شازدە (١٦) - نە زیاتر لە بیست هەزار (٢٠٠٠٠) لەرینەوەش دەبیستێ.

٢) **(دیتن):** ئێمە حەوت (٧) جۆرە تیشکمان هەن، بە شێوەیەکی سەرەکیی، ئەگەرنا دەگونجێ بۆ زۆر جۆر دابەش بکرێن:

١- **جۆری یەکەم:** لە ڕووی کورتیی شەپۆلەکانیانەوە، کورتترین شەپۆلی تیشك، شەپۆلی گاما (Gamma)یە، کە درێژیی شەپۆلەکەی یەك لەسەر سەد (١/١٠٠)ی نانۆمەترێکە، نانۆمەترێکیش یەکسانە بە بەشێك لە یەك ملیار (١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠) بەشی مەترێك، یانی: مەترێك بکەیە یەك ملیار بەش، یەك بەشی پێی دەگوترێ: نانۆمەتر، ئنجا درێژیی تیشکی گاما، یەك لەسەر

سەد (١٠٠/١)ی نانۆمەترێکە، تیشکی (گاما)ش بەکاردەهێنرێ بۆ کوشتنی خانە شێرپەنجەییەکان.

٢- **جۆری دووەم:** تیشکی سینیی (X-Ray) کە درێژیی شەپۆلەکەی بریتیە لە یەك نانۆمەتر و، ئەویش بۆ مەبەستی پزیشکیی بەکاردەهێنرێ، بۆ وێنەگرتنی تیشکیی.

٣- **جۆری سێیەم:** تیشکی سەرووی وەنەوشەیی (altraviolet)، کە درێژیی شەپۆلەکەی دەوری سەد (١٠٠) نانۆمەترە و، لە تەقینەوەکانی نێو ئەستێرەکانەوە پەیدا دەبێ و، تیشکی سەرووی وەنەوشەیی، بکوژ و زیان بەخشە.

٤- **جۆری چوارەم:** تیشکی بینراو (Visible light)، کە شەپۆلی جیا جیای هەن و شەپۆلەکانی لە چوار سەد تاکو حەوت سەد (٤٠٠ - ٧٠٠) نانۆمەتر درێژ دەبن، واتە: هەر حەوت جۆرە ڕەنگەکان، وەختێك تیشك دەشکێنرێتەوە، دەردەکەون و لە کۆلکە زێڕینەشدا دەردەکەون: سپی و زەرد و پرتەقاڵیی و سوور و وەنەوشەیی و سەوزو شین.

٥- **جۆری پێنجەم:** تیشکی ژێر سوور (تحت الحمراء)، (Infrared)، کە درێژییەکەی دەوری یەك لەسەر سەد (١٠٠/١)ی میللی مەترێکە و، بۆ دیاریی کردنی ئامانج بەکاردێنرێ، زیاتر دەخرێتە سەر چەك، بۆ ئەوەی بە تایبەت لە شەواندا ئامانجی پێ دیاریی بکرێ.

٦- **جۆری شەشەم:** بریتیە لەو تیشکەی کە شەپۆلەکانیان کورتن و پێی دەگوترێ: (مایکروف) (shortwave radiatioa)، کە بۆ مەبەستی پەیوەندیی و گەیاندن بەکاردەهێنرێن بە تایبەتی مۆبایل.

٧- **جۆری حەوتەم:** تیشکی شەپۆلی ڕادیۆیی (Radio waves)، کە درێژییەکەی لە مەترێکەوە تاکو کیلۆمەترێکەو، بەڵکو زیاتر لە کیلۆمەترێکیش دەڕوا، ئەویش لە ئەستێرەکانەوە دەردەچێ و، بۆ مەبەستی پەیوەندیی لاسلکیی بەکاردەهێنرێ.




وێنەی (٤٦) حەوت جۆرەکەی تیشـک

کەواتە: تیشك لە یەك لەسەر سەد (١/١٠٠)ی نانۆمەترێکەوە، تاکو کیلۆمەترێك و، زیاتر لە کیلۆمەترێك شەپۆلەکانی درێژن.

ئنجا وەك گوتمان: کیلۆمەترێك دەکاتە هەزار ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) نانۆمەتر، واتە: یەك تریلیۆن نانۆمەتر.

ئنجا لەم پەیژەیەدا تیشکی بینراو، بە هەر حەوت ڕەنگەکەیەوە، دەکەوێتە نێوان: چوار سەد تا حەوتسەد (٤٠٠ - ٧٠٠) نانۆمەتر، واتە: ئێمە لە مەودای سێ سەد (٣٠٠) نانۆمەتردا ئەو حەوت تیشکانە دەبینین، ئنجا ئەو سێ سەد (٣٠٠) نانۆمەترە، لە یەك تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) نانۆمەتر، لە یەك لەسەر سەدی (١/١٠٠)ی نانۆمەترێك تاکو یەك تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) نانۆمەتر، دەکاتە چەند؟!! واتە ڕێژەی ئەو سێ سەد نانۆمەترە لە چوار سەد تا حەوت سەد (٤٠٠ - ٧٠٠) کە چاو دەتوانێ ئەوەندە ببینێ، کە هەر حەوت تیشکەکانن، ڕێژەکەی چەندە لە چاو ئەو تیشکەی کە نابینرێ؟!! ڕێژەکەی بریتیە لە یەك لەسەر سی ملیار (١/٣٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠)، یانی: ئێمە لە سی ملیار (٣٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) بەشی تیشك، یەك بەشی دەبینین، یانی: سی ملیار

(٣٠٠٠٠٠٠٠٠٠) هێندەی ئەوەی کە ئێمە دەیبینین، نایبینین، بۆیەش خوا (سبحانه وتعالى ) دەفەرموێ:

﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ الحاقة.

واتە: نەخێر وانیە (وەك ئێوە دەڵێن، ئەی کافرەکان!) سوێند دەخۆم بەوەی کە دەیبینن و، بەوەش کە نایبینن.

هەندێك کەس وای تەفسیر دەکەن: ﴿ فَلَآ أُقْسِمُ ﴾، سوێند ناخۆم! بەڵام ئەو مانا لێکدانەوەیە ڕاست نیە، چونکە: هەموو سوێندەکانی قورئان هەروان، بۆ نموونە:

﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ ﴾ الواقعة.

واتە: وانیە وەك ئێوە دەڵێن، سوێند دەخۆم بەڕێ و بانی، ڕێ و شوێنی، ئەستێرەکان.

﴿ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ ﴾ الواقعة.

ئەگەر بزانن، ئەوە سوێندێکی مەزنە، ئنجا خوا بفەرموێ: سوێندێکی مەزنە، کەواتە: سوێندەکەی خواردوە!!

یان کە دەفەرموێ: ﴿ لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ﴿١﴾ ﴾ البلد.

نەخێر (ڕاست نیە وەك ئێوە دەڵێن)، سوێند دەخۆم بەم وڵاتە.

کە مەبەست پێی سەرزەمینی مەککەیە، بێگومان خوای کارزان سوێندی پێخواردوە.

کەواتە: چاوی مرۆڤ لەو تیشکانەی کە هەن، تەنیا یەك لەسەر سی ملیاری (١/٣٠٠٠٠٠٠٠٠٠)یان دەبینێ، کەواتە: هێزی چاو و بینینی مرۆڤ سنووردارە[1].

---

(١) بڕوانە: (إنك على الحق المبين)، ص١٣٣-١٣٤، محسن حسين عبدالله العواجي. ئنجا ئەگەر چاو لە بەرانبەر دیتنی دروستکراوەکاندا ئاوا سنووردار و دەستە پاچە بێ، چۆن لە بەرانبەر دیتنی خوای بەدیهێنەری بەرز و بێ وێنەدا، دەستە پاچە نابێ؟!

**پێنجەم:** خوا (سبحانە وتعالی) بەدیهێنەرە و لە بەدیهێنراوەکانی جیایە، بێگومان (خالق) لە (مخلوق) جیایە، لە هەموو ڕوویەکەوە، وەك خوا (سبحانە وتعالی) دەفەرموێ:

﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١﴾ الشورى.

واتە: هیچ شتێك وەك وێنەی خوا نیە و، خوا بیسەری بینەرە.

ئنجا کە خوا (سبحانە وتعالی) جیایە لە دروستکراوەکانی، ئەوەتا ئێمە: دەتوانین تەنیا یەك لەسەر سی ملیاری (١/٣٠٠٠٠٠٠٠٠٠)ی تیشك ببینین، یانی: بەشێك لە سی ملیاری (٣٠٠٠٠٠٠٠٠٠) بەشی تیشك، کە یەکێکە لە دروستکراوەکانی خوا، هەروەها هێزی کێشندە هەر نابینین، دیسان گەردیلەو ئەوەی لە نێو گەردیلەشدا هەیە، بەڵکو لە گەردیلەش گەورەتر کە گەرد (جُزيء)ە، ئەوەش نابینین، هەروەها ڕووح نابینین، عاتیفە نابینین، بەهایەکان نابینین، بە هەمان شێوە: خواش (سبحانە وتعالی) نابینین.

ئێمە ناتوانین بەشێك لە دروستکراوەکانی خوا ببینین، بەڵکو زۆربەی دروستکراوەکانی خوا (سبحانە وتعالی) نابینین، ئەدی چۆن دەبێ تەماعی ئەوەمان هەبێ: بەدیهێنەری دروستکراوەکان ببینین؟!.

**شەشەم:** ئەگەر خوا نابەرهەست (غیر محسوس) نەبووایە، مرۆڤ تاقی نەدەکرایەوە و ژیانی دنیا شوێنی تاقیکردنەوە نەدەبوو، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ:

﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ ٢﴾ الملك.

واتە: (خوا) ئەو زاتەیە کە مەرگ و ژیانی ڕەخساندوون، تاکو تاقیتان بکاتەوە، کامەتان کردەوەی باشترە و، ئەو (خوا) زاڵی لێبوردەیە.

کەواتە: ئەگەر ئێمە خوامان ببینیبایە (سبحانە وتعالی)، ئەو کاتە نە مرۆڤ تاقی دەکرایەوە و، نە ئەم ژیانەی دنیاش شوێنی تاقیکردنەوە دەبوو.

بە هەشت شوێنی تاقیکردنەوە نیە، چونکە ئیمانداران لەوێدا خوای پەروەردگار دەبینن.





**حەوتەم:** زۆر شتێکی نالۆجیکیی و ناماقووڵ و نازانستییانەیە و، زۆریش بێ ویژدانییە کە: لەبەر بەرهەست نەبوونی خوا، بڕوا بەخوا نەهێنرێ، چونکە مرۆڤ لە ژیانی دنیادا و بەم جەستە خاکییە تەحەممولی بینینی خوای بێ وێنە ناکات، مرۆڤ ناتوانێ زۆر لە (ڕۆژ)ەوە ڕامێنی، بەڵکو هەندێ جۆرە تیشك هەیە کە ئەگەر تەماشای بکەی، کوێر دەبی، بۆ وێنە: ئەو کاتانەی کە خۆر دەگیرێ، نابێ تەماشای بکەی، چونکە لەو کاتەدا هەندێ جۆرە تیشك هەیە، ڕەنگە مرۆڤ کوێر بکات، ئەدی چۆن تەحەمولی بینینی خوای پەروەردگار دەکەین؟!

﴿ وَلِلَّهِ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴾.

ئنجا با کۆتایی ئەم مەسەلەیە بە ئایەتێکی قورئان و فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بێنین:

أ- ﴿ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٤٣ ﴾ الأعراف.

شایانی باسیشە: ئەم ئایەتە لە بەرگی حەوتەمی تەفسیرە کوردییەکەمدا: (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)، (سوورەتی (الأنعام))، هەروەها لە بەرگی هەشتەمیشدا، (سوورەتی (الأعراف)) بە تەفصیلْ قسەم لەسەری کردوە.

واتە: کاتێك مووسا هات بۆ ژوانگەی دیدارمان (ئەو ژووانگەیە کە پەروەردگار (سبحانه وتعالى) بۆی دانابوو) و پەروەردگار (سبحانه وتعالى) دواندی و قسەی لەگەڵ کرد، گوتی: پەروەردگارم! خۆتم پێ نیشان بدە، با تەماشات بکەم، (پەروەردگاریش (سبحانه وتعالى)) فەرمووی: ناتوانی بمبینی، بەڵام تەماشای ئەو چیایە بکە، ئەگەر لە شوێنی خۆی مایەوەو خۆی ڕاگرت، تۆش دەتوانی بمبینی، کاتێ پەروەردگاری (سبحانه وتعالى)





بۆ کێوەکە، بۆ چیایەکە دەرکەوت، وردو خاش بوو، سووتا، مووساش لە هۆش خۆی چوو، کاتێك هاتەوە هۆش، گوتی: پاکیی بۆ تۆ، بۆ لای تۆ گەڕامەوە و من یەکەمینی بڕوادارانم، (واتە: کە تۆ بە چاوی سەر نابینرێی، لە ژیانی دنیادا).

**ب-** {عَنْ أَبِي مُوسَى (رضي الله عنه)، قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ، فَقَالَ: إِنَّ اللهَ لا يَنَامُ، وَلا يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَنَامَ، وَلَكِنَّهُ يَخْفِضُ الْقِسْطَ وَيَرْفَعُهُ، يُرْفَعُ إِلَيْهِ عَمَلُ اللَّيْلِ قَبْلَ عَمَلِ النَّهَارِ، وَعَمَلُ النَّهَارِ قَبْلَ عَمَلِ اللَّيْلِ، حِجَابُهُ النُّورُ - وفي رواية: النار - لَوْ كَشَفَهَا لأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ}، (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: ١٩٦٤٩، مُسْلِمٌ برقم: ١٧٩، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: ١٩٥، وَأَبُو عَوَانَة برقم: ٣٧٩، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: ٢٦٦، وَالطَّبَرَانِيُّ فِي "الأَوْسَط" برقم: ٦٠٢٥).

واتە: ئەبو مووسای ئەشعەریی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەڵسا لە نێوماندا پێنج وشەی فەرموون (پێنج شتی پێ گوتین): فەرمووی: بێگومان خوای زاڵ و پایەبەرز ناخەوێ و ناشگونجێ بخەوێ، تەرازوو نزم دەکات و بەرز دەکات، کردەوەی شەوێ پێشی ڕۆژێ بۆ لابەرز دەکرێتەوە و، کردەوەی ڕۆژێشی پێشی شەوێ بۆ لابەرز دەکرێتەوە، پەردەی خوا ڕووناکییە "لە ڕیوایەتێکدا دەفەرموێ: ئاگرە"، ئەگەر خوا پەردەکەی لابدات پڕشنگی ڕووی (خوای بێ وێنە) هەرچی لە حوکمی چەشمەندازی دیتنی خوادایە، هەمووی دەسووتێنێ.

کەواتە: ئێمە بەم جەستە خاکییەوە، تەحەممولی بینینی خوا ناکەین، وێڕای ئەوە کە ئەگەر خوای پەروەردگار خۆی پێشانی ئێمەدا بووایە، ئەو کاتە ئێمە لەوە دەردەچوو تاقی بکرێینەوە و، لە ڕاستییدا ئیمان بە خوا، کاتێك دێتە دی، کە خوا عزوجل پەنهان بێ، ئەگەرنا کەس نالێ ئیمانم بە ڕۆژێ هەیە، یان: ئیمانم بە مانگ هەیە، یان: ئیمانم بە گلۆپێك هەیە، شتێك کە بیبینی، ئیمان پێ بوونی ئازایەتیی نیە و، ئیمانیشی پێ ناگوترێ.

## بیانووی دووەم: هەبوونی ناڕێك و پێكیی لە گەردووندا:

ئەو بیانووە بەو شێوەیە خۆی دەنوێنێ، كە هەڵگرانی ئەو بیانوو و پاساوە دەڵێن: مادام خوا(سبحانه وتعالی)، وەك خواناسان دەڵێن، خاوەنی ئەو پەڕی زانایی و توانایی و حیكمەت و میهرەبانیی بێ، نابێ هیچ كەم و كوڕییەك، هیچ ناتەواوییەك لە دروستكراوەكانیدا هەبێ، بەڵام ئێمە لەنێو دروستكراوەكانیدا، ناڕێكیی و كەم و كوڕیی، ناتەواویی دەبینین، كەواتە: هەبوونی ناتەواویی و ناڕێك و پێكیی لە دروستكراوەكاندا: لە مرۆڤ و، لە دەوروبەری مرۆڤ و، لە ژینگەی مرۆڤ و، لە گەردووندا، بەڵگەی ئەوەیە كە بەدیهێنەرێك لە پشت مرۆڤ و ژیان و گەردوونەوە نیە، چونكە بەدیهێنەرێكی خاوەنی ئەوپەڕی زانایی و توانایی و كارزانیی و میهرەبانیی، نابێ ناڕێكیی لە كارەكەیدا هەبێ، ئنجا كە ناڕێكیی لە بووندا هەیە، كەواتە: خوایەك لە پشتیەوە نیە!

ئێمە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم قسەیە، كە هەر لە خۆیدا پووچەڵ و هەڵوەشاوەیە، چوار(٤) بەڵگان دەخەینە ڕوو:

**١)**- لە ڕاستییدا ئەم قسەیە پێچەوانەی عەقڵ و زانست و واقیعە و، پێشتریش قسەیەكی (جفري برون)مان هێنا، نووسەری كتێبی: (شارستانیەتیی ئەورووپا لە سەدەی نۆزدەدا)[1]، كە لە بەشی دووەمدا دەقی تەرجەمە عەرەبییەكەیم هێنا، پوختەكەی ئەوەیە دەڵێ:

ئێمە كە لە سروشتدا ناڕێكیی دەبینین، هۆكارەكەی عەقڵی ناڕێك و شێواوی خۆمانە، ئەگەرنا سروشت، (مەبەستی پێی دەوروبەرو گەردوونە)، بە شێوەیەكی لۆژیكییانەو زانستییانەی زۆر ڕێك و پێك بەڕێوە دەچێ، بەڵام ئەوە تێنەگەیشتنی ئێمەیە و، شێواویی فیكرو زەینی ئێمەیە، كە سروشت ناڕێك دێتە بەرچاومان.

---

(١) الحضارة الأوروبية في القرن التاسع عشر، ص١٤١.

دەڵێم: وەك چۆن كەسێك كە گرانەتای گرتبێ و میزاجی تەواو نەبێ، ئاوی شیرین و زولاڵی بە زاری تاڵە، هەروەها بابایەكی كوێر، هەرچەندە تەماشای ئاسمان بكات، بە نوێژی نیوەڕۆیە، خۆر نابینێ و، ئەگەر مانگ لە پازدەشدا بێ و بەدر بێ، بابای كوێر نایبینێ، كە بێگومان خەتای نەبوونی خۆرو مانگ نیە كە نایانبینێ، خۆر لە ڕۆژداو، مانگ لە شەودا، بەڵكو هۆكارەكە ئەوەیە كە: خۆی هەستی دیتنی نیە.

مولحیدەكانیش عادەتیان وایە: هەمیشە بەدوای ئەو شتانەدا وێڵن، كە بە حیسابی خۆیان خاڵی ڕەشن، وەك چۆن مێشە ڕەشە، هەمیشە بە دوای شتی پیس و خراپدا دەگەڕێ، ئەوانیش چونكە میزاجەكەیان ناتەواوە، بۆیە چەشمەندازیان لێڵە و لێڵ دەبینن، چونكە لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشا دەكەن و، میزاجیان تەواو نیە، بۆیە ئاوی شیرینیان بە زار تاڵە.

٢) گەلێ جاران هەندێ لە مولحیدەكان، كە سەریان لە مەسەلەیەك دەرنەچووە، بە هەڵەو نوقسانییان داناوە، بەڵام دوایی كە زانست بەرەو پێشەوە چووە: دەركەوتوە كە ئەوان نەیانزانیوە، نەك ئەو شتە كە ئەوان بە خاڵی ڕەش و نوقسانیی هاتۆتە بەرچاویان، لە خودی خۆیدا وا بووبێ، بەڵكو ئەوە بینینی خواروخێچی ئەوان، یان لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشا كردنی ئەوان، یان نەزانیی و بیركورتیی ئەوان، بووە، ئەو شتەی وا خستوونە بەرچاو، بۆ وێنە:

كاتی خۆی زۆر لە زانایانی بیۆلۆجیا، بە تایبەت ئەوانەی كە شوێنكەوتەی (داروینیزم)ن، - بیردۆزەی داروینیزم، دەڵێ: ژیانداران هەموویان لە ئەمیبایەكەوە هاتوون، لە زیندەوەرێكی یەك خانەیی - زۆر باسی ئەوەیان دەكرد كە لە نێو (DNA)دا پانتاییەكی زۆر هەیە، كە هیچ جفرەی جینیی تێدا نیە، ئەوەی كە پێی دەگوترێ: (جینیتك كۆد - Geneticcode)، بۆ دروستكردنی پرۆتینەكان، ئیدی داروینییەكان وەك عادەتی خۆیان لە بارەی هەر شتێكەوە كە شارەزای نەبن، ناویشیان لەوە نا: (DNA Junk) (جەنك دەنا)، واتە: وردە ترشەڵۆكی نێوكیی (DNA)، (الحمض الوراثي الخُردة)، چونكە پێیان وابوو ئەوە پاشماوەی

گەشەسەندنی چەند ملیۆن ساڵەی ڕابردووە، کە لە نێو خانەدا کۆبووەتەوە، بەڵام هیچ کارێکی نیە! کەچی لە ساڵی (٢٠١٢)دا گۆڤاری (Scientific american) واتە: (ئەمریکای زانستیی)، لێکۆڵینەوەیەکی دەنگدەرەوەی بڵاوکردەوە بە ناوی: خەزێنەی وردەی دەنا، کە بە (جەنك دەنا) ناسرابوو، ڕایگەیاند کە ئەوەی بەبێ کار و بێ کەڵکیان دانابوو، بێ کەڵك نیە، بەڵکو وەك ڕاستییەك زانراوە کە: (٨٠٪)ی ئەو ترشەڵۆکە بۆماوەییە بێ جفرەیە، چالاکیی بیۆکیمیایی تێدا ئەنجام دەدرێن و ئەرکی زۆرن لە جەستەدا، هەرچەندە تاکو ئێستا بە وردیی هەموو شتێکی لە بارەوە نەزانراوە.

هەر بۆیەش کاتێ لە سی و سێیەمین کۆنگرەی مەڵبەندی مۆرجین بۆ چاودێریی پزیشکیی (مركز مورجين للرعاية الطبية)، لە ساڵی (٢٠١٥)ی زایینیدا، یەکێك لە ئامادەبووان لە بارەی وردە (DNA) یان: (DNA)ی خوردەوە، پرسیاری لە (فرانسیس کۆڵنز) سەرۆکی پڕۆژەی جینۆمی بەشەریی کرد، لە وەڵامدا گوتی: (کە تەرجەمەی عەرەبیی کراوە:) (لَمْ يَعُدْ أَحَدٌ يستخدمُ هذا المصطلح)، واتە: ئێستا هیچ کەس ئەم زاراوەیە بەکار ناهێنێ، یانی: هیچ کەسێ ناڵێ: خوردە (DNA)، چونکە دەرکەوت ئەوەی کە بە خوردەیان دانابوو و، بە شتێکی بێ کاریان دانابوو، کاری هەیە و زۆر چالاکیی بیۆکیمیایی تێدا ئەنجام دەدرێن[1].

هەروەها کاتی خۆی داروینییەکان پێیان وابوو: لە جەستەی مرۆڤدا سەدو هەشتا (١٨٠) ئەندام هەیە، هیچ ئەرکێکیان نیە، سەدو هەشتا (١٨٠) ئەندام!! دەیانگوت: ئەو ئەندامە بێکارانە، ئەو ئەندامە بێ کەڵکانە، پاشماوەی قۆناغەکانی پەرەستاندنی ڕابردووی مرۆڤن، لە جەستەی مرۆڤدا ماونەوە و هیچ کاریشیان نیە!! بەڵام بەدرێژایی سەدەی ڕابردوو، - یانی: سەدەی بیست، چونکە داروینیزم لە سەدەی نۆزدەیەمدا پەیدا بوو - لە دوای ویەوە زانیاریی

---

(١) بڕوانە: (التطور: نظرة تأريخية وعلمية)، محمد صالح الهبيلي، ص٩٣،١٣١، هەروەها (إختراق عقل)، د.أحمد إبراهيم، ص١٧٤، ط٢.

زۆر بەرەو پێشەوە چوو، ئەسڵەن ئەو کاتە، ئەوەی کە ئێستا پێی دەڵێن: زانیاریی بۆ ماوەیی، (DNA) و کرۆمۆسۆمەکان و ئەوانە، هەر نەبوون، ئەو کاتە ئەو زانیارییە هەر نەبوو تا داروێنیش شتێکی لە بارەوە بزانێ! بەڵێ بە درێژایی سەدەی بیست، ڕۆژ بە ڕۆژ ئەو ئەندامانەی کە داروێنیستەکان پێیان وابوو بێ کەڵکن، کەم بوونەوە، هەتا شارەزایان گوتیان: هەموویان ئەرکیان هەیە لە جەستەدا، بۆ وێنە: هەردوو لەوزەکانی ئەملاو لای قورگ، هەروەها ڕیخۆڵە کوێرە، کە من نەفەرم پێ شك دێ، بەبێ ئەوەی کە پێویستیی پێ بێ، دوو لەوزەکەی خۆی دەرهێناون و، ڕیخۆڵە کوێرەی خۆیشی عەمەلیات کردوە، بەڵام دوایی کە زانست بەرەو پێشەوە چوو، حاڵی بوون، کە کاتی خۆی حاڵی نەبوو بوون! جارێك ئەو کابرایەم بینی، گوتم: دەزانی ئەو دوو لەوزەیەت سوودی زۆریان هەیە، چونکە لەولاو لای قورگن و، هەر شتێك لە دەمەوە بچێ، میکرۆب و دوژمنێك، ئەو دوو لەوزەیە لە دژی دەجەنگن، بۆیە جار جار ئەستوور دەبن، لە ئەنجامی بەرگریی کردنیاندا لە جەستە، هەروەها ڕیخۆڵە کوێرەش بەهەمان شێوە، ئەویش ئەرکی بەرگرییکردن لە جەستەی هەیە، هەروەها جۆرە بەکتریایەك دەردەدا کە بۆ پرۆسەی هەرس کردن و، بۆ بەرگرییکردن لە جەستە بەسوودە! هەڵبەتە لەو کاتەدا کابرا پەشێمان بووەوە، بەڵام تازە لە دەستی چوو بوو!

بەڕێزان! مرۆڤی ئیماندار کە متمانەی بە خوای خۆی هەیە، ئەو پەروەردگارەی کە هێناویەتە دی، دەزانێ کە هیچ شتێکی بەبێ حیکمەت نە خوڵقاندوە، ئنجا تەسلیم بوونی ئینسانی بڕوادار بە پەروەردگاری خۆی، ئەو جۆرە بیرکردنەوە سەقەتانەی لە کۆڵ دەکاتەوە، کە دوایی هەڵوێست و ڕەفتاری سەقەتیان لێ پەیدا دەبن[1].

٣) (إِبْنُ تَيْمِيَّة) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لەو بارەوە چەند قسەیەکی جوانی هەن، کە لە (المجموع الفتاوی)کەی خۆی دا، هێناونی، سەرەتا دەقی قسەکانی بە عەرەبیی دێنم، دوایی بە کوردیی تەرجەمەیان دەکەم، دەڵێ:

---

(١) بڕوانە: (مشكلة الشرِّ ووجود الله)، ص: (١٥٦-١٥٧)، د. سامي عامري.





(فَكُلُّ مَا فَعَلَهُ (الله تعالى) عَلِمْنَا أَنَّ لَهُ فِيهِ حِكْمَةً؛ وَهَذَا يَكْفِينَا مِنْ حَيْثُ الْجُمْلَةُ وَإِنْ لَمْ نَعْرِفْ التَّفْصِيلَ، وَعَدَمُ عِلْمِنَا بِتَفْصِيلِ حِكْمَتِهِ، بِمَنْزِلَةِ عَدَمِ عِلْمِنَا بِكَيْفِيَّةِ ذَاتِهِ، وَكَمَا أَنَّ ثُبُوتَ صِفَاتِ الْكَمَالِ لَهُ، مَعْلُومٌ لَنَا، وَأَمَّا كُنْهُ - أي حقيقة - ذَاتِهِ فَغَيْرُ مَعْلُومَةٍ لَنَا، فَلاَ نُكَذِّبُ بِمَا عَلِمْنَاهُ مَا لَمْ نَعْلَمْهُ، وَكَذَلِكَ نَحْنُ نَعْلَمُ أَنَّهُ "حَكِيمٌ" فِيمَا يَفْعَلُهُ، وَيَأْمُرُ بِهِ، وَعَدَمُ عِلْمِنَا بِالْحِكْمَةِ فِي بَعْضِ الْجُزْئِيَّاتِ لاَ يَقْدَحُ فِيمَا عَلِمْنَاهُ مِنْ أَصْلِ حِكْمَتِهِ، فَلاَ نُكَذِّبُ بِمَا عَلِمْنَاهُ مِنْ حِكْمَتِهِ مَا لَمْ نَعْلَمْهُ مِنْ تَفْصِيلِهَا، وَنَحْنُ نَعْلَمُ أَنَّ مَنْ عَلِمَ حِذْقَ أَهْلِ الْحِسَابِ وَالطِّبِّ وَالنَّحْوِ، وَلَمْ يَكُنْ مُتَّصِفاً بِصِفَاتِهِمْ الَّتِي اسْتَحَقُّوا بِهَا أَنْ يَكُونُوا مِنْ أَهْلِ الْحِسَابِ وَالطِّبِّ وَالنَّحْوِ، لَمْ يُمْكِنْهُ أَنْ يَقْدَحَ فِيمَا قَالُوهُ، لِعَدَمِ عِلْمِهِ بِتَوْجِيهِهِ، وَالْعِبَادُ أَبْعَدُ عَنْ مَعْرِفَةِ اللهِ وَحِكْمَتِهِ فِي خَلْقِهِ، مِنْ مَعْرِفَةِ عَوَامِّهِمْ بِالْحِسَابِ وَالطِّبِّ وَالنَّحْوِ، فَاعْتِرَاضُهُمْ عَلَى حِكْمَتِهِ أَعْظَمُ جَهْلاً وَتَكَلُّفًا لِلْقَوْلِ بِلاَ عِلْمٍ مِنَ الْعَامِّيِّ الْمَحْضِ، إِذَا قَدَحَ فِي الْحِسَابِ وَالطِّبِّ وَالنَّحْوِ بِغَيْرِ عِلْمٍ بِشَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ)[(١)].

واتە: هەرچی خوا (سبحانە وتعالی) کە ئەنجامی داوە و دروستیکردوە، دەزانین کە حیکمەتێکی تێدایە، ئەمە بە گشتیی بۆ ئێمە بەسە، کە بزانین: شتەکانی خوا هەموویان لە جێی خۆیانن، با بە وردەکاریی و ڕوونییش هەمووی نەزانین، ئنجا ئەوە کە ئێمە وردەکارییەکانی کاری خوا و حیکمەتەکەی نەزانین، هەر وەك دەرك نەکردنمانە بە چۆنیەتیی زاتی خوا، ئنجا هەروەك چۆن سەلمێنرانی سیفەتە تەواوەکانی خوا، بۆ ئێمە زانراوە و دەزانین کە خاوەنی هەموو سیفەتێکی تەواوە، بەڵام چییەت و جەوهەری زاتی خوا، بۆ ئێمە زانراو نیە، ئنجا ئەوەی کە ئێمە دەیزانین لە تەواویی خوا (سبحانە وتعالی)، نابێ بە هۆی ئەوەوە کە نایزانین لە وردەکارییەکانی ئەو تەواوییە، بە ناڕاستی بزانین و، بە درۆی دابنێین، هەروەها ئێمە دەزانین کە خوا (سبحانە وتعالی) هەرچی کردوویەتی و هەرچی فەرمانی پێ کردوە، لە جێی خۆیدایە و خوا کارزانە، ئنجا ئەگەر لە هەندێك لە وردەکارییەکاندا ئێمە دەرکی حیکمەتی خوای پەروەردگارمان نەکرد (سبحانە وتعالی)، ئەوە ڕێگر نیە لەوەی کە ئێمە لەبارەی ئەصڵی حیکمەتی خوای پەروەردگارەوە زانیومانە، بۆیە ئێمە ئەوەی کە زانیومانە لە حیکمەتی

---

(١) مجموع الفتاوى، ج٦، ص١٢٨.

خوا، دەبێ وامان لێ بکات: کە بێبڕوا نەبین بەوەی کە نەمانزانیوە، (واتە: ئەوەی کە زانیومانە لە حیکمەت و کارزانیی خوا، دەبێ هاندەرمان بێ: ئەوەش کە سەرمان لێی دەرناچێ، بڵێین: ئەویش حیکمەت و کارزانیی خوای کاربەجێی تێدایە).

(دوایی دەڵێ:) ئێمە دەزانین کە کەسانێك هەرچەندە زۆر وردەکار و، کارامەبن لە زانیاریی ژماردن (حیساب) و پزیشکگەریی (طب) و زانیاریی ڕێزمانی عەرەبیی دا، کە خەڵکی خۆیان پێیان ئاشنا و شارەزان، بەڵام ئەگەر ئەو کەسە خاوەنی ئەو صیفەتانە نەبوو، کە خاوەنە ئەسڵییەکانی ئەو زانستانە، پێی شایستەی ئەوە بوون، کە بە ئەهلی حیساب و (طب) و ڕێزمانی عەرەبیی دابنرێن، ئەو کەسە ناتوانێ ڕەخنە بگرێ لە شتێك کە ئەوان دەیلێن، یاخود تێی ناگات، (بۆی نیە بە بابای ژمێرەر بڵێ، یاخود بە پزیشکێك بڵێ: ئەوە وا نیە کە تۆ دەیلێی، یان بە شارەزایەکی زمانی عەرەبیی بڵێ: نەخێر ئەوە وانیە).

(ئنجا دەڵێ:) بەندەکان زۆر دوورترن لە ناسینی خوا و، حیکمەتی خوا لە دروستکراوەکانی دا، لە خەڵکی عەوام و پەیبردنیان بە ژماردن و پزیشکگەریی و ڕێزمانی عەرەبیی، هەر بۆیە ڕەخنەگرتنیان لە حیکمەتی خوا بە نەفامییەکی مەزنتر دادەنرێ و، بە بەکارهێنانی عەقڵ لە غەیری شوێنی خۆیدا دادەنرێ، لە نەزانیی کەسێکی عەوام کە ڕەخنە دەگرێ لە کەسانێك کە پسپۆڕن لە ژمێرە و پزیشکگەریی و ڕێزمانی عەرەبییدا، بەبێ ئەوەی لەو شتانەدا شارەزا بێ.

قسەکەی زۆر زۆر جوانە: ئەگەر کەسێك ڕەخنە بگرێ لە پزیشکێك، بێ ئەوەی کە هیچ لە پزیشکیی بزانێ، یان ڕەخنە بگرێ لە ئەندازیارێك، بێ ئەوەی کە هیچ لە ئەندازە (هَنْدَسَة) بزانێ، یان ڕەخنە بگرێ لە کیمیا زانێك، لە فیزیا زانێك، بێ ئەوەی کە هیچ سەرەدەری لە زانستەکانیاندا بکات، ئەوە زۆر بە نەفام دادەنرێ، ئنجا ئەگەر ئەو کەسە بە نەفام دابنرێ، ئەو کەسەش کە ڕەخنە دەگرێ لە کاری خوا، بێ ئەوەی کە بەشێك لە سیفەتەکانی خوای تێدابن، تاکو پەی بە دروستکراوەکانی خوا بەرێ، بێگومان ئەو کەسە زۆر زۆر

بە نەزانتر لە قەڵەم دەدرێ، لەو جۆرە کەسە عەوامەی کە بەبێ زانیاریی و شارەزایی ڕەخنە لە پسپۆڕان و شارەزایان دەگرێ.

٤) کۆتا بەڵگەم لەو بارەوە ئەوەیە کە: وەك چۆن زانایانی ڕۆچوو، زانایانی شارەزاو پسپۆڕ لە شەریعەتدا، لەبەر تیشکی ئایەتە (مُحْكَم)ەکاندا تەماشای ئایەتە (مُتَشابە)ەکان دەکەن، ئایەتە (محکم)ەکان، واتە: ئایەتە مانا ڕۆشنەکان و، ئایەتە (متشابە)ەکانیش، واتە: ئایەتە مانا وێکچووەکان، کە چەند مانایەك هەڵدەگرن، کە دەبێ هەمیشە لەبەر ڕۆشنایی ئایەتە ڕۆشنەکاندا تەماشای ئایەتە مانا ناڕۆشنەکان، یاخود ئایەتە زیاتر لە یەك مانا هەڵگرەکان بکەین، بەهەمان شێوەش: پێویستە لەبەر ڕۆشنایی (محکمات)ی دروستکراوەکانی خوادا، کە حیکمەتەکەیان دیارە و نهێنییەکانیانمان هەست پێکردوون، تەماشای ئەو دروستکراوانەی دیکەی خوای پەروەردگار بکەین، کە جارێ نهێنیی و حیکمەتەکەیان بۆ ئێمە کەشف نەبووە.

مادام ئێمە هەرچی تەماشای دەکەین: حیکمەت و کارزانیی خوای کاربەجێی تێدا دەدرەوشێتەوە، هەندێ شتیش کە حیکمەتەکەیمان نەزانی، دەبێ بزانین کە ئەویش حیکمەتێکی تێدایە، بەڵام جارێ بۆ ئێمە دەرنەکەوتوەو کەشف نەبووە.

## بیانووی سێیەم: بوونی شەڕو خراپە لە ژیانی مرۆڤدا:

ئەمەش یەکێکی دیکەیە لە بیانووە پووچەڵەکانی هەندێ لە مولحیدەکان، دەڵێن:

خواناسان دەڵێن: خوا خاوەنی ئەو پەڕی بەزەیی و کارزانیی و، ئەوپەڕی زانایی و دەسەڵاتە، ئنجا ئەگەر خوا ئەو پەڕی زانایی و کارزانیی و میهرەبانیی و دەسەڵاتیی هەیە و، خاوەنی مرۆڤ و گەردوونیشە، نەدەبوو ژیانی مرۆڤ هیچ نارەحەتیی و خراپەو ناگوزووریبەکی تێدا بووایە، کەچی ئەو شتانە هەن لە ژیانی مرۆڤدا.

کەواتە: ڕاست نیە کە دەڵێن: خوا خاوەن و بەدیهێنەرو پەروەردگاری مرۆڤ و دەوروبەرو گەردوونە!

ئێمە لە وەڵامی ئەم بیانووە پووچەڵەدا، یازدە (١١) ڕاستیی وەك بەڵگە دەخەینە ڕوو، بۆ زیاتر دەرخستنی پووچەڵیی و بێ نێوەڕۆکیی و قرپۆکیی، ئەم بیانووەش، کە بە داخەوە کەسانێك دەیکەنە پاساو و هۆکاری ئەوەی، پشت لە خوا بکەن و، ڕوو لە بیابانی خوانەناسیی بکەن و بکەونە زەلکاوی ئیلحادەوە:

### ١) ڕاستیی یەکەم: ئەم مەسەلەیە زیاتر لە لەلای خەڵکی وڵاتانی ڕۆژئاوادا گرفتی دروستکردوە:

ئاشکرایە کە: زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی ڕۆژئاوا، لەسەر ئایینی مەسیح (علیه السلام) حساب دەکرێن، ڕاستتر بڵێین: ئایینی نەصرانیی، کە دەزانین چ دەردێکی بەسەر هاتوە! وەك لە باسی یەکەمی ئەم بەشی سێیەمەدا باسمان کرد (سەرگوزشتەی سەرهەڵدانی ئیلحادو بێ دینیی لە ئەورووپاو ڕۆژئاوادا)، ئنجا ئایا بە هۆی چییەوە ئەم مەسەلەیە زیاتر لە ڕۆژئاوادا، گرفتی دروست کردوە؟! بە هۆی هەندێ قسەی: کتێبی پیرۆز (الکتاب المقدس)ەوە، جوولەکەکان و

نەصرانییەکان کتێبێکیان هەیە بە ناوی: (الكتاب المقدس - Holy book - کتێبی پیرۆز)، ئەو کتێبە دوو بەشی سەرەکییە: (پەیمانی کۆن)، کە هی پێش هاتنی عیسایە (عليه السلام) و (پەیمانی نوێ) هی دوای هاتنی عیسایە، دیارە جوولەکەکان دان بە (پەیمانی نوێ)دا ناهێنن، بەڵکو تەنیا (پەیمانی کۆن) بە کتێبی پیرۆزی خۆیان دادەنێن، بەڵام نەصرانییەکان هەم (پەیمانی کۆن)، هەم (پەیمانی نوێ)ش بە کتێبی پیرۆزی خۆیان دادەنێن.

ئنجا سەرەتا سەرنجێکی پەیمانی کۆن دەدەین، دواییش سەرنجێکی کورت لە پەیمانی نوێش دەدەین، کە ئایا چیيان تێدا هەیە، ئەو دوو کتێبە، ئەو دوو سەرچاوەیە، کە ببێتە بیانوو و دەستەچیلەی ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە، کە مادام خراپەو شەڕ لە ژیانی مرۆڤدا هەیە، کەواتە: خوا (سبحانه وتعالى) بوونی نیە، بۆچی مولحیدە ڕۆژئاواییەکان وا دەڵێن؟!

## پەیمـــانی کـــۆن:

لە پەیمانی کۆندا بە شێوەیەکی زۆر ناشایست باسی خوا کراوە (سبحانه وتعالى)، کە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ بەرزیی و پاکیی و کارزانیی و زانایی و بێ وێنەیی خوای بەرزدا ناگونجێ، من حەوت (٧) قسەم هێناون، وەك نموونە، لە هەندێك لەو (سیفر[1])انەی (پەیمانی کۆن) لێیان پێك هاتوە و، هەم ناوی (سفر)ەکە و، هەم ژمارەی (إصحاح)ەکە و، هەم ژمارەی بڕگەکەش[2] دێنم، هەروەها ژمارەی لاپەڕەی: (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس)یش:

**نموونەی یەکەم:** پاڵدراوەتە لای خوا، گوایە فەرموویەتی: (وَلَكِنِّي لا أُعفي المذنب من العقاب، بل أفتقد إثم الآباء في الأبناء والأحفاد حتى الجيل الرابع..)[3].

---

(١) (سفر) کۆی (أسفار)ە و لە جێی (کتێب)ە و (إصحاح)یش، لە جێی (سوورەت)ە.

(٢) بڕگە (مقطع)ەکانیش لە جێی (ئایەتەکان)ن.

(٣) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح ٣٤/ ٨، ص١٩٩.

واتە: بەڵام من تاوانبار لە سزا دان نابوورم، بەڵكو دەگەڕێم بۆ سزادانێك كە بابەكان كردوویانە، لە كوڕەكانیان و لە نەوەكانیاندا، هەتاكو وەچەی چوارەم.

یانی: بابێك گوناهێكی كردوە، (گوایە) خوا نەك هەر ئەو بابە سزا دەدا، بەڵكو كوڕەكانیشی، بەڵكو نەوەكانیشی، هەتا دەگاتە چوارەم پشت! ئایا دەگونجێ خوا وا بفەرموێ؟! بەپێی عەقڵ و لۆژیك، نەخێر، ئەمما بەپێی وەحیی ڕاست و دروست و دەستكاریی نەكراویی خوا، سەد جار نەخێر، خوا دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾ فاطر(١٨).

واتە: هیچ گوناهبارێك گوناهی كەسێكی دیكە هەڵناگرێ.

**نموونەی دووەم:** گوایە خوا فەرموویەتی: (أَهلكوا الشّيخ والشاب والعَذْرَاء والطّفْل وَالنِّسَاء..)[1].

واتە: پیرو گەنج و كچ و منداڵ و ژنان، هەموویان بفەوتێنن.

ئایا قسەی وا لە خوا دەوەشێتەوە؟! بە تەئكید نەخێر، بەڵام ئەوە لە پەیمانی كۆندا هەیە كە جوولەكەكان و نەصڕانییەكانیش بە كتێبی پیرۆزی خۆیانی دادەنێن!

**نموونەی سێیەم:** سەرچاوەی ناوبراو دەڵێ: (فَاذْهَبِ الآنَ وَهَاجِم عَمَالِيق وَاقْضِ عَلَى كُلِّ مَا لَهُ، وَلا تَعْفُ عَنْ أَحَدٍ مِنْهُمْ، بَل اقتلهُمْ جَمِيْعَاً رِجَالاً وَنِسَاءً وَأَطْفَالاً وَرُضَّعَاً، بَقَرَاً وَغَنَمَاً جِمَالاً وَحَمِيرَاً)[2].

واتە: ئێستا بڕۆ هێرش بكە سەر (عماليق)، (گەلێك بوون)، هەموو شتێكیان لە بەین بەرە و، لە هیچ كەسیان مەبوورە، بەڵكو هەموویان بكوژە، بە پیاو و ژنەوە، بە منداڵ و شیرە خۆرەوە، بە ڕەشەوڵاخ و مەڕو بزنەوە، بە حوشترو كەرەوە.

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر حزقيال، الإصحاح ٩/ ٦، ص١٦٠٢.

(٢) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر صموئل، الإصحاح ١/ ١٥، ص٥٩٤.

ئایا دەگونجێ خوا شتی وا بفەرموێ؟! باشە ئەوانەی کە باڵغن، ئەوە موکەللەفن، بەڵام ئەوانەی شیرە خۆرن، بۆچی!! پاشان ئاژەڵی بەستەزمان بۆچی؟!

**نموونەی چوارەم:** سەرچاوەی گۆڕین دەڵێ: (لا بُدَّ أَنْ تَتَحمَّلَ السَّامِرَة وِزْرَ خَطِيئَتِهَا، لأَنَّهَا تَمَرَّدت عَلَى إِلهها فَيَفْنَى أَهْلُهَا بحَدِّ السَّيْفِ، وَيَتَمَزَّقُ أَطْفَالُهَا أَشلاء، وَتُشَقُّ بطُونُ حَواملهَا)[١].

واتە: دەبێ سامیرە[٢] باجی گوناهەکەی خۆی بدات، چونکە لە پەرستراوەکەی خۆی هەڵگەڕاوەتەوە، دەبێ خەڵکەکەی هەموو بە تیژایی شمشێر لەبەین ببردرێن و دەبێ منداڵەکانی وڵاتی سامیرە پارچە پارچە ببن و، سکی ژنە دوو گیانەکانیش شەق بکرێ، (کۆرپەکەی نێو سکیشیان بکوژرێ).

ئایا دەگونجێ خوا شتی وا بفەرموێ؟! بەڵام ئەوە بە ناوی کتێبی پیرۆزەوە، جوولەکەکان و نەصرانییەکان دەڵێن: ئەوە خوا فەرموویەتی!

**نموونەی پێنجەم:** گوایە خوا فەرموویەتی: (يَا بنْتَ بَابِل المُحتَّم خَرَابُها، طُوبَى لِمَنْ يُجَازِيكِ بمَا جَزَيتِنا بهِ، طُوبَى لِمَن يُمْسِكُ صِغَارَكِ وَيَضْرب بِهِم الصخرة)[٣].

واتە: ئەی کچی بابیلی کە پێویستە تێکبچێ، {(بابیل) شوێنەوارەکەی لە باشووری عێراقە}، خۆشیی بۆ ئەو کەسەی کە سزات دەدا، لە بەرانبەر ئەوەدا کە تۆ سزای ئێمەت پێدا، خۆشیی بۆ ئەو کەسەی کە منداڵە گچکەکانت دەگرێ و، بە گاشە بەردانیاندا دەداو دەیانکوژێ.

ئایا دەگونجێ خوا قسەی وا بفەرموێ؟!

**نموونەی شەشەم:** ئەوە گوایە یەکێك کە خاوەنی (المزمور)ە، ئنجا داوودە(علیه السلام) یان یەکێکی دیکە لە پێغەمبەرانی بەنو ئیسرائیلە، ئاوا خوا دەدوێنێ:

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر هوشع، الإصحاح ١٣/ ١٦، ص١٧٣٦.

(٢) (سامرة): دەوڵەتۆکەیەك بووە لە فەڵەستین، هی جوولەکەکان بووە.

(٣) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، المزامير، المزمور: ١٣٧/ ٨،٩، ص١٢٦٧







(اسْتَيْقِظ! لماذا تَتَغافَى يَا رَبُّ؟ انتَبِهْ لا تَرْفُض إلى الأَبَدِ، لِماذَا تحجِبُ وَجْهَكَ وَتَنْسَى مَذَلَّتَنَا وَضِيْقَنَا؟!)[1].

واتە: بە خەبەر وەرە، ئەی پەروەردگار! بۆچی نادیدەمان دەگری، یان بۆچی خۆمان لێ گێل دەکەی، (پاکیی بۆ خوا)، وریابە! بۆ هەمیشە، پاڕانەوەکانی ئێمە ڕەفز مەکە، بۆچی ڕووی خۆتمان لێ پەنهان دەکەی و، بۆچی ئەو زەبوونیی و سەغڵەتییەی ئێمە تێیداین، نادیدەی دەگری؟!

**نموونەی حەوتەم و کۆتایی:** کە لە پەیمانی کۆن هێناومەتەوە، کە وەك گوتم بە هۆی ئەو جۆرە قسانەوە، ئەو بیرۆکەیەی: (خوا (سبحانه وتعالى) دنیای پڕکردوە لە شەڕو خراپە) لە ڕۆژئاوادا سەری هەڵداوە و، بۆتە یەکێك لە بیانوو و پاساوەکانی ئیلحاد: (حَتَّى مَتَى يَا رَبّ أدْعُو، وَأَنْتَ لاَ تَسْمَع؟ أَصْرُخُ إِلَيْكَ مِنَ الظُّلْمِ، وَأَنْتَ لاَ تُخَلِّص؟ لِمَ تُرِينِي إِثْماً وَتُبْصِرُ جَوْراً)[2].

واتە: هەتا کەی ئەی پەروەردگار من لێت دەپاڕێمەوەو تۆ گوێ ناگری! من هاوارت بۆلا دەکەم لە ستەم، تۆش دەربازم ناکەی! بۆچی گوناهم پیشان دەدەی و، ستەمیش دەبینی (بەڵام کۆتایی پێ ناهێنی)؟!

بۆیەش بابایەکی وەك: (ڕیتشارد داوکینز) لە کتێبی: (ئەفسانەی خوا - the God legend - وهم الإله)دا، - وەك خاوەنی کتێبی (مكشلة الشر ووجود الله): (د. سامي عامري)، تەرجەمەی عەرەبیی کردوە و لێی وەرگرتوە[3] - گوتوویەتی:

(يُمْكِنُ القَوْلُ: إنَّ إلَه العَهْد القَدِيم هُوَ أَكْثَر شَخْصِيَةٍ بَغِيضَةٍ فِي كُلّ القِصَصْ: غيور وَفخور بذَلِك، تَافِهٌ، جَائِرٌ، غَيْرُ مُسَامِحٍ، إنْتِقَاميٌ، مُتَعَطِّشٌ لِلدَمٌ، ومولَعٌ بالتَطهير العِرْقي، كَارِهٌ لِلنِّسَاء، عُنْصري، قَاتِلٌ للأَطْفَال، مُغْرَمٌ بالإِبَادَةِ الجَمَاعِيَّة...).

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر المزمور، الإصحاح ٤٤/ ٢٣ - ٢٤، ص١١٨٢.

(٢) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر الحبقوق، الإصحاح ١/ ٢ - ٦، ص١٨٠٤.

(٣) ص٨٨.

واتە: دەگونجێ بڵێی: ئەو خوایەی کە پەیمانی کۆن باسی دەکات، بوغزێنراوترین کەسایەتییە لە هەموو بەسەرهاتەکاندا، چونکە زۆر تووڕەیە و شانازیی بەو تووڕەییەی خۆیەوە دەکات، {داوکینز زۆر تەعبیری ناشایستی بۆ خوای بەرز و مەزن بەکارهێناون} هیچ و پووچە، ستەمکارە، لێ بوردە نیە، تۆڵەستێنە، تینووی خوێنە، زۆر حەزی لە پاکتاوی بە کۆمەڵە، (پاکتاوی ڕەگەزیی)، ڕقی لە ئافرەتانە، دەمارگیرە، منداڵان دەکوژێ و پێی خۆشە بە کۆمەڵ خەڵك قەلاچۆ بکات.

هەڵبەتە قسەکەی (داوکینز)، ئەگەر تەماشای پەیمانی کۆن بکەین، -- کە حەوت (٧) نموونەمان لێ هێنانەوە - لە ڕاستییەوە دوور نیە.

بەڵێ: ئێمە ئێستا لەوە تێدەگەین: بۆچی ئەو بیرۆکەیەی: (هەبوونی شەڕو خراپە لە ژیانی مرۆڤدا) لەگەڵ خواناسیی دا، تێك دەگیرێ؟ لەبەر ئەوەی بەو شێوەیە لە پەیمانی کۆندا، باسی خوا کراوە: گوایە خوا (سبحانە وتعالی) هانی پێغەمبەرانی خۆی داوە، بەڵكو فەرمانی پێکردوون، کە خوێن بڕێژن، منداڵ بکوژن، ئاژەڵان بکوژن، وڵاتان کاول بکەن، کە لە ڕاستییدا ئەوە هەمووی درۆیەو بوختانە بە ناوی ئاییینی خواوە کراوە و، خوا (سبحانە وتعالی) زۆر لەوە بەرزتر و میهرەبانتر و کارزانتر و زاناتر و پاك و بێگەردترە، کە قسەی بەو شێوەیە بفەرموێ.

**پەیمـــــانی نـــوێ:**

لە (پەیمانی نوێ) تەنیا یەك نموونە دێنینەوە، بەڵام سەرەتا با سەرنجی ئەم ئایەتە بە پێزە بدەین، خوا (سبحانە وتعالی) دەفەرموێ:

﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحۡنُ أَبۡنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥۚ قُلۡ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُمۖ بَلۡ أَنتُم بَشَرٞ مِّمَّنۡ خَلَقَۚ يَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ﴾ المائدة(١٨).

واتە: جوولەکەکان و نەصرانییەکان گوتیان: ئێمە کوڕانی خواو خۆشەویستانی خواین، (خوا دەفەرموێ) بڵێ: ئەدی بۆچی بە هۆی گوناهەکانتانەوە سزاتان







دەدا، بەڵكو ئێوەش وەك ئەو مرۆڤانەن كە خوا دروستیكردوون، هەر كەس بیەوێ، لێی دەبووریٚ و هەر كەسێكیشی بویٚ ئازاری دەدا (بە گوێرەی كردەوەكانیان).

ئنجا با سەرنج بدەین: چ بیرۆكەیەك لە پەیمانی نوێدا، (واتە: لە چوار ئینجیلەكان و كتێبەكانی كە پێیانەوە پەیوەستن)، وایكردوە كە بیرۆكەی: (هەبوونی خراپەو نارێكیی لە ژیانی مرۆڤدا) بكرێتە بەڵگەی نەبوونی خوا (سبحانە وتعالى)؟ دەڵێین: ئەو بیرۆكەیە كە دەڵێ: خۆشویستنی خوا بۆ خەڵك (محبة الله للعالَم)، كە ئەمە ناوونیشانێكە لە: (التفسیر التطبیقي للكتاب المقدس)دا[1]، هاتوە و لەم قسەیەی: (ئینجیلی یوحەننا)ی وەرگرتوە، كە دەڵێ: (...لأَنَّهُ هَكَذَا أَحَبَّ اللهُ العَالَمَ، حَتَّى بَذَلَ ٱبْنَه الوَحِيد..).

واتە: خوا هەموو خەڵكی خۆشدەوێ، هەر بۆیە تاقە كوڕەكەی خۆی كردە قوربانیی و فیداكار، (كە ببێتە سڕەرەوەی گوناه و تاوانەكانی خەڵك)[2].

ئنجا بەپێی ئەم بیرۆكەیە بێ، كە خوا تاقە كوڕەكەی خۆی، كە عیسایە (پاكیی بۆ خوا لەوە كە كوڕی هەبێ)، بە كوشتن داوە و بە لە سێدارەدران داوە، بۆ ئەوەی ببێتە مایەی كەفارەت و سڕەرەوەی گوناهی مرۆڤەكان، ئنجا نەصرانییەكان ئەنجامێك لەسەر ئەو قسە هەڵبەستراو (مُفترى) و بیرۆكە ئەفسانەییە هەڵدەچنن و دەڵێن: مادام خوا، دەفەرموێ: كوڕەكەی خۆم كردوەتە بەلاگێڕەرەوەی مرۆڤەكان، كەواتە: خوا مرۆڤەكانی هەموویان خۆشدەوێن، ئنجا ئەگەر ڕاستە: هەموویانی خۆشدەوێن، ئەدی بۆچی لە نێو مرۆڤاندا نەخۆشیی هەیە شەڕ و كوشتار هەیە، گرفت و نارەحەتیی هەیە، لافاو هەیە، هەورە تریشقە هەیە ...هتد؟!

بەڵام بێگومان ئەو بیرۆكەیە هەڵەیە، بەڵێ، خوا مرۆڤی خۆشدەوێ و ڕێزی لە مرۆڤ گرتوە، بەڵام:

---

(١) العهد الجديد، إنجيل يوحنا، الإصحاح: ٣، ص٢١٨٠.

(٢) وەك زۆرجار گوتوومانە: نێوان ئەم جۆرە كەوانانە ( ) زیادەی خۆمە بۆ چاكتر ڕوونكردنەوەی مەبەست.

١- خوا ئەو مرۆڤانەی خۆش دەوێن، کە لەسەر ڕاستە شەقامی وی دەڕۆن، ئەگەرنا مرۆڤانێك لەسەر ڕاستە شەقامی خوا نەڕۆن، چاویان لە زوڵم بێ، چاویان لە خراپە بێ، سپڵەو ناسپاس بن، بەرانبەر بە خوا، بە تەئکید خوا خۆشی ناوێن، وەك خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ:

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ﴿١﴾ وَطُورِ سِينِينَ ﴿٢﴾ وَهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ٱلۡأَمِينِ
﴿٣﴾ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدۡنَٰهُ أَسۡفَلَ سَٰفِلِينَ ﴿٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونٖ ﴿٦﴾ فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعۡدُ بِٱلدِّينِ ﴿٧﴾ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَحۡكَمِ
ٱلۡحَٰكِمِينَ ﴿٨﴾﴾ التين.

واتە: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، سوێند بە هەنجیر و بە زەیتوون و، سوێند بە کێوی سینا و (سوێند) بەم وڵاتە پڕ هێمنیی و ئاساییشە (کە مەبەست پێی حەڕەمی مەککەیە، سوێند بەو چوار شتانە)، بە دڵنیایی ئێمە مرۆڤمان لە باشترین پێکهاتەدا دروست کردوە (واتە: خوا مرۆڤی باش دروستکردوە)، دوایی گێڕامانەوە ژێری ژێرەوە (واتە: بە پێی سیستەمێك کە خوا دایناوە، مرۆڤ ئەگەر ئاگای لە خۆی نەبێ، دەچێتەوە بنی بنەوە!) جگە لەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن (کەواتە: بە هۆی ئیمان و کردەوەی باشەوە، مرۆڤ لەو پێگە بەرزە، کە خوا تێیدا دایناوە، کە باشترین پێگەیە، لەوێدا دەمێنێتەوە، بەڵام بە هۆی کوفرو بێ دینیی و خراپەوە، شۆڕ دەبێتەوە، نزم دەبێتەوە بۆ خواری خوارێ، ئەوانەی ئیماندارن و کردەوە باشەکانیان هەن)، پاداشتێکی نەبڕاوەیان هەیە، (ئەی مرۆڤ!) ئایا چ شتێك وات لێ دەکات، بڕوا بە سزاو پاداشتی خوا نەکەی؟! (یان بڕوا بە ئایین نەکەی، کە ئیسلامە)، ئایا خوا کارزانترین و لێزانترین حوکمڕان نیە؟!

یانی: کە بەو شێوەیەی داناوە: مرۆڤ دەتوانێ لەو پێگە بەرزە کە خوا تێیدا داناوە، بمێنێتەوە، بە هۆی ئیمان و کردەوەی چاکەوە و، دەشتوانێ خۆی شۆڕ بکاتەوە بۆ خواری خوارێ، وەك: لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ:

﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ۝٥٥﴾ الأنفال.



واتە: خراپترین زیندەوەر لەلای خوا، ئەوانەن کە بێبڕوان، چونکە ئیمان ناهێنن.

کەواتە: ئەوە ڕاست نیە کە خوا مرۆڤەکانی هەموویان خۆشبوێن، بەڵکو ئەوانەیانی خۆشدەوێ، کە ئەو ڕێزو حورمەتەی خوا پێی داون، لە خۆیاندا دەیپارێزن، بە هۆی ئیمان و کردەوەی باشەوە، بەڵام ئەوانەی ئەو ڕێزو حورمەتە لە دەست خۆیان دەدەن، بە هۆی کوفرو ستەم و خراپەو تاوانەوە، ئەوانە لەلای خوا بێ بایەخن، بێ ڕێزن، بەڵکو دەفەرموێ: بێڕێزترین دروستکراوی خوان (سبحانه وتعالى):

﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ الأنفال(٥٥).

٢- خۆشویستنی خوا بۆ مرۆڤەکان، مانای ئەوە نیە کە لە ژیانی دنیایاندا کە شوێنی تاقیکردنەوە و لە مەحەك دانیانە، بەردی سارد و گەرمیان نەیەتە بن پێ و هیچ گرفت و کێشە و ناگوزووریيەکیان نەبێ و، هەمیشە لە خۆشیی و ئیسراحەت و لە نێو ناز و نیعمەتدا بن! چونکە ئەو خەیاڵپڵاوە، دژ و پێچەوانەی سروشتی ژیانی دنیا و، حاڵەتی تاقیکرانەوەی مرۆڤیشە!.

## ٢) ڕاستیی دووەم: مادام خوا مرۆڤی بۆ تاقیکردنەوە خوڵقاندوە، خۆشیی و ناخۆشیی دێتە ڕێ:

ئەوانەی کە پێیان وایە، هەبوونی ناخۆشیی و خراپەو شەڕو ناڕەحەتیی و گرفتاریی، لە ژیانی مرۆڤدا، بەڵگەی ئەوەیە کە خوا عزوجل نیە، بە بیانووی ئەوە: کە ئەگەر خوا هەبووایە، چونکە خوا خاوەنی ئەو پەڕی زانیاریی و میهرەبانیی و کاربەجێییە، دەبوو هیچ ناخۆشیی و ناڕەحەتییەك لە ژیانی مرۆڤدا نەبێ! ئەو جۆرە کەسانە، شارەزای سروشتی ژیانی دنیا نین، خوا (سبحانه وتعالى) ئاوا بۆمان باسی سروشتی ژیانی دنیا دەکا، لە سوورەتی (الملك)دا، دەفەرموێ:

﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾﴾.

واتە: (خوا) ئەو زاتەیە کە مەرگ و ژیانی ڕەخساندوون، تاکو تاقیتان بکاتەوە: کامەتان کردەوەی باشترە و، خوا زاڵی لێبووردەیە.

هەروەها لە سووڕەتی (الأنبياء)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً ۖ وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٣٥﴾﴾.

واتە: بە ناخۆشییان و بە خۆشییان، (یاخود بە شەڕو بە خێر، کە مەبەست پێی زیان و قازانجە)، تاقیتان دەکەینەوە و، دواییش بۆ لای ئێمە دەگێڕدرێنەوە.

کەواتە: ئەو کەسەی کە پێی وایە هەبوونی ناڕەحەتیی و گرفتاریی لە ژیانی مرۆڤدا، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوا (سبحانه وتعالى) ئەم ژیانەی مرۆڤی نەڕەخساندوە و، خوا خاوەن و پەروەردگاری مرۆڤ نیە! لە سروشتی ژیانی دنیا حاڵی نەبووە، لێرەوە ئەو ئیشکالەی بۆ دروست بووە، بۆیە دەبێ چاو بەخۆیدا بگێڕێتەوە و، بزانێ ئەو خوایەی کە مرۆڤ و گەردوونیی ڕەخساندوون، چۆن باسی ژیانی دنیا دەکات! چونکە ئەو دەزانێ دنیای بۆچی ڕەخساندوون؟ نەك تۆ لە خۆتەوە و بە خەیاڵی خۆت، شتێکی بۆ دابتاشی!

### ٣) ڕاستیی سێیەم: ئەگەر ژیان تەنیا ژیانی دنیا بووایە، نەدەبوو گرفتاریی تێدابێ، بەڵام ئێرە تەنیا هۆڵی تاقیکردنەوەیە و، ئەنجامی ئەم ژیانە لە ڕۆژی دوایی دا وەردەگیرێتەوە:

بەڵێ ئەگەر ژیان تەنیا ئەم ژیانە بووایە و ژیانێکی دیکە نەبووایە و، ئەمە یەکەم قۆناغ و دوا قۆناغ بووایە، ئەو کاتە وا چاوەڕوان دەکرا، لە میهرەبانیی و بەخشش و کاربەجێیی خوا، کە هیچ ناخۆشیی و ناڕەحەتییەك لە ژیانی مرۆڤدا نەبووایە، بەڵام مرۆڤ لێرە لە تاقیکردنەوەدایە و، لە تاقیکردنەوەشدا تووشی







هەورازو نشێو، دێ، ئەگەرنا چۆن تاقی دەکرێتەوە؟ ئەگەر مرۆڤ خۆشیی نەیەتە ڕێ، تاکو خوا بزانێ: ئایا سوپاسگوزار دەبێ یان نا، ناخۆشییشی نەیەتەڕێ، تاکو بزانێ: داخۆ خۆڕاگر دەبێ یان نا، چۆن تاقیدەکرێتەوە؟! بۆیە خوا (سبحانه وتعالى) لە چەند شوێنێك لە قورئاندا باسی:

﴿لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾، (زۆر خۆڕاگرانی سوپاسگوزار)دەکات، ئەوانەی کە لەسەر ناڕەحەتیی و گرفتارییەکان زۆر خۆڕاگرن و، لە بەرانبەر چاکەو نیعمەتەکانی خوادا، زۆر شوکرانە بژێرو سوپاسگوزارن.

## ٤) ڕاستیی چوارەم: لە ڕاستییدا چەمکی شەڕو خراپە، شتێکی زەینیی و داڕنراو (ذهني و انتزاعي)ە و، بوونێکی خودیی نیە:

بۆ وێنە: کەسێك، کەسێك دەکوژێ، یاخود کەسێك، تاوانێك دەکات، هەر تاوانێك، ماڵ لە کەسێك دەستێنێ، چەمکی تاوانەکەی، شتێکی داڕنراوە و، ئێمە خۆمان دایدەڕنین لەو ڕووداوە کە ڕوو دەدا، ئەگەرنا بۆ خۆی بوونێکی دەرەکیی نیە، کە ئەوە بۆ هەر شتێکی دیکەش هەروایە، یانی: شەڕو خراپەکە، تاوانەکە، تەنیا ئەوەیە کە: ئەو کەسە بکوژە، کەسێکی بە ناهەق کوشتوە، بەڵام شەڕ و خراپە لە خۆیدا، وەك چەمکێکی فەلسەفیی، تەنیا لە مێشکی ئێمەدا هەیە.

لەسەر ئەرزی واقیع نەفەرێك، نەفەرێك دەکوژێ، نەفەرێك خراپەیەك دەکات، یان بۆ وێنە: کەسێك مار پێوەی دەدا، مار هەیەو، پێوەدران هەیەو، نەفەرەکەش هەیە، ئەمما چەمکی وشەی: شەڕ، خراپە، چەمکێکە لە مێشکی ئێمەدا و، مێشکی ئێمە بە هۆی سەرنجدانی ڕووداوەکانەوە، ئەو چەمك و واتایە بۆ خۆی دادەتاشێ و دروستی دەکات.

٥)- ڕاستیی پێنجەم: ئێمە پێویستە خۆمان بناسین و، لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای نەخشەی خوای کاربەجێ و کارە تەواوەکانی نەکەین و، لە هەمبانەی خۆماندا گوێز نەژمێرین:

خوا (سبحانه وتعالى) کارێك ئێستا دەیکات، جاری وایە دوای چوار پشت (جیل)ی دیکە، حیکمەتەکەی دەردەکەوێ، هەڵبەتە ڕۆژی دوایی دواقۆناغی ژیانی مرۆڤە و مەنزڵگای کۆتاییە و، شوێنی وەرگرتنەوەی ئەنجامە، بەڵام جاری وایە لە نێو ژیانی دنیای مرۆڤیشدا، دوای چەند پشتان ئنجا کاری خوا حیکمەتەکەی دەردەکەوێ، بەڵام ئێمە کورت بینین، زۆر ڕاستیشە کە گوتراوە: (رَحِمَ اللهُ امْرَءاً عَرَفَ قَدْرَ نَفْسِهِ فَوَقَف عِنْدَ حَدِّهِ)، واتە: خوا ڕەحم بە کەسێك بکات، کە ئەندازەی خۆی دەزانێ و، لە سنووری خۆی دا دەوەستێ.

ئاخر مرۆڤ! تۆ زەڕڕەیەکی لە موڵکی خوا، شتێکی بچووکی لە موڵکی خوادا، لە ڕووی قەبارەوە و لە ڕووی کاتەوە، تۆ لە چاو تروووکانێکدا لەسەر گۆی زەوی پەیدا دەبی، چۆن دەتوانی هەموو ئەوەی خوا خوڵقاندوویەتی، ئیستیعابی بکەی و دەرکی حیکمەتەکەی بکەی! ئنجا ئەوەی عەقڵیشت نەیگەیشتێ و حیکمەتەکەیت نەزانی، ڕەخنەی لێ بگری؟!

لە ڕاستییدا ئەوە جۆرێکە لە بوغرابوون و، لە کەوڵی خۆ دەرچوون، بۆیە خوا (سبحانه وتعالى) لە سووڕەتی (الإنفطار)دا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ۝٦ ﴾.

واتە: ئەی مرۆڤ! چ شتێك تۆی فریو داوە، بەرانبەر بە پەروەردگاری بەخشندەت، بۆچی لە کەوڵی خۆت دەردەچی و بوغرا دەبی و، لە بەرەی خۆت زیاتر لاق تێدەپەڕێنی؟!

٦) ڕاستیی شەشەم: بە دڵنیایی ئیلحاد و خوانەناسیی و، ڕەخنە لە خواگرتن، دژ و پێچەوانەی یەكدین:

هەر بۆیەش دەڵێین: ئەوانەی ڕەخنە لە خوا دەگرن، نە مسوڵمانێكی جیددیین، نە خوانەناسێكی جیددیین:

١-) كەسێك مسوڵمانێكی جیددیی بێ و بەڕاستیی خوا بناسێ، ڕەخنەی لێ ناگرێ، چونكە دەڵێ: خوا لە من زاناترە، لە من میهرەبانترە، ئەوەی كە خوا كردوویەتی، لە عەقڵی منەوە ناچێ، ئایا ئاوی دەریایەك لە پەرداخێكدا جێی دەبێتەوە؟! زانیاریی و حیكمەتی خوا، كە بێ سنوورن، چۆن لە عەقڵی مرۆڤەوە دەچن؟ مرۆڤ هەندێك شت دەزانێ و، زۆر شت نازانێ (عَلِمْتَ شَيْئًا وَغَابَتْ عَنْكَ أَشْيَاءٌ)، واتە: شتێكت زانیوەو زۆر شتیشت لێ پەنهانە، خواش (سبحانە وتعالی) لە سوورەتی (الإسراء) ئایەتی (٨٥)دا فەرموویەتی:

﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا﴾، واتە: كەمێك نەبێ زانیارییتان پێ نەدراوە.

ئنجا بەو كەمە زانیارییە، ئەی مرۆڤ! هەموو نهێنییەكانی بوون، نازانی و، هەموو مەتەڵەكانی بوونت بۆ هەڵنایەن، ئنجا ئایا دەكرێ هەر مەتەڵێك بۆت هەڵنەهات و، هەر نهێنییەك نەتزانی، نكووڵیی لە حیكمەتەكەی بكەی؟! كەواتە: كەسێك كە دەڵێ: خواناسم، بۆی نیە ڕەخنە لە خوا بگرێ.

٢-) كەسێكیش خوا نەناسێ، ئەوە هەر لە پێشترە كە بۆی نیە، ڕەخنە لە خوا بگرێ، ئاخر زاتێك دان بە بوونیدا نەهێنی، ڕەخنەی چی لێ دەگری؟ بۆیە ڕەخنە لە خوا گرتن و ئیلحاد، دژو پێچەوانەی یەكدین، كەسێك بەڕاستیی خوانەناس بێ، دان بە بوونی خوادا ناهێنێ، تاكو ڕەخنەی لێ بگرێ، هەروەها بەو لاشدا: كەسێك خواناس بێ و، بەڕاستیی خوا بناسێ، بە خۆی ڕەوا نابینێ ڕەخنە لە خوا بگرێ و، لە بەرانبەریدا، تووشی بێ ئەدەبیی و ناماقووڵیی ببێ.





٧) ڕاستیی حەوتەم: مەرج نیە ئەوەی ئێمە بە خراپەو زیانی دەزانین وا بێ:

لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢١٦)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾.

واتە: نیزیکە ئێوە ڕقتان لە شتێك بێ، بەڵام بۆ ئێوە باش بێ و، نیزیکە ئێوە شتێکتان حەز لێ بێ، بەڵام بۆ ئێوە خراپ بێ، خوا دەزانێ و ئێوە نازانن.

هەر کەس بەوردیی سەرنجی ژیان و بەسەرهاتی خۆی بدات، ڕاستیی ئەم ئایەتە موبارەکەی بە جوانترین شێوە لەلا بەرجەستە و نمایان دەبێ.

هەورەها خوا لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (١٩)دا دەفەرموێ: ﴿فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا﴾.

واتە: نیزیکە ڕقتان لە شتێك بێتەوە، بەڵام خوا خێرو بەرژەوەندییەکی زۆری تێدا دابنێ.

لەو بارەوە هەندێك لە کتێبەکان بەسەرهاتێك دێننەوە، باشە ئێمەش بیگێڕینەوە، بۆ پەند وەرگرتن:

گێڕدراوەتەوە: لە هەندێك لە کتێبە ئاسمانییەکاندا هاتوە، پێغەمبەرێك (صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ)، ڕۆژێك ئەم دیمەنە دەبینێ: تەماشا دەکات سوارێك دێ ئاو لە بیرێك دەخواتەوە، بەڵام پرێسکەیەکی لێ دەکەوێتە خوار و، هەست دەکرێ کە پارەیە، بەڵام ئەو هەستی پێ ناکات و دەڕوات، دوای وی، گەنجێك دێ ئاو لەو بیرە دەخواتەوە و، ئەو پرێسکە پارەیەش دەبینێ و، هەڵی دەگرێتەوەو دەڕوات.

ئنجا لە دوای ئەو گەنجە پیاوێکی بە تەمەن دێ، ئەویش ئاو لەبیرەکە دەخواتەوە، ئاوەکە دەخواتەوەو، هەر لەوێ دەبێ، سوارەکە دێتەوە.

پێی دەڵێ: پارەم لێرە لێ کەوتوە، بمدەوە!

ئەویش نکوولّیی دەکات و دەڵێ: هیچ پارەم نەبینیوەو حاشا دەکات.

بابای سواریش، کابرا بە تەمەنەکە دەکوژێ.

ئەو پێغەمبەرەش (صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ) لە خوا دەپاڕێتەوە: خوایە! ئەو پیاوە بە تەمەنە هیچی نەکرد بوو، گەنجەکە پارەکەی برد بوو، کەچی ئەو سوارە، ئەو پیاوە بە تەمەنەی کوشت، حیکمەتی چییە؟

خوای پەروەردگار وەحیی بۆ ئەو پێغەمبەرە دەنێرێ، دەفەرموێ: کاتی خۆی ئەو پیاوە بەتەمەنە، بابی ئەو سوارەی کوشتوە و، هەروەها کاتی خۆی، بابی ئەو پیاوە، کە کوژراوە، پارەی لە بابی ئەو گەنجە ستاندوە، بە زۆر لێی ستاندوە، ئنجا ئێستا ئێمە پارەکەمان بۆ ئەو گەنجە قەرەبوو کردەوە، کە پارە لە بابی ستێنراوە، لەلایەن بابی سوارەکەوە و، سوارەکەش، تۆڵەی بابی خۆی کردەوە، ئەوە حیکمەتەکەیەتی.

بە حەقیقەت زۆرجاران ئینسان، هەر لە ژیانی دنیای دا، زۆر لە حیکمەتەکانی خوای کاربەجێی بۆ دەردەکەون، بەڵام بە تەئکید دادگەریی ڕەهای خوا و حیکمەتەکانی خوا، تەنیا لەو کاتەدا بەتەواویی دەردەکەون، کە ڕۆژی دادگایی مەزنە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ ۝٩ ﴾ الطارق، ئەو ڕۆژە کە نهێنییەکان هەموویان ئاشکرا دەبن.

بەڵام بێگومان کەسێك ئەگەر خواناس بێ، دەزانێ کە خوا مادام هەموو شتێکی لە جێی خۆیدا داناوە، هەندێك کاریش کە سەری لێ دەرناچن - وەك پێشتر قسەکەی (إبن تیمیة)مان هێنا - دەزانێ ئەو شتانەش کە ئەو سەری لێیان دەرناچێ، هەر لە جێی خۆیاندان، بەڵام ئەو نهێنییەکانیانی بۆ دەرنەکەوتوە.

## ٨) ڕاستیی هەشتەم: هەبوونی شەڕو خراپە و، هەڵەو لادان و تاوان، بەرهەمی هەبوونی ئیرادەی ئازادە لە مرۆڤدا و، ئەمیش مەرجی تاقیکردنەوەیە:

مرۆڤ بەبێ ئیرادەیەکی ئازاد، کە بتوانێ چاکەشی پێ بکات و خراپەشی پێ بکات، ناگونجێ تاقی بکرێتەوە، دەبوو مرۆڤ ویستێکی ئازادی هەر هەبێ، بۆ ئەوەی بە کەڵکی تاقیکردنەوە بێ، ئەو ئایەتەی سووڕەتی (الأحزاب) یش ئاماژە بەوە دەکات:

﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ ﴾.

واتە: ئێمە سپاردەمان ڕانواند، پێشانی ئاسمانەکان و زەوی و چیایەکانماندا، ئامادە نەبوون هەڵیگرن و لێی ترسان، بەڵام مرۆڤ هەڵیگرت، بە ڕاستیی مرۆڤ زۆر ستەمکار و زۆریش نەفامە.

کاتێك مرۆڤ ئیرادەکەی لە ڕووی دەرك کردنەوە بە هەڵەدا دەچێ، تووشی نەفامیی (جَهل) دەبێ و، کاتێکیش لە ڕووی پڕاکتیکییەوە بە هەڵەدا چوو، تووشی ستەم (ظلم) دەبێ، ئنجا بە هۆی ئەو ئیرادەیەوە، مرۆڤ دەتوانێ نەفام بێ و ستەمکار بێ و، ئەگەر خاوەنی ئەو ویست و خواستە نەبووایە، ئەو کاتە نەجەهلی بەسەردا دەهات، نە زوڵمی بەسەردا دەهات، بەڵام بە هۆی ئیمانەوە، مرۆڤ دەتوانێ جەهلەکەی، بگۆڕێ بۆ عیلم و، ستەمەکەشی بگۆڕێ بۆ عەدل.

ئنجا هەبوونی شەڕو خراپە لە ژیانی مرۆڤەکاندا: هەڵەو تاوان و لادان و خوێن ڕشتن و...هتد، هەموویان بەرهەمی هەبوونی ئیرادەی ئازادن، ئیرادەی ئازادیش پێویستە بۆ ئەوەی مرۆڤ، بتوانێ مرۆڤ بێ و، بلوێ تاقی بکرێتەوە و بگونجێ هەڵگری سپاردەی خوا بێ و، بشێ جێنشینایەتیی خوا لەسەر زەوی بکات.

## ٩) ڕاستیی نۆیەم: حیكمەتی خوای كارزان لە دروستكردنی ئیبلیس دا، تاقیكردنەوەی مرۆڤە:

ئیبلیس سەرچاوەی سەرجەم گوناهو تاوان و خراپەكانە، ئەوە ڕاستە وەك خوای زانا و توانا فەرموویەتی:

﴿ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾ النمل: ٢٤.

واتە: شەیتان كردەوە خراپەكانیانی بۆ ڕازاندنەوە.

بەڵام دەڵێین: لە هەبوونی ئیبلیسیشدا، چەندان حیكمەت هەن، بۆ وێنە:

١- ئیبلیسیش یەكێكە لە دروستكراوەكانی خوا، بۆ تاقیكردنەوە خوڵقابوو، بەڵام لە تاقیكردنەوە دەرنەچوو، چونكە ئیبلیسیش ئەگەر كڕنووشی ڕێزگرتنی بۆ ئادەم بردبایە - كە ئەوە تاقیكردنەوە بوو بۆ ئیبلیس - وەك فریشتەكان، مانای وایە لە تاقیكردنەوەی خوا دەردەچوو، فریشتەكان نەیانتوانی كڕنووش نەبەن، چونكە ویستێكی ئازادیان نیە:

﴿ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾ التحريم(٦).

بەڵام ئیبلیس دەیتوانی كە كڕنووش بەرێ و، دەشیتوانی كڕنووش نەبات، چونكە ویستێكی ئازادی هەبوو، جینن و مرۆڤ هەردووكیان ویستی ئازادیان هەیە، بەڵام ئیبلیس ویستەكەی خۆی، بۆ خراپە بەكارهێنا و، سەرەنجام لە تاقیكردنەوەی خوادا كەوت.

٢- ئیبلیس هۆكارێكە بۆ تاقیكردنەوەی جند و مرۆڤەكان و، لێك جیاكردنەوەی پاك و پیس.

٣- بێگومان ئیبلیس جێگای دەرس لێ وەرگرتن و پەندو عیبرەتە، كە ئێمەش وەك ئەو نەكەین، بەڵكو وەك ئادەم بكەین، ئادەمیش (علیه السلام) هەڵەی كرد، بەڵام پەشێمان بووەوە، هەروەها ئیبلیس هەڵەی كرد، بەڵام وەك گوتراوە: (عوزر



لە قەباحەت خراپتر)، هەڵەکەی، بە هەڵەیەکی دیکە زۆر لە هەڵەکەی پێشووی خراپتر، پاساو دایەوە:

کڕنووشی بۆ ئادەم نەبرد و بێ فەرمانیی خوای کرد، خوا فەرمووی: بۆچی کڕنووش بۆ ئادەم نابەی؟! گوتی: من لەو چاکترم، واتە: فەرمانەکەی تۆ لە جێی خۆیدا نیە، ئەوەی پێشێ هەر سەرپێچیی بوو، بەڵام ئەوەی دووەمیان، ڕەخنە گرتن بوو! ئەوەیە عوزر لە قەباحەت خراپتر، ئنجا ئێمە دەبێ پەند لە ئیبلیس وەربگرین و، ئەوەش یەکێك بوو لە حیکمەتەکانی، بوونی ئیبلیس.

٤- دەرخستنی دەسەڵاتی خوا، کە خوا دەتوانێ شتە پێکەوە دژو ناکۆکەکان بخولقێنێ،

فریشتە و شەیتان.

سەرما و گەرما.

دنیا و دوارۆژ.

خێر و شەڕ.

ئەوەش دەسەڵاتی بێ سنوور و ڕەهای خوای زیاتر تێدا دەردەکەوێ.

١٠) ڕاستیی دەیەم: چەندان حیكمەتی مەزن لە هەبوونی ئەو شتانەدا هەن، كە مرۆڤ بەشەڕو خراپیان دادەنێ:

ئەو شتانەی كە لە ژیانی مرۆڤدا، مرۆڤ بە شەڕو خراپیان دادەنێ و، پێی وایە نەدەبوو هەبن، چەندان حیكمەتیان تێدان، ئێمە دوازدە (١٢)یانمان لێ گوڵبژێر كردوون:

**حیكمەتی یەكەم:** خراپەو زیان، هۆكاری هەستكردن بە خێرو خۆشیی و نیعمەتەكانن، ئەو دووانە: خراپەو زیان، بەڵا و گرفتارییەكان لەگەڵ چاكەو نیعمەتەكان، وەك دوو ڕووی دراوێك وان و، پێكەوە پەیوەستن و بەبێ یەكدی نابن: ئینسان تا تینووی نەبێ، قەدری ئاو نازانێ، تا برسیی نەبێ، قەدری خواردن نازانێ، تا سەرمای نەبێ، قەدری خۆ گەرم كردنەوە نازانێ، هەتا زۆر گەرمای نەبێ، قەدری خۆ فێنك كردنەوە نازانێ، تاكو زۆر خەوی نەیەت، قەدری نیعمەتی خەوتن نازانی، تاكو ترس و بیمی نەیەتە ڕێ، قەدری هێمنیی و ئاسایش نازانێ، هەتاكو ناكۆكیی و دووبەرەكیی نەبینێ، قەدری تەبایی و ئاشتەوایی نازانێ، هەموو ئەو شتە پێكەوە دژانە، بە هۆی خراپەكانیانەوە، ئینسان هەست بە چاكەكانیشیان دەكات، وەك گوتراوە: تەندروستیی و لەش ساغیی، تاجێكە لە سەری هەموو مرۆڤێكی تەندروست، بەڵام تەنیا نەخۆشەكان دەیبینن.

بۆ وێنە:

ئینسان سی و دوو (٣٢) ددانی هەیە، كاتێك هیچیان نایەشن، چەند نیعمەتێكی گەورەیە! جەستەی مرۆڤ لە سەد تریلیۆن (١٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) خانە پێكهاتوە، بەزۆریی هیچی گرفت و بەڵای نیە، ئەو هەموو ئەندام و كۆئەندامانەی سەلامەتن، لە چ نیعمەتێك دایە!! بەڵام كاتێك یەكێ لەو خانانەی لە ڕێی خۆی لابدات، یاخود یەكێ لە كۆئەندامەكانی لە كار بكەوێ، یاخود كەم و كوڕییەكی تێدابێ، ئەو كاتە قەدری لەشساغیی دەزانێ.

**حیکمەتی دووەم:** بە زۆریی خراپەو ناخۆشییەکان، پردی گەیشتنن بە خۆشییەکان، وەك گوتراوە: کەسێك گوڵی بوێ، دەبێ لە ئازاری دڕکەکەی نەترسێ، هەروایە، هەتا بەسەر ناخۆشییەکاندا نەڕۆی، ناگەیە خۆشییەکان، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {حُفَّتِ الْجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ، وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ} (أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: ٧٣٠٨، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ)، واتە: بەهەشت بە ناخۆشییان تەندراوە و دۆزەخیش بە ئارەزووەکان، کەسێك ڕوو لە ئارەزووان بکات، شوورەی دۆزەخ دەبڕێ و، دەچێتە نێو دۆزەخ، کەسێکیش ناڕەحەتییەکان تەحەممول بکات، شوورەی بەهەشت دەبڕێ و، دەچێتە نێو بەهەشت.

ئنجا وەك چۆن بۆ بەهەشت و دۆزەخ وایە، لە دنیاشدا هەروایە، وەك گوتراوە:

(بقَدَرِ الكَدِّ تُكْتَسَبُ المَعَالِي     مَنْ طَلَبَ العُلَى سَهرَ اللَّيَالِي)

واتە: بە ئەندازەی ئەوە کە زەحمەت و ڕەنج دەدەیە بەرخۆت، بەرزییەکان وەدەست دێنی، هەر کەسێ بەرزیی بوێ، شەونخوونیی دەکێشێ.

یانی: بەبێ ناڕەحەتیی و تەحەممولی ئازارەکان، ناگەیە خۆشیی و سەرکەوتنەکان.

**حیکمەتی سێیەم:** دەرکەوتنی سیفەتەکانی خوا، بە تایبەت حیکمەتی خوا، هەتا ناڕەحەتییەکانت نەیەنە ڕێ، هەتا ئازارو ناخۆشییەکان نەبینی، سیفەتەکانی خوات بۆ دەرناکەون، بە تایبەت حیکمەتی خوا (سبحانە وتعالى).

**حیکمەتی چوارەم:** خوا حەز دەکات لەلایەن مرۆڤەکانەوە، سوپاسگوزاریی بۆ بکرێ و، داوای لێبوردنی لێ بکرێ، یەکێ لەو شتانەی مرۆڤ تووشی دێ و ناخۆشەو ناڕەحەتە، گوناهو تاوان کردنە، ئنجا خوا پێی خۆشە مرۆڤەکان داوای لێبوردنی لێ بکەن، وەك لەم فەرمایشتەی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە:

{وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ لَمْ تُذْنِبُوا لَذَهَبَ اللهُ بِكُمْ، وَلَجَاءَ بِقَوْمٍ، يُذْنِبُونَ فَيَسْتَغْفِرُونَ اللهَ فَيَغْفِرُ لَهُمْ»} (أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: ٧١٤١، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ).

واتە: سوێند بەو زاتەی گیانمی بە دەستە: ئەگەر ئێوە گوناهتان نەکردبان، خوا ئێوەی لادەبرد و کۆمەڵێکی دیکەی دەهێنان، گوناهیان دەکرد و داوای لێبوردنیان لە خوا دەکرد و، خواش لێیان دەبورد.

کەواتە: خوا (سبحانه وتعالى) حەز دەکات داوای لێبوردنی لێ بکرێ، حەز دەکات سوپاسگوزاریی بکرێ، حەزیش دەکات لەسەر تاقی کردنەوەکانی خۆڕاگریی بکرێ، هیچ کام لەوانەش بەبێ ناڕەحەتیی و گرفتاریی ناگونجێ بێنەدی.

**حیکمەتی پێنجەم:** دەرهێنانی ئاکارە پەسندەکان لە خەڵك، ئەگەر خەڵك تووشی ناڕەحەتیی و هەورازو نشێو و گرفتاریان نەبێ، چۆن دەردەکەوێ داخۆ سیفەتی خۆڕاگرییان هەیە و، چۆن چۆنی سیفەتی خۆڕاگریی لەواندا گەشە دەکات؟

هەمیشە سیفەتە چاکەکان لە مرۆڤدا بەڕاهێنان و مەشق کردن گەشە دەکەن، سیفەتی خۆڕاگریی، سیفەتی زانست، سیفەتی هێمنیی و ئارامیی، سیفەتی خۆ پاك ڕاگرتن، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە:

{.. وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفُّهُ اللهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللهُ، وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللهُ}، (أَخْرَجَهُ البُخَارِي برقم: ١٤٠٠، وَمُسْلِم برقم: ٢٤٧١، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ).

واتە: هەر کەسێك خۆی لەسەر بێ نیازیی و چاو لە دەستی خەڵك نەبوون ڕابێنێ، خوا بێ نیازی دەکات و، هەر کەسێك خۆی لەسەر پاکیی ڕابێنێ، خوا پاکیی پێ دەبەخشێ و، هەر کەسێك خۆی لەسەر پشوودرێژیی و بارقووڵیی ڕابێنێ، خوا صەبری پێ دەبەخشێ.

هەروەها لە فەرمایشتی دیکەدا هاتوە، دەفەرموێ: {إِنَّمَا الْعِلْمُ بِالتَّعَلُّمِ، وَإِنَّمَا الحِلْمُ بالتَحَلُّمِ}، (أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُ في "الأوسط: برقم: ٢٦٦٣، والخطيب (٢٠١/٥)، وابن عساكر (٩٧/١٨) عَنْ أَبِي الدَّرْدَاء).

واتە: بەدڵنیایی زانیاریی بە فێربوونە و، هێدیی و مەندییش بە خۆڕاهێنانە.

کەواتە: ئەگەر ناڕەحەتییت نەیەتە ڕێ، صەبری لەسەر ناگری، ئارەزووت نەیەتە ڕێ، دەرناکەوێ کە سیفەتی خۆ پاکڕاگرتن لە تۆدا چەندە؟ هەروەها جار جار دەبێ بە نەزانیی خۆت بزانی، بۆ ئەوەی ئەو حاڵە پاڵت پێوە بنێ، عیلم پەیدا بکەی، هەروەها جار جار دەبێ تووشی بێ صەبریی و کەم حەوسەڵەیی ببی، بۆ ئەوەی سیفەتی ئارامیی و هێمنیی پەیدا بکەی.

**حیکمەتی شەشەم:** تاقیکردنەوەی ئیمانی بەندەکان، بەبێ بەڵا و گرفتاریی ئیماندارەکان چۆن تاقی بکرێنەوە کە ئایا ئیمانیان چەندە؟! وەك خوا دەفەرموێ:

﴿الٓمٓ ﴿١﴾ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٣﴾﴾ العنكبوت.

واتە: ئایا خەڵك پێیان وایە، کە گوتیان: بڕوامان هێنا، وازیان لێ دەهێنرێ و تاقی ناکرێنەوە، بە دڵنیایی ئەوانی پێش ئەوانمان تاقی کردەوە و، بە دڵنیایی خوا ڕاستان دەناسێ و درۆزنانیش دەناسێ.

بەڵام بۆیە تاقییان دەکاتەوە، تاکو بە کردەوە شایەدیی لەسەر خۆیان بدەن، کە چ ماڵێکن و چ مەعدەنێکن؟ کەواتە: بەبێ ناڕەحەتیی و گرفتاریی و ناخۆشییەکان، ئیمانی بەندەکان تاقی ناکرێتەوە.

**حیکمەتی حەوتەم:** ناچارکردنی مرۆڤ بە گەڕانەوە بۆ لای خوا، ئینسان ئەگەر ناڕەحەتیی نەیەنە ڕێ، زۆر جاران شەیتان فێڵی لێ دەکات و کڵاوی لەسەر دەنێ، هەروا بە پێخواسیی بە نێو دەکەوێ و، بەدوای ئارەزووان دەکەوێ و، ناگەڕێتەوە بۆ لای خوا، ناڕەحەتییەکان زۆر جاران قەمچی خوان، وەك پێشینان گوتوویانە: زللەی میهرەبانیین، زۆر کەس لە زینداندا گەڕاوەتەوە، من کەسی وام بینیوە، زۆر خراپەکار بووە، لە زینداندا نەك هەر گەڕاوەتەوە، بەڵکو بووە بە خواناسێکی زۆر باش و، بووە بە بانگخوازێکی باش.

**بەسەرهاتی مەلایەکی دەرچووی زیندان:**

مامۆستایەکی خەڵکی ناوچەی سەردەشت، ناوی (مامۆستا مەلا محمد أمین)بوو، من وامزانی هەر بە فەقێیەتیی خوێندوویەتی و بۆتە مەلا.

لێم پرسی: چۆن بوویە مەلا؟!

گوتی: ئەگەر بەسەرهاتی مەلایەتیی خۆمت بۆ بگێڕمەوە، زۆر سەیرە!

گوتم: چۆن؟

گوتی: من قاچاخچیی بووم، نە دەمزانی خوا کێیە؟ نە دەمزانی نوێژ چییە؟ ڕۆژوو چییە؟ نە دەمزانی حەڵاڵ چییە؟ نە حەڕام چییە؟

جارێکیان لە سەفەرێکی کاروانچێتی لەلای ئۆردوگای (بەستەستێن) چەکدارەکانی ڕژێم گرتیانم و بەناوی پاسدار تەسلیمی ڕژێمی عێڕاقیان کردم، لە زیندانی موسڵ گیرام، نۆ (٩) ساڵان سجن بووم، کەڕە نەخوێندەوارێك، نە خوێندن و نووسینم دەزانی، نە خوام دەناسیی، نە ئیسلامەتییم دەزانی، هیچم نەدەزانی.

گوتی: لەوێ خەڵکێکم لێ هەڵکەوت، پێشێ فێری زمانیان کردم، فێری پیتەکانیان کردم، دوایی فێری زمانی عەرەبییان کردم، دوایی فێری قورئانیان کردم، سەرەنجام: لەو نۆ (٩) ساڵەدا قورئانم هەموو لەبەر کرد، چەندان فەرمایشتی پێغەمبەرم (صلی الله علیه وسلم) لەبەر کردن، زانستە ئیسلامییەکانم خوێندن: تەفسیر، ئوصوڵی فیقە، فیقە، عەقیدە، تەجوید...هتد، ئیدی بە کەڕە نەخوێندەوارێکی خوانەناس چووبوومە زیندان، بە مەلایەتیی هاتمە دەرێ، دوای نۆ (٩) ساڵان عەفوو کرام و، بوومە مەلا!!

بەڵێ لە ڕاستییدا نارەحەتیی و گرفتارییەکان، زۆرجار قەمچی و زللەی میهرەبانیی خوان، بۆ گێڕانەوەی مرۆڤەکان بۆ لای خوا.

**حیکمەتی هەشتەم:** سڕانەوەی گوناهو تاوانەکان: یەکی دیکە لە حیکمەتەکانی نارەحەتیی و گرفتارییەکان لە ژیانی مرۆڤدا، ئەوەیە کە مرۆڤەکان لە گوناهـ و تاوانەکان بسڕێنەوە، پاك بکرێنەوە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هاتوە:

{مَا يُصِيبُ المُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ، وَلاَ وَصَبٍ، وَلاَ هَمٍّ، وَلاَ حُزْنٍ، وَلاَ أَذًى، وَلاَ غَمٍّ، حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا، إِلاَّ كَفَّرَ الله بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ}، (أَخْرَجَهُ البُخَارِي برقم: ٥٣١٨، وَمُسْلِم برقم: ٦٧٣٣، من حَدِيث أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ وَأَبِي هُرَيْرَةَ).

واتە: تووشی بڕوادار نابێ نە ماندوو بوون، نە خەفەت، نە دڵتەنگیی، نە هیچ ئازارێك، تەنانەت كە دڕكێكی تێڕا دەچێ، مەگەر خوا بە هۆی ئەوەوە، لە گوناهەكانی دەیسڕێتەوەو پاكی دەكاتەوە.

**حیكمەتی نۆیەم:** هەستكردنی مرۆڤ بە كەمیی و بێبایەخیی ژیانی دنیا، لە ڕووە مادديیەكەیەوە، بە هۆی ئازاری قەمچی بەڵاو گرفتارییەكانەوە.

لە ڕاستییدا ئینسان كە تووشی و بەڵاو گرفتارییەكان دەبێ لە دنیادا، كە بە عەرەبیی پێیان دەگوترێ: (المُنَغِّصات)، واتە: ژیان تاڵكەرەكان، ژیان ناخۆشكەرەكان، ئەوە وای لێ دەكات كە زۆر باوەش بە دنیادا نەكات و شیرینایەتیی ژیانی دنیا، هێندە بە گەروویدا نەچێتە خوارێ، كە ئاگای لە خواو خەڵك ببڕێ، بۆیە ئەوەش دیسان حیكمەتێكی دیكەی ناڕەحەتیی و گرفتارییەكانە، لە ژیانی دنیای مرۆڤدا.

**حیكمەتی دەیەم:** كاركردنی یاسا سروشتییەكانی خوا:

خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٦٥﴾.

بێگومان یەكێك لە یاساكانی خوا وایە، كە كاتێك هێزێك بەرانبەری دوژمن دەوەستێ، دەبێ فەرمانبەریی قیادەی خۆی بكات، ئنجا مسوڵمانان لە جەنگی ئوحوددا، فەرمانی پێغەمبەری خوایان (صلى الله عليه وسلم) شكاند، ئەویش ئەوە بوو كە تیرهاوێژەكان كە لەسەر شاخۆلكەی تیرهاوێژەكان (جَبَلُ الرُّماة) بوون، زۆربەیان فەرمانی پێغەمبەریان شكاند و هاتنە خوار، لە ئەنجامی ئەوەدا جەنگەكەیان دۆڕاند، لەو بارەوە خوا دەفەرموێ:

ئایا کە بەڵایەکتان تووش هات، ئێوە دووقاتی ئەوەتان تووشی دوژمن کرد بوو، (لە جەنگی بەدردا حەفتاتان لێ کوشتبوون و حەفتاشتان لێ بەدیل گرتبوون، بەڵام ئێوە لە جەنگی ئوحوددا حەفتاتان لێ کوژرا)، گوتتان: ئەوە لە کوێوە بوو؟ خوا دەفەرموێ:

﴿قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ﴾.

بڵێ: ئەوە خەتای خۆتانە، واتە: یاسای خواتان بەسەردا چەسپیوە.

بەڵێ: نارەحەتیی و گرفتاریی و بەڵایەکان، بریتین لە بەرجەستە بوونی یاساکانی خوا (سنن الله)، لە ژیاندا و ناگونجێ خوا یاساکانی خۆی پەك بخات، تاکو خەڵك تووشی نارەحەتیی نەبێ، سروشتی ژیانی دنیا وا هەڵدەگرێ.

**حیکمەتی یازدەیەم:** پاداشت و قەرەبووی ڕۆژی دوایی:

لە ڕۆژی دواییدا ئەو کەسانەی تووشی گرفتاریی و نارەحەتیی دێن، خوا قەرەبوویان دەکاتەوە، پاداشتیان دەداتەوە و بەخەسار ناچێ، بۆ کەسی خواناس بە خەسار ناچێ، بەڵام بابای خوانەناس، (خَسِرَ الدُّنيَا وَالأَخِرَة) نە دنیایەکەی خۆشە، نە لە دوارۆژەکەشی دا هیچ پاداشتێکی خوای چنگ دەکەوێ.

لە فەرمایشتێکی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە:

{يُؤْتَى بِأَشَدِّ النَّاسِ بُؤْسَاً فِي الدُّنْيَا مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَيُصْبَغُ صَبْغَةً فِي الْجَنَّةِ، فَيُقَالُ لَهُ: يَا ابْنَ آدَمَ هَلْ رَأَيْتَ بُؤْسَاً قَطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ شِدَّةٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ: لاَ وَاللهِ يَا رَبِّ، مَا مَرَّ بِي بُؤْسٌ قَطُّ، وَلاَ رَأَيْتُ شِدَّةً قَطُّ}، (أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: ٧٢٦٦).

واتە: حاڵ ناخۆشترینی خەڵکی لە ژیانی دنیادا، (کە دوایی دەخرێنە بەهەشت)، دەهێنرێ، یەکجار لە بەهەشتێ هەڵدەکێشرێ، (بە بەهەشتێ دا دەگێڕدرێ)، پێی دەگوترێ: ئەی ڕۆڵەی ئادەم! هەرگیز نارەحەتیی و مەینەتییت دیوە؟! هەرگیز گرفتارییت لێ تێپەڕیوە لە ژیانی دنیادا؟! دەڵێ: نەخێر، ئەی پەروەردگارم! سوێند بە خوا هەرگیز، مەینەتییم نەدیوە و هەرگیز نارەحەتییشم نەچێشتوە، لە دنیادا، (هەمووی لەبیر دەچێتەوە).

هەروەك لە درێژەی فەرمایشتەکەدا هاتوە، دەفەرموێ: {يُؤْتَى بِأَنْعَمِ أَهْلِ الدُّنْيَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُصْبَغُ فِي النَّارِ صَبْغَةً، ثُمَّ يُقَالُ: يَا ابْنَ آدَمَ! هَلْ رَأَيْتَ خَيْراً قَطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ نَعِيمٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ لاَ وَاللهِ يَا رَبِّ}، واتە: خۆشگوزەرانترینی خەڵکی دنیاش دەهێنرێ، یەکجار لە دۆزەخ هەڵدەکێشرێ، دوایی پرسیاری لێ دەکرێ: ئەی ڕۆڵەی ئادەم! هەرگیز لە دنیادا خۆشییت دیوە؟! هەرگیز ناز و نیعمەتت بەسەردا ڕۆیشتوە؟ دەڵێ: نە بە خوا پەروەردگارم، هەرگیز خۆشییم نەدیوە (هەمووی لەبیر دەچێتەوە).

**حیکمەتی دوازدەیەم و کۆتایی:** ئازار لە زۆر مەترسیی فەوتێنەر دەمانپارێزێ و، لە ڕاستییدا ئازار جەرەسی بێدار کردنەوەیە، ئنجا ئەگەر ئازارەکەش تاقەت پڕووکێن نەبێ، ئامانجەکەی ناپێکیی، کاتێك ئازارێك لە هەموو جەستەتدا هەیە، یان لە شوێنێکی جەستەت و لە ئەندامێکتدا ئەوە جەرەسە، زەنگی بێداریی و هۆشیارییە، کە: بزانە! ناتەواویی و کەم و کوڕییەك لەوێ هەیە.

**١١) ڕاستیی یازدەیەم و کۆتایی[١]: نە دەگونجا ژیانی دنیا بێ ئازار بێ و، تەنیا چاکەکارانی تێدا بن و، خراپەکارانی تێدا نەبن، کە بە هۆی خراپەکارانەوە، ئازار پەیدا دەبێ:**

ئەگەر (ماوتسی تۆنگ و لینین و ستالین) لە بلووکی ڕۆژهەڵاتی کاتی خۆی نەبوونایە، کە ئەو هەموو ملیۆنان خەڵکەیان قەتڵ عام کرد، هەروەها ئەگەر: (هیتلەرو مۆسۆلێنیی) لە بلووکی جیهانی سەرمایەداریی نەبوونایە و، ئەگەر زلهێزەکانی ئێستای کە مافی ڤیتۆیان هەیە، نەبوونایە، کە جیهانی ئیسلامییان پڕ کردوە، لە ستەم و ئاشووب و غەڵتانی خوێنیان کردوە، ئەگەر ئەو خراپەکارانە نەبوونایە، ئەو کاتە حیکمەتی خوا نەدەهاتە دی لە ژیانی دنیا، کە دەبێ چاکەکاران و خراپەکارانیش ببن، بەڵێ خراپەکاران سەرچاوەی هەموو شەڕو کوشتارو ئاژاوەو ئاشووبێکن، بەڵام سروشتی ژیانی دنیا وایە، ئەدی چۆن چاکیی چاکەکاران دەربکەوێ؟ ئەدی چۆن بەرخۆدان و فیداکاریی کەسانی تێکۆشەر، لە پێناوی خوادا و لە پێناوی چەوساواندا دەربکەوێ، ئەگەر خراپەکاران نەبن؟!

لێرەدا کۆتایی بە دەرخستنی پووچەڵیی بیانووی سێیەمیش دێنین.



---

(١) لەسەر زیاتر دەرخستنی پووچەڵیی ئەو بیانووە کە: هەبوونی گرفتاریی و ناڕەحەتیی و ئازارو مەینەتییەکان لە ژیانی مرۆڤدا، نابێتە بیانوو و پاساوی خوانەناسیی.





## بیانووی چوارەم: مادام گەردوون یاسادار (منظم) و سیستماتیکە، پێویستیی بە بەدیهێنەر نیە:

بەڕێـــزان!

پووچەڵیی ئەم بیانووەش لە حەوت (٧) خاڵدا، دەردەخەین:

١) هەبوونی یاسا (قانون)، لە جیاتی ئەوەی بێنیازمان بکات لە خوا، ناچارمان دەکات دان بە بوونی خوادا - کە یاسادانەرە - بێنین، چونکە لە ڕاستییدا یاسا پەلکێشی یاسا دانەر دەکات، یاسا و سیستم و ڕێك و پێکیی، ناچارمان دەکات، پەنابەرینە بەر یاسادانەرو ڕێکخەرێك، پەیدابوونی بۆ ئەو ڕێك و پێکیی و ئەو یاسایە.

بۆ وێنە: ئایا یاسای بەنزین و گاز و سووتاندنی لە نێو مەکینەی سەیارەدا (هەندێك سەیارە بە بەنزین کار دەکەن و هەندێکیش بە گاز) ئایا ئەوە بەدیلە بۆ دروستکەری سەیارەکە، کە بگوترێ: ئەوەتا دیارە بەنزینەکە دەسووتێ، یان گازەکە دەسووتێ و مەکینەکەی کار پێ دەکات و، سەیارەکە دەڕوات و، پێویستیی بەوە نیە بیگێڕینەوە بۆ دروستکەر (صانع)ێك؟؟ ئایا ئەوە شیکردنەوەیەکی ڕاستە؟

یان بە پێچەوانەوە: دەبێ بڵێین: ئەوە کە بەنزین یان گاز لە نێو مەکینەی سەیارەدا دەسووتێ و، دەبێتە هۆی کارپێکردنی مەکینەی ئەو سەیارەو، ڕۆیشتنی سەیارەکە، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی: کەسێك دروستیکردوە و ئەو تەگبیرەی بۆ ئەو سەیارەیە کردوە؟ - پێشتریش باسمان کردوە - کە یاسا و سیستم بەڵگەی یاسادانەرە.

٢) ئەم بیرۆکەیەی بێنیاز بوونی گەردوون لە بەدیهێنەر، بە هۆی ڕێك و پێکییەوەش، دیسان لە ڕۆژئاوا سەری هەڵداوە و، لەوێوە سەرچاوەی گرتوە، چونکە مولحیدەکانی ڕۆژئاوا، پێیان وابووە، کاتێك شتێك پەکی لەسەر بەدیهێنەر

کەوتوە، کە پەیدابوونەکەی هیچ هۆکارێکی سروشتیی نەبێ! چەند بیرۆکەیەکی غەڵەتە! هەر بۆیە لە سەدەی هەژدەو نۆزدەدا کە زانستە ئەزموونییەکان، سەرەتایان بوو و تازە گرو گاڵیان بوو، شەپۆلی ئیلحاد زۆر پەرەی ستاند و پێیان وابوو: هەر کاتێك هۆکاری سروشتیی هەر شتێك دۆزرایەوە و زانرا چۆن ڕوودەدا! ئەو کاتە پێویستیی بە خوا نامێنێ! بەڵام ئەمیش - وەك لە باسی یەکەمی ئەم بەشی سێیەمەدا باسمان کرد - هۆکارەکەی بریتی بوو لە هەڵوێستی چەوتی کڵێساو چینی ئەکلیرۆس، کە پێیان وابوو زانیاریی و ئایین دژو پێچەوانەی یەکدین و، هەر کەسێك لە نهێنییەکی خوای کۆڵیبایەوە، مەحکووم و تاوانباریان دەکرد، هەتا لە مێژووی ڕۆژئاواییەکاندا هاتوە:

جارێك مامۆستایەکی قەشە دەرسی دەگوتەوە بە کۆمەڵێك قوتابی، پرسیار هاتە سەر ئەوە: دەبێ ئەسپ چەند ددانی هەبن؟ مامۆستایەکە گوتی: مادام لە کتێبی پیرۆزدا، باس نەکراوە، باسی ناکەین، لەوێ دا نەهاتوە: ئەسپ چەند ددانی هەن! قوتابییەك بە زمانی سووتاو گوتی: مامۆستا! هەندە بە زەحمەت نیە، ئەسپێکیی تۆپیو تەماشای شەویلاگەی دەکەین و ددانەکانی دەژمێرین! مامۆستایەکە زۆر سەرزەنشتی قوتابییەکەی کرد و لێی تووڕە بوو، گوتی: چۆن قسەیەك دەکەی کە لە کتێبی پیرۆزدا نەهاتوە؟ مادام لە کتێبی پیرۆزدا باس نەکراوە، دروست نیە ئەو قسەیە بکرێ!

نەصرانییەکان ئاوا دژی زانست بوون و، لە کاردانەوەی ئەوەدا ئەو بیرۆکەیە کە دەڵێ: (هەر کاتێك هۆکاری سروشتیی شتێکمان بینی، کەواتە: پێویستیی بە خوا نیە)، سەری هەڵدا، بەڵام بەپێی عەقڵ و مەنتیق بە پێچەوانەوە: هەر کاتێك یاسادارێی و ڕێك و پێکییان بینی، ئەو یاسادارێی و ڕێك و پێکییە، ناچارمان دەکات: پەنا بەرینە بەر بەدیهێنەرێکی ئەو پەڕی زانای توانای کارزان.

**٣)** زاراوەیەك هەیە لەلای مولحیدە ڕۆژئاواییەکانی ئێستا، وەك: (ریتشارد داوکینز) و (هیتشنیز) و (ستیفن هۆکینگ) و (دینیت) و (سام هارس) بەکاردەهێنرێ، دەڵێن: خوای کەلێن و بۆشاییەکان (إله الفجوات).

کە مەبەستیان ئەوەیە: کاتی خۆی مرۆڤەکان ئەگەر هۆکاری ڕوودانی شتێکیان نەزانیبێ، گوتوویانە: ئەوە خوا دروستیکردوە، بۆ وێنە: چۆن باران دەبارێ؟ هۆکارەکەیان نەزانیوە، گوتوویانە: خوا دەیبارێنێ، هەورە تریشقە بۆچی ڕوودەدا؟ گوتوویانە: خوا تووڕە بووە، یان قەمچی خوایە، ئەو شتە بۆچی وایە؟ ئەوە خوا کردوویەتی، ئنجا دەڵێن: دوای ئەوەی کە هۆکارە سروشتییەکان زانران، پێویستی بە پەنابردنە بەر خوا نیە و، کە هەتا زانیاریی بەرەو پێشەوە بچێ و، بۆشاییەکان زیاتر پڕببنەوە، کەمتر پێویستییمان بە خوا دەبێ!! کە ئەمەش دیسان هەر پەیوەندیی بە ڕۆژئاواوە هەیە و، لەو ژینگە ناتەندروستەی کە ئایینی نەصڕانیی لە ڕۆژئاوادا پەیدای کردبوو، ئەو بیرۆکەیەش سەری هەڵدا.

٤) ئێمەی مسوڵمان لە ئیسلامدا هەرگیز ئەو کێشەیەمان نەبووە، چونکە خوا لە قورئانێ دا یاساکانی خۆی لە گەردووندا، بە (سُنن) ناوبردوون و، فەرمانیشی پێ کردووین، یاساکانی خوا بدۆزینەوە.

با وەك نموونە سەرنجی چەند ئایەتێك بدەین:

١- خوا لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ١٣٧ ﴾.

واتە: لە پێشدا ئێوەدا یاسایانێك ڕابردوون، بە زەویدا بڕۆن و سەرنج بدەن، سەرەنجامی بەدرۆدانەران چۆن بوو!

یانی: یاساکانی خوا کەشف بکەن و، یاساکانی خوا کە بەسەر ئەواندا چەسپین، ئاگاتان لێ بێ، بەسەر ئێوەشدا نەچەسپێن، کە یەکێکیان ئەوەیە: هەر کەس پێغەمبەرانی خوا بە درۆ دابنێ، خوا سزای دەدات.

٢- لە سوورەتی (الأحزاب)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلُۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا ٦٢ ﴾.

واتە: ئەوە یاسای خوایە لەوانەدا کە ڕابردوون لەمەو پێش، گۆڕین بۆ یاسای خوا نابینی.

٣- لە سوورەتی (العنكبوت)یشدا، خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٢٠) ﴾.

واتە: بڵێ: بە زەویدا بڕۆن و سەرنج بدەن، خوا دروستكراوەكانی چۆن دەست پێكردن! دواییش خوا جارێكی دیكە دروستیان دەكاتەوە.

٥) بێجگە لە یاساداریی و ڕێك و پێكیی، شایستەی خوای زانا و توانا و كاربەجێ نیە، ئایا لە خوای زاناو تواناو كارزان، چی چاوەڕوان دەكرێ، مەگەر ئەوە كە وەك چۆن نابینین: بەرنامەكەی هیچ كەم و كوڕییەكی تێدا هەبێ، كە قورئان و شەریعەتە، هەر ئەوەش لە خوا چاوەڕوان دەكرێ، كە دروستكراوەكانیشی لەو پەڕی یاساداریی و ڕێك و پێكیی دابن، وەك خوا (سبحانه وتعالی) دەربارەی فەرمایشتی خۆی، دەربارەی قورئان فەرموویەتی:

أ- ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴾ الأنعام: ١١٥.

واتە: فەرمایشتی پەروەردگارت لە ڕاستیی و دادگەرییدا، تەواوی كردوە، لە لووتكەدایە.

ب- هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٣)ی سوورەتی (المائدة)دا، دەربارەی ئیسلام (شەریعەت)، دەفەرموێ: ﴿ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ﴾.

واتە: ئەمڕۆ ئاینەكەتانم بۆ تەواو كردن.

ئنجا بە هەمان شێوە: لە بارەی دروستكراوەكانیشیەوە، هەروای فەرمووە، بۆ نموونە:

أ- ﴿ مَّا تَرَىٰ فِي خَلْقِ الرَّحْمَٰنِ مِن تَفَاوُتٍ ﴾ الملك: ٢.

واتە: لە دروستكراوی خوای خاوەن بەزەیی دا ناڕێكیی نابینی.

ب- لە سوورەتی (النمل) ئایەتی (٨٨)دا دەفەرموێ: ﴿ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ ﴾.





واتە: ئەمە دروستکراوی خوایە، کە هەموو شتێکی بەو پەڕی وردەکاریی دروستکردوە.

ج- لە سوورەتی (السجده) ئایەتی (٧)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ﴾.

واتە: ئەو خوایە، کە هەموو شتێکی بە چاکترین شێوە دروستیکردوە.

بەڵێ هەر وا لە خوا چاوەڕێ دەکرێ، کە دروستکراوەکانی سیستماتیك و ڕێك و پێك بن و، ئەو پەڕی یاساداریی و وردەکارییان تێدا بێ.

٦) لە ڕاستییدا ئەگەر بوونەوەر ناڕێك و پێك و پادشاگەردانیی بووایە، ئنجا ڕێی تێدەچوو ئیلحاد جێی پێی ببێتەوە، واتە: کاتێك ئێمە گەردوونێکی پڕ وردەکاریی و یاسادار دەبینین، دەبێ بزانین کە جێ پێی ئیلحادی تێدا نیە و، کاتێك گومان دەکرا کە خوایەك، بەدیهێنەرێك ئەم گەردوونەی نەخوڵقاندبێ، کە بێ یاسایی و ناڕێك و پێکیی تێدا بووایە.

٧) قسەی چوار لە زانایانی پسپۆڕی زانستە سروشتییەکان بە نموونە:

ئێستاش با قسەی چەند زانایەکی، پسپۆڕو شارەزا لە بواری زانستە سروشتییەکاندا، زانستە ئەزموونییەکاندا، بە نموونە بێنینەوە، کە هەندێکیان مولحیدن، بەڵام دان بەوەدا دێنن کە سیستماتیکیی گەردوون و یاساداریی گەردوون، بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر بوونی خوای پەروەردگار:

**یەکەم:** (فرید هویل): گەردووناسی ناودار، کە مولحیدیشە، دەڵێ: بەشێوەیەکی زۆر گەورە بیرۆکەی ئیلحاد لە دڵ و زەینمدا لەقی، دوای ئەو هەموو وردەکاریی و دۆزراوانە کە دەرکەوتن، کە تاکە لێکدانەوەی گونجاو لەگەڵ سەرەتا عەقڵییەکاندا، بۆ ئەو ڕاستییە زانستییانەی کە دەرکەوتوون، دەربارەی گەردوون و ژیان و دەوروبەر، ئەوەیە کە زیرەکییەکی لە ڕاددەبەدەر، گەمە بە فیزیاو کیمیاو بیۆلۆجیا دەکات و، ئەو ژمارانە و، ئەو ڕاستییانە کە دەرکەوتوون،





بۆ من زۆر ڕۆشنن کە هەر جۆرە ئیشکالێك لە بارەی بوونی پەروەردگار و بەدیهێنەرێکەوە، بێهێز دەکەن[١].

مەبەستی ئەوەیە بڵێ: کە بەهێزترین بەڵگەی خواناسان، ئەو ڕێك و پێکیی و سیستماتیکییەیە کە لە گەردووندا دەبینرێ.

**دووەم:** (بول دیفیز): ئەویش زانایەکی فیزیایی ناودارە، دەڵێ:

تەنانەت زانا مولحیدەکانیش ئەو ڕێك و پێکیی و وردەکاریی و سیستماتیکییەی کە لە گەردووندا هەیە، پێی هەڵا دەڵێن و، مرۆڤەکان کە هەموویان بەشێکی بچووك نەبێ، لەو گەردوونە پێك ناهێنن، سەرسامن بەو هەموو وردەکاریی و سیستماتیکییەی کە لە گەردووندا هەیە[٢].

**سێیەم:** (کریستوفر هیتشنز): کە مولحیدێکی زۆر دڕە، بە تەعبیری ئەو کتێبەی کە من لێم هێناوە، دەڵێ:

بێگومان ئەو وردەکاریی و ڕێك و پێکیی و کۆنترۆڵە وردەی کە دەیبینین لە گەردووندا، بەهێزترین بەڵگەیە، کە لایەنی بەرانبەر (مەبەستی خواناسانە)، دەیخاتە ڕوو و لە دژی ئێمە بەکاری دێنن[٣].

**چوارەم:** (جون لینکس): کە ماتماتیك زانێکی ناودارە، ئەویش دەڵێ:

هەتا زانیارییمان بە گەردوون زیاتر بێ، گریمانەی هەبوونی پەروەردگار هێزی زیاتر پەیدا دەکات، کە باشترین لێکدانەوەیە بۆ چۆنیەتی پەیدابوونی ئێمە لێرە و، ئەو گەردوونەی کە دەیبینین[٤].

---

(١) شموع النهار، ص٢٧٠، کە پێشتریش چەند جارێك ئاماژەمان پێداوە، دیارە ئەو لە سەرچاوەکەی خۆیەوە هێناویەتی و وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبیی.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ص٢٧٠.

(٣) سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

(٤) سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.



ئێستاش با بێینە سەر بیانووی پێنجەمی مولحیدەکان، بۆ پشت لە خواکردن و، نکووڵیی کردن لە بوونی خوا (سبحانه وتعالی)، کە بیانوویێکی زۆر پشت پێبەستراوی زۆرێك لە مولحیدەکانە، بۆیە ئێمەش پانتاییەکی باشمان بۆ دەرخستنی پووچەڵییەکەی تەرخانکردوە.

## بیانووی پێنجەم: مادده یان گەردوون هەربوو (أَزَلي)یەو پێویستیی بە بەدیهێنەر نیە:

مولحیدەکان هەندێکیان دەڵێن: مادده ئەزەلیی و هەربوو و بێ سەرەتایە و، هەندێکیشیان دەڵێن: گەردوون.

دیارە ئێمە لە وەڵامی ئەو قسە و ئیددیعایەدا، دوازدە (١٢) ڕاستیی دەخەینە ڕوو[1]، کە هەر کامێکیان بەڵگەیەکی هەڵوەشێنەرەوەی ئەو گومان و دەعوایەن، چ جای هەموویان پێکەوە؟!

**١) ڕاستیی یەکەم:** مادام ئیسپات بوو - وەك پێشتر باسمان کرد - کە هیچ شتێك لەخۆوە پەیدا نابێ و، ئەوە یاسایەکی ڕۆشن و ڕوون و بێ چەندو چوونی عەقڵییە: کە هیچ شتێکی پەیداکراو، بەبێ پەیداکەر پەیدا نابێ، هیچ شتێکی وەدیهێنراو، بەبێ بەدیهێنەر پەیدا نابێ، بۆیە ئەم قسەیە - هەربوویێتیی مادده یان گەردوون - هیچ بنەمایەکی نیە و هیچ بەهایەکی نیە.

**٢) ڕاستیی دووەم:** ئەم قسەیە قسەیەکی میتافیزیکییە، واتە: قسەیەك نیە، وەك مولحیدە ماددییەکان ئیددیعا دەکەن، کە بتوانن بەڵگەیەکی تاقیگەیی (مختبري) لەسەر بێننەوە، بەڵکو قسەیەکی میتافیزیکییە، چونکە قسەیەکە لەبارەی نادیار (غیب)ەوە، وەك خوا (سبحانه وتعالى) لە ئایەتی (٥١)ی سوورەتی (الکهف)دا دەفەرموێ:

﴿مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا ٥١﴾.

---

(١) ئێمە ئەم بەڵگانە لە کتێبی: (البحث عن الحقيقه الكُبرَى)ی، (المهندس عصام قصاب)، ص(١٠٧-١٠٨)، هەروەها چەند سەرچاوەیەکی دیکە کە ئاماژەیان پێدەدەین، وەردەگرین، بەڵام بە دەستکاریی و گۆڕانکاریی خۆمەوە.

واتە: من لە کاتی بەدیهێنانی گەردوون، (ئاسمانەکان و زەوی)دا و لە کاتی بەدیهێنانی خۆشیاندا، ئامادەم نەکردوون، (تاکو لە بارەیەوە قسە بکەن).

هەروەها ﴿مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ﴾، دەشگونجێ مەبەستی ئەوە بێ کە: ئاگادارم نەکردوون و پێشانم نەداون، کە گەردوون چۆن دروست بووە و خۆشیان چۆن دروست بوون؟

کەواتە: هەر شتێك لەو بارەوە بیڵێن، تفەنگ بە تاریکییەوە نانە و، قسەکردنە لە نادیار، بەبێ بەڵگە.

٣) **ڕاستیی سێیەم**: ماددە هەرگیز بە تەنیا بوونی نیە، هەرگیز ماددە بە ڕووتیی و بە تەنیا بوونی نیە، مەگەر لە خەیاڵ و مێشکدا، ئەگەرنا ماددە، یان دەبێ ئەوەی پێی دەڵێن: شلەی گەردوونیی (الحساء الكوني)، لەو شێوەیەدا بێ، کە زانایان دەڵێن: بەر لەوەی تەنانەت تەنۆلکەکان و، پێکهاتە سەرەکییەکانی گەردیلەش: ئەلیکترۆن و پرۆتۆن و نیۆترۆنیش، دروست بن، ماددەی گەردوون لە شێوەی شۆربایەك، یان شلەیەکدا بووە، کە خوای پەروەردگاریش لە سووڕەتی (فصلت) ئایەتی (١١)دا ئاماژەی پێ دەکات، کە دەفەرموێ:

﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ﴾.

واتە: دوایی خوا ویستی ئاسمان (واتە: گەردوون) دروست بکات، لەو کاتەدا دووکەڵ، بوو.

ئەو زانایانەش مەبەستیان پێ حاڵەتێکی ئاوا، بووە: حاڵەتێکی سادەی ماددە.

ئنجا ماددە، یان دەبێ ئەو گاز و دووکەڵە بوو بێ، کە پێیدەڵێن: شلەی گەردوونیی، یان لە حاڵەتی تەنۆلکەکاندا بووبێ، یان لە حاڵەتی گەردیلەکاندا، یان ئەستێرەکان و خڕۆکەکان، سەرەنجام ماددە دەبێ لە دیاردەکاندا بەرجەستە ببێت، واتە: ماددە یان مرۆڤە، یان ڕووەکە، یان ئاژەڵە، یان زیندەوەرە، یان هەوایە، یان تیشکی خۆرە...هتد، ماددە بە ڕووتیی و بەبێ ئەوەی کە لە حاڵەتێکی بەرهەستدا بەرجەستە ببێ، بوونی نیە.

کەواتە: بە سەلمێنرانی سەرەتادار بوونی گەردوون، پەیدا بوونی ماددەش دەچەسپێ، چونکە ماددەش کەرەستەیەکی خاوە و دەبێ لە شتێکدا بەرجەستە ببێ، ئەو جار بوونی دەبێت، ئەگەرنا بوونی وێنا (تَصَوُّر) ناکرێ لە عەقڵدا.

کەواتە: هەر کاتێك چەسپێنرا کە پێکهاتەکانی گەردوون سەرەتایان هەیە، دیارە هی ماددەش چەسپێنراوە، چونکە مادده، هەر ئەو کەرەستەیە کە گەردوون و پێکهاتەکانی پێك دێنێ.

٤) **ڕاستیی چوارەم:** مادده - وەك پێشتریش باسمان کردوە - لە گەردیلە جۆراو جۆرەکان پێکهاتوە، گەردیلەش سێ پێکهێنەری سەرەکیی هەن: ١- ئەلیکترۆن، کە لە سوورگەی گەردیلەدا دەخولێتەوە، ٢- پرۆترۆن، ٣- نیۆترۆن، کە هەردووکیان نێوك پێك دێنن، ئنجا ئەلیکترۆن بە خێراییەکی زۆر بە دەوری نێوکدا دەخولێتەوە و، ئەو زۆر خێرا خوولانەوەی ئەلیکترۆنیشە بە دەوری نێوکی گەردیلەدا، کە هێزێکی پاڵپێوەنەر (قوة دافعة/طاردة)ی دروستکردوە، لە حاڵێکدا کە نێوك - واتە: پرۆتۆن، ئەگەرنا نیۆترۆن بۆ خۆی بێ بارگەیە، بەڵام بە هەمووی دەگوترێ: نێوك - هێزێکی ڕاکێشانی گەورەی هەیە، کە دەیەوێ ئەلیکترۆن بە خۆیەوە بچەسپێنێ، هەروەها ئەلیکترۆنیش بە هۆی ئەو سوورانەوە خێرایەوە، هێزێکی پاڵپێوەنەری پێچەوانە دروست دەکات، ئنجا ئەو هاوسەنگییەی نێوان: بەرەو لای خۆ ڕاکێشانی نێوك و، پاڵپێوەنانی ئەلیکترۆن، حاڵەتی سوورانەوەی ئەلیکترۆن بە دەوری پرۆتۆندا دروست دەکات و، ئەوەشە کە گەردیلە پێك دێنێ، چونکە ئەگەر ئەلیکترۆنەکان لەگەڵ نێوکی گەردیلەکاندا، یەکیان گرتبایە، ئەو بۆشاییە زۆرەی نێوانیان، کە زانایان دەڵێن: وەك چۆن زەوی و هەر هەشت خڕۆکەکەی دیکەی کۆمەڵەی خۆر[1]، بە دەوری خۆردا دەخولێنەوە، کە بە هەموویان یەك لەسەر سەدی (١/١٠٠)ی بارستایی خۆریش پێك ناهێنن، بە هەمان شێوە: ئەلیکترۆنەکانیش کە بە دەوری نێوکدا دەخولێنەوە، دووریی نێوان زەوی و هەشت هاوەڵەکەی دیکەی لە خۆرەوە چەندە، - بۆ وێنە: زەوی سەدو

---

(١) کە بریتین لە: ١- زەوی، ٢- مەرریخ، ٣- موشتەریی، ٤- زوحەل، ٥- زوهرە، ٦- عەططارد، ٧- نیبتۆن، ٨- پلۆتۆ، ٩- ئۆرانۆس.




وێنەی (٤٧) کۆمـــەڵەی خۆر

پەنجا ملیۆن کیلۆمەتر (١٥٠،٠٠٠،٠٠٠ کم) دوورە، هەروەها ئەوانی دیکەش کەمترو زیاتر دوورن، لە خۆرەوە - ئنجا بە هەمان شێوە: دووریی ئەلیکترۆنیش لە نێوك (پرۆتۆن و نیوترۆن) هێندەیە، هەڵبەتە بەشێوەیەکی ڕێژەیی (نسبي).

واتە: ئەو بۆشاییەی کە لە نێوان کۆمەڵەی خۆرو خۆردا هەیە، چەندە، بە شێوەیەکی ڕێژەیی، ئەو بۆشاییەی کە لە نێوان ئەلیکترۆن و نێوکیشدا هەیە، بەو شێوەیە.

ئنجا زانایان دەڵێن: ئەگەر هاتباو ئەو بۆشاییەی نێوان ئەلیکترۆنەکان و نێوکەکان نەبووایە، زەوی بە قەدەر سێوێك، پرتەقاڵێکی لێ دەهاتەوە و، هەر هەمان قورسایی ئێستاشی دەبوو.

ئنجا هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر ئەوە، کە ئەلیکترۆنەکان بەهۆی جووڵەیەکی دیکەوە، وەگەڕ کەوتوون و بە دەوری نێوکدا، دەخولێنەوە، کەواتە: ئەو جووڵەیەی کە لە گەردیلەکاندا هەیە، سەرەتایەکی هەیە و جووڵێنەرێك جووڵاندوونی، وەگەڕخەرێك وەگەڕی خستوون، هەڵبەتە ئەویش دەبێ لە دەرەوەی خۆیانەوە بێ، کە خوای پەروەردگارە، وەك لە سووڕەتی (یس) ئایەتی ژمارە (٤٠)دا دەفەرموێ:

﴿ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسۡبَحُونَ ﴾.

هەرچەندە لەوێدا باسی خۆرو مانگ و شەوو ڕۆژ دەکا، کە مەبەست لە شەو و ڕۆژ، زەوییە، هەروەها ئەستێرەکانیش دەگرێتەوە، واتە: هەر کامێکیان لە خولگەیەکدا دەخولێتەوە.

**٥) ڕاستیی پێنجەم:** هەرگیز عەقڵ ناتوانێ جووڵە بەبێ سەرەتا وێنا (تصوُّر) بکا، هەموو جووڵەیەك دەبێ سەرەتایەکی هەبێ، ناگونجێ و لە عەقڵدا جێی نابێتەوە، شتێك جووڵەی هەبێ، بەڵام ئەو جووڵەیە سەرەتایەکی نەبێ، هەمیشە جووڵە دەبێ سەرەتایەکی هەبێ، ئنجا ئەو سەرەتایەی ئەو ماددەیەش: ئەگەر ئەلیکترۆنێکە، ئەگەر زەوییە بە دەوری خۆی و بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە، ئەگەر خۆرە، ئەگەر ئەستێرەکانن، ئەگەر کەهکەشانەکانن، ئەو جووڵەیە دەبێ، لە دەرەوەی خۆیان بۆیان دانرابێت، ئەگەرنا لە خۆوە، ماددە بۆ خۆی خاوەنی ئەو سیفەتانە نیە، کە لە خۆیدا پەیدایان بکات، بەڵکو لە دەرەوەی خۆی بۆی دانراون و بەسەریدا فەرز کراون، وەك مووسا (علیه السلام) دەفەرموێ:

﴿ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ۝٥٠ ﴾ طه.

**واتە:** پەروەردگارمان ئەو زاتەیە کە بوونی بە هەموو شتێك داوەو ڕێنماییشی کردوە، (پێشانی داوە، چۆن بەڕێوە بچێ و بەرنامەی بۆ داناوە).

**٦) ڕاستیی شەشەم:** هەرچی لە گەردووندا هەیە، دوو بەشی سەرەکییە: بە زاراوی زانایانی زانستی کەلام و بنچینەکانی ئایین (أصول الدین) و ئیمان و عەقیدە، هەرچی لە گەردووندا هەیە:

**أ/** یان (جوهر)ە، واتە: لە خودی خۆیدا بوونی هەیە.

**ب/** یان (عَرَض)ە، واتە: بوونێکی خودیی (ذاتي) نیە، بەڵکو سیفەتە بۆ شتێك کە بوونێکی خودیی هەیە.

بۆ وێنە: جەستەی مرۆڤ بۆ خۆی هەیە، کەواتە: جەستەی مرۆڤ لەو ڕووەوە کە خۆی هەیە، پێی دەگوترێ: جەوهەر، یاخود وەسفکراو (موصوف).

بەڵام ئەو حاڵەتانەی بەسەر جەستەی مرۆڤدا دێن، وەك ساغیی، نەخۆشیی، سەرمابوون، گەرما بوون، درێژیی، کورتیی.. تا دوایی، ئەوانە پێیان دەگوترێ: (عرض) یاخود سیفەت، چونکە لە خودی خۆیاندا نین و، دەبێ مەوصووفێك و جەوهەرێك هەبێ، ئەو (عرض)ە، ئەو سیفەتە، لەسەری پەیدا ببن.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە هەر کام لە ساردیی و گەرمیی، ساغیی و نەخۆشیی، درێژیی و کورتیی، پانیی و باریکیی، بەرزیی و نزمیی، هەموو ئەو سیفەتانە، سەرەتاو کۆتاییان هەیە، کەواتە: پەیدابوونی، ئەو (عرض)انە، ئەو سیفەتانە، سەرەتایەکی هەیە.

بۆ وێنە: جەستەی مرۆڤ ناگونجێ نە سارد بێ نە گەرم، نە ساغ بێ نە نەخۆش بێ، نە جووڵاو بێ نە نەجووڵاو بێ، نە درێژ بێ، نە کورت بێ، ناگونجێ، واتە: هیچ کاتێك جەوهەر، (موصوف) بەبێ (عرض) و سیفەت، بوونی نیە، ئنجا سیفەتیش سەرەتاو کۆتایی هەیە، کەواتە: جەوهەریش سەرەتاو کۆتایی هەیە، هەرچی لە گەردوونیشدا هەیە، یان جەوهەرە، بۆ وێنە: خۆر جەوهەرە، چونکە بوونێکی خودیی هەیە، بەڵام تیشکی خۆر، گەرمیی خۆر (عرض)ە، ئەستێرەکان، هەر کامێکیان جەوهەرە، کەهکەشانەکان هەر کامێکیان جەوهەرە، بەڵام ئەو سیفەتانەی کە لێیان پەیدا دەبن، کە تیشکدانەوە و خولانەوەیە، ئەوانە (عرض)ن.

ئنجا هەرگیز (عرض) بەبێ جەوهەر نابێ و، هەرگیز جەوهەریش بەبێ (عرض) نابێ، هەر جەوهەرێك هەبێ، دەبێ سیفەتێکی هەبێ، (عرض)ێکی هەبێ، ئنجا هەرکات دەرکەوت: (عرض) سەرەتای هەیە، بە هەمان شێوە و لە هەمان کاتدا: دەریش کەوتوە، کە جەوهەریش سەرەتای هەیە.

کەواتە: مادام ئەم گەردوونەی ئێمە لە کۆمەڵێك جەوهەر پێکهاتوە، کۆمەڵێك دیاردە کە بوونێکیان هەیە و، ئەو خاوەن بوونانەش کۆمەڵێك سیفەتیان هەن و، هیچیان بەبێ یەکدی نابن:

١- ئایا هیچ کەسێك دەتوانێ: مرۆڤێك لە مێشکی خۆیدا وێنا (تصوّر) بکات، دەستی نەبێ و، چاوی نەبێ و، سەری نەبێ و، سك و پشتی نەبن و، لاقی نەبێ و، درێژیی نەبێ و، ساغیی و، نەخۆشیی نەبێ؟! نەخێر.

٢- ئایا هیچ کەسێك دەتوانێ: ئەستێرەیەك، کەهکەشانێك لە مێشکی خۆیدا وێنا بکات، هیچ کام لەو سیفەتانەی نەبن، کە هی ئەوانن؟! نەخێر.

کەواتە: هیچ کاتێك جەوهەر بەبێ (عرض) نابێ، واتە وەسفکرا و (موصوف) بەبێ سیفەت و ئاوەڵناو نابێ، هەروەها سیفەتیش بەبێ وەسفکراو نابێ.

ئەگەر یەکێك بڵێ:

ئایا خوا (سبحانه وتعالى)، ئەویش بەو واتایە کە بوونێکی خودیی هەیە و، سیفەتی هەن، ئەویش بنچینەی جەوهەرو عەرەضی بەسەردا دەچەسپێ؟

دەڵێین: نەخێر، چونکە خوا (سبحانه وتعالى) خاوەنی بوونێکی سەربەخۆ و خودیی (ذاتي)یە و بوونەکەی، نەبوونی پێش نەکەوتوە، پاشان خوا (سبحانه وتعالى) گۆڕانی بەسەردا نایەت و لە حاڵێکەوە ناگۆڕێ بۆ حاڵێکی دیکە.

دواتریش لە کاتی پووچەڵکردنەوەی بیانووی حەوتەم (ئەگەر هەموو شتێك بەدیهێنەری هەیە، ئەدی بەدیهێنەری خوا کێ یە؟) لەوێدا زیاتر باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین[١].

**٧) ڕاستیی حەوتەم:** جۆراو جۆربوونی پێکهاتەکانی گەردوون (تَنَوُّعُ مُكَوِّنَاتِ الكَوْن)، ڕێ لە هەربووێتیی (أزلية) مادده و گەردوون دەگرێ، واتە: کاتێك ئێمە سەرنج دەدەین: گەردوون لە پێکهاتەی جۆراو جۆر پێکهاتوە، یەکەی سەرەکیی کە کەهکەشانەکانن، لە ملیاران ئەستێرەو خڕۆکەو شوێنکەوتووانی خڕۆکەکان پێکهاتوون، دوایی زەوی نشینگەمان لە کۆمەڵێك پێکهاتە دروستبووە، هەروەها مرۆڤ لە کۆمەڵێك ئەندام پێکهاتوە، ژیانداران بە هەموو جۆرەکانیانەوە، کە

---

(١) البحث عن الحقيقة الكبرى، ص١١٥-١١٦.

ملیۆنان جۆرن: زیندەوەران، پەڕەوران، هی دەریا، هی هەوا، ئاژەڵان، ئنجا ڕووەکەکان...هتد، کاتێك ئێمە تەماشای پێکهاتەکانی گەردوون دەکەین، جۆراو جۆریی دەبینین، ئنجا لە بەرانبەر ئەو حاڵەتەدا، تەنیا سێ ئەگەری عەقڵیی هەن، کە چوارەمیان نیە:

**ئەگەری یەکەم:** ئەو شتە جۆراو جۆرانە هەربوو و ئەزەلیین و، نەبوون (عَدَم) پێشیان نەکەوتوە!

ئەوەیان ئێمە دەیبینین وانیە، ئەگەر کاتی خۆیشی شوبهەو ئیشکالێك لەو بارەوە هەبوو بێ، ئێستا لە دوای پێشکەوتنی فیزیاو زانستی گەردوونناسیی تازە، ئەو ئیشکالە هەر نەماوە، مولحیدەکانیش دەڵێن: سێزدە ملیار و حەوت سەد ملیۆن (١٣٧٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش، نە گەردوون هەبووەو نە ئاسمان هەبووەو، نە زەوی هەبووەو، نە ماددە هەبووەو نە جووڵە هەبووەو ...هتد.

کەواتە: ئەوە کە ئەم پێکهاتە جۆراو جۆرانەی کە گەردوونیان لێ پێکهاتوە، بوونیان ئەزەلیی و بێ سەرەتا بێ، شتێکە عەقڵ و واقیع و زانستی تازە بە درۆی دەخاتەوە.

**ئەگەری دووەم:** ماددەو جووڵەکەی، ئەو پێکهاتە جۆرا و جۆرانەیان هێناونەدی، ماددە جووڵەی هەیە: بە نسبەت گەردیلەوە: ئەلیکترۆن بە دەوری نیۆترۆن و پڕۆتۆندا، دەخولێتەوە، هەروەها گەردیلەکانیش دەجووڵێن: کاتێك گەردەکان (جُزیئات) پێکدێنن و، ئەوانیش دوایی توخمەکان پێکدێنن و، ئەوانیش دوایی شتی گەورەتر پێك دێنن.

کە دەشگوترێ: ماددەو جووڵەکەی ئەوەیان پەیدا کردوون، یانی: بە ویستی خۆیان، خۆیان ویستوویانە! کە ئەمە پێچەوانەی سروشتی ماددەیە، - چونکە وەك پێشتر باسمان کرد - ماددە نە ئیرادەی هەیە، نە زانیاریی هەیە، نە ژیانی تێدایە، نە کردن و نەکردنی هەیە! بۆیە بەدڵنیایی: ئەو دیاردەو حاڵەتانە، هیچ پەیوەندییان بە ماددەوە نیە و، لە دەرەوەی ماددەوە بەسەر ماددەدا سەپێنراون.

**ئەگەری سێیەم:** ئەوەیە کە ماددەو جووڵەکەی و، سەرجەم پێکهاتەکانی گەردوون، خوا دروستیکردوون، بە پێی سیستم و چەندان یاسا دروستیکردوون.

بێگومان هەر ئەمەشیان عەقڵ وەری دەگرێ و[1]، پەسندی دەکات و، بگرە پێویستیشی دەکات.

٨) **ڕاستیی هەشتەم:** بەپێی یاسای دووەمی دینامیکای گەرمیی:

(second Law of Thermo Dynamics) (القانون الثاني للديناميكا الحرارية)، ناگونجێ هیچ کام لە ماددە و گەردوون(المادة والكون) هەر بوو (أزلي) و بێ سەرەتابن، ئەو یاسایەش، وەك زانای فیزیایی (بوڵتزمان)، لە کتێبی: (الله يتجلى في عصر العلم)[2]دا هاتوە گوتوویەتی، هەروەها لە کتێبی (أساسيات الفيزياء)[3]دا هاتوە، پوختەی ئەو یاسایە ئەوەیە کە:

بەردەوام لە تەنە گەرمەکانەوە گەرمایی و تیشك دەچێ بۆ تەنە ساردەکان، تاکو تەنە گەرمەکان ئەو گەرمیی و تیشکەیان نامێنێ و، هەموویان یەکسان دەبن لە گەرمییدا، ئەو کاتە ئەم گەردوونە دەوەستێ و، تاریکییەکی بێ ڕەزا هەموو گەردوون دادەگرێ و، ئەو حاڵەتەی ئێستا دەیبینین، کۆتایی پێ دێ، ئنجا ئەو یاسایە پێچەوانەشی نیە، واتە: ناگونجێ جارێکی دیکە لە تەنە ساردەکانەوە، کە ئێستا ساردن، دوایی کە یەکسان بوونەوە لەگەڵ تەنە گەرمەکان، ئنجا لەوانەوە گەرمیی بچێتەوە، بۆ ئەوانی دیکە، چونکە هەردووك لایان یەکسانن.

بۆ وێنە: ئێستا بەردەوام گەرمیی لە خۆرەوە دێ بۆ کۆمەڵەکەی، بۆ زەوی و ئەو هەشت خڕۆکەیەی دیکە کە بەدەوری خۆردا دەخولێنەوە، ئنجا ئەوە بەردەوام دەبێ، ئەگەر - خوا (سبحانه وتعالى) ئەم گەردوونە ڕابگرێ - تاکو گەرمیی نێوان خۆرو خڕۆکەکانی یەکسان دەبێ و هەر کات یەکسان بوو، ئەو یاسایە

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ص١١٧.

(٢) ص٩٦.

(٣) ص٣٤٥، ط١٩٨٢م.

حاڵەتی پێچەوانەی نیە کە جارێکی دیکە لە نۆ خڕۆکەکەی کۆمەڵەی خۆرەوە، تیشك و گەرمیی بۆ خۆر بچێ، چونکە تازە یەکسانن و هیچیان لە هیچیان زیاتریان نیە.

هەرچەندە پێشتریش باسمان کرد، بەڵام بۆ ئەوەی زیاتر بەرجەستە ببێ ئەم یاسایە چۆنە؟ دەڵێین: خۆر، بەپێی مەزندەی زانایانی گەردووناس و فیزیازانی ئێستا: تەمەنەکەی دەوری دە ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵە و، بارستایی (کتلة) ەکەی دوو هەزار تریلیۆن تریلیۆن (٢٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠)، (٢^٢٧) تەن قورسە، وەك (د. زغلول النجار) لە کتێبی (السماء في القرآن الكريم)دا، هێناویەتی[١].

ئنجا خۆر، ڕۆژانە: چوار سەد ملیار (٤٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) تەن وزە دەدات، کە لە هەر چرکەیەکدا دەکاتە زیاتر لە چوار ملیارو شەشسەد ملیۆن (٤٦٠٠٠٠٠٠٠٠) کیلۆگرام، یاخود دەوری پێنج ملیۆن (٥٠٠٠٠٠٠) تەن، چونکە خۆر لە هەر چرکەیەکدا، شەش سەدو پەنجاو پێنج ملیۆن (٦٥٥،٠٠٠،٠٠٠) تەن هیدرۆجین دەگۆڕێ، بۆ شەش سەدو پەنجا ملیۆن (٦٥٠٠٠٠٠٠٠) تەن هیلیۆم، ئەو پێنج ملیۆن تەنەی نێوانیان: (٦٥٥٠٠٠٠٠٠-٦٥٠٠٠٠٠٠٠)= (٥٠٠٠٠٠٠) ئەو پێنج ملیۆن تەنە، دەبێتە وزەو تیشك.

ئەمە وێڕای: (د. زغلول النجّار)، (د.جعفر شيخ إدريس)یش، لە کتێبی: (الفيزياء و وجود الخالق)دا و[٢]، گەلێك لە زانایانی دیکە، لەو کتێبانەدا کە پێشتر ئاماژەمان پێکردوون، هێناویانە، بەڵام هەندێکیان دەڵێن: لە هەر چرکەیەکدا: خۆر چوار ملیۆن و شەش سەد هەزار (٤٦٠٠٠٠٠) تەن، وزە بەرهەم دێنێ و، هەندێکیش دەڵێن: پێنج ملیۆن (٥،٠٠٠،٠٠٠) تەن، یان پێنج ملیار (٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) کیلۆگرام، وزە بەرهەم دێنێت و دەیخاتە دەرەوەی خۆی.

---

(١) ص١٩٩-٢٠٠.

(٢) ص٧٣.

ئنجا ئایا ئەو خۆرە کە پسپۆڕانی فیزیا و گەردوون، تەمەنییان بە دە (١٠) ملیار ساڵ مەزەندە کردوە و دەڵێن: ئێستا تەمەنی پێنج ملیار (٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵە، ئایا چەندەی وزە پێ ماوە؟! بە مەزەندەی زانایان دەڵێن: بایی پێنج ملیار (٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵی دیکە، هیدرۆجینی خەزنکراوو پەزمەندەکراوی تێدا ماوە، کە بیسووتێنێ و بیگۆڕێ بۆ هیلیۆم، لە حاڵێکدا کە لە هەر چرکەیەکدا نزیکەی پێنج ملیۆن (٥٠٠٠٠٠٠) تەن، یان پێنج ملیار (٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) کیلۆ گرام وزە دەبەخشێ، بەڵام تەمەنەکەی بایی پێنج ملیار (٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵی دیکە، هەندێکیش دەڵێن: چوار ملیارو نیو (٤٥٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵی دیکە، دەکات.

ئنجا بێگومان ئەگەر گەردوون ئەزەلیی بووایە، ئەوە لەمێژ بوو ئەو وزەیەی خۆر تەواو بووبوو، وەك چۆن پێنج ملیار (٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵەکەی ڕابردوە، ئەو پێنج ملیار (٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵەش هەر زۆر زۆر لەمێژ بوو تێپەڕیبوو و ڕابردبووو، ئەوەی کە دەبینین، هیچ شتێکمان نەدەبینی.

٩) **ڕاستیی نۆیەم:** هەم زانایانی فیزیا و هەم زانایانی کیمیا دەڵێن: ژمارەیەك توخمی تیشکدەرەوەن، هەن، تیشك دەدەنەوە، کە هەیانە بە چەند چرکەیەك تەواو دەبێ و، هەشیانە ملیاران ساڵ بەردەوام دەبێ، بەپێی جۆری توخمەکە و بەپێی سروشتی ئەو حاڵەتی تیشکدانەوەیە، کەم خایەن دەبێ، یان درێژ خایەن دەبێ، ئنجا بەپێی ئەو حیسابە، زانایان: تەمەنی گەردوونیان بە دە ملیار، تاکو پازدە ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠ - ١٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ مەزەندە کردوە، هەموو گەردوون، بەڵام هی خۆریان بە دەوری نۆ ملیار، تاکو دە ملیار (٩٠٠٠٠٠٠٠٠٠ - ١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) مەزەندە کردوە، چونکە خۆر دوایی پەیدا بووە.

بۆ وێنە: (الدکتور کوثران) کە کیمیازانە لە زانکۆی (کورنل)ی کەنەدیی، دەڵێ: زانستی کیمیا پێمان دەڵێ: مادە بەرەو نەمان دەچێ، بەڵام هەندێکی بە خێرایی و هەندێکیشی بە هێواشی، هەروەها زانیاریی کیمیا ئەوە دەگەیەنێ: کە سەرەتای پەیدابوونی مادە، لەسەرەخۆو پلە پلە نەبووە، بەڵکو کت و پڕ بووە(١).

---

(١) سەرچاوەی پێشوو: (الفیزیاء و وجود الخالق) جعفر شیخ إدریس، ص١١١-١١٢، هەروەها





**١٠) ڕاستیی دەیەم:** تەقینەوەی گەورە و لەیەککشانی بوونەوەر (الإنفجار الكبير وَتَوسّع الكون)، ڕێ لە ئەزەلیی بوونی مادده و گەردوون دەگرێ.



وێنەی (٤٨) تەقینەوە گەورەکە و لەیەککشانی بونەوەر

ئەمە کە وردەکاریی و تەفصیلێکی زیاتری دەوێ، بۆیە ئێمە لە چەند خاڵێکدا ئەم ڕاستییە دەخەینە ڕوو:

١- (ئاینشتاین) کاتی خۆی کە بیردۆزەی ڕێژەیی (النظرية النسبية)ی دانا، وای حساب کردبوو کە بوونەوەر چەسپاوە و حاڵەتێکی چەسپاوی هەیە.

٢- بەڵام (جورج لۆمیتەر) قەشەی کاسۆلیکیی و زانای فیزیای بەلجیکیی، هەروەها زانای ڕووسیی (ئەلکساندەر فریدمان)، هەردووکیان بیردۆزەی کشانی گەردوونیان پێشکەش کرد، ئەوان گوتیان: ئێمە پێمان وایە گەردوون چەسپاو نیە، وەك ئینیشتاین دەڵێ، بەڵکو لێك دەکشێ و فراوان دەبێ.

---

سەرچاوەکانی دیکەش، ئەو جۆرە زانیارییانە یان هێناون.

٣- پاشان (ئیدیون هابڵ) لە ساڵی (١٩٢٩ز)دا، سەرنجی دا کە کەهکەشانەکان لێمان دووردەکەونەوە، بەخێراییەکی گونجاو لەگەڵ مەسافەی نێوانماندا، واتە: هەتا ماوەکە زیاتر بێ، خێراییەکە زیاترە.

هەروەها سەرنجی دا: تیشکە هاتووەکەیان سوور دەنوێنێ، واتە: لێمان دووردەکەونەوە، چونکە سەرچاوەی تیشك لە کاتێکدا بەرەو ڕووی چاودێر بێ، شین دەنوێنێ، بەڵام لەکاتێکدا لێی دوور بکەوێتەوە، سوور دەنوێنێ، بە تەعبیرە عەرەبییەکە: (الإنزياح نحو الأحمر) لە کاتی دوورکەوتنەوەدا: کشان و خلیسکان بەرەو سوور و (الإنزياح نحو الأزرق) خلیسکان و کشان بەرە و شین، لە کاتی نیزیك کەوتنەوەدا.

٤- (جۆرج گامۆ) لە ساڵی (١٩٤٦ز)دا گریمانەی دانا، کە لەگەڵ کشانی گەردوون و دابەزینی پلەی گەرمییدا، (فۆتۆنەکان) لە حاڵەتی ماددە دەرچوون و تیشکێکیان پێکهێناوە، ئێستاش لە گەردووندا ماوە، واتە: گریمانەی دانا: کە تیشکی گەردوونیی (الشعاع الكوني) پەیدابووە، لە کاتێکدا کە گەردوون کشاوە و پلەی گەرمیی دابەزیوە و (فۆتۆنەکان) لە حاڵەتی ماددە دەرچوون بۆ حاڵەتی تیشك.

٥- ئەوە بوو کە هەر کام لە: (ئەرنۆ بنزیاس) و (ڕۆبەرت ویلسۆن) ئەو تیشکەیان کەشف کرد، لە ساڵی (١٩٧٨ز)دا، کە دوایی ناوی لێنرا: تیشکی پاشخانی گەردوونیی، یان پاشکۆی گەردوونیی (إشعاع الخلفية الكونية) ئەوەش بەهێزترین بەڵگەی لەسەر ڕوودانی تەقینەوەی گەورە (Big Bang)ی خستە بەردەست، چونکە ئەو تیشکە دەری خست کە پلەیەکی گەرمیی نائاسایی لە نێوان کەهکەشانەکاندا هەیە و، فەزای کەهکەشانەکان ساردی ڕەها نیە، بەڵکو پلەی گەرمییەکەی دەگاتە دەوری سێ پلە بە پێوەری (کاڵفن) کە بریتیە لە: دوو سەدو حەفتا و سێ و پۆینت شازدە (٢٧٣,١٦) سالیب (-) پلە بە پێوەری سیلزیی (سەنتیگراد)، واتە: دووسەدو حەفتاو سێ و پۆینت شازدە (٢٧٣,١٦) پلە ژێر سفر. کەواتە: پلەی گەرمیی فەزای کەهکەشانەکان بریتییە لە: ٢٧٣,١٦ - ٣ = ٢٧٠,١٦، یانی: ٢٧٠,١٦ (سالیب)، یان: ٢٧٠,١٦ پلەی سەنتیگراد (سیلزیی) ژێر سفر.

ئنجا ئەو تیشکەش پاشماوەی ئەو گەرمییە زۆرەی ئەو تەقینەوە گەورەیەیە، کە بە حیساب سەرەتای دروستبوونی گەردوونە، ئیدی سەرەنجام ئەو دوو لێکۆڵەرەوەیە کە باسمان کردن، لە ساڵی (١٩٧٨ز)دا پاداشتی نۆبڵیان لەسەر ئەو دۆزینەوەیە وەرگرت.

ئنجا سەیر ئەوەیە کە ئەو دوو زانایە، بە (ڕێکەوت) ئەوەیان دۆزیەوە، کە سەرنجیاندا، گوتیان: یان ئێمە لە دایکبوونی گەردوونمان بینیوە، یان وەك فیزیازان و گەردووناسەکان پێمان دەڵێن: کۆمەڵە کۆترێکمان بینیوە! وا دیارە ئەو تیشکە گەردوونییە کە پێی دەگوترێ: تیشکی پاشماوەی گەردوونیی (إشعاع الخلفية الكونية)، شێوەی پۆلە کۆترێکی نواندوە.

پوختەی بیردۆزەی: تەقینەوەی مەزن (الإنفجار العظيم - Big Bang)یش، ئەوەیە، کە دەڵێ:

ئەو گەردوونەی ئێستا ئێمە تێیداین: لە تاك (مفردة)ێکی زۆر زۆر گەرمەوە هاتوە، کە هەم گەرمییەکەی بێ سنوور بووە، هەم چڕییەکەی بێ سنور بووە، هەم قەبارەکەی لە بچووکییدا، بێ سنوور بووە، ئەویش پێش سێزدە ملیارو حەوت سەد ملیۆن (١٣٧٠٠٠٠٠٠٠٠) یاخود سێزدە ملیارو هەشت سەد ملیۆن (١٣٨٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش.

ئنجا ئەو موفرەدەیە کە بە ئینگلیزیی: سینگلارتی (Singularity) پێ دەڵێن، واتە: تاکی گەردوونیی، بە عەرەبیی وشەی: تۆوی گەردوون (بذرة الكون)ی بۆ بەکاردێنن، هەروەها وشەی: هێلکەی گەردوون (بيضة الكون)یشی بۆ بەکاردێنن، پسپۆڕان دەڵێن: شتێکی ئەوەندە بچووکە، کە هەرچی ئەندازەی فیزیایی هەیە، لەوێدا هەمووی دەوەستێ، چ لە ڕووی گەرمیی، چ لە ڕووی کات، چ لە ڕووی قەبارەوە، کە بەپێی: سنوور یان نەگۆڕی (blank) (حَدٌّ أو ثابت بلانك)، تەماشای دەکەن و دەڵێن: ئەو تاکە، (سینگلارتی)یە:

**١)** دە توان سی و دوو ($10^{32}$) بە پێوەری (کاڵفن)، پلەی گەرمییەکەی بووە، واتە: ژمارە (١٠) سی و دوو سفری لە پێش دابنرێ: (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠).

کە بێگومان تەصەووڕ ناکرێ گەرمییەکەی چەند زۆرە!

**٢)** لە ڕووی کاتەوە: دە توان چل و سێ سالیب (١٠-٤٣)ی چرکەیەك، ئەوەندە کاتەی پێ چووە کە تەقیوەتەوە، واتە: چرکەیەك بکەی بە ژمارەیەك، کە ژمارە دە (١٠) دابنێی و چل و سێ (٤٣) سفری لە پێشەوە بێ، ئنجا یەك بەشی ئەو ژمارەیە، یان یەك لەسەر ئەو ژمارەیە، ئەو تاو(دەم)ە، بووە کە پێیچووە:

(١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠).

**٣)** قەبارەکەشی دە توان سی و پێنج سالیب (١٠-٣٥)ی مەترێك، واتە: مەترێك دابەش بکەی بۆ ژمارەیەك، کە ژمارە: دە (١٠) سی و پێنج (٣٥) سفری هەبێ، ئنجا یەکێك لەسەر ئەو هەموو ژمارەیە، لە بەشەکانی مەترێك، قەبارەی ئەوە بووە کە پێی دەگوترێ: (singlarty)، تاکی گەردوونیی.

ئنجا شایانی باسە: کە دوای کەشف کردنی ئەو ڕاستییە زانستییەش، کە کەهکەشانەکان و ئەستێرەکان: (٧٥٪) یان (٧٤٪)یان هیدرۆجین و، (٢٤٪) یان (٢٥٪)یان، هیلیۆم پێکی دێنن، ئەو بیردۆزەیەی پشت ڕاستکردەوە، کە ڕاستە کە ئەم گەردوونەی ئێمە، لەو ڕووداوە کت و پڕەوە هاتوە، کە تەقینەوەی گەورەی[1] پێدەڵێن.

ئنجا لە ڕاستییدا شتێك ئەوەندە بچووك بێ نەك وەك: گەردیلە، بگرە زۆر زۆریش لە گەردیلە بچووکتر بێ و، ئەوەندە گەرم بێ، بێ کۆتایی گەرم بێ و، لە ماوەیەکی هێندە کورتدا کە چرکەیەك بکەی بە دە (١٠)، چل و سێ (٤٣) سفری لە پێشەوە بێ، یەك لەسەر ئەو ژمارەیە!! کە لە ڕاستییدا ئەگەر بگوترێ: ئەم گەردوونەی ئێمە لە نەبوونەوە هاتوە - چونکە ئەوە هەر بە شتێکی نەبوو دادەنرێ - لە عەقڵەوە نزیکترە، بەڵام دیارە ئەو زانایانەی کیمیاو فیزیا، تەنیا مامەڵە لەگەڵ شتە بەرهەستەکاندا، دەکەن، بۆیە ئەو بیردۆزەیان بەو شێوەیە خستۆتە ڕوو.

---

(١) چەند جارێك باسمان کرد کە ئەو تەعبیرەمان پێ ڕاست نیە، چونکە سیستم و ڕێك و پێکیی، لە تەقینەوەوە پەیدا نابێ.

بەڵێ بەڕێزان! زانایانی فیزیك زان و گەردوونناس، ئێستا لەسەر ئەوە كۆكن و ڕێككەوتوون كە سەرەتای ئەم گەردوونە، دەگەڕێتەوە بۆ یەكەیەكی زۆر بچووكی ماددە، كە بە ئینگلیزیی: سینگلارتی (Singularity)ی پێ دەڵێن و بە عەرەبیی (المفردة)ی پێ دەڵێن، واتە: تاكی گەردوونیی، هەروەها تۆوی گەردوون (بذرة الكون)یشی پێ دەڵێن و، هێلكەی گەردوون (بیضة الكون)یشی پێ دەڵێن، كە ئەوە دەبێ بە پێی نەگۆڕی بلانك تەماشا بكرێ و، نەگۆڕی بلانك (ثابت بلانك) بۆ ئەو موفرەدەیە دانراوە، كە بەم جۆرەیە:

١-) (١٠^٣٢) پلەی (كالڤن) گەرم بووە.

٢-) لە ڕووی كاتەوە: (١٠^-٤٣)چركە، كاتی پێچوە كە تەقیوەتەوە.

٣-) لە ڕووی قەبارەوە: (١٠ ^-٣٥)ی مەترێك پانتایی بووە، ئیدی ئەو تەنۆلكەیە تەقیوەتەوە و لێك كشاوە و، سەرەنجام ئەو گەردوونەی ئێمەی لێ پێكهاتوە!!

ئنجا با تۆزێك سەرنجی قسەی زانایانی فیزیكزان و گەردوونناس بدەین! چۆن باسی ئەو ڕووداوە دەكەن:

یەكێك لەوانە (ستیفن هوكینگ)ە، كە لە ڕووی زانستیی فیزیاوە زانایەكی ناودارە، هەروەها لە ڕووی گەدوونناسییەوە، ئاوا باسی تەقینەوەی گەورە (Big Bang) دەكات، كە - وەك چەند جاری دیكەش گوتوومە - من تێبینییم لەسەر ئەو وشەیە هەیە و لە ڕاستییدا ئەوە تەقینەوە نەبووە، چونكە تەقینەوە فەوزاو پادشاگەردانیی لێ پەیدا دەبێ، ئایا ئەوە چ تەقینەوەیەكە، كە ئەو هەموو ڕێك و پێكیی و یاساداریی و سیستماتیكییەی لێ پەیدا بووە، بەڵام بە هەر حاڵ ئەوان ئەو تەعبیرەیان بەكارهێناوە.

(ستیفن هوكینگ) لە كتێبكیدا بە ناوونیشانی: (مێژوویەكی كورتتر بۆ كات)دا[1]، دەڵێ:

---

(١) ناوونیشانی كتێبەكە بە عەرەبیی: (تأريخ أكثر إيجازاً للزمن)، ص (٧٧-٨٣)، بەڵام من یەكسەر تەرجە كوردییەكەی دێنم.

سێزدە ملیارو حەوتسەد ملیۆن (١٣٧٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ لەمەوبەر، گەردوون لە تاك (مفردة)ەیەكدا، كورت هەڵاتوە، كە قەبارەكەی سفر بووە و، چڕیی و چەماوەیی كات و شوێن (زمكان)یشی بێ كۆتا بوون {(زمكان)، واتە: كات و شوێن پێكەوە}.

لە ماوەی چركەیەكدا لە تەقینەوەكە، گەردوون هێندە كشاوە، كە گەرمییەكەی بۆ دە ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) پلەی سەنتیگراد (سیلزیی) دابەزیوە، پێشێ یەكجار یەكجار گەرم بووە، بەڵام لە ماوەی چركەیەكدا بۆ ئەو ئەندازەیە دابەزیوە، كە ئەو كاتیش لە نێو جەرگەی خۆر، هەزاران جار گەرمتر بووە، (یانی: لە نێو جەرگەی ئێستای خۆر، ئەو گەرمییە هەزاران جار زیاتر بووە).

ئنجا دوای سەد (١٠٠) چركە، پلەی گەرمییەكەی بۆ ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠)ێك دابەزیوە.

ئنجا دوای چەند سەعاتێك، بەرهەم هاتنی هیلیۆم وەستاوە.

هەتا یەك ملیۆن (١٠٠٠٠٠٠) ساڵ گەردوون لەسەر كشانی بەردەوام بوو، دواتر ئەلیكترۆن و نێوكەكان چی دیكە نەیانتوانی بەسەر هێزی كەهرۆموگناتیسیی نێوانیاندا زاڵ بن و، یەكیان گرت و گەردیلەكان پێكهاتن.

هەروەها (ستیفن هوكینگ) لە كتێبێكی دیكەیدا بە ناوی: (كورتە مێژوویەكی كات)، (تأریخ موجز للزمن)دا[1]، دەڵێ:

ئەگەر موعەددەلی لێككشانی گەردوون لە دوای یەك چركە، لە تەقینەوەی مەزن، كەمتر بووایە بە ئەندازەی: (١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) (١٠$^{١٧}$) بەشێك لە سەد ملیۆن ملیار بەش، ئەو كاتە گەردوون بەر لەوەی بگاتە ئەم حاڵەی ئێستای، دەهاتەوە یەك و، ئەم گەردوونە دروست نەدەبوو! {ئەگەر كشانەكەی لە یەك لەسەر سەد ملیۆن ملیار بەش كەمتر بووایە! كە ئەوە ئەندازەیەكی خەیاڵییە، نەك نیوەی ئێستا، یان یەك لەسەر چواری ئێستا، بەڵكو:

---

(١) ص١٢١،١٢٢.

(١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠)، یانی: لە سەد ملیۆن ملیار بەش (١٠[١٧])، یەك بەشیان، ئەوەندە كەمتر بووایە لە لێككشانی بوونەوەر، لەو حاڵەتەی كە خوا بۆی داناوە، ئەوە گەردوون دروست نەدەبوو}[1].

هەروەها هەر (ستیفن هوكینگ) لە كتێبی (the grand design)، (دیزایینی مەزن)دا، دەڵێ: حاڵەتەكە بەو شێوەیە بووە كە پارچەیەك دراوی كانزایی كە تیرەكەی (١سم) بێ، كت و پڕ بە ئەندازەی دە ملیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠) هێندەی پانایی مەجەڕڕەی كاكێشان لێك بكشێت[2].

واتە: پارچە دراوێك فڕێ بدەی كە تیرەكەی دەوری (١سم)ە، بەڵام كت و پڕ بە ئەندازەی دە ملیۆن(١٠٠٠٠٠٠٠) جار هێندەی پانایی كەهكەشان لێك بكشێ، ئەم گەردوونەی ئێستا، سەرەتایەكەی بەو شێوەیە بووە.

## هەشت قۆناغەكەی دروستبوونی گەردوون:

(د. زغلول النجار)یش لە كتێبی (السماء في القرآن الكريم)دا، باسی قۆناغەكانی دروستبوونی گەردوون دەكات، كە من پوختم كردۆتەوە بۆ هەشت (٨) قۆناغ و، ئەو لە ژێر ئەم ناوونیشانەدا:

(مَرَاحِلُ خَلْقِ الكَوْنِ عِنْدَ كُلٍّ مِنَ الفَلَكِيِّينَ وَالفِيزيائِيِّين)، (قۆناغەكانی دروستبوونی گەردوون، لەلای هەر كام لە گەردووناسەكان و فیزیا زانەكان)دا گوتوویەتی:

**قۆناغی یەكەم:** دوای ماوەیەكی زۆر زۆر كەم، كە مەزەندە دەكرێ بە: (١٠ $^{-35}$)ی چركەیەك (١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠)، {واتە: چركەیەك بكەی بە ژمارەیەك كە (١)، (٣٥) سفری لە پێشەوە بێت، یەك بەشی ئەو ژمارەیەی چركەیەك، یانی: چركەیەك بكەی بەو هەموو بەشە،

---

(١) نێوان كەوانەكان زیادەی خۆمە.
٢

ئنجا یەك بەشی ئەو هەموو ژمارەیە}، لە دوای تەقینەوەی گەورە، گەردوون: بارِیۆنەكان و دژەكانی، لەلایەك و، فۆتۆنەكانی تیشك لەلایەكی دیكە، یەكسان بوون، ئنجا بارِیۆنەكان و دژەكانیان، هەندێكیان هەندێكیانیان لە بەین دەبرد و، وزەیەكی زۆریان بەرهەم دەهێنا، كە دوایی لەو وزەیە، تەنۆلكە سەرەتاییەكانی مادده و دژەكانیان دروست دەبوون، ئەویش بە هۆی ئەوەوە كە ئەو دژانەی یەكدییان لە بەین دەبرد، بەو هۆیەوە فۆتۆنەكان دروست دەبوون، دوایی ئەو فۆتۆنانەش باریۆنەكانیان لێ پێك دەهاتن و، باریۆنەكانیش خشتی بنەڕەتیی و پێكهێنەری سەرەكیی نێوكی گەردیلەكانن، كە هەر باریۆنێك لە سەد ملیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠) فۆتۆن دروست دەبوو {واتە: (١٠٠٠٠٠٠٠٠) سەد ملیۆن فۆتۆن لە كاردا دەبوون، تاكو باریۆنێكیان وەدی دەهێنا، ئەوە بەپێی مەزەندەو بیردۆزەی زانایان، كە لەو بارەوە باسیان كردوە}.

**قۆناغی دووەم:** لە دوای تێپەڕینی یەك چركە(ثانیة)، ئەندازەی وزەی پەیدابوو لە گەردووندا، ڕێگای دا، بەوە كە تەنۆلكەكانی وەك ئەلیكترِۆن، كە ئەلیكترِۆن بۆ خۆی سالیبە و، دژەكەی، كە بۆزیترِۆنە و موجیبە، ئەوانە دروست ببن، ئنجا ئەو تەنۆلكانە هەندێكیان هەندێكیانیان لە بەین دەبرد، بەڵام لە ئەنجامی یەكدی لەبەین بردندا، تیشكێكی زۆر گەرمیان لەسەر شێوەی فۆتۆنەكانی وزە، كە لە هەموو گەردووندا بڵاودەبووەوە، دروست دەكرد، كە ئەوە دوایی ناوی لێنرا: تیشكی پاشخانی گەردوونیی، كە ئەوەش ئاماژە دەكات بەوەی گەردوون: بە تێپەڕینی كات، هەم چڕییەكەی كەم بۆتەوە و هەم گەرمییەكەشی.

**قۆناغی سێیەم:** لە دوای تێپەڕینی پێنج چركە، پلەی گەرمیی دابەزی بۆ چەند ملیارێك لە پلەی ڕەها {واتە: پلەی (كالْڤن)}، لەو كاتەدا جگە لە چەند تەنۆلكەیەكی سەرەتایی لە ماددەو لە وزە، وەك: پرِۆتۆنەكان و نیۆترِۆنەكان و ئەلیكترِۆنەكان و نیوترِیۆنەكان و فۆتۆنەكان، هیچ شتێكی دیكە بوونی نەبوو، واتە: جارێ گەردیلەكان دروست نەبوو بوون.

**قۆناغی چوارەم:** لە دوای تێپەڕینی سەد (١٠٠) چركە، پلەی گەرمیی گەردوون بۆ یەك ملیار(١٠٠٠٠٠٠٠٠٠) پلەی (كالْڤن) دابەزی، {سفری (كالْڤن) بریتیە

لە (٢٧٣،١٦)ی سالیبی سانتیگڕانت، سیلزیی}، کە لەوە ساردتر تەصەوور ناکرێ.

ئنجا لەو کاتەدا {دوای سەد (١٠٠) چرکە، کە پلەی گەرمیی بۆ یەك ملیار پلەی (کالْڤن) دابەزی}، پڕۆتۆنەکان و نیوترۆنەکان دەستیان کرد بە یەکگرتن و پێکهێنانی نێوکی گەردیلە هاوشێوەکان (نظائر)ی: هیدرۆجین و هیلیۆم و لیشیۆم، بە دوای یەکدا، ئیدی بەو شێوەیە، خشتە یەکەمەکانی دروستبوونی گەردوون، هاتنە دی.

**قۆناغی پێنجەم:** دوای تێپەڕینی چەند خولەکێك لە ڕووداوی تەقینەوەی گەورە، پلەی گەرمیی گەردوون دابەزی بۆ (١٠٠٠٠٠٠٠٠) سەد ملیۆن، {لە یەك ملیارەوە بۆ سەد ملیۆن، واتە: بۆ یەك لەسەر دە (١/١٠)}، دابەزی، ئەوەش وایکرد کە ئەو لێکدانی نێوکیی بەردەوام بێ، هەتا (٢٥٪)ی بارستایی گەردوون بۆ هیلیۆم گۆڕا و، زۆرینەکەشی کە (٧٥٪)ە، بە شێوەی هیدرۆجین مایەوە، کە حاڵەتی ئێستای گەردوونیش هەر بەو شێوەیە ماوەتەوە، هەرچەند هەندێك دەڵێن: (٧٤٪) هیدرۆجین و (٢٤٪) هیلیۆم و، (٢٪)ش، سەدو پێنج (١٠٥) توخمەکانی دیکەی گەردوونە.

**قۆناغی شەشەم:** دوای تێپەڕینی هەزار (١٠٠٠) چرکە تاکو دە ترلیۆن ((١٠٠٠) - (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠)) چرکە، ئایۆنەکانی هیدرۆجین و هیلیۆم دروستبوون، {ئایۆن (ion)یش بریتیە لە گەردیلەیەك، یان کۆمەڵە گەردیلەیەك، کە یان ئەلیکترۆنێکیان لە دەست داوە، یاخود ئەلیکترۆنێکی زیادیان هەیە و، بەوە بوونە خاوەن بارگەیەکی کارەبایی کە دەگونجێ لەگەڵ گەردیلەیەکی دیکەدا یەك بگرێ}[1].

**قۆناغی حەوتەم:** دوای تێپەڕینی دە تریلیۆن چـرکە، تاکو هەزار تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠)، (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) چرکە، ئنجا گەردیلەکانی توخمەکان دروستبوون و پێکەوە لکان.

---

(١) الموسوعة العلمية الشاملة، ص٤٢٧.





**قۆناغی هەشتەم و کۆتایی:** لە دوای هەزار ترلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) چرکە، کە دەکاتە: (٣٢،٠٠٠،٠٠٠) سی و دوو ملیۆن ساڵ بە حسابی ئێمە، هەتاکو ئێستا کە دە ملیار[1] (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵە، ئەستێرەو کەهکەشانەکان دروست بوون.

ئەمە وەك گوتمان: (د. زغلول النجار) هێناویەتی و، ئەویش لە کۆمەڵێك سەرچاوەوە کە ئاماژەی پێکردوون، هێناویەتی و، زۆربەی ئەو کتێبانەی کە باسی گەردوون و فیزیاو سەرەتای دروستبوونی گەردوون دەکەن، ئەو جۆرە زانیارییانەیان تێدا هەن.

**١١- ڕاستیی یازدەیەم:** هەر کام لە کات و شوێن و گەردوون، (الزمان والمكان والكون)، دوای ئەو تەقینەوەیە پەیدابوون و، پێشتر هیچ کامیان بوونیان نەبووە، ئەمە بە ئیعتیراف‌ی (ستیفن هوكینگ)، کە گەورە زانای فیزیای ئەم ڕۆژگارە بووە، یەك، دوو مانگ لەمەو پێش، مرد[2]، ئەویش دەڵێ: پێش ئەوە، هیچ شتێك بوونی نەبووە: نە کات هەبوو، نە شوێن هەبوو، نە مادده هەبوو، نە گەردوون، هیچ شتێك نەبوو، پێش ئەو تەقینەوە گەورەیەی کە لەو تاك (مفردة) (Singularity)وە، دا کەوت ئەگەر ڕاست بێ و پێکابیان.

فەرمایشتی خوای زاناو شارەزاش ئاماژە بەوە دەکات، کە دەفەرموێ:

﴿ أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَآءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الأنبياء.

واتە: ئایا ئەوانەی بێبڕوان نازانن، کە ئاسمانەکان و زەوی پێکەوە بوون، پێکەوە جۆشدراو بوون، لێکمان جیاکردنەوە و، هەموو زیندەوەرێکیشمان لە ئاو وەدی هێنا، ئایا بڕوا ناهێنن؟! واتە: خوا (سبحانه وتعالى) لە ئایەتێکدا، یان لە

---

(١) زۆربەی زانایانی گەردووناسی هاوچەرخ سەرەتای گەردوون دەگێڕنەوە بۆ دەوری: (١٣-١٥) ملیار ساڵ لەمەوبەر.

(٢) لە کاتی پێشکەشکردنی ئەم وتارانەدا.

ڕستەیەکی درێژدا، هەم باسی سەرەتای دروست بوونی گەردوونتان بۆ دەکات، هەم باسی سەرەتای دروست بوونی ژیانتان بۆ دەکات، لە فەرمایشتەکەی خۆیدا، ئایا بڕوا ناهێنن کە ئەم فەرمایشتە لە خواوەیە؟!

ئەگەرنا کەسێك خۆی ئەو گەردوونەو ئەو بوونەی نەهێنابێتە دی و، خۆی ژیانی نەهێنا بێتە دی، چووزانێ کە سەرەتای ژیان ئاوایە، سەرەتای ژیان دەگەڕێتەوە بۆ ئاو و، گەردوونیش دەگەڕێتەوە بۆ شتێکی پێکەوە چەسپاو، پێکەوە لکاو، بەڵام خوا (سبحانه وتعالى) لێکی جیا کردۆتەوە، وەك پێشتر گوتمان: ئێمە وشەی تەقینەوە (إنفجار - bang)مان پێ گونجاو نیە!! چونکە تەقینەوە فەوزای لێ پەیدا دەبێ، پادشاگەردانیی و بێ سەروبەریی لێ پەیدا دەبێ، بەڵام ئەو تەعبیرەی خوا (سبحانه وتعالى) بەکاری هێناوە، وشەکانی: پێکەوە لکاویی (رتق)[1] و لێك جیایی (فتق)[2] تەعبیرێکی ئەو پەڕی وردە و ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو حاڵەتە: بە شێوەیەکی یاسایی سیستماتیك ڕوویداوە.

ئنجا (ستیفن هوکینگ) بۆ خۆی دەڵێ: لێککشانی گەردوون لە دوای چرکەیەك، ئەگەر بە یەك لەسەر دە توان حەڤدە (١/١٠ ١٧) کەمتر بووایە، لەوەی ئێستا ئەم گەردوونە دروست نەدەبوو، کەواتە: ئەوپەڕی وردەکاریی و ڕێك و پێکیی تێدا ڕەچاو کراوە.

هەڵبەتە ئەوەش بە ئەندازەی ئەوە کە ئێستای عەقڵی بەشەر پێی گەیشتوە، چونکە خوا کە دەفەرموێ:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت.

---

(١) الرتق: الضمُّ والإلتحام خِلقةً كانت أو صنعةً. مفردات ألفاظ القران، راغب الأصفهاني، ص٢٠٤.

(٢) الفتق: الفصل بين المتصلين وهو ضد الرتق، هەمان سەرچاوە، ص٣٨٨.





واتە: لەمەودوا نیشانەکانی خۆمانیان پیشان دەدەین، لە ئاسۆیەکان و لە خۆشیاندا، تاکو بۆیان دەرکەوێ کە هەقە، ئایا بەس نیە کە پەروەردگارت ئاگاداری هەموو شتێکە.

ئنجا مادام خوا ئاگاداری هەموو شتێکە، هەموو شتێکتان لەو کتێبەی خۆیدا، ئەگەر بە ئاماژەیەکی کورتیش بێ، پێ دەفەرموێ: بە تایبەت سەرەتای دروستبوونی ژیان و گەردوون و، ئەو ڕاستییە مەزنانەی دیکە کە پەکتان لەسەریان کەوتوە.

**١٢) ڕاستیی دوازدەیەم و کۆتایی:** لەبارەی پووچەڵیی زنجیرەی بێ کۆتایی یەوە، ئەوەیە کە قسەیەکی (إِبْنُ تَيْمِيَّة) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لەو بارەوە دێنین کە لە کتێبی (منهاج السنة النبوية)[1]دا، هاتوە، پێشێ دەقە عەرەبییەکەی دێنین، دوایی بە کورتیی مانای دەکەین.

دەڵێ:

(التَّسَلْسُلُ نَوْعَانِ:

أولاً: تَسَلْسُلٌ فِي الْمُؤَثِّرَاتِ كَالتَّسَلْسُلِ فِي الْعِلَلِ وَالْمَعْلُولَاتِ، وَهُوَ التَّسَلْسُلُ فِي الْفَاعِلِينَ وَالْمَفْعُولَاتِ، فَهَذَا مُمْتَنِعٌ بِاتِّفَاقِ الْعُقَلَاءِ.

وَمِنْ هَذَا الْبَابِ تَسَلْسُلُ الْفَاعِلِينَ وَالْخَالِقِينَ وَالْمُحْدِثِينَ مِثْلَ أَنْ يَقُولَ: هَذَا الْمُحْدَثُ لَهُ مُحْدِثٌ، وَلِلْمُحْدِثِ مُحْدِثٌ [آخَرُ]، إِلَى مَا لا يَتَنَاهَى، فَهَذَا مِمَّا اتَّفَقَ الْعُقَلَاءُ "فِيمَا أَعْلَمُ" عَلَى امْتِنَاعِهِ؛ لأَنَّ كُلَّ مُحْدَثٍ لايُوجَدُ بِنَفْسِهِ، فَهُوَ مَعْدُومٌ بِاعْتِبَارِ نَفْسِهِ، [وَهُوَ مُمْكِنٌ بِاعْتِبَارِ نَفْسِهِ]، فَإِذَا قُدِّرَ مِنْ ذَلِكَ مَا لاَ يَتَنَاهَى، لَمْ تَصِرِ الْجُمْلَةُ مَوْجُودَةً وَاجِبَةً بِنَفْسِهَا، فَإِنَّ انْضِمَامَ الْمُحْدَثِ، إِلَى الْمُحْدَثِ، وَالْمَعْدُومِ إِلَى الْمَعْدُومِ، وَالْمُمْكِنِ إِلَى الْمُمْكِنِ، لاَ يُخْرِجُهُ عَنْ كَوْنِهِ مُفْتَقِراً إِلَى الْفَاعِلِ لَهُ، بَلْ كَثْرَةُ ذَلِكَ تَزِيدُ حَاجَتَهَا وَافْتِقَارَهَا إِلَى الْفَاعِلِ، وَافْتِقَارُ الْمُحْدَثَيْنِ الْمُمْكِنَيْنِ أَعْظَمُ مِنَ افْتِقَارِ أَحَدِهِمَا، كَمَا أَنَّ عَدَمَ الإِثْنَيْنِ

---

(١) ج١، ص٤٣٦.





أَعْظَمُ مِنْ عَدَمِ أَحَدِهِمَا، فَالتَّسَلْسُلُ فِي هَذَا وَالْكَثْرَةُ لَا تُخْرِجُهُ عَنِ الإِفْتِقَارِ وَالْحَاجَةِ، بَلْ تَزِيدُهُ حَاجَةً وَافْتِقَارًا.

فَلَوْ قُدِّرَ مِنَ الْحَوَادِثِ وَالْمَعْدُومَاتِ وَالْمُمْكِنَاتِ مَا لا نِهَايَةَ لَهُ، وَقُدِّرَ أَنَّ بَعْضَ ذَلِكَ مَعْلُولٌ لِبَعْضٍ أَوْ لَمْ يُقَدَّرْ ذَلِكَ، فَلَا يُوجَدُ [شَيْءٌ مِنْ] ذَلِكَ إِلَّا بِفَاعِلٍ صَانِعٍ لَهَا خَارِجٍ عَنْ هَذِهِ الطَّبِيعَةِ الْمُشْتَرَكَةِ الْمُسْتَلْزِمَةِ لِلإِفْتِقَارِ وَالإِحْتِيَاجِ، فَلا يَكُونُ فَاعِلُهَا مَعْدُوماً وَلاَ مُحْدَثاً وَلاَ مُمْكِناً يَقْبَلُ الْوُجُودَ وَالْعَدَمَ، بَلْ لاَ يَكُونُ إِلاَّ مَوْجُودًا بِنَفْسِهِ وَاجِبَ الْوُجُودِ لاَ يَقْبَلُ الْعَدَمَ، قَدِيمًا لَيْسَ بِمُحْدَثٍ، فَإِنَّ كُلَّ مَا لَيْسَ كَذَلِكَ، فَإِنَّهُ مُفْتَقِرٌ إِلَى مَنْ يَخْلُقُهُ وَإِلاَّ لَمْ يُوجَدْ.

ثانياً: وَأَمَّا التَّسَلْسُلُ فِي الْآثَارِ كَوُجُودِ حَادِثٍ بَعْدَ حَادِثٍ، فَهَذَا فِيهِ الأَقْوَالُ الثَّلاَثَةُ الْمُتَقَدِّمَةُ:

إِمَّا مَنْعُهُ فِي الْمَاضِي وَالْمُسْتَقْبَلِ، كَقَوْلِ جَهْمٍ وَأَبِي الْهُذَيْلِ.

وَإِمَّا مَنْعُهُ فِي الْمَاضِي فَقَطْ، كَقَوْلِ كَثِيرٍ مِنْ أَهْلِ الْكَلاَمِ.

وَإِمَّا تَجْوِيزُهُ فِيهِمَا، كَقَوْلِ أَكْثَرِ أَهْلِ الْحَدِيثِ وَالْفَلاَسِفَةِ، وَهَذَا مَبْسُوطٌ فِي غَيْرِ هَذَا الْمَوْضِعِ).

واتە: زنجیرەی بێ کۆتایی (کە پێچەوانە عەقڵە)، دوو جۆرە:

**یەکەم:** زنجیرەیەك لە کارتێکەرەکان، وەك زنجیرەی پەیداکەرو پەیداکراوەکان، بکەرو پێکراوەکان، کە ئەمە بەیەك دەنگیی هەموو خاوەن عەقڵان، شتێکی مەحاڵە، هەروەها زنجیرەی بکەرەکان و بەدیهێنەرەکان و پەیداکەرەکان، بۆ وێنە: بگوترێ: ئەمە پەیدا کراوە، پەیداکەرێکی هەیە، پەیداکەرەکەش پەیداکەرێکی دیکەی هەیە، تا کۆتایی ...، ئەوە هەموو خاوەن عەقڵەکان، ئەوەندەی من بزانم، لەسەر ئەوە کە مەحاڵە، رێککەوتوون، چونکە هەر پەیداکەرێك کە لە خودی خۆیدا نەبێ، ئەوە بە نسبەت خۆیەوە بە نەبوو (معدوم) لە قەڵەم دەدرێ و، بە بوون گونجاو (ممکن) لە قەڵەم دەدرێ، ئنجا ئەگەر ژمارەیەکی بێ کۆتایی مەزندە بکرێ، ئەوە ئەو ژمارە بێ کۆتاییە لە پەیداکراوەکان نابن بە بوون پێویست، چونکە ئەگەر پەیداکراوێك







بچێتە گەڵ پەیداکراوێك و، نەبووێك بچێتە گەڵ نەبووێك و، بوون گونجاوێك بچێتە گەڵ بوون گونجاوێك، ئەوە لەو سروشتەی خۆی نایباتە دەر، کە پێویستیی بە بکەرێك هەیە، پێویستیی بە پەیداکەرێك هەیە، بەڵکو زۆربوونی پەیداکراوو نەبوو (معدوم) و بوون گونجاوەکان، هەر زیاتر ناچاریان دەکات، پێویستییان بە پەیداکەرێك بێ، کە خاوەنی بوونێکی زاتیی بێ، بۆیە ئەگەر وا مەزەندە بکرێ، ڕووداوان و، نەبووان و، بوون گونجاوانی بێ کۆتایی هەن و، وا مەزەندە بکرێ کە هەندێك لەوانە هۆکاری پەیدابوونی هەندێکیانن، یاخود ئەوە مەزەندە نەکرێ، هیچ کام لەوانە پەیدا نابن، مەگەر بە هۆی پەیداکەرێکەوە کە لە دەرەوەی سروشتی ئەوانەیە، ئەو سروشتە هاوبەشەیان، کە خوازیاری پێویستیی و ئاتاجییە بەوەی پەیداکەرێك پەیدای بکات، هەر بۆیە بکەرو پەیداکەری ئەوانە، نابێ نەبوو (معدوم)بێ و، نابێ پەیداکراو، (محدَث)بێ و نابێ بوون گونجاو (ممکن)بێ و بگونجێ بوون و نەبوون، هەردووکیان قبووڵ بکات، بەڵکو دەبێ خاوەنی بوونێکی زاتیی بێ و، بوونەکەی پێویست بێ و، نەبوون قبووڵ نەکات.

**دووەم:** بریتیە لە زنجیرەی شوێنەوارەکان، ئەویش وەك ئەوە کە پەیداکراوێك هەبێ، پەیداکراوێکی دیکەش هەبێ، پەیداکراوێکی دیکەش هەبێ ...، هەر درێژ بێتەوە (بێ کۆتایی)، ئەمە سێ ڕای لەبارەوە هەن (لە نێو ئەهلی ئیسلامدا):

أ- ئەوە کە لە ڕابردوو و لە داهاتوودا، بڕوامان پێی نەبێ، کە جەهمی کوڕی صەفوان و ئەبی هوذەیل ڕایان وا بووە، {گوتوویانە: لە ڕابردوودا خوای پەروەردگار دروستکراوانی بێ کۆتایی نەبوون، بەڵکو ئەو گەردوونەی پەیدا کردوە و، پێش ئەو هیچ نەبووە، هەروەها گوتوویانە: دواییش خوا ئەهلی بەهەشت و، ئەهلی دۆزەخیش، هەموویان لە بەین دەبات و بەس خۆی دەمێنێتەوە، واتە: نە لە ڕابردوودا زنجیرەی بێ کۆتایی هەیە، نە لە داهاتوودا}[1].

ب- ڕای دووەم ئەوەیە، کە لە ڕابردوودا (زنجیرەی بێ کۆتایی) نەبووە، بەڵام لە داهاتوودا دەبێ، {ئەهلی دۆزەخ و ئەهلی بەهەشت بەردەوام دەبن بەبێ

---

(١) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

کۆتایی}، ئەمە ڕای زۆربەی ئەهلی کەلامە، واتە: {زانایانی ئیمان و عەقیدە لە ئیسلامدا).

ج- ڕای سێیەم ئەوەیە، کە هەم لە ڕابردوودا، ئەوە بە دروست دابنرێ و، هەم لە داهاتووشدا، {لە داهاتوودا، یەکدەنگیی هەموو ئەهلی ئیسلامی لەسەرە، جگە لە جەهمی کوڕی صەفوان و ئەبو هوذەیل، کە لە ڕاستییدا ڕایەکەیان هەڵەیە، بەڵام بۆ ڕابردوو} ئەوە قسەی زۆربەی ئەهلی حەدیث و فەیلەسووفەکانە، (کە (إبن تیمیة) خۆیشی ڕای وایە}.

هەڵبەتە مەبەستیان پێی ئەوەیە کە خوا (سبحانه وتعالى) ئەم گەردوونەی هێناوەتەدی، لە پێش ئەم گەردوونەشدا شتی دیکەی هەبووە و، لە پێش ئەویشدا شتی دیکەی هەبووە و...هتد، بەڵام هەموویان هەر پەیداکراون، واتە: هەر کام لەو پەیداکراوانەی کە هەن، پەیداکراوێکی دیکەی لە پێشە و ئەویش پەیداکراوێکی دیکەی لە پێشە و...هتد، ئنجا ئایا پاساوی ئەو قسەیان چی بووە؟ پاساوەکەی ئەوە بووە گوتوویانە: خوا (سبحانه وتعالى) سیفەتەکانی لەگەڵ زاتنی و زاتی خواش نەبوونی پێش نەکەوتوە، سیفەتەکانیشی هەر لەگەڵ زاتیدا بوون، واتە: خوا بەبێ سەرەتا بەدیهێنەر و پەیداکەر بووە، ژیێنەر بووە، مرێنەر بووە، ئەو سیفەتانەی کە ئێستا هەینی، هەر هەیبوون، ئنجا مادام ئەو سیفەتانەی کە هەینی، هەر هەیبووبن، دەبێ شوێنەواری ئەو سیفەتانەشی هەر هەبووبێ، بۆ وێنە: بەدیهێنەرایەتیی خوا، سیفەتێکی زاتی خوای پەروەردگارە، هەروەها زانیاریی خوا، دەسەڵاتی خوا، ویستی خوا، ئەو سیفەتانەی پەیدا نەبوون و هەر هەیبوون، کەواتە: دەبێ شوێنەواری ئەو سیفەتانەشی هەر بووبن.

هەڵبەتە هەندێك شتیش لە ڕووی نەقڵییەوە بەڵگە دێننەوە، بۆ وێنە:

١) خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ﴾ هود: ٧.

واتە: (خوا) ئەو کاتە بارەگا (عرش)ەکەی لەسەر ئاو بوو، کەواتە: بەر لە ئاسمانەکان و زەوی (گەردوون)، (عەرش)یش بووەو (ئاو)یش بووە.

٢) ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ﴾ فصلت(١١).

واتە: ئنجا (خوا) ویستی (دروستکردنی) ئاسمانی کرد کە لەو حاڵەدا دووکەڵ بوو..

کەواتە: بەر لەوەی گەردوون بوو بێ، دووکەڵ (گاز)، (دخان) بووە، هەڵبەتە ئەوە بابەتێکی زۆر قووڵە و قسە لە بارەوەکردنی وردبوونەوە و دووربینیی (إحتیاط)ی زۆری دەوێ و، شتێکی ئاسان نیە[1].

ئنجا هەرچەندە (إبن تیمیة) وای گوتوە، بەڵام بە بۆچوونی من باشتر وایە بگوترێ: عەقڵی بەشەر لەوە بچووکترە جێگای وێناکردن (تصوُّر)ی ئەزەل و ئەبەدی تێدا ببێتەوە، بەڵام هەر شتێك وەحیی خوا هەواڵمان لە بارەیەوە پێ بدات، بە حوكمی ئیمانەكەمان وەریدەگرن و تەسلیمی دەبین، ئنجا بە نسبەت (ئەبەد) ەوە، کە ژیانی ئەهلی بەهەشت هەمیشەییەو بێ کۆتاییە، هەروەها ژیانی ئەهلی دۆزەخیش بەهەمان شێوە، ئەوە خوای زانا و شارەزا هەواڵی پێداوین و، هیچ بواری مشت و مڕی تێدا نیە، بۆ وێنە خوا عزوجل لە بارەی ئەهلی بەهەشتەوە و، هەر مانەوەی بێ کۆتاییان تێیدا، فەرموویەتی:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ خَيۡرُ ٱلۡبَرِيَّةِ ٧ جَزَآؤُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ رَبَّهُۥ ٨﴾ البينة.

هەروەها لە بارەی بە هەمیشەیی و بێ بڕانەوە لە دۆزەخدا مانەوەی دۆزەخییانەوە، فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمۡ سَعِيرًا ٦٤ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ لَّا يَجِدُونَ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ٦٥﴾ الأحزاب.

---

(١) سوپاس و ستایش بۆ خوا ئێمە لە کتێبی چوارەمی: مەوسووعەی: {بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیعدا}، بە ناوونیشانی: (پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی)دا، لەو بارەوە قسە و باسمان کردوە، بڕوانە: لاپەڕە: ٦١-٦٦، چاپی یەکەم / ٢٠١٩ز.

بەڵام بە نسبەت ڕابردووەوە: ئایا خوا لە پێش ئەم گەردوونەدا شتی دیکەی خوڵقاندوە؟ بەڵێ خوا ئاماژەی بەوە داوە، لە ئایەتی (٧)ی سوورەتی (هود) دا، دەفەرموێ:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾.

واتە: ئەو (خوا) ئەو زاتەیە، کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژاندا (بە شەش قۆناغ) هێنانە دی و، ئەو کاتە عەرشەکەی لەسەر ئاو بوو، تاکو تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردەوەی باشترە...

کەواتە: پێش ئەم گەردوونە، پێش ئاسمانەکان و زەوی، خوا هەم عەرشیشی دروستکردوە و، هەم ئاویش و عەرشەکەی لەسەر ئاو بووە، ئنجا ئایا ئەوە مەبەست پێی چییە؟! دەڵێین: ئەوە بابەتێکی دیکەیە، بەڵام خوا باسی ئەو دوو دروستکراوەی خۆی دەکات، بەر لەهێنانەدی ئاسمانەکان و زەوی.

هەروەها کە لە ئایەتی (١١)ی سوورەتی (فصلت)دا دەفەرموێ:

﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ ﴾.

واتە: خوا ویستی ئاسمان دروست بکات، لەو کاتەدا دووکەڵ بوو، کە هەندێك لە فیزیکزان و گەردووناسانی ئێستا، زاراوی شلەی گەردوونیی یان شۆربای گەردوونیی (الحِساء الكوني)ی، بۆ بەکاردێنن، بە هەرحاڵ خوا لەوێش باسی ئەوە دەکات، کە بەر لەوەی گەردوون بە شێوەی ئێستای بخوڵقێنێ، دووکەڵ بووە.

بەڵام ئەوە کە ئایا لە پێش ئەم گەردوونەی ئێمەدا و بەبێ سەرەتا، خوا دروستکراوی دیکەی بوون؟ کە (إبن تيمية) دەڵێ: ئەوە ڕای زۆربەی ئەهلی حەدیث و، هی فەیلەسووفەکانیشە، کە بە نسبەت فەیلەسووفەکانەوە ڕاستە، ڕەنگە زۆریان ڕایان وابووبێ، بەڵام بە نسبەت ئەهلی حەدیثەوە، ڕاست نیە و، پێشم سەیرە (إبن تيمية) وایگوتوە!!.

من بەڵگەیەکی نەقڵیی شایستەی پشت پێ بەسترانم لەوبارەوە پێ شك نایەت!

هەرچەندە ئەو ڕایەش پێم وایە لە ئیسلامدا هەر جێی دەبێتەوە، مادام دەڵێ: ئەو شتانەش هەموویان هەر پەیداکراون و، هیچیان بوونێکی زاتییان نیە، پێشەوا (أبو حامد الغزالي)یش بۆیە قسەی فەیلەسووفەکانی بە کوفر داناوە لە کتێبی: (تهافت الفلاسفة)دا، چونکە گوتوویانە: دروستکراوەکانیش، بە زاتی خۆیان بێ سەرەتا (قدیم بالذات)ن.

بەڵام پێم وایە وا سەلامەتترە کە بگوترێ: خوا عزوجل دەفەرموێ: ئاسمانەکان و زەوی (گەردوون)م پەیدا کردوە، بەڵام ئایا لە پێش ئەم گەردوونەدا، چ باسە؟ خوا هەواڵی پێ نەداوین، جگە لەوەی باسی ئاوو باسی عەرشی کردوە، باسی دووکەڵی کردوە، بەڵام ئەوە نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی خوا دروستکراوانی بێ سەرەتای بووبن، هەرچەندە ئەوە مەحاڵێکی عەقڵییش نیە و، ئەگەر واش بووبێ، گرنگ ئەوەیە خوا (سبحانە وتعالی) بەدیهێنەری هەموو شتێکە، کەواتە: ئەگەر گریمان واش بێ، ئەوانیش هەر خوا پەیدای کردوون، ئنجا بەڕاستیی ئەو قەزیانەش لەوە گەورەترن لە عەقڵی مرۆڤدا چاك جێیان ببێتەوە و، مرۆڤ دەبێ سنووری خۆی بزانێ، تەماعی ئەوەی نەبێ کە هەموو شتێك لە عەقڵیدا جێگای ببێتەوە، وەك چۆن ئاوی دەریایەك لە پەرداخێك دا ناحەجمێ و جێی نابێتەوە.




## بیانووی شەشەم: گەردوون بە ڕێكەوت (صُدْفة) دروستبووە:

بەڕێـــزان!

بۆ قسەكردن لە بـــارەی ئەم بیانووە شەشەمەی ئیلحـــاد و دەرخستنی پووچەڵییەكەیەوە، سەرەتا پێناسەیەكی كورت و پوختی ڕێكەوت (صدفة) دەكەین و، دواییش لە نۆ (٩)بڕگەدا، پووچەڵیی و دژی عەقڵ و لۆژیك و زانست بوونی ڕێكەوت، ڕوون دەكەینەوە:

پێناسەی ڕێكەوت (الصدفة):

أ- خاوەنی (المعجم الوسيط) دەڵێ: (صَادَفَهُ مُصَادَفَةً: حَاذَاهُ، صَادَفَ فُلاَنَاً: لَقِيَهُ وَوَجَدَهُ مِنْ غَيْرِ مَوْعِدٍ وَلاَ تَوَقُّعٍ)[١]، واتە: (صَادَفَهُ مُصَادَفَةً): چووە ئاستی، (صَادَفَ فُلاَنَاً): تووشی بوو، پێی گەیشت بێ ئەوەی پێشتر بەڵێنێكیان بووبێ و مەوعیدێكیان بووبێ و، بەبێ ئەوەی چاوەڕوانیی كردبێ.

ب- (المنجد)، دەڵێ: (صَدَفَ يَصْدِفُ صَدْفَاً: انْصَرَفَ وَمَالَ، وَصَدَفَ يَصْدِفُ ويَصْدُفُ صَدْفاً وَصُدُوفَاً (عِنْدَ العَامَّةِ): لَقِيَهُ اتِّفَاقَاً وَقَابَلَهُ عَلَى قَصْدٍ وَبدُونِهِ، وَالصِدْفَةُ "الجَمْعُ صِدَف" لَفْظَةٌ مُوَلَّدَةٌ بِمَعْنَى المُصَادَفَةِ وَالإِتِّفَاق)[٢].

واتە: (صَدَفَ يَصْدِفُ صَدْفاً) و (يَصْدُفُ) بە هەردووكیان هاتوە، (صَدْفَاً) واتە: ڕۆیشت، لایدا، (وَصَدَفَ يَصْدِفُ ويَصْدُفُ صَدْفاً وَصُدُوفَاً)، كە خەڵك بە گشتیی بەركادێنن، واتە: تووشی بوو، بەمەبەستەوە، یاخود بەبێ ئەوەی كە مەبەستی بێ، (صِدْفَة) كە بە (صِدَف) كۆ دەكرێتەوە، {هەرچەندە خەڵك بە زۆری دەڵێن (صُدْفَة)، بەڵام ئەسڵەكەی (صِدْفة)یە}، وشەیەكە پەیدا كراوە، بە مانای یەكدی دیتن و پێكگەیشتن دێ.

---

(١) ص٥١٠.

(٢) ص٤١٩.

بۆ وێنە: کەسێك تووشی کەسێك دێ، کە چەند ساڵە نەیدیوە، چاوەڕوانیشی نەکردوە، دەگونجێ بڵێ: بە ڕێکەوت تووشی بووم، ئەمە مانای (صِدفة)یە.

ئنجا ئایا دەگونجێ (گەردوون) وەك مولحیدەکان دەڵێن: بە ڕێکەوت دروست بووبێ؟!

بێگومان: نەخێر، بەڵام شیکردنەوەی ئەم مەسەلەیە هەوێرێکی ئاو خوازە و، هەوڵ دەدەین لە نۆ (٩) بڕگاندا بیخەینە ڕوو:

**١- دوای ئەوەی سەلمێنرا: هەر کام لە زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی، خوازیارو بەڵگەی هەبوونی خوای تاك و پاکن(سبحانە وتعالی)، بواری قسەکردن لەبارەی (ڕێکەوت)ەوە نەماوە:**

بەڵێ: دوای خرانە ڕووی بەڵگەکانی خواناسیی، بواری قسەکردن لە ڕێکەوت (صُدْفَة) نەماوە، چونکە ڕێکەوت کاتێك پەنای بۆ دەبردرێ، لە بارەی پەیدابوونی شتێکەوە، کە ئێمە سەراسیمە بین و، بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نەبێ و، هیچ بەرچاو ڕوونییەکمان نەبێ، ئەو شتە چۆن پەیدا بووە؟ ئەو کاتە پەنا دەبرێتە بەر ڕێکەوت، بەڵام دوای ئەوەی باسمان کرد و سەلماندمان کە هەرکام لە: زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی، خوازیاری ئەوەن کە دەبێ ئەم گەردوونە خاوەن بەدیهێنەرو مشوورخۆرێکی هەبێ، تازە بواری قسەکردن لە ڕێکەوت نەماوە، بۆ کەسێك عەودالی هەق بێ و، بە دوای بڕوبیانووی مولحیدیی دا نەگەڕێ.

**٢- ناگونجێ قسە لە ڕێکەوت بکرێ، بۆ چۆنیەتی تەفسیرکردنی پەیدابوونی ماددە:**

بۆ پەیدابوونی ماددە: هیچ بواری تێدانیە باسی ڕێکەوت بکرێ، چونکە ئاشکرایە ڕێکەوت تەنیا لە کات و شوێن (زمان ومکان)دا، ئەگەری بوون و کارکردنی هەیە، دەبێ کات(زمان)ێك هەبێ و، شوێن (مکان)ێك هەبێ، ئەگەرنا ڕێکەوت بوونی مەحاڵە، بۆیە کاتێك کە کات و شوێن (زمان و مکان) نەبووون، هیچ بواری قسەکردن لە بارەی ڕێکەوتەوە نیە، هەندێك کەس وا دەزانێ: ڕێکەوت شتێکە و بوونی هەیە! نەخێر ڕێکەوت بوونێکی زاتیی نیە.





با وێنەیەك بێنینەوە:

یەکێك لەولاوە دێ و، یەکێك لەولاوە دێ و دەگەنە یەك، یان سەیارەیەك لەولاوە دێ، سەیارەیەك لەولاوە دێ، خۆیان لێك دەدەن، دەڵێن: تەصادوفیان کرد، لێرەدا شتێکی تازە پەیدا نەبووە، تەنیا هەردوو سەیارەکانن کە هەن، بەڵام حاڵەتێك لە ئەنجامی لێکدانی ئەو دوو سەیارەیەدا پەیدا بووە، پێی دەگوترێ: ڕێکەوت (صُدْفَة)، کە لە ڕاستییدا تەنیا بوونێکی زەینیی هەیە و، بوونێکی زاتیی نیە، کە لەسەر ئەرزی واقیع هەبێ.

یان دوو نەفەر دەگەنە یەکدی، یان کەسێك شتێکی لێ هەڵدەکەوێ، شتێك دەدۆزێتەوە، دەڵێ: بە ڕێکەوت (صُدْفَة) دۆزیمەوە! بەڵێ (صُدْفَة) بوونێکی خودیی نیە، چونکە لە مەسەلەی شت دۆزینەوەکەدا: تەنیا مرۆڤەکە و شتە دۆزراوەکە هەن و، هیچی دیکە! کەواتە: لە حاڵێکدا کات و شوێن نەبووبن، قسە لە ڕێکەوت کردن، شتێکی نا مەنتیقیی و نا مەعقووڵە.

**٣- تەفسیرکردنی پەیدابوونی بوونەوەر بە ڕێکەوت، ئەفسانەیەکی دژی عەقڵ و زانستە:**

بەڵێ ئەگەر گریمان شایەدیی دانی: (زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی)یش واز لێ بهێنین، هەر سروشتی گەردوون بۆ خۆی، ڕێی هیچ خاوەن عەقڵ و ویژدانێك نادات، باسی ڕێکەوت بهێنێتە پێش، چونکە:

وەك لە ڕابردوودا باسمان کرد، لە هەر گۆشەیەکەوە سەرنجی گەردوون بدەین و، تەماشای هەرکام لە پێکهاتەکانی بکەین، ئەوپەڕی یاساداریی (تنظیم) و وردەکاریی (إتقان) و سیستماتیکیی دەبینین، کە بە هیچ جۆرێك بوار بۆ قسەکردن لە بارەی ڕێکەوتەوە، ناهێڵنەوە، چونکە، ڕێکەوت (مُصادفة)ش یاسایەکی هەیە پێیەوە پابەندە و لێی لانادات:

یاسای ڕێکەوت (قانون المصادفة) دەڵێ: (إنَّ حَظَّ المُصَادَفَةِ مِنَ الإعْتِبَارِ يَنْقُصُ بِنِسْبَة مَعْكُوسَة مَعَ عَدَدِ الإمْكَانَاتِ المُتَكَافِئَة المُتَزَاحِمَة)[1].

---

(١) قصة الإيمان بين العلم والفلسفة والقرآن، الشيخ نديم الجسر ، ص٢٩٢.

واتە: شانسی ڕێکەوت کەم دەبێتەوە بەڕێژەی زۆربوونی ژمارەی ئەگەرە وەك یەکە پێکەوە پێشبڕکەکەرەکان، یانی: هەتا ژمارەی ئەگەرەکان زیاتر بێ، شانسی ڕێکەوت کەمتر دەبێتەوە و هەتا ژمارەی ئەگەرەکان کەمتر بێ، شانسەکەی زیاتر دەبێ.

بۆ وێنە: ئەگەر هەڵبژاردن لە نێوان دوو شتاندا بێ، ئەوە شانسی ڕێکەوت یەك لەسەر دوو (٢/١)ە، بەڵام ئەگەر هەڵبژاردنەکە لە نێوان دە (١٠) شتاندا بێ، ئەوە شانسی ڕێکەوت یەك لەسەر دە (١٠/١)یە، بەڵام ئەگەر شتەکان سەد دانە (١٠٠) بن، یاخود هەزار دانە (١٠٠٠) بن، ئەوە ئەگەری ڕێکەوت: یەك لەسەر سەد (١٠٠/١) و، یەك لەسەر هەزار (١٠٠٠/١)ە و، هەتا ژمارەی شتەکان زیاتر بێ، لە شانسەکەی کەمتر دەبێتەوە، تاکو وای لێ دێ ئەصڵەن هیچ شانسی نامێنێ، یانی: هیچ ئەگەر (إحتمال)ی نامێنێ.

بۆ وێنە: دراوێك[1] کە (٢) دوو دیوی: شێرو خەتی هەن، کاتێك هەڵی دەدەی، ئەگەری ئەوە کە بەسەر دیوی (خەت)دا، یان بەسەر دیوی (شێر)دا بکەوێ، یەك بۆ دوو(٢/١)ە، یانی: ئەگەری هەیە بەسەر ئەودا بکەوێ و، ئەگەریشی هەیە بەسەر ئەمدا بکەوێ، یەك لە بەرانبەر دوو دا، بەڵام زارێك کە بۆ تاوڵەو یاریی دیکە بەکاردەهێنرێ، کە شەش (٦) ڕووی هەن، ئەگەر بڵێی: دەمەوێ بەسەر فلان دیودا بکەوێ، ئەوە یەك بۆ شەش (٦/١)ە، دەگونجێ شەش جاران هەڵیبدەی، ئنجا جارێکیان ئەوە بێ: کە ویستووتە.

چونکە وەك گوتمان: یاسایەك هەیە بۆ ڕێکەوت (صدفة)، زانایانی ماتماتیکزان (علماء الحساب) دایانناوە، دەڵێ: هەتا ئەگەرە تێکگیراوە یەکسانەکان بۆ ڕوودانی شتێك، پتربن، شانسی ڕێکەوت کەمتر دەبێتەوە و، هەتا ژمارەیان کەمتر بێ، شانسەکەی زیاتر دەبێ، بۆ وێنە: وەك پێشتریش گوتمان: پارچە دراوێك کە دوو دیوی هەن، کە هەڵیدەدەی داخۆ بەسەر کام لایەیاندا دەکەوێ؟ ئیحتیمالی یەك بۆ دوو (٢/١)ی هەیە، یان ئەویانە، یان

---

(١) یانی: دراوێکی کانزایی (عملة معدنیة).

ئەویانە، بەڵام ئەگەر شتێك بێ، چوار ڕووی هەبن، دیارە ئیحتیمالی یەك بۆ چوار (١/٤)ە و، ئەگەر شەش بن، وەك: زار (نرد)ی تاوڵە كە هەڵیدەدەن، ئەوە ئەگەری یەك بۆ شەش (١/٦)ی هەیە بەسەر هەر لایەكیاندا بكەوێ، ئێستا با وێنەكە ئاڵۆزتر بكەین و وردەكاریی زیاتری تێدا بێ:

بۆ وێنە[١]:

ئەگەر دە (١٠) دەرزییمان هەبن و، ئەو دەرزییانە هەموویان ژمارەیان لەسەر بێ، یەك تا دە (١-١٠)، ئنجا ئەو دە (١٠) دەرزییە لە توورەكەیەكدابن، ئایا ئەگەری ئەوە چەندە كە هەر دە (١٠)یان، بە پێی ڕیزبەندییان، واتە: پێشێ یەكەم، دوایی دووەم، دوایی سێیەم، چوارەم، تاكو دەیەم، بە دوای یەكدا دەربێنین؟ بەپێی یاسای ڕێكەوت: ئەگەری یەك لەسەر دە ملیار (١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) (١٠ ^١٠)ە، واتە: لە دە ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) جار، ئنجا یەك جار ئەگەری ئەوە هەیە، ئەو دە (١٠) دەرزییە، هەر دەیان پێكەوە و بەپێی ڕیزبەندیی ژمارەكانیان، پێشێ یەك، ئنجا دوو، سێ، چوار، پێنج، شەش، حەوت، هەشت، نۆ، دە، بە دوای یەكدا دەربێن.

بەڵام ئەگەر دەرزییەكان دوازدە (١٢) بن، ئەوە شانسی ڕێكەوت دەبێتە: یەك لەسەر تریلیۆنێك (١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) (١٠^١٢)، بەڵام ئەگەر دەرزییەكان بیست و یەك (٢١) دانە بن، ئەو كات شانسی ڕێكەوت دەبێتە: یەك لەسەر هەزار ملیار ملیار (١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) (١٠^٢١)، دەشتوانین بڵێین: هەزار ملیۆن تریلیۆن، واتە: ئەگەری دەرهێنانی ئەو بیست و یەك دەرزییە ژمارە لێدراوە، بەو شێوەیە كە باسكرا، ئەوەندەیە، كە ئەگەر (إحتمال)ێكی زۆر زۆر بێهێزە.

ئەدی ئایا كتێبێكی (٥٠٠٠٠٠) پێنج سەد هەزار وشەیی، ئەو كتێبە شانسی چەندە بە ڕێكەوت چاپ بكرێ؟ ئەوە لە ڕاستییدا هەر حیساب ناكرێ!

---

(١) قصة الإيمان بين العلم والفلسفة والقرآن، الشيخ نديم الجسر، ص٢٩٤ فما بعد.





کەچی جەستەی مرۆڤ لە: سەد تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) (١٠ ^١٢) خانە پێکهاتوە، بە مەزەندەی زانایانی توێکاریی سەد تریلیۆن خانە، یاخود: سەد ملیۆن ملیۆن، ئنجا هەر خانەیەکیش لە: سەد تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) گەردیلە پێکهاتوە، یانی: بۆ ئەوەی ژمارەی گەردیلەکانی جەستەی مرۆڤێك بزانین، دەبێ سەد تریلیۆن جارانی سەد تریلیۆن بکەین:

١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠ ×١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠ =١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠ = (١٠ ^٢٨)

واتە: دە هەزار تریلیۆن تریلیۆن، یان: دە ملیار ملیار ملیار

ئەوە ژمارەی گەردیلەکانی جەستەی مرۆڤێکە!

ئنجا ئەوانە هەموویان چۆن وا ڕێکخراون؟! ئەو خانانە هەموویان، بۆ چەند پۆلێك دابەش بوون و، هەر بە چەند خانەیەك، شانە (نسیج) پێکدێنن و، شانەکان ئەندام (عضو) پێکدێنن و، ئەندامەکان کۆئەندام (جهاز) پێکدێنن و، کۆئەندامەکان، جەستە پێك دێنن، ئەوە لەوێ جەستەی هەر مرۆڤێك، ئنجا ئەگەر بڕۆین بۆ ئاژەڵان و زیندەوەرانی دیکە، بە هەمان شێوە.

هەروەها ژمارەی کەهکەشانەکانی گەردوون، بە مەزەندەی هەندێك لە زانایان دەڵێن: سەد ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) کەهکەشان و، هەندێکیش دەڵێن: بە دوو سەد ملیار (٢٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) کەهکەشان مەزەندە کراون و، هەندێك دەڵێن: بە هەزار ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) واتە: یەك تریلیۆن کەهکەشانەکان مەزەندە دەکرێن و[1]، هەر کەهکەشانێکیشیان لە ملیاران ئەستێرەو خڕۆکە پێکدێن، بۆ وێنە:

کەهکەشانەکەی ئێمە ژمارەی ئەستێرەکانی کە خۆری ئێمە یەکێکە لە ئەستێرەکانی، بە (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) (١٠ ^١٢) یەك تریلیۆن ئەستێرە مەزەندە

---

(١) الكون بين القرآن والعلم، ص٥٣.

دەکرێن و[1]، زانایان بە شێوەیەکی نزیك خستنەوە (تقریب)ی دەڵێن: ژمارەی ئەستێرەکانی هەموو گەردوون بە: (٧٠ ^٢١) مەزەندە دەکرێ[2].

ئنجا ئەو گەردوونەش هەمووی زۆر بە ڕێك و پێکیی کار دەکات، هەروەك چۆن جەستەی مرۆڤ، لە: سەد تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) خانەو، هەر خانەیەك لە: سەد تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) گەردیلە پێکهاتوە و هەمووی وەك سەعات ئیش دەکات!

### ٤- دەرەنجامی قسەی ڕێکەوت پەرستان:

بە پێی قسەی ڕێکەوت پەرستان:

١) دەبێ سەرجەم کەهکەشانەکان، کە وەك گوتمان: هەندێك لە زانایان بە یەك تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) مەزەندەیان دەکەن و، هەندێکیان بە سەد ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) و هەندێك بە دوو سەد ملیار (٢٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) و، هەر کەهکەشانەشی بە یەك تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ئەستێرە، یاخود بە کەمتر یان زیاتر، مەزەندە دەکرێن، ئەوانە هەموویان.

٢) پاشان لە نێو کەهکەشانی خۆماندا: کۆمەڵەی خۆرو زەوی و مانگ و، ئنجا هەل و مەرجەکانی پەیدابوونی ژیان لەسەر زەوی و.. هتد.

٣) ئنجا خانەکانی جەستەی زیندەوەران و ژیانداران بە مرۆڤیشەوە.

٤) ئنجا هەموو گەردیلەو تەنۆلکەکان (الذَّرَات وَالجُسَيْمَات)، کە ژمارەیان بە (١٠ ^٨٠) مەزەندە دەکرێ، هی هەموو گەردوون.

٥) پاشان ئەرکە ئاڵۆزەکانی دەناو ڕەنا (DNA) و (RNA) کە لە نێو خانەکانی تێکڕای ژیانداران و زیندەوەراندان هەن.

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص٣٦.

(٢) السماء في القرآن الكريم، ص١٩٧.

٦) ئنجا ئەو هەموو ئەندامانەی جەستەکانی ژیاندارانی هەوایی و زەمینیی و ئاویی.

٧) هەروەها هەموو ئەو دروستکراوانەی دیکە لە ئاسمانەکان و زەوی دا.

هەموو ئەوانە: بە حیسابی ڕێکەوت پەرستان، بە ڕێکەوت و هەڕەمەکیی دروست بوون! کە بە دڵنیاییی ئەوە جگە لە قسەیەکی بۆش، هیچی دیکە نیە.

**٥- ڕێکەوت و پەیدابوونی گەردی پڕۆتینیی[1]:**

دکتۆر (فرانك ئەلەن) دەڵێ: پڕۆتین پێکهاتەی سەرەکیی خانەی زیندوویە و، پڕۆتین بۆ خۆی لە پێنج توخم پێك دێ:

١- کاربۆن: (C)، ٢- هیدرۆجین: (H)، ٣- نیترۆجین: (N)، ٤- ئۆکجسین: (O)، ٥- کبریت: (S).

ئنجا هەر گەردێك (جزيء - مۆلکۆل)ێکی پڕۆتین (ئاشکراشە بە هەزاران گەردیلە گەردێك و بە چەندان گەردیش خانەیەك پێکدێنن)، هەر گەردێکی پڕۆتین لە چل هەزار (٤٠٠٠٠) گەردیلەی ئەو پێنج توخمە: (کاربۆن و هیدرۆجین و نیترۆجین و ئۆکسجین و کبریت) پێك دێ، ئنجا لەبەر ئەوەی ئەو پێنج توخمە، لە نێو زیاتر لە (١٠٠) سەد توخمی دیکە دان، چونکە توخمەکان (عناصر) هەموویان: سەدو پێنج (١٠٥) و، هەندێکیان دەڵێن: سەدو نۆ (١٠٩)ن، بۆیە دەگونجێ چۆنیەتی پێکهاتنی گەردێکی پڕۆتینیی لە ڕێی تێکەڵکردنی بەردەوامی توخمەکان و، کارکردنی ڕێکەوتەوە، حیساب بکرێ، واتە: (١٠٥) یان (١٠٩) توخمەکەی گەردوون پێکەوە لێکبدرێن و تێکەڵ بکرێن، بەو پێنجەشەوە، ئێمە ئەو پێنجەمان پێویستن، ئەو پێنجەی کە گەردێکی پڕۆتینیان لێ پێك دێ، ئنجا ئایا تاکو چل هەزار (٤٠٠٠٠) گەردیلە لەو پێنج

---

(١) بۆ نووسینی ئەم باسە پشتم بەم دوو سەرچاوەیە بەستوە:
١- العلم يدعو للإيمان، كريسي موريسيون، ص١٠٠.
٢- الله يتجَلّى في عصر العلم، ص١١.

توخمە، پێکەوە کۆدەبنەوە و، گەردێکی پڕۆتینمان بۆ بەرهەم دێنن، چەندی پێدەچێ و چەندی تێدەچێ؟!

زانای ماتماتیکیی سویسڕیی (تشارلز یوجین جای)، ئەوەی حیساب کردوە و تەماشای کردوە کە ئەگەری دروستبوونی یەك گەردی پڕۆتینیی بە ڕێکەوت: بریتیە لە: یەك لەسەر دە توان سەدو شەست (١/١٠ ^١٦٠^)، واتە: ژمارە دە (١٠)، سەدو شەست (١٦٠) سفری لە پێشەوە بێ، ئنجا یەك ئەگەری هەیە لەسەر ئەو ژمارە زۆرە، کە ئێمە گەردێکی پڕۆتینیمان بە هۆی ڕێکەوت و بە هۆی تێکەڵکردنی هەڕەمەکیی (عشوائي) ئەو توخمانەوە، بۆ دروست بێ، بەڵام:

**یەکەم:** ئەو کارلێکە کیمیاییە هێندەی ماددە دەوێ، کە بە ملیۆنان جار لە ماددەی گەردوون زیاتر بێ، ئەو ماددەیەی کە ئێستا لە گەردووندا هەیە، دەبێ ئەو ماددەیەی تێکەڵ دەکرێ و دەشڵقێنرێ، تاکو بە ڕێکەوت و هەڕەمەکیی گەرد (جُزيء)ێکی پڕۆتین بەرهەم بێ، دەبێ ملیۆنان جار لەوە زیاتر بێ!!

**دووەم:** کاتی پێویستیش بۆ هاتنەدی ئەو ڕووداوە، بریتیە لە: دە توان دووسەدو چل و سێ (١٠ ^٢٤٣^)، یانی: ژمارە دە (١٠) دوو سەدو چل و سێ (٢٤٣) (سفر)ی لە پێشەوە هەبێ، ئەوەندە ساڵەی پێ بچێ، تاکو گەردێکی پڕۆتینیمان بۆ دروست دەبێ، لە حاڵێکدا کە تەمەنی گەردوون بریتیە لە: چواردە ملیار (١٤٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) (١٤ ^٩^) ساڵ، ئەویش کە بەلای زۆردا دایبنێین، ئەگەرنا دەڵێن: سێزدە ملیارو حەوتسەد ملیۆن (١٣٧٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵە، بەوەندە مەزندەی دەکەن، بەڵام ئێمە دایدەنێین بە: (١٤٠٠٠٠٠٠٠٠٠)، (١٤ ^٩^) ساڵ، بەڵام (١٤ ^٩^) لە کوێ و (١٠ ^٢٤٢^) لە کوێ؟! ئنجا پڕۆتینیش لە زنجیرەیەکی درێژی ڕێك و پێك لە ترشە ئەمینییەکان (الأحماض الأمينية) پێك دێ، کە زانای ئینگلیزیی (ج. ب. لیتز)، ئەویش ئەو ماوەیەی کە پێویستە بۆ کۆبوونەوەی ئەو گەردیلانە تاکو ترشە ئەمینییەکانی یەك گەردی پڕۆتینمان بۆ دروست بێ، حیسابی کردوە، کە بریتیە لە: دە (١٠)توان چل و هەشت (٤٨) (١٠ ^٤٨^) ساڵ، واتە: ژمارە دە (١٠) چل و هەشت (٤٨) سفری لە پێشەوە بێت، کە



ئەوەش زۆر زۆر لە تەمەنی گەردوون زیاترە، کە بریتیە لە ($10^{14}$)!! ئەوە تەنیا بۆ ترشە ئەمینییەکان، کە بۆ گەردێکی پرۆتینیی، پێویستن!

ئنجا ئەوە هەمووی بۆ پێکهێنانی گەردێك، کە بە چەند گەردێك خانەیەك پێکدێنن و، بە ملیۆنان خانە، شانەیەك پێك دێنن و، بە چەند شانەیەکیش ئەندامێك پێك دێنن، ئنجا ئەندامیش یەکێکە لە پێکهێنەرەکانی کۆئەندام و، کۆئەندامیش بەشێکە لە جەستە، ئنجا هی مرۆڤ بێ، یان هی ئاژەڵ، یان ژیاندارانی دیکەی درشت و ورد.

هەڵبەتە جەستەش هەر لە پرۆتینەکانەوە، تاکو خانەکانی و شانەکانی و ئەندامەکانی و، کۆئەندامەکانی، هەموویان پێکەوە ڕێك و پێك و گونجاون و، پێکەوە کار دەکەن و هاوکارن، ئنجا ئەگەر ئەوە هەمووی حیساب بکرێ و کات و شوێنی پێویست، بۆ ڕوودانی ڕێکەوتانێك (صِدَفْ)ی بێ ئەژمار، ئەوانەش هەموویان حیساب بکرێن: دەگەینە ژمارەی زۆر زۆر گەورەتر لەوە کە بۆ دروست بوونی گەردێکی پرۆتینیی، پێویست بوو، هەروەها ئەو کاتەی کە پێویستمان بوو بۆ دروستبوونی گەردێکی پرۆتینیی، کە بریتی بوو لە: ($10^{243}$)، هەروەها ئەو ماددەیەش کە پێویستمان بوو، کە بریتی بوو لە: ($10^{160}$)، بەڵام ئەگەر بتەوێ ئەوەی گوتمان هەمووی حیساب بکەی: دەگەیە ژمارەیەکی گەردوونیی (رقم كوني) و خەیاڵیی وا کە کۆمپیوتەرە زەبەلاحەکانیش، ئەو ژمارە خەیاڵییە جێی تێیاندا نەبێتەوە.

ئنجا شایانی باسە: کە زانایان تەمەنی زەوی هەمووی بە: چوار ملیار و نیو (٤٥٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ دەخەمڵێنن.

هەروەها دەڵێن: لەسەر زەوی ملیۆنان جۆرە زیندەوەرو، ملیۆنان جۆرە ڕووەك هەن کە هەموویان ژیاندارن، هەروەها مرۆڤیش بەو هەموو تایبەتمەندییانەوە کە هەینی، کە واتە: کاتمان بەدەستەوە نیە بۆ ڕێکەوت و، ئەسڵەن ڕێکەوت جێ پێی نیە لە گەردووندا، نە کاتمان هێندە بەدەستەوە هەیە، نە ماددەمان هێندە لەبەر دەست دا هەیە، بۆیە ئەو هەموو ڕێك و پێکییە کە لە تاك تاکی پێکهاتەکانی

گەردووندا هەیە، هەروەها ئەو هەموو سیستماتیکیی و تەبایی و هاوکارییەی کە لە نێوان پێکهاتەکانی گەردووندا هەیە، ئەگەری بەڕێکەوت دروست بوونیان نیە، ئنجا ئەوە هەمووی لە ڕووە ماددییەکەیەوە، ئەمما لە ڕووی چییەت (ماهیة)ی ژیان (حیاة)ەوە، تا ئێستا زانایان لە بەردەمیدا دەستەوستانن و دەڵێن: ئەوە مەتەڵێکی هەڵنەهێنراو و پرسیارێکی بێ وەڵامە، چونکە ئەگەر گریمان بیردۆزەی پەرەستاندن و گەشەسەندنیش ڕاست بێ، ئەدی چۆن یەکەمین خانە ژیانی تێدا پەیدابوو؟! ئەو ژیانە چییە؟! ئەوە چ نهێنییەکە کە تا ئێستا مرۆڤ و زانستی بیۆلۆجیا، لە بەردەمیدا دەستەوستانە؟!

ئنجا دەڵێین: ئەگەر ڕێکەوت نەتوانێ گەردێکی پرۆتینی دروست بکات، کە خانەیەکی زیندوو، یانی: خانە (خلیة) ژیانەکەی لێ لابەرە و لەوێی دانێ، چونکە ئەوە مەتەڵێکەو حەل ناکرێ، بەڵام هەر لە ڕووە ماددەکەشیەوە: خانەیەکی زیندوو، پێویستیی بە هەزاران یاخود ملیۆنان گەرد دەکات، ئنجا هەر گەردێك لە هەزاران گەردیلە پێك دێ، بێگومان ئەگەر ڕێکەوت نەتوانێ یەك گەردی پرۆتینیی دروست بکات، ئەدی گەردوونێکی هەزار ملیار کەهکەشانیی، واتە: خاوەنی یەك تریلیۆن ($1^{12}$) کەهکەشان، کە هەر کەهکەشانی ملیاران ئەستێرە و خڕۆکەو مانگ و...هتدی تێدایە و، هەر کامێکیشیان (لەو ئەستێرە و خڕۆکە و مانگ و .. هتدانە) لە تریلیۆنان گەردیلە پێکهاتوون، گەردیلەکانیش لەو هەموو تەنۆلکانە پێکهاتوون! کەواتە: بەهیچ جۆرێك جێی ڕێکەوت لە گەردووندا نیە، چونکە تاکو ژمارەکان زیاتر بن، شانسی ڕێکەوت بێهێزتر دەبێ، تاکو وای لێ دێ دەبێتە سفرو بوونی نامێنێ.

**٦)- ڕێکەوت و دروستبوونی گەردوون:**

لە سۆنگەی ئەوەوە کە بەر لە تەقینەوەی گەورە (bing bang) هیچ کام لە کات و شوێن نەبوون، پاشان یەکسەر گەردوونیش لەو سینگلارتی (Singlarty) (مفردة - تاکی پێکهێنەری گەردوونیی)یەوە، سەری هەڵداوە، ئەویش بە وردترین پێوەران، کە ئەگەر تۆزقاڵێك جیاواز بوونایە گەردوون نەدەهاتەدی، - وەك لە بەشی دووەم و لەم بەشی سێیەمەشدا گوتمان و ڕوونمان کردەوە - بۆیە هیچ بوارێك نیە بۆ

ڕێکەوت، چونکە هەموو شتێك هەر لە سەرەتاوە زۆر بە وردیی لە شوێنی خۆیدا دانراوە و، بە هیچ شێوەیەك شیمانەو ئەگەری ڕۆڵ بینینی ڕێکەوت لە ئارادا نیە.

**٧)- ڕێکەوت و سێ پایەکەی:**

ڕێکەوت سێ پایەی هەن، لێی جیانابنەوە، کە بریتین لە:

١- ناڕێك و پێکیی (العَشْوَائِيَّة).

٢- بێ ئامانجیی (اللاَّغَائِيَّة).

٣- بێ بەهایی (اللاَّقِيْمَة).

یانی: کە پێی ڕێکەوت دێتە نێو، دەبێ:

١- ناڕێك و پێکیی هەبێ.

٢- بێ ئامانجیی هەبێ.

٣- بێ بەهایی هەبێ.

ئەو سێ پایە، پێکهێنەری ڕێکەوتن.

بەڵام - وەك پێشتر باسمان کرد - گەردوونی ئێمە، خۆشمان چ وەك جەستەی خۆمان، چ وەك ڕووح، هەروەها شتەکانی گەردوون بە گشتی:

١- سیستماتیك و ڕێك و پێك و بە وردترین، لە هەزاران پێوەری فیزیایی و کیمیایی دروست کراوە.

٢- ئامانج و مەبەست لە پشت هەر پێکهاتەیەکیەوە هەیە، چ جای بە گشتی.

٣- ژیانی مرۆڤ پڕە لە بەهایەکان، ئەو بەها بەرزانەی، کە مرۆڤ بە گشتی شانازییان پێوە دەکات، بە مولحیدەکانیشەوە.

کەواتە: لە گەردووندا: هیچ کام لە پێکهاتەکانی ڕێکەوت و پایەکانی چنگ ناکەون: نە ناڕێك و پێکیی، نە بێ ئامانجیی، نە بێ بەهایی:

١- گەردوون سیستماتیك و ڕێك و پێکە.

٢- گەردوون ئامانجدارەو مەبەست لە پشت هەر پێکهاتەیەکیەوە هەیە، هەر شتێك تەماشای بکەی، دەزانی ئامانج لە دروستکردنیدا هەیە، ئامانجێك لە پشتیەوە هەیە، ئامانجێك تەحقیق دەكات.

٣- پاشان بە تایبەت ژیانی مرۆڤ پڕە لە بەهای بەرز.

کەواتە: دەبێ ئەو ڕێك و پێکیی و، ئەو ئامانج و، مەبەست و ئەو بەهایە، لە دەرەوەی ماددەوە، بەسەر ماددەدا فەرزکرابن، بەڵێ: شوێن دەستی ڕێکەوت، بە هیچ شێوەیەك لە گەردووندا نیە، چونکە هیچ کام لەو پایانەی، کە ڕێکەوتیان لێ پێکدێ، بوونیان نیە.

**٨)- ڕێکەوت بوونێکی خودیی و سەربەخۆی نیە، بەڵکو بوونێکی ئیعتیباری هەیە:**

بە داخەوە: کە باسی ڕێکەوت دەکرێ، نەك هەر خوانەناسان، بەڵکو زۆربەی خواناسانیش - وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا - وا دەزانن: ڕێکەوت کائینێکە و شتێکە بوونی هەیە و کاروچالاکیی دەكات! دەگوترێ: فڵان شتە بە ڕێکەوت دروست بووە! ئەو شتە ڕێکەوت دروستیکردوە!

بەڵام پێشتریش باسم کرد و لێرەش دووبارەی دەکەمەوە: ڕێکەوت بوونێکی سەربەخۆی نیە، بەڵکو بوونێکی زەینیی هەیە، بوونێکی ئیعتیباریی هەیە، هەر وەك چۆن کات (زمن)، بوونێکی سەربەخۆو خودیی (ذاتي) نیە، بەڵکو ئەویش دیسان بوونێکی ئیعتیباریی و زەینیی هەیە.

هەروەها شوێن (مكان) بریتیە لە درێژبوونەوەی ماددە، وەك چۆن کات (زمن) بریتیە لە جووڵەی ماددە، واتە: نە شوێن، نە کات، بەبێ ماددە بوونیان نیە، بە هەمان شێوەش ڕێکەوتیش بوونێکی خودیی نیە، بەڵام با وێنەیەك بێنینەوە بۆ ئەوەی زیاتر باسەکە ڕوون بێتەوە:

پێشتریش هەر نموونەمان بەوە هێنایەوە، چونکە نموونەیەکی سادەیە: پارچە دراوێك کە دوو دیوی هەن، کاتی خۆی دراوی کانزایی هەبوو دوو دیوی (شێرو

خەت)ی هەبوون، پارچە دراوێك كاتێك هەڵیدەدەی، ئەگەری ئەوە كە لەسەر دیوی شێر بكەوێ و شێر بە دەرەوە بێ، یاخود خەت بە دەرەوە بێ، بریتیە لە: یەك بۆ دوو (٢/١)، بەڵام زارێكی شەش ڕوویی، ئەگەری ئەوە كە لەسەر هەر لایەكیان بكەوێ، ئەگەرەكەی بریتیە لە: یەك لەسەر شەش (٦/١).

ئنجا ئایا ئەگەری كەوتنی پارچە دراوەكە بەسەر یەكێ لە دوو ڕووەكەیدا، یاخود كەوتنی زارەكە بەسەر یەكێ لە شەش ڕووەكەیدا، شتێكی سەربەخۆیە و جیایە لە دراوەكە؟ یان جیایە لە زارەكە؟ بە تەئكید نەخێر، تۆ شتێكت پێیە كاتێك هەڵیدەدەی، بەسەر ئەو دیوەدا بكەوێ، یان بەسەر ئەو دیوە، یان بەسەر ڕووێكدا بكەوێ، یان بەسەر ڕووێكی دیكەدا، ئایا ئەوە شتێكی جیایە لە خودی شتەكە؟! بە تەئكید نەخێر، بەڵكو هەر خودی شتەكەیە، بەڵام مەسەلەی كەوتن بەملاداو بەولادا، دوو ئەگەری هەن، ئەگەر دوو ڕووی هەبن، یان شەش ئەگەر، ئەگەر زار (نَرْد)ێكی شەشڕوو بێ.

بەڵێ بەڕێزان! گرنگە بزانین كە ڕێكەوت شتێك نیە بوونێكی دەرەكیی هەبێ، ڕێكەوت بریتیە لە ئەگەری ڕوودانی یان ڕوونەدانی شتێك، كە ئێمە مامەڵەی لەگەڵدا دەكەین.

كەواتە: بەبێ بوونی شتەكە، ڕێكەوت مانایەكی نابێ، هەروەك چۆن بەبێ ماددە، كات (زمن) مانای نیە، چونكە كات بریتیە لە جووڵەی ماددە، ئنجا ئەگەر ئێمە لەسەر زەوی نەبووینایەو، زەوی بە دەوری خۆیدا نەخولابایەوە لە بەرانبەر خۆردا، شەوو ڕۆژ پەیدا نەدەبوون، هەروەها ئەگەر بە دەوری خۆردا نەخولابایەوە، چوار كەشەكانی ساڵ پەیدا نەدەبوون، ئنجا ئەگەر شەوو ڕۆژ نەبوونایە و، هەفتە و مانگ و ساڵ، نەبوونایە، كات مانایەكی نەدەبوو بۆ ئێمە، ئێستا لەسەر هەندێ لە خڕۆكەكان، شەو و ڕۆژ و هەفتە و مانگ و ساڵ، مانایەكی دیكەیان هەیە، زەوی ئێمە لە بیست و چوار سەعاتدا، جارێك بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، بەڵام خڕۆكەی وا هەیە بە چەند ساڵی ئێمە جارێك بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، كەواتە: شەوو ڕۆژی ئەو خڕۆكەیە لەگەڵ

هی ئێمە زۆر جیاوازە، بەڵکو کەهکەشانی وا هەیە: دوو سەدو پەنجا ملیۆن (٢٥٠٠٠٠٠٠٠)ساڵی پێ دەچێ، تاکو سووڕێك دەدا بە دەوری خۆیدا، یان بە دەوری شتێکی لە خۆی گەورەتردا.

کەواتە: بەبێ بوونی ماددە، نە کات نە شوێن، بوونیان نابێ، ئنجا ڕێکەوتیش لە کات و شوێندا نەبێ، ناتوانێ کار بکات، چونکە ڕێکەوت هەر بریتیە لە خودی شتەکان، جووڵەی شتەکان و ئەگەری ڕوودانی ئەمیان، یان ئەویان، بۆیە بەبێ هەبوونی شتەکان لە کات و شوێندا، ڕێکەوت هیچ بوونێکی نیە، کەواتە: قسەکردن لە پەیدابوونی ماددە، یان گەردوون بە هۆی ڕێکەوت (صدفة)ەوە، شتێکی بێ جێیە و پێچەوانە و دژی عەقڵ و لۆژیك و زانستە.

**٩)- لە کۆتایی دا، چەند قسەیەکی سێ لە زانایان:**[1]

**١- (فرید هۆیل):**

دەڵێ: مەحاڵیی پەیدابوونی سادەترین شێوەی ژیان، لە میانی ڕێکەوتدا، وەك ئەوە وایە فڕۆکەیەکی بۆینگ (٧٤٧) لە ئەنجامی ئەوەدا پەیدا بێ، کە گەردەلوولێك لە ساحەیەك دەدا، ئاسنەواڵەی لێ کۆکراوەتەوە، ئیدی لە ئەنجامی لێدانی ئەو گەردەلوولەدا، فڕۆکەیەکی بۆینگ (٧٤٧) دروست ببێ!! ئنجا ئەوە چەند لە عەقڵەوە نیزیکە، ئەوەش کە سادەترین شێوەی ژیان بە ڕێکەوت دروست ببێ، هەر ئەوەندە لە عەقڵەوە نیزیکە!

کە دیارە هەرگیز فڕۆکەیەکی بۆینگ (٧٤٧) بەوە دروست نابێ کە گەردەلوولێك لە ساحەیەك دەدات، کە ئاسنی کۆنی لێ کۆکراوەتەوە.

**٢- (مایکل ترنز):**

گوتوویەتی: ئەگەر بگوترێ: ژیان لەسەر زەوی بە ڕێکەوت دروست بووە، وەك ئەوە وایە تیرێك لەم سەری گەردوون بهاویشترێ بۆ ئەو سەری گەردوون و،

---

(١) شموع النهار، ص ١٩١- ١٩٢.

لەویٚ نیشانەیەکی یەك میللی مەتر (١ملم)یی ببینێکیی! کە گەردوون تیرەکەی هەندێك بە: پازدە ملیار (١٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵی تیشکیی مەزەندەی دەکەن و، هەندێکیش بە (٢٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) بیست ملیار ساڵی تیشکیی!

٣- (هف روس):

گوتوویەتی: پەیدابوونی ژیان، یان پەیدابوونی هەر کام لەو دروستکراوانەی کە وردەکارییان تێدا هەیە، لە دەوروبەرماندا، بە ڕێکەوت، وەك ئەوە وایە کە قارەی ئەمریکا هەمووی بە دراوی کانزایی داپۆشین، هەتا دەگاتە مانگ، کە سێ سەدو هەشتا هەزار (٣٨٠٠٠٠ کم) کیلۆمەترە، دوایی: یەك ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠) قارەی دیکەی بێنین، ئەوانیش بەهەمان شێوە، بە دراوی کانزایی داپۆشین، ئنجا یەکێك لەو دراوانە بە ڕەنگی سوور ڕەنگ بکەین و بیخەینە نێو ملیاران لەو دراوە کانزاییانەوە، دوایی کەسێکی کوێر، یان کەسێك کە چاوی نوقێنراوە، پاڵی پێوە بنێین، کە ئەو تاکە دراوە کانزاییە کە ڕەنگ کراوە، لە نێو ئەو هەموو ملیاران کانزایەدا، هەڵبگرێتەوە، ئنجا ئەو کەسە چەندە ئەگەر (إحتمال)ی هەیە ببینێکیی و ببینێتەوە بە کوێریی، یان چاونووقاویی، ئەوەندەش ئیحتیمالی ئەوە هەیە، کە ژیان لەسەر زەوی، یاخود یەکێك لەو شتانەی کە باسمان کردن، کە ئەو هەموو وردەکارییانەیان تێدا هەیە، بە ڕێکەوت دروست بووبن!!



## بیانووی حەوتەم: ئەگەر هەموو شتێك بەدیهێنەری هەبێ، خواش بە هەمان شێوە بەدیهێنەری هەیە:

هەندێکی دیکە لە مولحیدەکان ئاوا ئەم بیانووە دادەڕێژن: ئەگەر هەموو شتێك پەیداکەری هەبێ، ئەدی پەیداکەری خوا کێیە، یاخود: ئەگەر خوا پەیداکەری هەموو شتێکە، ئەدی کێ خوای پەیدا کردوە؟

بەڕێزان! ناوم لە هەموو ئەو بەناو بەڵگە و پاساوانەی خوانەناسیی ناوە: (بیانووە پووچەڵەکانی ئیلحاد)، ئنجا ئەم بیانووە پووچەڵەش، زۆرێك لە مولیحەدەکان پەنایان پێ بردوە، بۆ وێنە:

(ستیفن هوکینگ)، لەو بارەوە دەڵێ:

{بۆچی شتێك هەیە، لە جیاتی نەبوونی ئەو شتە؟ ئێمە بۆچی هەین؟ ئەو کۆمەڵە یاسایە کە لە گەردووندا هەن، بۆچی هەن؟ بۆچی کۆمەڵێك یاسای دیکە نین؟ هەندێك وا گومان دەبەن، کە وەڵامی ئەو پرسیارانە ئەوەیە بڵێین: خوایەك هەیە و وای هەڵبژاردوە، کە ئەم گەردوونە بەو شێوەیە دروست بکات، ئەو جۆرە یاسایانەی تێدا دابنێ، بەڵام جێی خۆیەتی کە ئێمە بڵێین: کێ ئەم گەردوونەی دروست کردوە؟ ئنجا ئەگەر وەڵامەکەی ئەوە بێ کە: خوا دروستی کردوە، وەڵامەکە هەڵدەگەڕێتەوە و دەڵێین: ئەدی کێ خوای دروست کردوە؟}.(١)

(ستیفن هوکینگ) کە بە حیساب بە یەکێك لە سەرانی ئیلحاد دادەنرێ، ئەوە ئاستەکەیەتی!

ئنجا لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە، کە ئەو برادەرە (ستیفن هوکینگ) کە چەند مانگێك لەمەوپێش مرد، ناوی لە کتێبەکەی خۆی ناوە: دیزاینی مەزن (The Grand Design) بەڵام چۆن عەقڵی پێی نەگوتوە: کە دیزاین (تصمیم)،

---

(١) بڕوانە: التصميم العظيم، ص ١٩.

بەبێ دیزاینەر (مُصَمِّم) نابێ؟! بۆیەش کتێبەکەی خۆی ناوناوە: دیزاینی مەزن (التصميم العظيم) چونکە: زۆر بڕوای بەوە هەیە، کە ئەم گەردوونە زۆر سیستماتیك و ڕێك و پێك و یاسادارە، بەڵام بە ڕاستیی ئەوە جێی سەرسووڕمانە کە لە خۆی نەپرسێ: باشە ئەوە دیزاینەکەیە، بەڵام دیزاینەکەرەکە کێیە؟! ئەمە یاساکەیە، بەڵام یاسادانەرەکە کێیە؟! ئەمە ڕێك و پێکیی و وردەکارییەکەیە، بەڵام ئەدی ڕێك و پێك خەرەکە کێیە؟! کە لە بەڵگە نەویستەکانی عەقڵە، لە سەرەتاکانی عەقڵە، ڕێك و پێکیی بەبێ ڕێك و پێکخەر نابێ و، یاسا بەبێ یاسادانەر نابێ.

با وێنەیەکی سادە بێنینەوە:

کەسێك کە لە کێڵگەیەکدا کارێك دەکا، ئەگەر نووکی پاچەکەی لە شتێك بگیرێ (کە زۆرجار وا بووە و کەسی وا هەبووە زێڕی دۆزیوەتەوە، خەزنەی دۆزیوەتەوە، شوێنەوارێکی کۆنی دۆزیوەتەوە)، دوایی گڵەکە هەڵدەداتەوەو تەماشا دەکات: ئەوە کووپەیەکە، یان ئەوە گۆزەیەکە، ئنجا یان کانزای تێدایە، یان هەندێك شتی تێدایە، یان تێیدا نیە، ئایا ئەو کەسە دەتوانێ قەناعەت بەخۆی بێنێ، کە وەك چۆن گڵەکە هەر لەوێ بووە، ئەو گۆزەیەش هەر لەوێ بووە؟ بە تەئکید نەخێر، یان ئایا ئەگەر پارەیەك بێ و وێنەی پادشایەکی لەسەر بێت، دەتوانێ قەناعەت بەخۆی بێنێ، کە ئەویش هەر لەگەڵ ئەو گڵە بووە؟ نەخێر، بەڵکو دەڵێ: ئەوە کەسێك لێرەی داناوە، ئەوە هی گەلانی پێشووە، بەڵکو ئەگەر شارەزای مێژوو و شارەزای شوێنەوار زانیی (علم الآثار)بێ، دەتوانێ دیاریی بکات: ئەو پارەیە یان ئەو شوێنەوارە، هی چ گەل و کۆمەڵگایەك و، چ حوکمڕانێکیشە!

ئنجا لێرەدا جارێکی دیکە دەپرسین: ئایا ئەگەر ئەو کەسە ئەو گەلانەی نەناسین، ئەو شارستانییەتەی نەناسی و، زانیاریی لەبارەی ئەو دەوڵەتەوە نەبوو، کە خاوەنی شوێنەوارەکەیە، دەیکاتە پاساو و بیانووی نکووڵییکردن لەوەی، کە ئەو پارچە دراوە، یاخود ئەو پارچە شوێنەوارە، مادام خاوەنەکەی ناناسێ و،

زانیاریی وردی لەبارەیەوە نیە: بێ خاوەنە و هی کەس نیە و لە خۆوە پەیدابووە؟! بە تەئکید نەخێر، بەڵێ من خاوەنەکەی ناناسم، بەڵام دڵنیام لەوەی ئەم پارچە کانزایە (ئەگەر زێڕە، ئەگەر زیوە، ئەگەر هەر شتێکە)، ئەوە شوێنەواری خەڵکێك بووە، کە لێرە ژیاون، یان لێرەدا ئەو شتەیان پەنهان کردوەو شاردوویانەتەوە.

ئێستاش ئێمە لە وەڵامی ئەو بیانووەی مولحیدەکاندا، دە (١٠) ڕاستییان دەخەینە ڕوو، کە هەر کامیان بە تەنیا وەڵامی ددان شکێنی ئەو بیانووەی ئیلحادی تێدایە، چ جای هەموویان وێکڕا:

**١) ڕاستیی یەکەم:**

ئەو پرسیارە کە دەڵێ: (ئەگەر هەموو شتێك پەیداکەرێکی هەیە، ئەدی کێ خوای پەیدا کردوە؟)، پرسیارەکە خۆی هەڵەیە، دەبێ بگوترێ: ئەگەر هەموو دروستکراوێك، دروستکەرێکی هەیە، یان: ئەگەر هەموو پەیداکراوێك، پەیداکەرێکی هەیە، نەك هەموو شتێك، چونکە شتێك کە پەیدا نەکرابێ، پێویستیی بە پەیدارکەر نیە، شتێك کە بەدینەهێنرابێ، پێویستیی بە بەدیهێنەر نیە، بەڵێ هەموو پەیداکراوو دروستکراوێك، پەیداکەرو دروستکارێکی هەیە و، هەموو وەدیهێنراوێك پەکی لەسەر بەدیهێنەرێك کەوتوە، کە خوای تاك و پاکە، بەڵام خوا (سبحانە وتعالی) لەبەر ئەوەی بۆ خۆی خاوەنی بوونێکی خودیی (وجود ذاتي)یە، بۆیە پەکی لەسەر پەیدارکەر نەکەوتوە، ئەوانە پێویستییان بە پەیداکەر هەیە، کە پەیداکراون، شتێك پێویستیی بە دروستکەر هەیە، کە دروست کرابێ، بەڵام شتێك کە دروست نەکرابێ و هەر بووبێ، نەبوون(عدم) پێشی نەکەوتوە، تاکو بڵێین: کێ پەیدای کرد؟!.

**٢) ڕاستیی دووەم:**

دوای ئەوەی کە سەلمێنرا ماددەو گەردوون وەدیهێنراون، لەلایەن بەدیهێنەری تاك و بێ وێنەوە و هیچ شتێکیش نیە، کە خوا بەدیهێنەرو خاوەنی نەبێ، ئەو پرسیارە هیچ جێی چنگ ناکەوێ و قسەیەکی بێ جێیە، چونکە دانهێنان بە بوونی خوادا (سبحانە وتعالی)، یانی: دانهێنان بە بوونی زاتێکدا کە بوونەکەی

هی خۆیەتی و، بوونیشی بە غەیری خۆی داوە، ئنجا ئەو دانپێداهێنانە، ڕێگا لەوە دەگرێ، کە پرسیار بکرێ: ئەدی کێ خوای بەدیهێناوە؟ یان چ شتێك خوای بەدیهێناوە؟ وەك خوا (سبحانه وتعالى) لە سووڕەتی (طه)دا کە - چەند جارێك بە بەڵگە هێنامانەوە - دەفەرموێ:

﴿قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾﴾.

واتە: (مووسا) فەرمووی: پەروەردگارمان ئەو زاتەیە کە بوونی بە هەموو شتێك داوە، دوایی ڕێنمایی کردوە، یانی: سیستمی بۆ داناوە و خستوویەتە سەر ڕێ، چۆن بەڕێوەبچێ.

کەواتە: ئەوە دژیەکیی (تَنَاقُض)ە، کە: لەلایەکەوە دان بە بوونی خوادا بێنی و، لەلایەکی دیکەشەوە بپرسی: کێ دروستیکردوە؟ خوا بوونەکەی زاتییە و نەبوون (عدم) پێشی نەکەوتوە، بوونەکەی لە شوێنێکی دیکەوە بۆ نەهاتوە، بەڵکو ئەو بوونی بە غەیری خۆی داوە (غەیری خۆی)، واتە: هەرچی هەیە جگە لە خوا، هەمووی بوون پێدراوە، بوون پێ بەخشراوە، هەمووی وەدیهێنراوە، بۆیە نابێ لە نێو وەدیهێنراوەکاندا، جارێکی دیکە بگەڕێی داخۆ کامیان بەدیهێنەری ئەو خوایەیە، کە بوونی بە هەموویان داوە؟! ئەوە لە زانستیی لۆژیکدا پێی دەگوترێ: دژیەکیی (تَنَاقُض).

**٣) ڕاستیی سێیەم:**

بەپێی یاسای هۆکاریی (قانون السببية) هەموو شتێك پەیداکەرێکی هەیە، بەڵام خوا (سبحانه وتعالى)، ئاوا خۆی بۆ ئێمە پێناسە کردوە:

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى.

واتە: هیچ شتێك وەك خوا نیە و، ئەو خوا بیسەری بینەرە.

واتە: یاسای هۆکاریی خوا بۆ دروستکراوەکانی دایناوە، بەڵام خۆی مەحکوومی یاسایەکەی خۆی نیە، ئایا مرۆڤێك کە سەیارەیەك دروست دەکات، کۆمپیوتەرێك دروست دەکات، حاسیبەیەك دروست دەکات و سیستمێکی بۆ

دادەنێ، ئایا ئەو مرۆڤە خۆی مەحکوومی سیستمی ئەو سەیارەیە، یاخود ئەو کۆمپیوتەرەیە، یان ئەو حاسیبەیە؟ بە تەئکید نەخێر، (وَللهِ المَثَلُ الأَعْلَى)، خواش یاسای هۆکاریی لە نێو دروستکراوەکانیدا داناوە، کە هەموویان بەپێی ئەو یاسایە بەڕێوە دەچن، بەڵام خۆی لە بازنەی دروستکراوەکانی و، لەو یاسایانەش کە بۆ دروستکراوەکانی دایناون، بەدەرە و خوا (سبحانه وتعالى)، لە دەرەوەی کات و شوێنە.

واتە: یاسایەك - وەك یاسای هۆکاریی - کە خوای بەدیهێنەر بۆ دروستکراوەکانی دایناوە، مەعقووڵ نیە، خۆیشی مەحکوومی ئەو یاسایە بێ.

٤)- ڕاستیی چوارەم:

مادام پێشتر سەلمێنرا، کە زنجیرەی بێ کۆتایی (التسلسل اللأنهائي) کە بریتیە لەوەی شتێك درێژ بێتەوە بەبێ کۆتایی، مەحاڵێکی عەقڵییە، مادام ئەوە سەلمێنرا، ئەگەر گریمان خوای بەدیهێنەر پەیداکەریشی هەبووایە، ئەو کاتە پەیداکەرەکەشی بە هەمان شێوەو، ئەویش یەکی دیکە و، ئەویش یەکی دیکە و.. هتد، ئەوەش سەردەکێشێ بۆ زنجیرەی بێ کۆتایی، زنجیرەی بێ کۆتاییش مەحاڵێکی عەقڵییە، یانی: بوونی نیە، کاتی خۆشی ئەم وێنەیەمان هێنایەوە لەو بارەوە:

سەربازێك فەرمانی پێکراوە تەقە بکات لە نیشانەیەك، بەڵام ئەگەر ئەو سەربازە بڵێ: تاکو سەرەوەی خۆم فەرمانم پێ نەکات، تەقە ناکەم، سەرەوەی خۆیشی بڵێ: دەبێ سەرەوەی خۆم فەرمانم پێ بکات، سەرەوەی ئەویش بڵێ: سەرەوەی خۆم، ئەوە وەك کوردەواریی دەڵێ: تاکو قیامەتێ ئەو سەربازە تەقەی بۆ ناکرێ، بۆیە دەبێ لەسەر کەسێك بوەستێ و، ئەو کەسە نەگەڕێتەوە بۆ سەرەوەی خۆی و بڵێ: لێرەوە فەرمان دەرچێ، بەڵام ئەگەر هەروا بڕوا و، سەربازەکە بە ئەفسەرەکەی پشت خۆی بڵێ و، ئەفسەرەکە بە یەکی پشت خۆی و، ئەوی دیکە بە یەکی پشت خۆی و، هەروا بڕوا بەبێ کۆتایی، هەرگیز ئەو فیشەکە ناتەقێنرێ.

٥)- ڕاستیی پێنجەم:

ئەو پرسیارە: (کێ خوای دروستکردوە؟) زیاتر هەڵقوڵاوی زەینی مولحیدەکانی ڕۆژئاوایە، کە زۆر بە شێواویی خوای بەرزو مەزنیان بۆ وێنا کراوە، کە پێشتریش شتێکمان لێ باسکرد، کە چ لە (پەیمانی کۆن) و چ لە (پەیمانی نوێ)دا: (کتێبی پیرۆز- الكتاب المقدس)، کە هەندێك شتمان لێیەوە نەقڵ کرد، لە زمانی (ریتشارد داوکینز)ەوە، هەروەها لە باسی چوارەمی ئەم بەشی سێیەمەشدا: (هۆکارە ڕاستەقینەکانی ئیلحاد) لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەل دەکەین لەو بارەوە کە کتێبی خاوەن کتێبەکان، چۆن خوای پەروەردگاری وێنا کردوە و، چۆن ڕۆژئاواییەکان لەو خوایە، کە ئەو کتێبە بەناو موقەددەسە، بۆیان وێنا دەکات، لێی ڕایان کردوە و لێی سڵەمیونەوە؟

بۆیە دەبێ بڵێین: ئەوانەی دەپرسن: ئەدی کێ خوای دروستکردوە، ئیشکالی گەورەیان بە هەڵە ناسینی خوای تاك و پاکە، هەروەها تێڕوانینی هەڵەی دیکەی زۆر کە لە بارەی خواو، لە بارەی ئاییینەکەیەوە، هەن، کە لە کتێبە ئاییینیەکانیانەوە سەرچاوەیان گرتوە و، بوونە مۆتەکە و کابووسێکی قورسی سەر دڵ و سینەیان.

٦)- ڕاستیی شەشەم:

پەی نەبردن بە ماهیەتی خوا (سبحانە وتعالى) و نەتوانینی وێنا کردنی، پاساوی نکووڵیی لێ کردنی نیە، چونکە کەسێك کە لەبەر نەزانینی چییەتی خوا، نکووڵیی لە بوونی دەکات:

١- پێویستە بەهەمان بیانوو و پاساو، نکووڵیی لە عەقڵ و ڕووحی خۆیشی و، لە گەردیلەکانی ماددەو، لە تەنۆلکەکانی پێکهێنەری گەردیلەکانیش و، گەلێك شتی دیکەش بکات، چونکە چییەت و جەوهەری هیچ کام لەمانە نازانێ.

٢- ئەو کەسە وەك کەسێکە کە دەچێتە ئەشکەوتێکەوە و، چەند وێنەیەکی کۆن و چەند شوێنەوارێك دەبینێت، لەوەوە هەڵدەهێنجێ کە کاتی خۆی بەشەر لەو ئەشکەوتەدا

ژیاون، بەڵام دوایی بە هۆی ئەوەوە کە نایانناسیٚ، ئەو بەشەرانە کیٚ بوون؟ ناویان چی بووە؟ چ نەتەوەیەك بوون؟ زمانیان چی بووە؟ لە کویٚ هاتوون؟ بۆ کویٚ چوون؟ ڕەنگیان چۆن بووە؟ لەبەر ئەوەی ئەو تایبەتمەندییانەیان، نازانیٚ، نکووڵیی لە بوونیان بکات! کە بە تەئکید ئەوە شتیٚکی نالۆژیکییە، بەڵیٚ زانیاریی و وردەکاریی لەبارەیانەوە نازانیٚ، بەڵام ئەوە پاساوو بیانووی نکووڵیی کردن لە بوونی ئەو کۆمەڵە خەڵکە نیە، کە ئەو شویٚنەوارەیان لەو ئەشکەوتەدا بەجیٚ هیٚشتوە.

**٧)- ڕاستیی حەوتەم:**

هەم خواناس و، هەم مولحیدەکانیش دەڵیٚن: دەبیٚ مەوجوودیٚکی بیٚ سەرەتا و ئەزەلیی هەبیٚ، ئنجا خواناسان دەڵیٚن: ئەو مەجوودە بریتیە لە خوا (سبحانە وتعالى)، کە بوونەکەی، بوونیٚکی خودییە و بوونیٚکی بیٚ سەرەتایە، بوونیٚکە نەبوونی پیٚش نەکەوتوە، بەڵام مولحیدەکان دەڵیٚن: ماددەی گەردوون ئەزەلییە، کەواتە: جیاوازیی نیٚوان خواناسان و خوانەناسان تەنیا ئەوەیە: ئایا ئەو شتەی ئەزەلیی و بیٚ سەرەتایە، ماددەی بیٚ ژیان و بیٚ ئیرادەو بیٚ هۆش و ...هتد؟ یاخود خوای زاناو بەزەیی و بەخشندەیی کارزانە؟!

هەڵبەتە ئیٚستا فیزیای نویٚ ئەوەشی دەرخستوە، کە مادده ناگونجیٚ بیٚ سەرەتا بیٚ، چونکە مادده، وەك پیٚشتر باسمان کرد، تەنیا لە زەیندا و لە وەهم و خەیاڵدا بوونیٚکی سەربەخۆی هەیە، ئەگەرنا (مادده) یان دەبیٚ گەردیلە بیٚ، یان دەبیٚ تەنۆلکەکانی نیٚو گەردیلەکان بن، بەر لەوەی گەردیلەکان دروست بن، یان دەبیٚ لە ئەستیٚرەکاندا، لە کەهکەشانەکاندا، لە ژیانداراندا، لە ڕووەکدا، لە شتیٚکدا دەبیٚ بەرجەستە ببیٚ، ئەگەرنا (مادده) بۆ خۆی بەبیٚ ئەوەی کە لە دروستکراویٚکدا، لە دیاردەیەکدا بەرجەستە ببیٚ، تەنیا لە وەهم و خەیاڵدا بوونی هەیە، بەڵام گریمان مادده بوونیشی هەبوو بەبیٚ ئەوانە و، فیزیای ئیٚستاش ڕاست نەبوو، کە دەڵیٚ: گەردوون هەمووی لەو تەنۆلکە گچکەیەوە کە: (singularity) (یەکەی گەردوونیی)، یاخود: (تۆوی گەردوونیی)، یان

(هێلکەی گەردوونیی) پێ دەڵێن، گریمان ئەوەش ڕاست نەبوو، باشە، ئایا ئەو مەوجوودە بێ سەرەتا و ئەزەلییە، کە ئەو هەموو پێکهاتانەی نێو گەردوونی دروست کردوون، عەقڵ و لۆژیك وا دەخوازێ پاڵ بدرێتە لای ماددەیەك، کە نە ژیانی هەیە، نە عەقڵی هەیە، نە هۆشی هەیە، نە ئیرادەی هەیە، یان پاڵبدرێتە لای خوایەك کە خاوەنی ژیانە، خاوەنی ویستی ڕەهایە، خاوەنی زانیاریی ڕەها و بەزەیی ڕەها و دەستەڵاتی ڕەهایە؟ بێگومان وەڵامەکەی ڕوونە.

پێشتریش باسمان کرد، کە نەداری شتێك ئەو شتەی پێ نابەخشرێ، ماددە خۆی کە عەقڵی نەبێ و هۆشی نەبێ و ژیانی نەبێ و ئیرادەی نەبێ، چۆن توانی شتانێك دروست بکات، کە هەموو ئەو شتانەیان هەبن؟!.

**٨)- ڕاستیی هەشتەم:**

پاساوو بیانووێکی دیکەی مولحیدەکان کە یان: پەنا دەبەنە بەر هەربوویی ماددە و گەردوون، (کە فیزیای نوێ ئێستا ئەوەشی لێ هەڵوەشاندوونەوە)، یان هەر دان بە بوونی خوادا ناهێنن، ئەوەیە کە دەڵێن: خوا زۆر ئاڵۆزە، سەرمان لێی دەرناچێ!

بۆ وێنە:

(ڕیتشارد داوکینز)، کە یەکێکە لە مولحیدە سەرسەختەکانی ئەم ڕۆژگارە و زانایەکی زیندەوەرزانە، لە کتێبی: (The God Delusion)[1]، (واتە: (وهم الإله - خوای خەیالیی)دا، گوتوویەتی:

(بۆیە بڕوا بە خوا ناهێنم، چونکە خوا بوونێکی ئاڵۆزترە لە گەردوون، ئێمە گەردوونێکمان هەیە، ئنجا لە جیاتی ئەوەی ئەو گەردوونە، کە سەرمان لێی دەردەچێ و یاساکانی تاڕاددەیەك دەزانین، پاڵی بدەینە لای خوایەك، کە سەرمان لێی دەرناچێ، هەروا باشە بڵێین: ئەو گەردوونە خۆی هەیە).

---

(١) ص١٧٦.

ئنجا چی بە بەڵگە دێنێتەوە؟! (ڕیتشارد داوکینز) دەڵێ: بەپێی عەقیدەی خواناسان، خوا ئاگاداری هەموو شتێکە لە گەردوونی پان و پۆڕدا و، بەسەریەوە حوکمڕانە و هەرچی لە گەردووندا ڕوودەدات، لە هەمان کاتی ڕوودانیدا دەیزانێ، بۆ وێنە: هەست و نەست و نزاو پاڕانەوەی بەندەکان، ئاگاداری هەموو وردەکارییەکانە، هەڵبەتە زاتێکی ئاواش، ئەو پەڕی ئاڵۆزیی تێدایە!

بەڵام ئێمە لە وەڵامی ئەو قسە سادەو بێ بنەمایەدا، دەڵێین:

خوا (سبحانە وتعالی) بەدیهێنەری هەموو دروستکراوەکانەو، لە نێو دروستکراوەکاندا زۆری وا هەن، کە مرۆڤ سەری لێ دەرناچن:

١-ئایا (ڕیتشارد داوکینز) و مولحیدەکانی دی، سەریان لە هەموو وردەکارییەکانی جەستەی خۆیان دەرچووە، کە خۆیشی زانایەکی زیندەوەرزانە؟!

٢- ئایا سەری لە کاری هەموو کۆئەندامەکان دەردەچێ؟!

٣- ئایا سەری لە کاری کۆئەندامی مێشك و دەمار دەردەچێ؟!

٤- ئایا سەری لە وردەکارییەکانی نێو خانە، کە یەکەی دروستبوونی ژیاندارانە، دەردەچێ؟!

ئنجا ئایا ئاڵۆزبوونی شتێك - بەو واتایەی کە وردەکارییەکانی نەزانی و سەرت چاك لێیان دەرنەچێ - بەڵگەیە لەسەر نەبوونی؟

بۆ نموونە:

أ- هێزی کێشندە.

ب- ئەو هەموو وردەکاریيانەی لە نێو گەردیلەکاندا هەن.

ج- ئەو هەموو وردەکاریيانەی لە نێو هەموو دروستکراوەکانی خوادا هەن.

د- مەتەڵی ژیان، کە هەتا ئێستا هیچ کەس بۆی هەڵنەهێندراوە، ئایا ئەوە پاساوو بیانووێکی ڕاستە کە دان بە ژیاندا نەهێنی، لەبەر ئەوەی زانست لە بەرانبەریدا دەستەپاچەیەو دەستەوئەژنۆ دانیشتوە و هیچی بۆ ناکرێ؟ بەڕاستیی







ئەوە قسەیەكی سادەو منداڵانەیە: لەبەر ئەوەی سەرمان لە خوا دەرناچێ، بڕوای پێ ناهێنین!

خوا (سبحانه وتعالى) لەو بارەوە لە سووڕەتی (طه)دا دەفەرموێ:

﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلۡمٗا ١١٠﴾.

واتە: زانیاریی دروستكراوەكان دەوری خوا نادات.

هەڵبەتە مەبەست لە دەورەدان (إحاطة) پەیبردن بەچییەتە، نەك ناسین و زانین!

ئنجا ئێمە زۆربەی هەرە زۆری دروستكراوەكان، جەوهەرو چییەتیان نازانین، چ جای خوای بەدیهێنەرو پەروەردگار، كە خاوەنی بوونی ڕەها، بوونی بێ سەرەتاو بێ كۆتا، خاوەنی سیفەتە ڕەها و بێ سنوورەكان: زانیاریی ڕەهاو بێ سنوور، دەستەڵات، ئیرادە، ژیانی ڕەهاو بێ سنوور، بەزەیی و میهرەبانیی، كارزانیی، هەموو سیفەتەكانی خوا ڕەها و بێ سنوورن، ئێمەش سنووردارین، چ عەقڵمان، چ جەستەمان، چ ڕووحمان، چ پێنج هەستەكانمان، سنووردارن، هەڵبەتە بێ سنوورو ڕەها لە سنووردارردا، جێی نابێتەوە، بەڵكو جاری وا هەیە شتێكی سنووورداری گەورەش، لە شتێكی سنووورداری بچووكدا، جێی نابێتەوە، ئایا ئاوی دەریاكان لە پەرداخێكدا جێی دەبێتەوە؟! كە هەردووكیان سنووردارن؟! نەخێر.

بۆیە ئەو قسەیە، قسەیەكی بێ جێیە.

هەڵبەتە ئەگەر (ڕیتشارد داوكینز) گوتبای: ئەو خوایەی، ئەو پەروەردگارەی كە (پەیمانی كۆن) و (پەیمانی نوێ) پێناسەی دەكەن: (پەیمانی كۆن) سیفەتی مرۆڤان پاڵ دەداتە لای خوا - وەك پێشتر باسمان كرد[1] - (پەیمانی نوێ)ش، خوا بە سێكوچكەی لێكدراو (الثالوث المُرَكَّب)، (باب و كوڕو گیانی پیرۆز)

---

(١) بڕوانە: بیانووی سێیەم: بوونی شەڕ و خراپە لە ژیانی مرۆڤدا، لەم بەشی سێیەمە.

دادەنێ، ئەگەر گوتبای: بڕوا بەو جۆرە خوا و پەروەردگارە ناکەم، کە پەیمانی کۆن و نوێ دەیڵێن، تا ڕاددەیەك قسەکەی ڕێی تێ دەچوو، بەڵام خوا عزوجل وەك لە دوا نوسخەی دەسکاریی نەکراویی وەحییدا، پێناسە کراوە، کە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، هیچ ئاڵۆزییەکی تێدانیە، بەو واتایە کە لەگەڵ عەقڵدا تێکبگیرێ، بەڵێ خوایەك سیفەتی مرۆڤی هەبێ، لەگەڵ عەقڵدا تێك دەگیرێ، خوایەك سێ بێ و یەکیش بێ، وەك عەقیدەی شێوێنراوی مەسیحیی دەڵێ: سێشەو یەکیشە، ئەوە لەگەڵ عەقڵدا تێك دەگیرێ، بەڵام بێگومان لەگەڵ عەقڵدا تێکگیران شتێکە و، سەر لێ دەرنەچوونی عەقڵ و دەورەنەدانی عەقڵ، شتێکی دیکەیە، بۆ وێنە: خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الإخلاص)دا دەفەرموێ:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ① ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ② لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ③ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ④﴾.

واتە: بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، بڵێ: خوا تاکە، جێی نیازو بێ نیازە، کەسی لێ نەبووە و، لە کەسیش نەبووە و، هیچ کەس هاوتای وی نیە.

ئایا ئەمە چ ئاڵۆزییەکی تێدایە؟! خوا تاك و بێ وێنەو بێ هاوەڵە، جێی نیازو بێ نیازە، خاوەنی بوونێکی سەربەخۆیە و، هەموو دروستکراوەکان پێویستییان بەوە و ئەو پێویستیی بە غەیری خۆی نیە.

ئەمە عەقڵ زۆر باش تێی دەگات، بەڵام بتەوێ چییەت و جەوهەری خوا بزانی، ناتوانی، چونکە ئەی مرۆڤ! تۆ چییەت و جەوهەری ماددە نازانی، کە لەبەر دەستتەو مامەڵەی لەگەڵدا دەکەی، چ جای خوای بێ وێنەی پەروەردگار!!

هەروەها خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الشورى) ئایەتی (١١)دا، دەفەرموێ:





﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾.

واتە: هیچ شتێك وێنەی ئەو (خوا) نیە و، ئەو (خوا) بیسەری بینەرە.

بۆیە زانایان گوتوویانە: (وَكُلُّ مَا خَطَرَ ببَالِكَ، فَاللهُ بخِلاَفِ ذَلِكَ)، واتە: هەرچی بە هۆشی تۆدا دێ، خوا لەوە جیایە.

چونکە ئەوەی بە هۆشی تۆدا دێ، هەمووی دروستکراوە و بەزۆرییش بەرهەستە، هۆش و عەقڵی مرۆڤ سوود لە چی دەبینێ؟ لەو کەرەستە خاوەی کە لە رێی پێنج هەستەکانەوە پێی دەگات: بینراوەکان، بیستراوەکان، تامکراوەکان، بۆنکراوەکان، دەست لێ کوتراوەکان، هەستەوەرەکانیش تەنیا مامەڵە لەگەڵ ماددەدا دەکەن، کەواتە: ئەوەی دێتە عەقڵ و هۆشی مرۆڤەوە، زیاتر ئەو وێنەو دیمەن و دەنگ و تام و بۆنانەن، کە لە دیاردەو دیمەنە ماددییەکانەوە، پێنج هەستەکان کۆیان کردوونەتەوە، خواش (سبحانه وتعالى) لە دەرەوەی جیهانی ماددەیە.

ئنجا - وەك پێشتریش هێنامان - خوا عزوجل لە سوورەتی (طه)دا، دەفەرموێ:

﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلۡمٗا ١١٠﴾.

واتە: زانیاریی ئەوان دەوری ئەو (خوا) نادات.

بەڵێ زانینی چییەتی خوا، شتێکی چاوەڕوان نەکراوە و هەر دەبێ وا بێت، چونکە زۆر شت لەو شتانەش کە خوا دروستی کردوون، مرۆڤ لە بەرانبەر زانینی جەوهەر و چییەتیاندا دەستە پاچەیە، بۆ وێنە: ڕووح، ئەو ڕووحەی کە لە جەستەی خۆماندایە، لە نێو دوو تەنیشتەکانماندایە، تا ئێستا سەرمان لێ دەرناچێ، وەك خوا بۆ خۆی هەواڵی پێداوین، دەفەرموێ:

﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ٨٥﴾ الإسراء.

واتە: دەربارەی ڕووح پرسیارت لیٚ دەكەن؟ بلیٚ: ڕووح لە كاری پەروەردگارمە، (یان: فەرمانی پەروەردگارمە)و، ئەندازەیەكی كەم نەبیٚ زانیارییتان پیٚ نەدراوە.

نەك هەر ڕووحی مرۆڤ، كە ژیانیٚكی تایبەتییە، بەڵكو ژیانیٚك كە لە ڕووەكدا هەیە و، ئەو ژیانەی كە لە ئەمیبایەك و، ژیانداریٚكی یەكخانەییدا هەیە، تا ئیٚستا زانست و مرۆڤ لە بەرانبەریدا دەستەپاچەن، سەریان لیٚ دەرناچیٚ، چ جای جەوهەر و زاتی بیٚ ویٚنەی خوا (سبحانە وتعالى)!!

٩- ڕاستیی نـۆیـەم:

لە بارەی ئەو قسەیەوە: مادام هەموو شتیٚك بەدیهیٚنەری هەیە، دەبیٚ خواش بەدیهیٚنەری بیٚ!

پیٚغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) ئەم قسەیەی بە خوتخوتەی شەیتان داناوە، ئنجا لەبەر ئەوەی ئەو مەسەلەیە لە سوننەتی پیٚغەمبەردا (صلى الله علیه وسلم) گرنگیی پیٚدراوە، ئیٚمەش ئەو فەرموودانەی لەو بارەوە هاتوون، دە (١٠)یانمان لیٚ هەڵبژاردوون، كە هەر كامیٚكیان لە گۆشەیەكەوە، باسی ئەو مەسەلەیە دەكات، با سەرنجی ئەو دە (١٠) فەرموودەیە بدەین[١]:

فەرموودەی یەكەم: {يَأْتِي الشَّيْطَانُ أَحَدَكُمْ فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَ كَذا؟ مَنْ خَلَقَ كَذا؟ حَتَّى يَقُولَ: مَنْ خَلَقَ رَبَّكَ؟ فَإِذا بَلَغَهُ، فَلْيَسْتَعِذْ بِاللهِ وَلْيَنْتَهِ} (رَوَاهُ البُخَارِي برقم: ٣٢٧٦، وَمُسْلِمٌ برقم: ٣٦٢، عَن أَبِي هُرَيْرَةَ).

پیٚغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) دەفەرمویٚ: شەیتان دیٚتە لای یەكیٚكتان، دەڵیٚ: ئەمە كیٚ دروستی كردوە؟ ئەدی ئەمەیان كیٚ دروستی كردوە؟ هەتا دەڵیٚ: ئەدی پەروەردگارت كیٚ دروستی كردوە؟ ئەگەر گەیشتە ئەویٚ، با ئەو مرۆڤە پەنا بە خوا بگریٚ و واز بیٚنیٚ.

---

(١) دیارە پیٚغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) ئەو فەرمایشتانەی فەرموون، بۆ ئەوەی ئیٚمە دوور بینیی (إحتیاط) خۆمان وەربگرین و، خۆمان بۆ ئەو جۆرە پرسیارانە ئامادە بكەین، بۆیە ئەهلی ئیسلام زۆر بە ئاسانیی وەڵامی ئەو پرسیارانە دەدەنەوە، چونكە پیٚغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) پیٚشتر ئیٚمەی ئاگادار كردۆتەوەو هۆشداریی پیٚداوین.

فەرموودەی دووەم: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمویێ: {لَنْ يَدَعُ الشَّيْطَان أَنْ يَأْتِي أَحَدكُمْ فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَات وَالأَرْض؟ فَيَقُولُ: الله، فَيَقُولُ: فَمَنْ خَلَقَكَ؟ فَيَقُولُ: الله، فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَ الله؟ فَإِذَا حَسّ أَحَدكُمْ بذَلِكَ، فَلْيَقُلْ: آمَنْتُ باللهِ وَبرسُلِهِ} (رَوَاهُ ابْنُ حِبَّانَ برقم:١٥٠، عَنْ عَائِشَة رَضِيَ اللهُ عَنْهَا).

واتە: شەیتان واز لە یەکێکتان ناهێنێ تاکو دێتە لای (واتە: دێتە زەین و خەیاڵییەوە)، پێی دەڵێ: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروستکردوون؟ ئەویش دەڵێ: خوا، دەڵێ: ئەدی کێ تۆی دروستکردوە؟ دەڵێ: خوا، دەڵێ: ئەدی کێ خوای دروستکردوە؟ ئەگەر یەکێك لە ئێوە هەستی بە شتێکی وا کرد، با بڵێ: بڕوام بە خواو بە پێغەمبەرەکانی هێنا. (تەواو و کۆتایی پێ بێنێ).

فەرموودەی سێیەم: {لاَ يَزَالُ النَّاسُ يَتَسَاءَلُونَ حَتَّى يُقَالَ: هَذَا خَلَقَ اللهُ الْخَلْقَ، فَمَنْ خَلَقَ اللهَ؟ فَمَنْ وَجَدَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًاً، فَلْيَقُلْ: آمَنْتُ بِاللهِ} (رَوَاهُ مُسْلِم برقم: ٣٦٠).

واتە: خەڵك بەردەوام دەپرسن، تاکو دەگوترێ: باشە ئەوە خوا دروستکراوەکانی وەدیهێناون، ئەدی کێ خوای وەدیهێناوە؟ هەر کەسێك شتێکی وای لە دڵ و زەینی دا هەست پێ کرد، با بڵێ: بڕوام بە خوا هەیە. (ئەو قسەیە بکات و کۆتایی پێ بێنێ).

فەرموودەی چوارەم: {يُوشِكُ النَّاسُ أَنْ يَتَسَاءَلُوا بَيْنَهُمْ حَتَّى يَقُول قَائِلُهُمْ: هَذَا اللهُ خَلَقَ الْخَلْقَ، فَمَنْ خَلَقَ اللهُ؟ فَإِذَا قَالُوا ذَلِكَ، فَقُولُوا: اللهُ أَحَدٌ، اللهُ الصَّمَدُ، لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوَاً أَحَدٌ، ثُمَّ لِيَتْفُلْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاَثَاً، وَلْيَسْتَعِذْ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ} (رَوَاهُ النَّسَائِي فِي "الكبرى" برقم: ١٠٤٢٢ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ).

واتە: نیزیکە خەڵك لە نێوان خۆیاندا پرسیار بکەن، هەتا بێژەرێکیان دەڵێ: باشە ئەوە خوا دروستکراوەکانی وەدیهێناوە، ئەدی کێ خوای وەدیهێناوە؟ ئەگەر ئەوەیان گوت، ئێوە بڵێن: خوا تاکە، بێ نیازو جێی نیازە، کەسی لێ نەبووەو، لە کەس نەبووە و، هیچ کەس نیە هاوتای وی بێ، دوایی با سێ جاران تف لەلای چەپی بکات و، پەنا بە خوا بگرێ لە شەیتان.

فەرموودەی پێنجەم: {لَنْ يَبْرَحَ النَّاسُ يَتَساءَلُونَ حَتّى يَقُولُوا: هَذَا اللهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ، فَمَنْ خَلَقَ اللهَ؟} (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: ٦٨٦٦ عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ).

واتە: خەڵك بەردەوام دەپرسن، تاكو دەڵێن: ئەوە خوا بەدیهێنەری هەموو شتێكە، ئەدی كێ بەدیهێنەری خوایە؟

فەرموودەی شەشەم: كە فەرموودەیەكی قودسییە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە خوای بەرزی مەزن دەیگێڕێتەوە، دەفەرموێ: {قَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: إِنَّ أُمَّتَكَ لاَ يَزَالُونَ يَقُولُونَ: مَا كَذَا؟ مَا كَذَا؟ حَتَّى يَقُولُوا: هَذَا اللهُ خَلَقَ الْخَلْقَ، فَمَنْ خَلَقَ اللهَ؟} (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: ١٢٠١٤، وَمُسْلِمٌ برقم: ١٣٦، عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ).

واتە: خوای زاڵی پایەدار فەرمووی: (ئەی موحەممەد!) ئوممەتەكەت بەردەوام دەبن، هەر دەڵێن: ئەوە چییە؟ ئەوە چییە؟ هەتا دەڵێن: ئەوە خوا دروستكراوەكانی هێناونە دی، ئەدی كێ خوای هێناوەتە دی؟!

فەرموودەی حەوتەم: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: جَاءَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيّ (صلى الله عليه وسلم) فَسَأَلُوهُ: إِنَّا نَجِدُ فِي أَنْفُسِنَا مَا يَتَعَاظَمُ أَحَدُنَا أَنْ يَتَكَلَّمَ بِهِ، قَالَ: «وَقَدْ وَجَدْتُمُوهُ»؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: ذَاكَ صَرِيحُ الإِيمَانِ} (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: ٣٥٧).

واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: كۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاتنە خزمەتی و پرسیاریان لێ كرد، گوتیان: ئێمە شتێك لە دڵی خۆماندا دەبینین، كە یەكێك لە ئێمە پێی شتێكی زۆر مەزنە، بیدركێنێ و بەسەر زاریدا بێ (پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تێگەیشت مەبەستی چییە؟!) فەرمووی: ئەوەتان هەست پێ كرد، لە دڵی خۆتاندا؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: ئەوە ئیمانی ڕووتە.

ئنجا (أبو سُلَيْمَان الخَطَّابي) مانایەكی لێ دەداتەوە، بەڵام من مانا لێدانەوەكەی ئەوم پێ باش نیە، ئەو دەڵێ:

(قَالَ أَبُو سُلَيْمَان الخَطَّابِي، أَي: صَرِيحُ الإِيْمَانِ: هُوَ الَّذِي يَمْنَعُكُمْ مِنْ قَبُولِ مَا يُلْقِيهِ الشَّيْطَانُ فِي أَنْفُسِكُمْ وَتَصْدِيقِهِ، وَلَيْسَ مَعْنَاهُ أَنَّ وَسْوَسَةَ النَّفْسِ صَرِيحُ الإِيْمَانِ، وَذَلِكَ أَنَّهَا إِنَّمَا تَتَوَلَّدُ مِنْ فِعْلِ الشَّيْطَانِ وَتَصْوِيرِهِ، فَكَيْفَ يَكُون إِيْمَاناً صَرِيحاً)(١).

واتە: مەبەست لە ئیمانی ڕووت، واتە: ئیمانی ساغ پاڵتان پێوە دەنێ کە ئەوەی شەیتان وەك خوتخوتە دەیخاتە دڵتانەوە، وەری نەگرن و بەڕاستیی دانەنێن، ئەگەرنا مەبەست پێی ئەوە نیە کە ئەو وەسوەسەیە بریتیە لە ئیمانی ڕووت و ئیمانی تەواو، چونکە وەسوەسە لە کرداری شەیتانەوە پەیدا دەبێ و هاندانی شەیتان و جوانکردنی ئەوە، ئنجا چۆن دەبێتە ئیمانێکی ساغ و بێ خەڵتە؟!

بەڵام وام پێ ڕاستترە بگوترێ: مەبەست ئەوەیە کە ئەو خوتخوتە کردنەی شەیتان بۆ ئێوە، نیشانەی ئیمانی ساغە، بۆیە لە خۆتان مەترسن، وەك لە فەرموودەی دیکەدا هاتوە، نەك لەبەر ئەوەی ئێوە ئەو وەسوەسەیە قبووڵ ناکەن، ئەوە ئیمانی ڕووتە، بەڵکو هەر خودی ئەو خوتخوتە بۆ کرانە، نیشانەی ئەوەیە کە ئەو مرۆڤە، ئیمانێکی باشی لەلایە، بۆیە شەیتان دەیەوێ ئیشکال و گومانی بۆ دروست بکات و، ئەو ئیمانە باشەی لێ تێك بدات.

فەرموودەی هەشتەم: {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَحَدَنَا يَجِدُ فِي نَفْسِهِ "يُعَرِّضُ بِالشَّيْءِ" لأَنْ يَكُونَ حُمَمَةً أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَنْ يَتَكَلَّمَ بِهِ، فَقَالَ: «اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، أَللَّهُ أَكْبَرُ، الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي رَدَّ كَيْدَهُ إِلَى الْوَسْوَسَةِ»} (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: ٥١١٤، وَصَحَّحَهُ الأَلْبَانِي).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! یەکێك لە ئێمە لە دڵی خۆیدا هەست بە شتێك دەکات، هەست بە خەیاڵێك - بە لەبەر ڕا هاویشتن (کناية) شتەکەی باس کرد - پێی خۆشە ببێتە خەڵووز، نەك قسەی وا بکات، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

---

(١) شرح السنة للبغوي، ج١، ص١١٠.

فەرمووی: (اللهُ أَكْبَر، اللهُ أَكْبَر، اللهُ أَكْبَر) خوا گەورەترە، خوا گەورەترە، خوا گەورەترە، ستایش بۆ ئەو خوایەی کە فێڵی شەیتانی گێڕایەوە بۆ خوتخوتە کردن (هیچی دیکەی لە بەرانبەرتاندا لە دەست نایەت، کەواتە: ئەوە خوتخوتەی شەیتانەو گوێی پێ مەدەن).

فەرموودەی نۆیەم: ئەمە ڕیوایەتێکی دیکەیە: {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنِّي أُحَدِّثُ نَفْسِي بِالشَّيْءِ، لَأَنْ أَخِرَّ مِنَ السَّمَاءِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَتَكَلَّمَ بِهِ، قَالَ فَقَالَ: النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، الْحَمْدُ للهِ الَّذِي رَدَّ كَيْدَهُ إِلَى الْوَسْوَسَةِ} (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: ٢٠٩٧، وَقَالَ شعيب الأرناؤط: إِسْنَاده صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْن).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم)، من جاری وایە لە دڵی خۆمدا خەیاڵێکم بە دڵدا دێ، ئەگەر لە ئاسمانەوە بکەومە خوارێ، لە لام خۆشترە، (لەلام باشترە) لەوەی کە ئەو قسەیەی لە دڵمدا دێت و دەچێ، بیڵێم، (پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تێبگەی کە ئەو قسەیە چییە)، فەرمووی: خوا گەورەترە، خوا گەورەترە، خوا گەورەترە، ستاییش بۆ ئەو خوایە کە فێڵی شەیتانی گێڕایەوە بۆ دنەدان و خوتخوتە.

فەرموودەی دەیەم و کۆتایی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {إِذَا سَأَلَكُمُ النَّاسُ عَنْ هَذَا، فَقُولُوا: اللهُ كَانَ قَبْلَ كُلِّ شَيْءٍ، وَاللهُ خَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ، وَاللهُ كَائِنٌ بَعْدَ كُلِّ شَيْءٍ} (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: ١٠٩٧٠)[1].

---

(١) قال الألباني: إسناده معضل، "السلسلة الصحيحة" ج١، ص ٢٣٦. تعليق شعيب الأرنؤوط: هذا الحديث ثلاث قطع بثلاثة أسانيد: أما القطعة الأولى فإسنادها صحيح على شرط مسلم، وأما القطعة الثانية وهي الأثر عن أبي هريرة فإسنادها ضعيف لجهالة نجبة بن صبيغ، وأما القطعة الثالثة فإسنادها مُنْقَطِعٌ.

واتە: هەر کاتێك خەڵك پرسیاری لێ کردن لەو بارەیەوە، (لە بارەی ئەوەوە کە خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، ئەدی بوونی خوا چۆنە؟) بڵێین: خوا لە پێش هەموو شتێکدا بووە و، خوا هەموو شتێکی وەدیهێناوە و، خوا لە دوای هەموو شتێك هەر هەیە.

وەك خوا بۆ خۆی دەفەرموێ:

﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْآخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ إن﴾ الحديد.

واتە: خوا یەکەمەو دوایەمینەو، ئاشکراو پەنهانە.

یان وەك زانایان گوتوویانە: (أَوَّلٌ بلاَ ابْتِدَاء، آخِرٌ بلا انْتِهَاء)، واتە: خوا یەکەمە، بەبێ دەست پێکردن و، دوایەمینە بەبێ کۆتایی هاتن.

## سێ ئەنجامگیریی لە کۆی ئەم دە (١٠) فەرموودەیە:

### ئەنجامگیریی یەکەم:

ئەو جۆرە خەیاڵ و بیربە دڵدا هاتنە، کە مادام هەموو شتێك خوا بەدیهێناوە، ئەدی کێ خوای بەدیهێناوە؟ تەنیا خوتخوتەو خەیاڵە و بەڵگە نیە، تاکو بە بەڵگە وەڵام بدرێتەوە، خوتخوتە و خەیاڵ و دنەدانێکە، بۆیە پێویستیی بە بەڵگە وەڵامدرانەوە ناکات، چونکە بەڵگە پشت بە سەرەتا عەقڵییەکان، سەرەتا بەڵگە نەویستەکان دەبەستێ، بە تایبەت بەڵگە لەسەر بوونی خوا:

١- (هەموو پەیدابووێك پەیداکەرێکی هەیە).

٢- (هەموو ڕێکخراوێك ڕێکخەرێکی هەیە).

٣- (هەموو ڕێنمایی کراوێك، ڕێنماییکارێکی هەیە).

ئنجا کەسێك نکوولیی لە سەرەتا عەقڵییەکان بکات، بە تایبەت ئەو سەرەتا عەقڵییەی: (هەموو پەیدابووێك پەیداکەرێکی هەیە)، ئەوە بەبەڵگە وەڵام نادرێتەوە، چونکە بەڵگە سەرەنجام هەر دێتەوە سەر ئەو سەرەتا عەقڵییانە،

بەڵێ کەسێك نکوولْیی لە سەرەتا عەقڵییەکان بکات، لە ڕاستییدا پێویستیی بە چارەسەرو دوعا هەیە، پێویستیی بە ئامۆژگاریی هەیە، پێویستیی بە وەبیرهێنانەوە هەیە، ئەگەرنا کەسێك نکوولْیی بکات لەوە کە:

١-) دوو کۆ دوو، دەکاتە چوار (٢ + ٢= ٤).

٢-) یان لەوە کە: هەموو (كلّ) لە بەش (جزء ) گەورەترە.

٣-) یان لەوە کە: دوو شتی دژ بەیەك، پێکەوە کۆنابنەوە، بۆ وێنە: ناگونجێ شتێك هەبێ و نەبێ.

٤-) یان لەوە کە: هەموو پەیداکراوێك پەیداکەرێکی هەیە.

کەسێ نکوولْیی لەوانە بکات، بە کەڵکی قسە لەگەڵدا کردن نایەت و دەبێ سەرەتا بگێڕدرێتەوە بۆ حاڵەتی تەندروستی خۆی، لە ڕووی عەقڵ و هۆشەوە، ئنجا بدوێنرێ.

هەر بۆیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی کردوە بە وازهێنان: (ولْيَنْتَهِ)، هەروەها فەرمانی کردوە بە پەنا بەخوا بردن (ولْيَستعذْ بالله)، دیسان فەرمانی کردوە بە تەئکید کردنەوەی ئیمان: (فَلْيَقُلْ: آمَنْتُ بالله).

**ئەنجامگیریی دووەم:**

بۆیە پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) وێڕای پەنا بە خواگرتن لە شەیتان، فەرمانیشی کردوە بە وازهێنان (ولینته) تاکو بزانرێ، کە ئەوە کۆتایی وەسوەسەیە و، دەبێ دەستبەرداری ببێ، نەك سەرەتای وەسوەسە بێ و هی دوایی لایبەرێ، ئەوە کۆتا فێڵی شەیتانە، وەك لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: (اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، الحَمْدُ للهِ الَّذِي رَدَّ كَيْدَهُ إِلى الوَسْوَسَة)، خوا گەورەترە، خوا گەورەترە، خوا گەورەترە، ستایش بۆ ئەو خوایەی کە فێڵەکەی شەیتان هیچی بەدەست نەما، خوتخوتە نەبێ، واتە: ئەوە دوایین هەوڵیەتی، ئنجا کە دوایین هەوڵیەتی، تۆش پەنا بە خوا





بگرەو وازبێنە، خوتخوتەکە بۆ خۆی دەپووکێتەوە، چونکە ئەوە تەنیا خەیاڵێکە بە مێشکدا هاتوە.

**ئەنجامگیریی سێیەم[1]:**

گوتنی (آمنتُ بالله)، (بڕوام بە خوا هێنا)، ئەوە لە شێوەی لابردنی زیانبەخش بە دژەکەیەتی، کە سوود بەخشە، چونکە شەیتان لە کاتی یادی خوادا، خۆی پەنهان دەکات، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ٢٠١﴾ الأعراف.

واتە: ئەوانەی پارێز دەکەن، کاتێك کە شەیتان خۆیان ڕێ دەخشێنێ، شەیتان دەستێکیان دەگەیەنێتێ، یاخود خەیاڵێکی شەیتانیان بۆ دێ، خوایان بیر دێتەوە و یەکسەر بەرچاویان ڕۆشن دەبێتەوە، فێڵی شەیتان دەبینن، هەروەها لە کۆتا سوورەتی قورئاندا، سوورەتی (الناس)دا خوای پەنهانزانی میهرەبان فەرموویەتی:

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ١ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ٢ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ٣ مِن شَرِّ ٱلۡوَسۡوَاسِ ٱلۡخَنَّاسِ ٤ ٱلَّذِي يُوَسۡوِسُ فِي صُدُورِ ٱلنَّاسِ ٥ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ٦﴾.

واتە: (بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەڵك ١ حوکمڕانی خەڵك ٢ پەرستراوی خەڵك ٣ (بۆچی و لەچی؟) لە خراپەو زیانی خوتخوتەکەری خۆ پەنهانکەر ٤ (کە چی دەکات؟) کە

---

(١) ئەم سێ ئەنجامگیرییەم بە کورت کردنەوەوە لە کتێبە ناودارەکەی (إِبْنُ تَيْمِية)، (دَرءُ التَّعَارضِ بَيْنَ العَقْلِ وَالنَّقْل) ج٣، ص (٣٠٨ و ٣٠٩)، وەرگرتوون.



خوتخوتەو خەیاڵ دەخاتە دڵ و سینەی خەڵکەوە، ﴿٥﴾ (کێیە ئەو خوتخوتەکەرو خۆپەنهان دەرە؟) چ لە جند بێ، چ لە مرۆڤ بێ ﴿٦﴾).

**١٠) ڕاستیی دەیەم و کۆتایی:**

لە بارەی پووچەڵکردنەوەی ئەو ئیشکال و گومانەی حەوتەمەوە، ئەوەیە کە:

ئەم پرسیارە: (ئەگەر هەموو شتێك خوا دروستیکردوە، ئەدی کێ خوای دروستکردوە؟) ئەمە دژیەکیی و ناکۆکیی (تناقض)ی تێدایە، چونکە خوا بەدیهێنەرە، نەك بەدیهێنراو، بۆیە ناگونجێ پرسیاری بەدیهێنەرەکەی بکرێ، ئەمە وەك ئەوە وایە بڵێی: ئایا بەدیهێنەری هەموو شتێك، کێ بەدی هێناوە؟ یان: ئایا ئەو کەسەی کە بەدیهێنەری نیە، کێ بەدیهێنەریەتی؟ یان ئایا ئەو زاتەی کە هەموو شتێکی بەدیهێناوە، کێ ئەوی بەدیهێناوە؟ یان: ئایا ئەو زاتەی کە هیچ بەدیهێنەری نین و، خۆی بەدیهێنەری هەموو شتێکە، کێ بەدیهێنەریەتی؟! بەڵێ ئەو پرسیارە لە ڕاستییدا دژیەکیی (تناقض)ی تێدایە و، دژ و پێچەوانەی سەرەتا و بەڵگەنەویستە عەقڵییەکان (الأوَّليات والبديهيات العقلية)ە.

## بیانووی هەشتەم: مرۆڤ لە ئەنجامی گەشەسەندن و پەرەستاندنی ژیاندارانەوە دروست بووە، بۆیە پێویستیی بە خوا نیە:

**دەستپێك:**

بەڕێزان، برایان، خوشكان!

ئێمە پێشتر باسمان كرد و سەلماندمان كە هەموو شتێك، تەنانەت تەنۆلكە و گەردیلە و گەردەكان (الجُسَیمات والذرات والجزیئات)یش، مەحاڵە هیچ كامیان بەبێ خوا پەیدابن و بەردەوام بن، هەروەك گەردوون بەگشتی پێویستیی بە خوا هەیە، چ بۆ پەیدابوونی و چ بۆ بەردەوامبوون و بەڕێوەچوونیشی، ئنجا مرۆڤ: ئەوەی تا ئێستا بەپێی زانیاریی ئێمە دەركەوتوە: شاگوڵی باغی گەردوونە و، ناوازەترین دروستكراوی خوایە لە گەردووندا، بۆیە ئەگەر گەردوون جارێك پێویستیی بە بەدیهێنەر هەبێ، كە سەلماندمان: زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی وا دەڵێن، مرۆڤ بە چەندان پلە لە پێشترە كە پێویستیی بە پەروەردگارو بەدیهێنەرو مشوورخۆر هەبێ.

خواش یاریدەدەر و پشتیوانمان بێ لە شەش (٦) بڕگاندا، پووچەڵیی و قڕپۆكیی ئەم بیانووی هەشتەمە دەخەینە ڕوو:

**١)** سەرەتا پێناسەی بیردۆزەی: گەشەكردن و پەرەستاندن (النشوء والتطوّر) دەكەین، كە دیارە (داروینیزم) یەكێكە لە ئاڵقەكانی ئەو بیردۆزەیە، ئەگەرنا بیردۆزەی گەشەسەندن و پەرەستاندن لە (داروینیزم)دا كورت هەڵنەهاتوە، بەڵكو لەوە فراوانترە و (لامارك)ی فەڕەنسیی[1] لە پێش (داروین)دا ئەوەی گوتوە و،

---

(١) لامارك جان باتیست (١٧٤٤ - ١٨٢٩م)، لە زانایانی سروشتناسی فەڕەنسییە و خاوەنی: (دائرة المعارف النَّباتیة) و (التأریخ الطبیعي للحیوانات اللافقریة)یە، بڕوانە: المنجد في الأعلام، ص٤٩٦، ط٢٩/٢٠٠٨م.

خەڵكی دیكە هەبووە لە پێش ئەویش دا هەندێ شتی لەو بارەوە گوتوە و، هەندێ لە زانا یۆنانییەكانیش باسیان كردوە، بەڵكو بە نسبەت ژیاندارانەوە بە گشتی: هەندێ لە زانایانی مسوڵمانیش ئاماژەیەكیان بەوە داوە، كە كۆتایی ماددەی بێ ژیان (جماد) سەرەتای ڕووەك (نبات)ە و، كۆتایی ڕووەك سەرەتای ژیانداران (حیوانات)ە، بەڵام بە نسبەت مرۆڤەوە، باسیان نەكردوە، چونكە مرۆڤ بەدیهێنراوێكی ناوازەی خوای پەروەردگارەو، بە ڕووح لەوان جیا دەبێتەوە.

**٢)** لە بڕگەی دووەمدا باسی ئەوە دەكەین، كە یاساداریی لە ژیانی مرۆڤدا و لە گەردووندا، لەگەڵ بوونی خوادا، دژی یەك نین، بۆیەش (داروینیزم) كە لە ئەفسانەیەك زیاتر نیە، ئەگەر ڕاستیش بێ، بیانووی ئیلحاد نیە.

**٣)** ئنجا لە بڕگەی سێیەمدا دێینە سەر هەڵوەشاندنەوەی (داروینیزم) بە پێنج (٥) بەڵگەی جۆراو جۆر.

**٤)** لە بڕگەی چوارەمیشدا باسی مەتەڵی ژیان دەكەین، كە مەتەڵێكی هەڵنەهێنراوە تاكو ئێستاش.

**٥)** لە بڕگەی پێنجەمیشدا باسی چەند پرسیارێكی بێ وەڵام دەكەین، كە ئاڕاستەی بیردۆزەی گەشەكردن و پەرەستاندن (داروینیزم) بە تایبەت دەكرێن.

**٦)** لە بڕگەی شەشەم و كۆتاییشدا، باسی فێڵ و ساختەكردنی زۆری (داروینیستەكان) دەكەین.

## برگەی یەكەم: پێناسەی بیردۆزەی: گەشەكردن و پەرەستاندن:

بیردۆزەی گەشەكردن و بەرەوپێشچوون (النشوء والإرتقاء)، یان: گەشەكردن و پەرەستاندن (النشوء والتطور) بە زۆر جۆر پێناسەكراوە، كە ئێمە پێنج دانەیان بە نموونە وەردەگرین و، لەبەر ئەوەی ئەو سەرچاوانەی لێمان وەرگرتوون بە زمانی عەرەبیین، دەقە عەرەبییەكانیان دێنین و، تەرجەمەیان دەكەین:

١- (التطور: نَظَرِية الأَجْنَاسِ الحَيَّةَ، إِنَّ ذَلِكَ حَدَثَ نَتِيجَة اخْتِيَارِ طبيعي لصَالحِ الأَجْنَاس الأكثر أَهْلِيَةً لِلْبَقَاء)[١].

واتە: بیردۆزەی ڕەگەزە زیندووەكان (زیندەوەرە ژیاندارەكان)، ئەوە لە ئەنجامی هەڵبژاردنی سروشتیی بۆ ئەو ژیاندارانەی كە زیاتر شایستەیی مانەوەیان هەیە، پەیدابووە.

٢- (التطور: التَغَيُّرُ التدْرِيجي الَّذِي يَحْدُثُ فِي بُنيَةِ الكَائِنَاتِ وَسُلوكِهَا)[٢].

واتە: گەشەكردن، بریتیە لەو گۆڕانكارییە پلە پلەییەی كە لە پێكهاتەی ژیاندارانداو، لە هەڵسوكەوتیاندا پەیدادەبێ.

٣- (تَدَّعِي نَظَرِية التطور أَنَّ الحَيَاة وَالكَائِنَات الحَيَّة بأَكْمَلها، نَشَأت مِنْ خَلِية وَحِيدَةٍ قَبْلَ (٣،٨) مليار سَنَة)[٣].

واتە: بیردۆزەی گەشەسەندن، ئیددیعا دەكات كە ژیان و ژیانداران هەموویان لە یەك خانەوە، بەر لە: سێ ملیار و هەشت سەد ملیۆن (٣،٨٠٠،٠٠٠،٠٠٠) ساڵ لەمەوپێش دروست بوون، (یەك خانەی زیندوو هەبووە هەموویان لەوەوە هاتوون).

---

(١) المنجد في الأعلام، ص٢٣٧.

(٢) المعجم الوسيط، ص٥٧٠.

(٣) العظمة في كل مكان، هارون يحيى ص١٢٨.

٤- (نَظَرِية التطوُّر باختِصَارٍ شَدِيد هِي: تَفْضِيلُ صِفَاتٍ عَلَى الأُخْرَى، بِمَا يَتَنَاسَب مَعَ البيْئَة المُحِيطَة، عَنْ طَرِيق الإِصْطِفَاء الطَّبِيعِي، وَعَلَيْهِ: فَإِنَّ الكَائِنَات الَّتِي تَحْمِل هَذِهِ الصِّفَة المفَضَّلَة، تَكُون لَدَيْهَا فرصَة أَكْبَر للتَّكَاثر وَالبَقَاء)[1].

واتە: بیردۆزەی گەشەسەندن بە کورتییەکی زۆر کورت (بە گوشراویی) بریتیە لە هەڵبژاردنی هەندێك لە سیفەت بەسەر هەندێکیاندا، کە گونجاوترن لەگەڵ ئەو ژینگەیەدا کە ئەو زیاندارانە تێیدا دەژین، لە ڕێی هەڵبژاردنی سروشتییەوە، هەر بۆیە ئەو ژیاندارانەی کە ئەو سیفەتە هەڵبژێردراو و پەسەندە هەڵدەگرن، ئەوانە هەلی زیاتریان لە بەردەمدا هەیە، کە زۆرببن و بمێننەوە.

٥- (تفترض نظرية التطور أَنّ كُلَّ أَشْكَال الحَيَاة الَّتِي نَعْرِفُهَا، نَشَأَت فِي البدَايَة بالخبط العَشْوَائِي عبر أَخْطَاء فِي نسخ الحَمض النووي أَو الشَّرِيط الوِرَاثِي (DNA) بكائِنَات أَوَّلِية بسِيطَة، لاَ نَعْرِف مِنْ أَيْنَ أَتَت؟ أَو كَيْف تكوَّنَت؟ وَهَذِهِ الأَخْطَاء سَيَنْتج عَنْهَا صِفَات جدِيدَة للكَائِن الحَي، وَقَدْ تَكُونُ مُفِيدَة وَقَدْ تَكُون غَيْر مُفِيدَة، وَهُنَا يَأْتِي دَور الإِنْتِخَاب الطبيعي، ليختار ويُبقي عَلَى كُلّ شَيءٍ مُفِيد للمَعِيشة والتَّكَاثر، حصل عليه الفرد بضربات الحَظِّ المتَتَالية، وعَلى الجَانب الآخر يستبعد ويمحو كُلَّ مَا هو غَير مُفِيد أو غير مُنَاسب للمعيشة أو للتكاثر والبقاء، وَذَلِكَ الإِسْتِبْعَاد سَيَكُون بسَبَب الصّرَاع عَلَى المَوَارد المَحْدُودَة فِي الطَّبِيعَة...)[2].

واتە: بیردۆزەی گەشەسەندن وای دادەنێ کە هەموو شێوەکانی ژیان، کە ئێمە ئێستا دەیانبینین، لەسەرەتاوە لە ئەنجامی پاشا گەردانیی و هەڵەدا، لە ترشی نێوکیی، یاخود شریتی بۆ ماوەیی، لە: (DNA)ی زیندەوەرە سادەکان دا، ئیدی لەوەوە هەموو شێوەکانی ژیان پەیدا بوون، ئەویش لەو زیندەوەرە سادانەوە کە تا ئێستا نازانین، لە کوێوە هاتن و چۆن دروست بوون؟ (واتە لە زیندەوەری یەك خانەیی بۆ وێنە: ئەمیبا)، ئنجا ئەو هەڵانە کە لە نێو شریتی بۆماوەییاندا بوون، چەند سیفەتێکی نوێ بۆ ئەو زیندەوەرە پێکدێنن، کە جاری وا هەیە ئەو

---

(١) التطور نظرة تأريخية وعلمية، محمد صالح الهبيلي، ص١٥٢-١٥٣.

(٢) إختراق عَقلٍ ص١٥٩.

سیفەتە بە سوودە و جاری واش هەیە بێ سوودە، ئنجا لێرەدا ڕۆڵی هەڵبژاردنی سروشتیی دێتە پێش، تاکو ئەوەی کە باشە لەو سیفەتانە و لەگەڵ ژیاندا دەگونجێ و بۆ زۆربوون باشە، بیهێڵێتەوە و ئەوانی دیکە لە بەین بەرێ، ئەویش دیارە بە هۆی هەڵبژاردنێکەوە و لە ئەنجامی چەندان هەوڵی دووبارەی شانس و بەختندا، لەو لاشەوە: سڕینەوەی ئەوانی دیکە، ئنجا ئەو بە دوورگرتنەی سیفەتە خراپەکان و هەڵبژاردنی سیفەتە باشەکان، لەسەر بناغەی ئەوەیە کە کێشە هەیە لەسەر ئەو خۆراکەی کە لە سروشتدا هەیە و، ئەو زیندەوەرانە لەسەری دەژین و، کامیان زیاتر توانای مانەوەی هەبێ، ئەوەیان دەمێنێتەوە.

## بڕگەی دووەم: یاساداریی لە گەردوون و لە ژیانی مرۆڤدا، لەگەڵ پێویست بوونی بەدیهێنەردا دژ نیە:

پێشتریش گوتمان: یاساداریی گەردوون، لەگەڵ پێویستیی هەبوونی بە بەدیهێنەردا، تێکناگیرێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە: تاکو گەردوون ڕێك و پێکتر و سیستماتیکتر بێ، زیاتر ناچارمان دەکات بڵێین: ڕێکخەرێك و دیزاینکارێك و پەروەردگارێك و مشوورخۆرێکی هەیە.

ئنجا گریمان ئەگەر ئەم بیردۆزەی گەشەکردن و پەرەستاندنی ژیانداران (نشوء وتطور الحيوانات) کە (چارلس داروین)، - لە ساڵی (١٨٠٩)ی زایینی دا لە دایك بووە و لە ساڵی (١٨٨٢)دا مردوە - تەبەنیی کردوە، ئەگەر ڕاستیش بێ و، مرۆڤ دوا ئاڵقەی ئەو گەشەسەندن و پەرەستاندنە بێ، ئەوە نابێتە بەڵگەو بیانووی ئیلحاد، چونکە ئەو کاتە دەگوترێ: ئا ئەو شێوە دروستبوونەی مرۆڤ، سیستم و یاسایەکە خوا لە ژیاندارانادا دایناوە، کە بەو جۆرە دروست بن و گەشە بکەن.

واتە: گەشەکردن و پەرەستاندن (النشوء والتطور) شتێکی خودیی (ذاتي) نیە، کە لە ماددەوە پەیدا بن، بەڵکو (گەشەپێکردن و پەرەپێستاندن)، (التنشئة والتطوير)، میکانیزمێکە خوای پەروەردگار دایناوە، بۆ ئەوەی بەو شێوەیە ژیانداران دروست ببن.

هەڵبەتە ئەوە لە حاڵێکدا کە بیرۆدەزەی ناوبراو ڕاست بێ، کە بێگومان ڕاست نیە، بەڵکو پێچەوانەی عەقڵ و زانست و واقیعە، وەك لە بڕگەی سێیەمدا، باسی دەکەین، کە زۆرترین پانتایی لە توێژینەوەی ئەم (بیانووی هەشتەم)ەدا، بۆی تەرخانکراوە.

## بڕگەی سێیەم: هەڵوەشاندنەوەی بیردۆزەی داروینیزم:

ئێمە پێنج بەڵگە لەسەر هەڵوەشاندنەوەی بیردۆزەی داروینیزم دێنینەوە، کە دوا ئاڵقەی بیردۆزەی گەشەکردن و پەرەستاندنە، کە وەك پێشتر ئاماژەم پێدا: تەنانەت لە نێو هەندێك لە یۆنانییەکانیشدا بیردۆزەیەکی بەو شێوەیە هەبووە و، لە پێش داروینیدا (لامارك)ی فەڕەنسییش قسەیەکی وای هەبووە و، هەندێك لە زانایانی دیکەش لەو بارەوە قسەیان کردوە، بەڵام داروینیزم دوا ئاڵقەی ئەو بیردۆزەیەیە، بۆیە وەختێك داروینیزم هەڵدەوەشێنینەوە، ئەوانی دیکەی پێش ئەویش هەڵوەشاونەتەوە:

**بەڵگەی یەکەم:** ڕەخنەلێگرتنی دوو پایە بنەڕەتییەکەی گەشەکردن و پەرەستاندن:

بیردۆزەی داروینیزم لەسەر دوو پایەی بنەڕەتیی وەستاوە:

١- پلە پلەیی (التدرج).

٢- وێکچوون (التشابە).

**پایەی یەکەم: پلە پلەیی (التدرُّج):**

یەکەمین پایەی بیردۆزەی داروینیزم، ئەوەیە کە دەڵێ: لە میانی ملیۆنان ساڵدا زیندەوەرەکان لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی دیکە، بە شێوەی پلەپلەییەکی سست و لەسەرەخۆ، گەشەیان کردوە و لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی دیکە گۆڕاون!

ئنجا با تەماشای واقیع بکەین! داخۆ ئەم پایەی یەکەمەی داروینیزم چۆن دەردەچێ؟!

١- ئێمە کاتێك تەماشای واقیع دەکەین و سەرنجی هەڵکۆڵدراوەکان (أحافیر) دەدەین، دەبینین: ئاڵقە ڕاگوزەرەکان (الحلقات الإنتقالية) بوونیان نیە، بۆ وێنە:

دوو ژیاندار هەن، کە یەکێکیان ژمارە یەك (١)ی بۆ دادەنێین و، یەکێکیشیان ژمارە: پێنج (٥)، ئنجا ئەگەر ڕاست بێ ئەو ژمارە پێنج (٥)ە، لەو یەك (١)ەوە،

هاتبێ، دەبێ دوو (٢) و سێ (٣) و چوار (٤)یش هەبن، چونکە یەك (١)، یەکسەر نەبۆتە پێنج (٥)، بەپێی بیردۆزەی داروینیزم، چونکە بیردۆزەی گۆڕین دەڵێ: بە گەشەسەندنێکی هێواشی لەسەرەخۆی پلەپلەیی، ژیانداران پەیدابوون، واتە: کاتێك ژیانداری ژمارە یەك (١)، بۆ وێنە: (ئەمیبا) دەبێتە ژیانداری ئیسفنج، کە ژمارە پێنج (٥)ە، دەبێ بە قۆناغی دووەم و سێیەم و چوارەمدا بڕوات، کەچی لە تۆماری هەڵکۆڵدراوەکاندا، کە زانایانی زیندەوەرزان زەوییان هەڵکۆڵیوە، تەماشا دەکرێ: تەنیا پاشماوە و کەلەشی ژیانداری: ژمارە یەك (١) و، ژیانداری ژمارە: پێنج (٥) هەنە، واتە: کە ئێستا ژیانداری: ژمارە یەك (١) و ژمارە پێنج (٥) هەن، لە ژێر زەویشدا لە نێو پاشماوەی هەڵکۆڵدراوەکاندا، تەنیا شوێنەواری ئەو دووانە دیارە، بەڵام هی: دوو (٢) و سێ (٣) و چوار (٤) دیار نیە!

کەواتە: ئەو بیردۆزەیە ڕاست نیە، چونکە تەنیا شوێنەواری یەك (١) و پێنج (٥) هەن، وەی ئاڵقەکانی دیکەی: (٢) و (٣) و (٤) دیار نیە، مانای وایە: پێنج (٥) لە یەك (١)پەیدا نەبووە، بەڵکو خوا یەك (١)ی بە جیا خوڵقاندوە و، پێنج (٥)یشی بە جیا، ئەگەرنا: دوو و سێ و چوار، کوان؟!

(ڕیتشارد داوکینز) لە کتێبێکی دا کە بە عەرەبیی تەرجەمە کراوە: (صانع الساعات الأعمى)، (دروستکەری کوێری سەعاتەکان)دا،[1] دەڵێ:

(الأَحَافِيرُ سَبَّبَت خَيْبَةَ أَمَلٍ كُبْرَى لأَنْصَار التطور، وَجَدنا الكَائِنَاتِ فِي أَقْدَمِ طَبَقَاتِ الأَرْضِ "الكَامْبَرِي" دُونَ أَي تَأريخ تَطَوري، وَكَأَنَّهَا زُرِعَت بالأَمْس، وَهَذَا يُسْعِدُ أَنْصَار الخَلْق)[2].

واتە: هەڵکۆڵدراوەکان بوونە هۆکاری تێکشانێکی گەورە بۆ پشتیوانان لە بیردۆزەی پەرەستاندن، چونکە زیندەوەرەکانمان بینی لە کۆنترین چینی زەویدا،

-----

(١) ص٢٢٩.

(٢) ئەو زانا ڕۆژئاواییانە ئەوەیان باشە، ئەگەر هەموو جارێش نەبێ، جار جار دان بە هەقێدا دێنن، ئەگەر بە زیانی خۆشیان بێت.







چینی کامبێری[١]، بەبێ هیچ مێژوویەکی گەشەسەندن، تەماشا دەکەین زیندەوەران هەن، هەر وەك دوێنێ پەیدابووبن.

(ئەوەی کە: شەشسەد ملیۆن (٦٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ لەمەوبەر لە چینەکانی زەویدا دەدۆزرێتەوە، لەگەڵ ئەوەی ئەمڕۆدا، هەروەك یەکن)[٢]، ئەمەش پشتیوانانی بیردۆزەی خەلق بەختەوەر دەکات و دڵخۆش دەکات، (کە دەڵێن: خوا ڕاستەوخۆ ئەو زیندەوەرانە و ئەو ژیاندارانەی دروستکردوون).

٢- ئەگەر بیردۆزەی پەرەستاندن ڕاست بووایە، دەبووایە کائینات لە بنکەیەکەوە دەرچووبان و بەدرێژایی کات بە شێوەی ئاسۆیی لق و پۆپی جۆراو جۆریان لێ جیابووبانەوە و، لە هەر لقێکیش چەند جۆری لێك جیاواز، واتە: ئەگەر ئەو بیردۆزەیە ڕاست بووایە، دەبووایە، لە بنکەوە بە باریکیی و تەسکیی هاتباو بە شێوەی ئاسۆیی فراوان بووبایە، چونکە (ئەمیبا) دەبێتە چەند خانەیەك و، ئەوانیش هەر کامیان چەند خانەیەك و.. پاشان زیندەوەران و ئنجا ژیانداران و .. هتد بەڵام واقیع بە پێچەوانەوەیە - وەك وێنەکەشم کێشاوە - دەبوو ئاوا بێ، کەچی ئێستا بە پێچەوانەوەیە: ئێمە دەبینین: دروستکراوەکان لە ژیانداران کە دروست بوون، لە سەرەتاوە زۆربوون، واتە: بنکەکەی فراوان بووە، دوایی وردە وردە ژیانداران کەمبوونەوە و هەندێکیان نەماون! واتە: بە پێچەوانەی بیردۆزەی داروینیزم:

لە جیاتی ئەوەی لە بنکەیەکی باریکەوە بێت و، دوایی فراوان بێ، ئێمە کە تەماشای چینەکانی زەوی دەکەین: زیندەوەران بنکەیەکی فراوانیان هەیە و زۆر زۆرن، دوایی وردە وردە کەم بوونەتەوە، بۆ نموونە: هەزاران جۆرە مەیموون هەبوون، هەندێکیان لێ ماونەوە، هەروەها هەزاران جۆرە زیندەوەری بچووك هەبوون و،

---

(١) چاخی (کامبێری) وەك دوایی باسی دەکەین دەڵێن: شەش سەد ملیۆن (٦٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش چاخێك بووە: کت و پڕ و لە ناکاو دەریاکان پڕ بوون لە زیندەوەر، لە ناکاو! نەك وەك داروینیزم و گەشەسەندن دەڵێ: پلەپلەیی، بەڵکو کت و پڕ!

(٢) نێوان کەوانە زیادەی خۆمە بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی مەبەست.



4. Multiplication of species

1. Evolution versus creation

3. Gradualism

5. Natural selection

A

2. Common descent




وێنەی (٤٨)

هەزاران جۆرە ژیانداریی دیکەی دەریا هەبوون، کەچی دوایی کەمبوونەتەوە، وەك هەرەمێك کە سەرەتا بنکەکەی فراوان بووە، بەڵام دوایی باریك بووەتەوە.

ئەمەش لە لێکۆڵینەوەیەکی: (ئەکادیمیای زانستە پشتگیرەکانی پەرەستاندن)، (أكاديمية العلوم المناصرة للتطور) لێکۆڵینەوەیەکی بڵاوکردۆتەوە بە ناوی: (لێکۆڵینەوەیەکی زانستیی کە چەمکی گەشەسەندن و پەرەستاندن سەرەوبن دەکات)، (دراسة علمية تَقلِبُ فَهم التطور رأساً على عقب).

تەنانەت (ستیفن جای جۆلد - Stephen jay Gould) کە یەکێکە لە کۆڵەکەکانی داریونیزمی نوێ، دانی پێداناوە کە پەرەستاندنی پلەپلەیی لە تۆماری هەڵکەندراوەکان (السجل الأحفوري)دا بوونی نیە!

گوتوویەتی: مێژووی زۆربەی هەڵکۆڵدراوەکان، دوو سیفەت دەگرنە خۆیان، کە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ پەرەستاندنی پلەپلەیی لە پەیدابوونی زیندەوەرەکاندا، تێك ناکەنەوە:

١- هاوسەنگیی.

٢- سەقامگیریی.

تەماشا دەکەین: سروشتی ئەو ژیاندارانە لەو ماوەیەدا کە لەسەر زەوی ژیاون، نەگۆڕاوە، ئەمیبا هەر ئەمیبایە، ئەو ژیاندارانەی دیکە، باڵندەکان، هی دەریا، هی نێو هەوا، هی سەر زەوی، هەروەك خۆیانن، یانی: مریشك لەوەتی خوا دروستیکردوە، هەر مریشك بووە، مەیموون لەوەتی خوا دروستیکردوە هەر مەیمون بووە، گۆڕانیان بەسەردا نەهاتوە[1].

---

(١) التطور: نظرة تأريخية وعلمية، لمحمد صالح الهبيلي، ص ١٦٧ - ١٧١.

**پـــایەی دووەم: وێکچوون (التشابه):**

ئەمیش دابەش دەکەن بۆ دوو جۆر:

**جۆری یەکەم:** وێکچوونی ڕواڵەتیی جەستە (التشابه المورفولوجي):

دەڵێن: وێکچوونی ڕواڵەتیی، یاخود توێکاریی شکڵ و فۆڕمی ژیانداران، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە پێشوویەکی هاوبەشیان هەیە و، هەتا زیاتر وێك بچن، دیارە ئەو پێشووە هاوبەشەیان لێیان نیزیکترە، بۆ وێنە: سەگ و پشیلە، یان گورگ و سەگ، پێشوویەکیان هەیە، کە هەردووکیان لەوێدا پێك دەگەن.

بەڵام کە تەماشای واقیع دەکەین وای نابینین و، سەرباری ئەوەش:

(بیۆلۆجیا)ی گەردیی (البیولوجیا الجزیئیة) دەریخستوە کە هەندێك لە زیندەوەران بە ڕواڵەت پێك دەچن، بە ئەندازەی کە فتوکۆپیی بن و لێك گیرابنەوە، بەڵام لە ڕووی جینییەوە لێك جیان:

أ- بازی ئەمریکیی لەگەڵ بازی ئەفریقیی، کە بە شکڵ زۆر پێکدەچن، بەڵام لە ڕووی جینەتیکەوە، لەڕووی کرۆمۆسۆمەکانەوە، بازی ئەمریکیی سەر بە خێزانی لەقلەقەکانە، بەڵام بازی ئەفریقیی سەر بە خێزانی داڵەکانە (دالاش و خەرتەلەکان).

ب- نموونەیەکی دیکە: گورگی جیرابیی (الذئب الجِرابی)[١] هەیە، لەگەڵ گورگی خۆڵەمێشیی، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر پێکدەچن، بەڵام هیچ پێشینەیەکی هاوبەشیان نیە.

**جۆری دووەم:** وێکچوون لە ڕووی جێنەتیکەوە:

داروینییەکان دەڵێن: ژیانداران (حیوانات) تاکو لە ڕووی جین و کرۆمۆسۆمەکانەوە زیاتر پێکبچن، مانای وایە پێشینەیەکی هاوبەشی نیزیکتریان هەیە، بەڵام کاتێك سەرنجی واقیع دەدەین وای نابینین.

---

(١) الجرابيَّات: رتبةُ الثَّدييات المِلاّمشيميَّات، من فصائلها: الغُرُيْراوات الجَيبيَّة وجَثيلات الأذناب وطويلات الأرجل والجُرذات الجرابيَّة، المعجم الوسيط، ص١١٤.




وێنەی (٤٩) وێکچوون لە ڕووی جێنەتیکەوە

با چەند نموونەیەك بێنینەوە:

**یەکەم:** دەڵێن: جینی بەشەر لەگەڵ هی مەیموونی شەمبانزیی، دەوری: (٩٨٪) پێك دەچن، بۆیە دەبێ پێشینەیەکی هاوبەش (سلف مشترك)یان هەبێ و هەردووکیان لەودا پێك بگەنەوە.

**دووەم:** (ئەم وێنەی دووەمە، بە درۆخەرەوەی ئەو ئیددیعایەیە کە لە نێوانی بەشەرو مەیموونی شەمبازییدا پێشینەیەکی هاوبەش هەبێت)، دەڵێن: جیناتی مشك لەگەڵ هی بەشەر دەوری: (٩٩٪)ی پێکدەچن، بەڵام بێگومان مشك و بەشەر زۆر لێك دوورن، کە پێشینەیەکی هاوبەشیان هەبێت!

**سێیەم:** جینەکانی مرۆڤ لەگەڵ هی ئیسفنجی ئاو: (٧٠٪) پێکدەچن، ئیسفنجی ئاو، یەکێکە لە ژیاندارە زۆر سەرەتاییەکان و لەگەڵ مرۆڤ زۆر لێك دوورن و، لە خوارەوەی ئەو درەختەیە کە داروین وێنای کردوە، لە مێشکی

خۆیدا، مرۆڤ لە سەری سەرێیە و ئەو لە خواری خوارێیە، کەچی (٧٠٪) لە ڕووی جینەتیکەوە پێك دەچن!

**چوارەم:** مێشی درۆسۆفیلا، جۆرە مێشێکی میوەیە، جینەکانی، لەگەڵ هی مرۆڤ (٦٠٪) پێکدەچن!

کەواتە: وەك چۆن لە ڕووی مۆرفۆلۆجیی و جەستەییەوە پێکچوون بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە پێشینەیەکی هاوبەشیان هەیە، ئەمەش دیسان بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە پێشینەیەکی هاوبەشیان هەیە و، لە یەك بنك (جذع)ەوە هاتوون، بە تایبەت وێکچوونی جینەکانی ئیسفنجی ئاو، لەگەڵ هی مرۆڤدا، ئەوە هەر بەڵایەکی زۆر گەورەیە بۆ داروینیزم، چونکە ئیسفنجی ئاو، پێش تەقینەوەی کەمبەریی، واتە: پێش شەشسەد ملیۆن (٦٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ، (کە دەڵێن: لە ناکاو دەریا پڕ بووە لە زیندەوەران)، هەر هەبووە و لە زیندەوەرە سەرەتاییەکان دادەنرێ، کە نە شانەی تێدایە، نە ماسوولکەی هەیە، نە دەماری هەیە، نە کۆئەندامەکانی هەن، بۆیە مرۆڤ لە لووتکەی ژیانداران دایە، بەڵام ئیسفنج لە کلك و بنی بنەوەی ژیاندارانە، کەچی: (٧٠٪)ش لە ڕووی جینەتیکەوە پێکدەچن.

ئنجا ئەگەر وابووایە و ئەو پەیوەندییەی نێوان ژیانداران، وەك داروینیزم دەڵێ، پەیوەندییەکی ڕاست و دروست بووایە - چ لە ڕووی مۆرفۆلوجیی (جەستەیی) و چ لە ڕووی جینەتیکەوە - ئێمە ئەو هەموو پێکچوونەمان نەدەبینی لە نێوان مرۆڤ (کە لە لووتکەی ژیانداران دایە) و ئەو ژیاندارانەدا کە زۆر لە خوار ئەوەوەن، بە تایبەتی ئیسفنجی ئاو، یاخود مشك، کە لە (٩٩٪) لە ڕووی جینەتیکەوە لەگەڵ مرۆڤ پێکدەچێ.

کەواتە: وێکچوونی چ مۆرفۆلۆجیی (ڕواڵەتیی و ڕووکەشیی)، چ جینەتیکیی، بەڵگەیەکی عیلمیی نیە، بۆ ئیسپاتی ئەوە کە ئەو ژیاندارانە پەیوەندییان پێکەوە هەیە، یان کە لە یەك ئەسڵەوە هاتوون، هەر بۆیەش لە ساڵی (٢٠٠٩)ی زایینیدا، دوای ئەو دۆزرانەوانە، درەختی دراوینیزم کە بۆخۆی وێنای کردوە لە خەیاڵی خۆیدا، کۆتایی پێهات[1].

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ص (١٧٤- ١٧٨).




وێنەی (٥٠) درەختی داروینیزم

**بەڵگەی دووەم:** دروستبوونی خانە (خلية) بە درۆخەرەوەی داروینیزمە:

پێشتریش باسمان کردوە، کە خانە یەکەی دروستبوونی هەر زیندەوەرێکە و، هەندێك لە ژیانداران تەنیا یەك خانەن، وەك (ئەمیبا) و، خانەش یەکجار کائینێکی ئاڵۆزە و پڕ وردەکارییە، خانە ژیانی تێدایە، سادەترین شێوەی ژیانی تێدایە، لە دەوری تریلیۆنێك (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) گەردیلە پێکهاتوە، یانی: (١٠^١٢)، یانی: ملیۆن ملیۆن گەردیلە کۆدەبنەوە، خانەیەك پێکدێنن، هەتا ئێستاش چۆنیەتی گۆڕانی گەردیلەکان بۆ مۆلکۆلەکان (جُزَيئَات) (Molcls)، پاشان گۆڕانی مۆلکۆلەکان بۆ پێکهاتەی دیکە و، دواتر ئەوانیش بۆ خانە، هەتا ئێستا نەزانراوە، چۆنە؟ ئایا چۆن ئەو تریلیۆن گەردیلەیە پێکەوە کۆدەبنەوە بەپێی بەرنامەیەکی یەکجار ورد، بۆ پێکهێنانی مۆلکۆلەکان و، پاشان خانە دروست دەکەن؟! بێگومان ئێمە ناچارین بۆ تەفسیر کردنی ئەوە، یەکێك لە دوو ئەگەران هەڵبژێرین:

**١)**- ئەو گەردیلەو مۆلکۆلانە، هەست و شعوورو ئیرادەیان هەیە و کۆدەبنەوە، دەڵێن: با کۆببینەوە خانەیەك پێکبێنین، ئنجا ئەو تریلیۆن گەردیلە کۆدەبنەوە و مۆلکۆلان پێکدێنن، ئەوانیش کۆدەبنەوە و خانە پێکدێنن.

**٢)** یان خوا (سبحانە وتعالی) بەو جۆرە بەرنامەیەی بۆ داناون، وەك لە ئایەتی (٥٠)ی سوورەتی (طه)دا مووسا بە فیرعەون دەفەرمویێ:

﴿رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ﴾.

واتە: پەروەردگارمان ئەو زاتەیە، کە بوونی بە هەموو شتێك داوەو ڕێنماییشی کردوە.

ئنجا ئەو خوایەی کە گەردیلەکانی دروست کردوون، ڕێنماییشی کردوون چۆن مۆلکۆل پێك بێنن، مۆلکۆلەکانیشی ڕێنمایی کردوون چۆن بەشەکانی خانە و، بەشەکانیش چۆن خانە پێك بێنن!

گومانیشی تێدانیە کە هیچ کەس ناتوانێ بڵێ: گەردیلەکان هۆش و عەقڵ و ئیرادەیان هەیەو، بەرنامە بۆخۆیان دادەنێن، هیچ خاوەن عەقڵێك شتی وا ناڵێ، چونکە پێشتر باسمان کرد، گوتمان ماددە خاوەنی ژیان و ئیرادەو عەقڵ و زانیاریی و...هتد نیە.

کەواتە: دەبێ بڵێین خوا (سبحانه وتعالى) بەرنامەی بۆ گەردیلەکان و بۆ مۆلکۆلەکانیش داناوە: بەو شێوەیە خانە پێکبێنن[1].

**بەڵگەی سێیەم:** ژیان بریتیە لە زانراوەکان (الحياة معلومات):

ژیان لە سادەترین شێوەیدا بریتیە لە زانیاریی، لە ساڵی (١٩٥٣)دا، هەر کام لە (جیمس واطنسون) و (فرانسیس کریك)، پێکهاتەی ترشی نێوکیی (DNA) یان، دۆزیەوە و لە سەر ئەوە خەڵاتی (نۆبڵ)یان لە ساڵی (١٩٦٢)دا وەرگرت.

(DNA) کە جینەکان، واتە: کرۆمۆسۆمات دەگرنە خۆیان، کە سیفەتە بۆ ماوەییەکانی ژیانداران لەوێ دان، ئەمەش بیردۆزەی گەشەسەندنی تووشی شۆك کرد، چونکە هیچ بەش و سیفەتێکی ژیاندار هەرچەندە پێکهاتەکەی سادە بێ، ناگونجێ بگۆڕدرێ و دەستکاریی بکرێ بۆ شێوەیەکی دیکە، مەگەر لەڕێی ئەو زانیارییە ژمارەییە جفرەییانەوە، کە لەسەر ئەو شریتە بۆماوەییە تۆمارکراون، دەبێ زانیارییەکانی سەر کرۆمۆسۆمە زانراوەکان دەستکاریی بکرێن، ئنجا ئەو ژیاندارە لەو حاڵەتەوە دەگۆڕێ بۆ حاڵەتێکی دی، کەواتە: پرۆسەی پەرەستاندنی هەر ژیانداریك بۆ ژیانداریکی دیکە، خوازیاری هەموارکردن یان دەستکاریی کردن و دووبارە نووسینەوەی پرۆگرامە ژمارەییە تۆمارکراوەکەی سەر شریتی ترشەڵۆکی نێوکیی (الحمض النووي)، واتە: (DNA)یە، ئەمەش ڕێك دژی تێگەیشتنە سادەو سەرکێڵانەکەی داروینە، کە لە بارەی پەرەستاندنی ژیاندارانەوە بە شێوەی هەڕەمەکیی (عشوائي) ڕەچاوی کردبوو و، وای دەزانی: (خانە) تەنیا شلەیەکی هولامیی[2] سادەی بە دەورەوەیە.

---

(١) ئەم زانیارییانە لە: (التطور: نظرية علمية أم أيدولوجيا؟) دا، هاتوون، ص٣٢٢، أ. د. عرفان يلماز.

(٢) المادة الهُلامية: مادة بروتينية شفافة تُستخرجُ من الأنسجه الحيوانية المختلفة، مثل: الجلد والعظم





**زانیارییەکانی نێو دی ئێن ئەی (DNA):**

١)- یەك گرام لە (DNA)، هێندەی سەد ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) (CD، DVD)ی کۆمپیوتەر یاخود بەرانبەر چوار سەدو پەنجا (٤٥٠) ئیکسابایت، زانیاریی تێدایە، کە هەر ئیکسابایتێك یەك ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠) گیگابایت زانیاریی تێدایە.

٢)- کۆدی بۆماوەیی (DNA) لە جۆری چوارییە و پشت بە چوار بنچینەی نایترۆجینی دەبەستێ، کە بریتیە لە (A،T،C،G)، کە بیل گێتس (Bill Gates) خاوەنی شەریکەی مایکرۆسۆفت و ویندۆز، دەڵێ: ئەو (DNA)ە، لە هەرچی مرۆڤ دروستی کردوە، ئاڵۆزترە، ئەگەر هەرچی ئامێری مرۆڤ دروستیکردوە، هەموویان کۆبکەیەوە، ئنجا بە قەدەر ئاڵۆزیی و، ئەو وردەکارییەی لە (DNA)دا هەیە، لەو شریتە بۆ ماوەییەدا کە سیفەتەکانی ژیاندارانی لەسەر تۆمارکراون، بە قەدەر ئەوە ئاڵۆزیی و وردەکاریی تێدا نیە.

٣)- ئەو شریتە بۆماوەییە کە لە نێو خانەدا لوول پێچ کراوە، کە وەك پەیژەیەك دوو لای هەن و پلەپلەییە، وەك مارپێچ، لە هەر خانەیەکدا چل و شەش (٤٦) کرۆمۆسۆم هەیە و، لە نێو کرۆمۆسۆمەکاندا ئەو لوولپێچە هەیە، بەڵام یەك تاڵە مووی سەری مرۆڤ، پەنجا هەزار (٥٠٠٠٠) جار بە قەدەر ئەو شریتەی کە لە نێو کرۆمۆسۆمەکاندا هەیە، ئەستوورترە.

ئنجا شایانی باسە، کە ئەو زانراوانەی لە نێو جینۆمی مرۆڤدان، بەشێوەی کۆد دانراون و، ژمارەیان دەوری سێ ملیار و دوو سەد ملیۆن (٣٢٠٠٠٠٠٠٠٠) دەبێ، یانی: هەر کرۆمۆسۆمێك کە لە نێو خانەی مرۆڤدا هەیە: سێ ملیار و دوو سەد ملیۆن زانیاریی تێدایە.

ئنجا لێرەدا دەپرسین:

---

والأربطة، وتكون جامدةً عند جفافها ولكنَّها تَتحوَّلُ إلى سائلٍ بالرطوبة. المعجم الوسيط، ص٩٩٢.

١- ئایا سەرچاوەی ئەو زانیارییانە چییە؟

٢- ئایا دەگونجێ ماددەی بێ ژیان و بێ ویست و بێ هۆش و بێ زانست، هەموو ئەو زانراوانەی لە جینۆمدا دانابن، چ جینۆمی مرۆڤ، چ هی غەیری مرۆڤ؟

٣- ئایا نەداری شتێك، شتەكەی پێ دەبەخشرێ؟

٤- ئایا سیستم و یاسا لە بێ یاسایی و فەوزاوە پەیدادەبێ؟

بێگومان هەر سیستمێكی مەعلووماتیی، دەبێ سەرچاوەكەی زانیاریی بێ، بۆیە ئیددیعا كردنی ئەوە، كە گەشەستاندن ئەو زانیارییانەی لەسەر كرۆمۆسۆمەكان داناون، بە شێوەی كۆد (جفرة)، (لە حاڵێكدا كە گەشەستاندن بێجگە لە شتێكی وەهمیی كە مێشك دایدەتاشێ، هیچی دیكە نیە، چونكە گەشەستاندن شتێك نیە لە دەرەوەی ماددە)، ئەو ئیددیعایەش وەك ئیددیعایەكەی زیاتر لە سەد (١٠٠) ساڵ لەمەوبەرە، كە ئیددیعا دەكرا: دروستبوونی ژیان بە شێوەیەكی خودییە و دەیانگوت: (التَخَلُّق اللاَّ حَيَوِي) دروست بوونی نازیندوویی، یان (التَوَلُّد الذَّاتِي للحياة) لەخۆوە پەیدا بوونی ژیان.

شایانی باسیشە ئەو كاتە ئەم جۆرە بەڵگانەیان دەهێنانەوە:

١- دەیانگوت: لە كادێنێكدا كە كای تێدایە، مشك پەیدا دەبێ.

٢- دەیانگوت: گۆشتێك دابنێ، دوایی كرمی تێ پەیدا دەبێ.

٣- دەیانگوت: نانێك دابنێ، دوایی كەڕووی تێدا پەیدا دەبێ.

٤- دەیانگوت: تۆزێ ماست لە شیر بكە، دوایی هەوێن دەبێ و بەكتریای تێدا پەیدادەبێ.

بەڵام (لویس باستۆر) كە لە ساڵی (١٨٢٢ ز)دا لە دایك بووە، لە ساڵی (١٨٩٥ ز)دا مردوە، دوای ئەوەی كە زەڕەبین (میكرۆسكۆب)ی دروستكرد، ئەو بیردۆزەیەی هەڵوەشاندەوە و، دەریخست كە ژیان تەنیا لە ژیان پەیدا دەبێت و ئەوە: كە گۆشتێك دوایی كرمی لێ پەیدا دەبێ، هۆیەكەی ئەوەیە كە میكرۆبی ژیاندار دەچنە نێو ئەو گۆشتە و، لەوێدا گەشە دەكەن و دەبن بە كرم، هەروەها كە مشك لە (كادێن)دا پەیدا دەبێ و، شتێكی دیكە كە لە شتێكی دیكەدا،

پەیدا دەبێ، هەمووی بەکتریایەو میکرۆبە دەچێ، لەو ژینەگەدا گەشە دەکات و، دەبێ بە شتێکی دی، ئەگەرنا ژیان تەنیا لە ژیان پەیدا دەبێ[١].

**بەڵگەی چوارەم:** تەقینەوەی چاخی کامبەریی داروینیزمی بە ئیعتیرافی داروین، هەڵوەشاندۆتەوە:

داروین گوتوویەتی[٢]: (إِذَا كَانَتِ الأَنْوَاع الكَثِيرَةُ، وَالَّتِي تَنْتَمِي إِلى نَفْسِ الأَجْنَاسِ أَو الفَصَائِلِ، قَدْ دَبَّت فِيهَا الحَيَاة فَجْأَةً، فَسَتُمَثِّلُ هَذِهِ الحَقِيقَةُ ضَرْبَةً قَاتِلَةً لِنَظِرية انْحِدَار الأَنْوَاع بتَحَوّرٍ بَطِيء مِنْ خِلاَلِ الإِنْتِقَاءِ الطَّبِيعِي)[٣].

واتە: ئەگەر سەلمێنرا کە جۆرە زۆرەکان لە ژیانداران، کە هەموویان دەبنەوە بە یەك ڕەگەز، یان بە یەك جۆر، ئەگەر سەلمێنرا کە کت و پڕ ژیانیان تێدا پەیدابووە، ئەوە دۆزینەوەی ئەو ڕاستییە، زەبرێکی کوشندە دەدات، لە بیردۆزەی پەیدابوونی جۆرەکانی زیندەوەران بە شێوەی گەشەسەندنی پلەپلەیی.

ئنجا با بزانین داخۆ واقیع چیمان پێ دەڵێ؟

دوایین مەزەندە (تقدیر) بۆ تەمەنی ژیان لەسەر زەوی، ئەوەیە کە چوار ملیار (٤،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠)[٤] ساڵە، نەك ژیانی مرۆڤ، بەڵکو ژیانی ژیانداران، هەر لە قەوزەو ڕووەکەوە بگرە - چونکە ئەوانیش ژیانیان هەیە - تاکو دەگاتە مرۆڤ، ژیان تەمەنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چوار ملیار (٤،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) ساڵ، لەمەوبەر، ئنجا ئەگەر ئەو ماوەیە بە ڕۆژێکی تەواو، واتە: بە بیست و چوار سەعات (٢٤) دابنێین، حاڵەکە بە جۆرێك دەبێ کە ڕێك لەگەڵ بۆچوونەکەی دارویندا دژبوەستێ:

---

(١) التطور: نظرة تأريخية وعلمية، ص٨٩-٩٣، ص ١٨٢-١٨٤.

(٢) وەك زۆرجاری دیکە گوتوومانە: بێگومان داروین بە ئینگلیزیی نووسیویەتی، بەڵام ئێمە تەرجەمە عەرەبییەکەیمان هێناوە.

(٣) أصل الأنواع، طبعة: ١٩٦٤، ص ٣٠٢.

(٤) هەندێکیش بە سێ ملیار و هەشتسەد ملیۆن (٣،٨٠٠،٠٠٠،٠٠٠) ساڵ مەزندەیان کردوە، وەك پێشتر هێنابوومان.

١- ماوەی بیست و سێ (٢٣) سەعات، تەنیا ژیاندارە یەك خانەییەکانی وەك بەکتریا هەبوون.

٢- لە نێوان سەعات بیست و سێ و پەنجاو حەوت (٢٣:٥٧)خولەکدا تاکو ئێستا، یانی: تەنیا لە ماوەی سێ خولەکەدا، پێش تەواوبوونی ڕۆژەکە: دەریا بە ڕێژەی (٦٠٪ - ٨٠٪) پڕ بووە لە جۆرە ژیاندارە سەرەکییەکان، کە ئێستا هەن.

بۆیەش (جیرالد سکرویدر) لە بارەی لێکۆڵینەوەکانی: (واڵکت) (Walcott) کە ئەویش زانایەکی زیندەوەرزانە، کە: (٦٠٠٠٠ تا ٨٠٠٠٠) شوێنەواری ژیاندارانی تێرو تەواوی دۆزیوەتەوە، لە چینەکانی زەویدا، کە دەگەڕێنەوە بۆ چاخی کامبەریی، واتە: بۆ شەشسەد ملیۆن (٦٠٠،٠٠٠،٠٠٠) ساڵ لەمەوبەر، گوتوویەتی: ئەگەر (والکت) ویستبای: یەك سوپای دێنا لە دیکۆمێنتی ئەو ژیاندارانە، بەڵام ویستوویەتی کە یەکجاریی کەشتیی گەشەستاندنی داروین نغرۆ نەکات![1]

کەواتە: قسەکەی (داروین) ڕێك لەگەڵ واقیعدا تێکدەگیرێ، (داروین) دەڵێ:

ئەگەر ژیان کت و پڕ پەیدابووبێ لە هەندێك لە ژیانداراندا، ئەوە زەبرێکی کوشندەیە لە بیردۆزەکەم دەدرێ، چونکە بیردۆزەکەم دەڵێ: وردە وردە پەیدا بووە، بەڵام وەك باسمان کرد لە ماوەی بیست و سێ سەعات و پەنجاو حەوت (٢٣:٥٧) خولەکدا تەنیا زیندەوەرە یەك خانەییەکان هەبوون، دوایی لە ماوەی سێ خولەکدا، دەریا پڕ دەبێ لە ژیاندارانێ کە ئێستا دەیانبینین: شەست تاکو هەشتا لە سەدا (٦٠٪ تا ٨٠٪)یان، کەواتە: ئەوە ڕێك لەگەڵ بیردۆزەکەی دارویندا تێك دەگیرێ.

**بەڵگەی پێنجەم:** زانیاریی زیندەوەرە وردیلەکان، داروینیزم هەڵدەوەشێنێتەوە:

چونکە (داروین) لە کتێبی (أصل الأنواع)دا، گوتوویەتی[2]:

---

(١) التطور: نظرة تأريخية وعلمية، ص٢٠١،٢٠٢.

(٢) ص١٨٩.

هەر کاتێك ئیسپاتی بوونی هەر ئەندامێکی لێکدراو (مرکَّب)مان کرد، کە لە هەموارکردنە سووکەکان (التعدیلات الطفیفة)ەوە، کە بەدوای یەکدا دێن، پەیدا نەبووە، ئەوە بیردۆزەکەی من بە تەواویی هەرەس دێنێ.

چونکە بیردۆزەکەی دەڵێ، دەبێ هەموو گۆڕانکارییەکان پلە پلەیی (مُتَدرِّج) بن.

بابزانین واقیع چی دەڵێ؟:

زانایان دەڵێن: (میکۆپلازما - Mycoplasma) کە وردترین زیندەوەری سەر زەوییە، چوارسەد و شەست و هەشت (٤٦٨) جینی تێدایە، واتە: کرۆمۆسۆمەکان، هەر جینەش پرۆتینە لێکدراوەکانی تێدان، کە ژمارەیان دەگاتە هەزار تاکو دە هەزار (١٠٠٠ - ١٠٠٠٠)، ترشەڵۆکی ئەمینیی.

ئنجا ئەگەر گەشەستاندن ڕاست بووایە، ئێمە پێویستییمان بەوە بوو، کە لە جینی (سفر)ەوە دەست پێ بکەین، ئەگەر بمانەوێ لە هیدرۆجینەوە بەرەو مرۆڤ بچین، کەچی تەماشا دەکەین (میکۆپلازما) کە وردترین زیندەوەرە و، لە پێش ویەوە شتێکی دیکە نیە: لە (٤٦٨) جین پێکهاتوە و، هەر جینەشی: هەزار تاکو دە هەزار ترشەڵۆکی ئەمینیی تێدایە، کەواتە: سادەترین زیندەوەر ئاوێتە (مُرَکَّب)یە!

(داروین)یش دەڵێ: هەر کاتێك دەرکەوت کە بەبێ هەموارە سووکەکان، بەبێ پلەپلەیی، ئەندامێکی لێکدراو (عضو مرکب)ی زیندەوەرێك هەیە، ئەوە بیردۆزەکەی من هەرەس دێنێ، چونکە کت و پڕ پەیدا بووە، کەواتە: دیارە لە ئەنجامی گەشەستاندنەوە پەیدا نەبووە؟![1].

---

(١) کَهَنَةُ الإلحاد، ص١٤٠، د. هیثم طلعت،

## بڕگەی چوارەم: ژیان مەتەڵ و نهێنییەكی نەزانراوە:

(داروین) لە كتێبی: (بنەڕەتی جۆرەكان)، (أصل الأنواع)ەكەی خۆیدا، باسی ئەصڵی ژیان و چۆنیەتی پەیدابوونی نەكردوە، چونكە ئەو كاتە (سەدەی نۆزدە)، وا باو بووە كە ژیان بە شێوەی پەیدابوونی خۆیەتیی (التولد الذاتي)، پەیدابوونی ڕاستەوخۆ (التولد التلقائي)، لە ماددە پەیدا دەبێ، كاتێك زیندەوەرەكانیان دەبینی: چۆن لە بەرماوەی خواردن و، مشك لە دانەوێڵەو، كرم لە گۆشت و، ...هتد پەیدا دەبن، دەیانگوت: ژیان (حیاة) لە ماددەی بێ ژیانەوە پەیدا دەبێ.

بەڵام زانای زیندەوەرناسی فەڕەنسیی (لویس پاستۆر)، كە پێشتریش ئاماژەمان پێدا و لە ساڵی (١٨٢٢ز)دا لە دایك بووە و، لە ساڵی (١٨٩٥ز)دا مردوە، ڕوونی كردەوە و بە بەڵگە سەلماندی كە كرم و گەراو ...هتد، هەموویان بەكتریاو زیندەوەری نەبینراون، لەو ژینگانەدا گەشە دەكەن و دەبن بە ژیانداریی جۆراو جۆرو، ئەو كاتە ئەو قسە ناودارەی خۆی ڕاگەیاند كە لە كۆمەڵێك سەرچاوەدا هاتوە، تەرجەمە عەرەبییەكەی دەڵێ: (لَقَدْ أَصْبَحَ الإِدِّعَاءُ القَائِلُ بِأَنَّ المَوَادَّ غَيْرَ الحَيَّة تَسْتَطِيعُ أَنْ تُنْشِيء الحَيَاةَ، فِي مَهَبِّ الرِّيح)[1].

واتە: ئەو دەعوایەی كە دەیگوت: ماددەی بێ ژیان، دەگونجێ ژیان پەیدا بكەن، ئێستا بەدەم باوە چوو (وەك دەگوترێ: وەك بەفری پار توایەوە).

هەروەها دواییش زانای پسپۆڕی بواری: زیندەوەرزانیی (ئەلیكساندەر ئۆبارین) كە زانایەكی ڕووسییە، كۆمەڵێك لێكۆڵینەوەی كردن لە بارەی ژیانەوە و، ئەو كاتەش (ماركسیزم، لینینیزم) زۆر پێویستییان بەوە بوو كە ناوبراو بۆیان ئیسپات بكات: ژیان لە ماددەی بێ ژیانەوە پەیدا دەبێ و پێویستیی بە خوای وەدیهێنەر نیە، زۆریش هانیاندا لە ساڵانی سییەكاندا، بینیومە كە: دە پازدە (١٠- ١٥) ساڵان خەریك بوو، بەڵام دوایی سەرەنجام ڕێزی لە زانستەكەی

---

(١) العظمة في كل مكان، ص١٢٨- ١٢٩، هارون يحيى.

خـــۆی گرت و گـــوتی: (إِنَّ أَصْلَ الخَلِيَّةِ يَعُدُّ نُقْطَةَ سَوْدَاء تَبْتَلِعُ نَظَرِيةَ التَطور برُمَّتِهَا)[1].

واتە: ئەصڵی خانە بە خاڵێکی ڕەش دادەنرێ، کە بیردۆزەی گەشەستاندن هەمووی قووت دەدات، هەڵیدەلووشێ (چونکە نازانرێ خانە چۆن ژیانی تێدا پەیدا بووە؟).

هەڵبەتە نهێنیی ژیان (سر الحياة)، چ لە ژیاندارانی وەك: نەهەنگ و فیل دا، چ لە زیندەوەرانی وەك: (میکۆپلازما) و (ئەمیبا)دا، هەر یەکە، هەر مەتەڵە، چونکە هەندێك کەس پێیان وایە لەبەر ئەوەی کە (میکۆپلازما) و (ئەمیبا) زیندەوەری بچووکن، دەگونجێ لەخۆوە پەیدا بن، ئنجا لەوانیشەوە شتی دیکە پەیدا ببێ، بەڵام نهێنیی ژیان لە (میکۆپلازما) و لە (ئەمیبا)یەکدا و، لە فیلێکدا هەر نهێنییە، بەڵکو لە وردەکاندا، نهێنییەکە زیاتریشە، بۆچی؟ چونکە: فیل ئەوە فیلەو کۆئەندامەکانی هەن، یان گایەك، یان نەهەنگێکی شین (حوت أزرق) کە گەورەترین ژیانداریی دەریایە و، فیلیش گەورەترین ژیانداریی وشکانییە، بەڵام ئەمیبایەك، یان میکۆپلازمایەك، کە وردترین زیندەوەری دەریایە، کاتێك ئەو: (٤٦٨) جینی تێدابێ، جینیش کە پرۆتینە لێکدراوەکانی تێدان و ژمارەیان دەگاتە: (١٠٠٠ - ١٠٠٠٠) ترشەڵۆکی ئەمینیی و، بە هەموویان ئەو زیندەوەرە بچووکە پێك دێنن، کە بچووکترین زیندەوەرە، ئەوە لە ڕاستییدا نهێنیی ژیانی زیاتر تێدا چڕ بۆتەوە.

(بول دایڤیز) زانای پسپۆڕی زیندەوەرزان، لە کتێبەکەی خۆی: (بناغەی ژیان) (أصل الحياة)دا[2]، قسەیەکی زۆر سەیر دەکات، دەڵێ:

ئەگەر کەوچکێك لە گڵی باش بێنی، دەوری دە تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) بەکتریای لە دە هەزار (١٠٠٠٠) جۆر تێدان و، زیندەوەرە مایکرۆبییەکان، کێشیان

---

(١) العظمة في كل مكان، هارون يحيى، ص١٢٨- ١٢٩، قسەکەیم لە تەرجەمەی عەرەبییەوە هێناوە.

(٢) أصل الحياة، ترجمة: منير شريف، ص٦٥.

دەگاتە سەد تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) تەن، کە لە کێشی سەرجەم ژیاندارانی بینراوی سەر زەوی، هەموویان پێکەوە، زیاترە.

کەواتە: زیندەوەرە بچووکەکانیش، ئەو نهێنیی ژیانەی کە تێیاندایە، هەر مەتەڵێکی حەل نەکراوە و، مەتەڵەکەیان قورستریشە لە هی ژیاندارە بەرهەستەکان.

## بڕگەی پێنجەم: چەند پرسیارێکی دیکەی خێرای بێ وەڵام:

لەم بڕگەیەدا حەوت (٧) پرسیاران دەخەینە ڕوو کە ئاڕاستەی بیردۆزەی داروینیزم بە تایبەتیی و، بە گشتیی بیردۆزەی گەشەستاندن دەکرێن، بەڵام وەڵامەکانیان دەست ناکەون:

**پرسیاری (١)** : ژیان چۆن لەسەر زەوی پەیدا بوو؟

**پرسیاری (٢)** : ئایا هەڵبژاردنی سروشتیی (الإنتخاب الطبيعي)، وشەیەکی بێ مانا نیە، لە کاتێکدا هەڵبژاردن و گوڵبژێرکردن، پاڵبدرێتە لای ماددەی بێ ژیان و بێ ویست و بێ هۆش؟

**پرسیاری (٣)** : جۆرەکانی ژیانداران کە بەلای کەمەوە دوو ملیۆن تا سێ ملیۆن (٢٠٠٠٠٠٠ - ٣٠٠٠٠٠٠) جۆر دەبن، کە بە حیساب لەڕێی بازدانەوە پەیدا بوون، دەپرسین: ئایا بازدانی بابایەکی کوێر، جگە لە کەوتن و مل شکان، چی لێ چاوەڕوان دەکرێ؟ چونکە داروین باسی بازدانی سروشتیی دەکات، ئاخر سروشت چییە؟ ئەو ماددەیەی کە نە هۆش و نەگیان و نە ئیرادەی هەیە، چۆن باز دەدات؟ مرۆڤ جاری وایە باز دەدات و ملی دەشکێ، ئەدی بابایەکی کوێر باز بدات، نەزانێ بۆ کوێ باز دەدات و چی لێ دێ؟ لە حاڵێکدا کە ئێمە تاکو ئێستا هیچ بازدانێکی بە سوودمان نەبینیوە.

**پرسیاری (٤)** : زانراوەکانی سیستمی کۆدی چوارینەیی (نظام التشفير الرباعي) (CGTA)، وەك وشە چاپكراوەكانی سەر كاغەزو، جفرە تۆماركراوەكانی سەر (CD)

ین، کە وردترین زانیاریی لەبارەی زیندەوەرەکانەوە دەگرنە خۆیان، بەڵام سەرەنجام تەنیا کۆد (Cod)ن، ئنجا ئایا چۆن ئەو کۆدانە دەگۆڕێن بۆ زیندەوەرێکی ڕاستەقینە؟ سەدان شت لەسەر وەرەقەیەك بنووسە، بۆ بازار، هەتا نەیانکڕی هیچت چنگ دەکەوێ؟! یان ئەندازیارێك نەخشەی بینایەك لەسەر کاغەزێك بنووسێ، ئایا یەکسەر دەبێتە خانوو، هەتا نەخشە لەسەر زەوی نەکێشرێ و، وەستاو کرێکار نەیەن و دروستی نەکەن؟!

**پرسیاری (٥)** : کۆدە چوارینە بە دوای یەکداهاتووەکان (CGTA) پێویستییان بە ملیاران جار، پڕی گەردوون زیندەوەری نارێك (كَائِنَات مُشَوَّهة) هەیە، لە پێناو هێنانەدی زیندەوەرێکی ساغدا، ئەگەر بویسترێ یەك ژیانداری (میکۆپلازما) بێتە دی، ملیاران جار پڕی گەردوون، ئەزموونی شکستخواردووی پێویستن، چونکە ژمارەی بنچینە نایترۆجینییەکان لە میکۆپلازمادا پێنج سەد هەزارە، نیو ملیۆن (٥٠٠٠٠٠)، ئنجا بۆ ڕیزکردنی نیو ملیۆن بنچینەی نایترۆجینیی بە ڕێکەوت (صدفة)، ئەگەرەکەی بریتیە لە: (١٠ $^{٢٥٠،٠٠٠}$) واتە: ژمارەی (١٠) دوو سەدو پەنجا هەزار سفری هەبێ، لە حاڵێکدا ژمارەی تەنۆلکەکانی هەموو گەردیلەکانی گەردوون، بریتیە لە: دە توان هەشتا (١٠ $^{٨٠}$)، واتە: ژمارەی (١٠) هەشتا سفری لە پێشەوە بێ، یانی: هەر زۆر زۆریش قەرزار دەبینەوە! ئنجا ئایا وەڵامی بیردۆزەی گەشەستاندن لەو بارەیەوە، چییە؟!

**پرسیاری (٦)** : ئایا باب، یان ئەسڵی ڕاستەوخۆی مرۆڤ، لە کوێیە؟ ئەگەر ئادەم (علیه السلام) نەبێ، ئەدی کوا لە کوێیە؟

**پرسیاری (٧)** : ئایا ئەسڵی یەکەمی ژیانداران، هەر کامێکیان، هی مەیموون، هی بەراز، هی گورگ، هی چەقەڵ، هی ماسی، لە کوێیە؟!

بۆ نموونە:

داروینیزم دەڵێ: پشیلەو سەگ، ئەسڵێکیان هەبووە، کوا ئەو ئەسڵە بۆچی دیار نیە؟ ئەوە سەگ دیارەو، لە هەڵکۆڵدراوەکاندا پەیکەری سەگ هەیەو، هی پشیلەش هەیە، بەڵام ئەدی کوا ئەو ئەسڵە هاوبەشەی هەردووکیان، لە کوێیە؟!

## بڕگەی شەشەم: فێڵ و ساختەکردنی زۆری داروینیستەکان:

بەڕێـــــزان!

لە شەش خاڵاندا باسی چەند نموونەیەك لە فێڵ و ساختەکاریی ئەوانە دەکەین، کە شوێنکەوتووان و هەوادارانی بیردۆزەی داروینیزم و، بیردۆزەی گەشەکردن و پەرەستاندنی ژیاندارانن:

١- نیوە بەشەرەکان (أنصاف البشر)، یاخود مرۆڤی مەیموون، کە زۆر ڕەواجیان پێ داوە و ئێستاش بە داخەوە لە هەندێ لە کتێبەکاندا مێشکی قوتابیانی پێ پڕ دەکرێ، جگە لە ئەفسانەیەکی بە ناو زانیاریی" هیچی دیکە نیە، وەك (إیرنست هوتن) مامۆستا لە زانکۆی (هارفارد) گوتوویەتی: دروستکردنەوەی جەستەکان هیچ بەهایەکی زانستیی نیە، پەیکەرتاشی کارامە دەتوانێ فێڵی زۆری تێدا بکات، بۆ وێنە: ئێسقانێکیان دۆزیوەتەوە، ئنجا بۆ ئەوەی بیسەلمێنن: داروین ڕاست دەکات، کە دەڵێ: مرۆڤ لە مەیموونەوە هاتوە، بە کارامەیی ئەو ئێسقانەیان دەستکاریی کردوە و" هەندێك شتی دیکەیان بۆ زیاد کردوە! بۆیە (إیرنست هوتن) دەڵێ: پەیکەرتاشێکی کارامە دەتوانێ سەد کڵاو لەسەری خەڵك بنێت (وەك دوایی هەندێك نموونە دێنینەوە)، کەواتە: نیوە بەشەرەکان بۆ سەلماندنی ئەوە، کە مرۆڤ لە مەیموونەوە هاتوە، تەنیا ئەفسانەیەك بووە و شتێکی زانستی نەبووە.

٢- مەیموونی ئەفریقیای باشوور (لووسیی)، کاتی خۆی بانگەشەی زۆری بۆ کرا گوایە: ئاڵقەیەکی نێوەندیی نێوان مرۆڤ و مەیموونە، بەڵام دوایی دەرکەوت کە ئەمیش جگە لە جۆرێك لە مەیموونە نەماوەکان (احد أنواع القردة المنقرضة) کە ئێستا نەماون، وەك چۆن دیناصۆرەکان نەماون، جگە لەمە هیچی دیکە نەبووە، نەك ئاڵقەیەکی نێوەندیی بێ لە نێوان مرۆڤ و مەیمووندا، بەڵکو یەکێك بووە لە مەیموونە فەوتاوەکان، وەك ناودارترین زانایانی توێکاریی جیهان

(لۆرد سالیی زیکیرمان) و پرۆفیسۆر (تشارلز ئوکسنارد) ئەو ڕاستییەیان دەرخست و گوتیان: شەش هەزارو پێنج سەد (٦٥٠٠) جۆرە مەیموون هەیە، کە ئێستا هەندێکیان نەماون، ئەو پەیکەرانەی دەدۆزرێنەوە، هی هەندێك لەو مەیموونە فەوتاوانەن، نەك ئاڵقەی نێوانی مەیموون و مرۆڤ بن، هەر بۆیەش گۆڤاری ناوداری فەرەنسیی (زانست و ژیان) (science et vie) لە ژمارەی مایۆی ساڵی (١٩٩٩)ی زایینیدا، بە مانشێتێکی گەورە نووسیبووی: (خوا حافیز ئەی لووسیی!) (وداعاً یا لوسی!)[1].

٣- مرۆڤی ڕاوەستاو (منتصب) و مرۆڤی کارکەر و ژیر (الإنسان العامل والعاقل)، کە گوایە ئەوانە ئاڵقەی دوای مەیموونن، پێش ئەوەی ببێتە مرۆڤی ئێستا، دوایی دەرکەوت کە جگە لە ئەفسانەی داروینیزم" هیچی دیکە نەبوون.

وەك زانای شارەزای هەڵکۆردراوەکان (الحفریات) (ڕیشارد لیکی) گوتوویەتی: مرۆڤی ڕاوەستاوو هاوچەرخ، هەریەك جۆرن، ئەو جیاوازییانەی لە نێوانیاندا هەن، لەو جیاوازییەی کە ئەمڕۆ لە نێوان ڕەگەزە جوگرافییە جیاجیاکاندا دەبینرێن، کەمترە! ئێستا مرۆڤێکی ئەفریقایی لەگەڵ یەکێکی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، لەگەڵ یەکێکی سیبیریا، لەگەڵ یەکێکی ئێرە، جیاوازییان هەیە لە ڕووی فۆڕم و شێوەی کەللەسەر و ئێسقانەکان و هەڵکەوتەی جەستەییاندا.

ئنجا ئەو جیاوازییەش کە لە نێوان ئەو جۆرە مرۆڤانە: مرۆڤی ڕاوەستاو و مرۆڤی کارکەر و مرۆڤی عاقڵن و لەگەڵ ئەوەی ئێستادا، هەیە، هەر ئەوەندەیە کە ئێستا لە نێو جۆر و ڕەگەزەکانی مرۆڤەکاندا هەیە.

٤- (ئەرنست هیگل)، لە وتارێکیدا، لە دیسێمبەری ساڵی (١٩٠٨)ی زایینیدا بە ناوونیشانی: (ساختەکاریی لە وێنەی کۆرپەلەکاندا) بە ڕەسمیی ڕایگەیاند کە کاتی خۆی لە سەردەمێکدا کە داروین لە ژیاندا بووە، وێنەی ساختەی کۆرپەلەکانی دروستکردوە، کە ئێستاش لە زۆرێك لە کتێبەکاندا هەن، کۆرپەلەی بەراز و مەیموون و هی مرۆڤ و چی و چی، کە پێك دەچن، گوتوویەتی: هەموو

---

(١) کهنة الإلحاد، ص١٤٣-١٤٤.




ئەو وێنانە من دروستم کردبوون بۆ داروین، بۆ ئەوەی تەشجیعی بکەم لەسەر بیردۆزەکەی خۆی[١].

٥- مرۆڤی پلتنداون (Dildown mon) کە ئەمەش گوایە جۆرە مرۆڤێکە و" نزیکەی پێنج سەد (٥٠٠) نامەی دکتۆرای لەسەر نووسران، کەچی دوای چل (٤٠) ساڵ: زانرا کە ئەمە شوێنەوارێکی ساختەیە لەلایەن داروینیستێکی فێڵبازەوە دروستکراوە.

٦- ئەو تاکە خرێنە (ضِرْس)یە، کە لە ڕۆژئاوای (نبراسکا) دۆزرایەوە و داروینیستەکان گوتیان: ئەو ددانە هەڵگری سیفەتە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ و مەیموونە و، هونەرمەندە نیگارکێشەکان وێنەی خەیاڵیی ئەو ئاڵقە ونبووە (الحلقة المفقودة) یان کێشا، بگرە وێنەی ژن و منداڵەکانیشیان لەگەڵ کێشا! یانی: یەك ددانی خرێنەیان دۆزیوەتەوە، کەچی وێنەی خۆییان کێشاوە لەو خرێنەیەوە، دواتر وێنەی منداڵ و خێزانەکەشیان کێشاوە! دوایی گوتوویانە: ئەوە وێنەی ئەو ئاڵقە ونبووەیە کە لە نێوان مرۆڤ و مەیمووندایە، کەچی دوای پێنج (٥) ساڵ دەرکەوت کە ئەو جۆرە ددانە، هی جۆرە بەرازێکی دەشتەکیی ئەمریکاییی فەوتاوە، کە ئێستا نەماوە![٢].

تەماشای ئەو هەموو فێڵ و ساختەییە بکەن، کە لەلایەن داروینیستەکانەوە، کراوە!!

کەواتە: دەرکەوت کە داروینیزم و بیردۆزەی گەشەسەندن و پەرەستاندن، جگە لە ئەفسانەیەکی ڕەواج پێدراوی بە ناوی زانستەوە، هیچی دیکە نیە، بەڵام چونکە بەدیلەکەی، بەدیلی گەشەستاندن، بەدیلی داروینیزم (بە حیسابی ئەوان!) بریتیە لە بڕوا هێنان بە خوا (سبحانە وتعالی)، ئێستا لە ڕۆژئاوا مەسرەفێکی زۆری لێدەکرێ و بە زۆر دەسەپێنرێ و، هەر زانایەك دژی بوەستێ، لێدەدرێ و دەردەکرێ و

---

(١) كهنة الإلحاد، ص١٤٥.

(٢) كهنة الإلحاد، ص١٤٥.

دوور دەخرێتەوە، هەتا فیلمێك هەیە بە ناوی: دەركراوەكان (المطرودون)، هەموو ئەو زانایانەی كە ئیحتیرامی زانستەكەی خۆیان گرتوە، وەك نموونەم بە هەندێكیان هێنایەوە، گوتوویانە: ئەوە دەركەوت، هەر بە دانپێدانانی داروین خۆی، ئەوەی كە داروین گوتوویەتی: هەڵەیە، هەروەك خۆی گوتوویەتی: (هەر كاتێك دەركەوت كە ژیانداران كت و پڕ پەیدا دەبن، ئەوە بیردۆزەكەی من هەرەس دێنێ)، هەروەها گوتوویەتی: (هەر كاتێك دەركەوت كە زیندەوەرێك پەیدا بوو كە لێكدراوە (مركّب)ە و بەبێ گەشەكردنی پلە پلەیی دروست بووە، ئەوە بیردۆزەكەی من هەڵوەشاوەتەوە)، ئنجا ئەوانەش هەموویان دەركەوتوون.

كەواتە: هەر بە ئیعتیرافی داروین خۆی، بیردۆزەكەی هەڵوشاوەتەوە، بەڵام ئێستا لە ڕۆژئاوا (غرب) لەبەر ئەوەی هەر كە گوتت: داروینیزم هەڵەیە، دەبێ بڵێی: خوا ڕاستەوخۆ مرۆڤی دروست كردوە و، خوا ژیاندارەكانی دیكەی سەربەخۆ دروست كردوون و، لەیەكدییەوە نەهاتوون و پەیدا نەبوون، لەبەر ئەوەی داروینیزم بەدیلەكەی بریتیە لە دانهێنان بەبوونی خوادا و گەڕانەوە بۆلای خوا، ئنجا - وەك پێشتر باسمان كرد لە: (سەرگوزشتەی سەرهەڵدانی ئیلحاد لە ڕۆژئاوا و ئەورووپادا) و، دواتریش لە باسی: (گۆڕدرانی كتێبە ئاسمانییەكان) دا قسەی لێ دەكەین - لەبەر ئەوەی:

**یەكەم:** خوا (سبحانە وتعالی) بە شێوەیەكی ناڕاست و هەڵە وێنا كراوە.

**دووەم:** هەر كات دانیان بەبوونی خوادا هێنا، دەڵێن: پێی كلێساش دێتە پێشێ و پیاوانی ئاینیش دێتە پێشێ، بەو هەموو سرووت (طقوس) و ئەفسانە و بەزم و ڕەزمەوە، كە دایان هێناوە لە ئاییندا، بۆیە دەڵێن: با هەر لە بنەڕەتەوە نكووڵیی لە بوونی خوا بكەین! بەڵێ ڕۆژئاواییەكان خوا خوایان بووە ڕێچكە و بیردۆزەیەكیان دەست بكەوێ وەك: ئەڵتەرناتیڤ و بەدیل بۆ خواناسین و، بڕواهێنان بە خوا (سبحانە وتعالی)، تاكو لەو هەموو ئەفسانە و درۆ و ناهەقییەی كلێسا و، لەو هەموو بەڵا و گرفتارییانەی لە سەدەكانی نێوەڕاستدا، ئایینی شێوێنراوی مەسیحیی و یەهوودیی بەسەری هێناون و لەو هەموو ئەفسانەو ناڕاستییەی كە (كتێبی پیرۆز) گرتوویەتە خۆی، دەربازیان بێت.

## بیانووی نۆیەم: خوا چ پێویستیەکی بە بەندایەتیی مرۆڤەکان هەیە، کە داوای لێکردوون بیپەرستن؟

ئنجا وەك ئەنجامگیرییەك دەڵێن: مادام خوا پێویستیی بە بەندایەتیی مرۆڤەکان نیە و، بە ناوی ئایینیشەوە ڕاگەیەنراوە کە خوا داوای لە مرۆڤەکان کردوە بیپەرستن، کەواتە: ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوایەك نیە داوای لە مرۆڤەکان کردبێت بیپەرستن[1]؟!

بەر لەوەی بێینە سەر وەڵامی ئەم پرسیارە دەبێ پێنج ڕاستییان ڕابگەیەنین:

**١)- ڕاستیی یەکەم:** مادام خوا عزوجل بێنیازە لە پەرستنی بەندەکانی، بۆچی داوای لێکردوون بیپەرستن؟ ئەم پرسیارە، نە خواناسێکی ڕاستەقینە و، نە خوانەناسێکی جیددیی دەیکات:

أ- خواناس لەوە بە ئەدەبترە کە پرسیاری وا بکات، خوا دەناسێ و دەزانێ کە خوا بێنیازە، بەڵام کە فەرموویەتی: ئەی مرۆڤەکان! بەندایەتییم بۆ بکەن، مرۆڤەکان خۆیان پێویستییان بە بەندایەتیی کردن بۆ خوا (سبحانه وتعالى) هەیە.

**ب-** خوانەناسیش کە خوا نەناسێت، چۆن پرسیاری لە بارەوە دەکات؟!

**٢)- ڕاستیی دووەم:** کەسێك کە ئەم پرسیارە دەکات، نە خۆی دەناسێ و نە خوا دەناسێ، وەك گوتراوە: (الحكم على الشَّيءِ فرعٌ عن تصوُّره)، واتە: بڕیاردان لە بارەی شتێکەوە، لقێکە لە وێناکردنی.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە مرۆڤ ناتوانێ چییەتی خوا و، چۆنیەتی خوا، بە زات و سیفەتیەوە بزانێ، هەمیشە بەبێ گەڕانەوەی بۆ وەحیی، مامەڵەی

---

(١) بۆ نووسینی ئەم باسە لە نووسینێکی (د. سامي عامري) بە ناوونیشانی: (لماذا يطلب الله من البشر عبادته؟) سوودم بینینوە، بەڵام بە دەستکاریی و گۆڕینی زۆری خۆمەوە.

لەگەڵ خوادا هەڵە دەردەچێ، وەك خوا (سبحانه وتعالى) لە ئایەتی (٩٧)ی سوورەتی (الزمر)دا دەفەرموێ:

﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ مَطْوِيَّـٰتُۢ بِيَمِينِهِۦ ﴾.

واتە: وەك بۆ خوا شایستەیە، ڕێزیان لە خوا نەگرت، قەدری خوایان نەگرت، (خوایان بە بەرز و مەزن نەگرت)، لە حاڵێكدا كە لە ڕۆژی دوایی دا زەوی هەمووی لە چنگی خوادا دەبێ و ئاسمانەكانیش بەدەستی ڕاستی (یان: لەبن هەنگڵی ڕاستی دا) دەپێچرێنەوە.

بێگومان (بەكارهێنانی وشەكانی: (چنگ) و (دەستی ڕاست) لێرەدا بۆ تێگەیشتنی ئێمەیە، نەك ئێمە وامان بێتە زەینەوە كە خوای بێ وێنە و تاك ئەندامی هەن، چونكە: خوا (سبحانه وتعالى):

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾ الشورى: ١١، هەم لە زاتیدا و هەم لە سیفەتەكانیدا).

لێرەدا (أبو زید القیروانی) قسەیەكی جوان دەكات، دەڵێ: (لا يبلغ كُنْهَ صفته الواصفون، ولا يحيط بأمره المتفكرون، يعتبر المتفكرون بآياته، ولا يتفكرون في ماهية ذاته)[1].

واتە: وەسفكەرەكان ناتوانن چییەتی سیفەتی خوا (سبحانه وتعالى) دەرك بكەن و، بیركەرەوەكان ناتوانن كاری خوا (سبحانه وتعالى) دەورە بدەن، بەڵام ئەوانەی كە ڕادەمێنن، پەند لە ئایەتەكانی وەردەگرن و بیرناكەنەوە لە چییەتی زاتی خوا (سبحانه وتعالى).

بەڵێ كەسێك ئەم پرسیارە دەكات: نە خۆی بناسێ، نە خوا، واتە: لەبەر ڕۆشنایی وەحییدا خوای نەناسیوە، ئەگەرنا زات و ماهیەتی خوا هەر ناناسرێ، بەڵام لەبەر ڕۆشنایی وەحییدا، بایی ئەوەندەی ئێمە پێویستمانە و لە عەقڵی ئێمەوە دەچێ، خوا (سبحانه وتعالى) خۆی بە ئێمە ناساندوە.

---

(١) الرسالة" ص١١٧، أبو يزيد القيرواني.

**٣)- ڕاستیی سێیەم:** ئەم پرسیارە زادەی وێناکردنی خوایە لە شێوەی بەشەردا، وەك بتپەرستەکان (وثنیون) کردوویانەو دەیکەن، هەڵبەتە ڕۆژئاواش چ بە حوکمی پاشخانی ئایینیی، چ بە حوکمی پاشخانی فیکریی و فەلسەفیی، کە لە گریکەکان و لە ڕۆمانەکانەوە بۆی بەجێ ماوە، زۆر لەگەڵ بتپەرستیی و بە مرۆڤ چواندنی خوادا ئاوێتەیە!

**٤)- ڕاستیی چوارەم:** داواکردنی شتێك بەڵگەی ناتەواویی داواکەر نیە، کەسێك داوای شتێك لە کەسێك بکات، مانای ئەوە نیە کە نوقصانیی هەیە، بەڵکو ئەوە بەپێی جۆر و سروشتیی داواکارەکان دەگۆڕێ: جاری وا هەیە داواکردن بەخشش و چاکەیەکی ڕووتە، خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: لێم بپاڕێنەوە، تاکو بمانداتێ، ئەوەش مانای ئەوەیە بەخششە، هەروەها خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: بمپەرستن، بۆ ئەوەی ئازادبین و ئازابین و سەربەرز بین.

کەواتە: ئەوە کەرەمی خوایە و ڕەحمی خوایە لەگەڵ ئێمەدا، بۆیە هەڵەیە کە داواکردنی خوا لەبەندەکانی کە: بیپەرستن، بە پێویستیی وی، دابنرێ.

بۆ وێنە: کەسێك دێ بۆ لات، داوای شتێکت لێ دەکات، دەڵێی: ئێستا نیمە، بەڵام فڵان ڕۆژە وەرەوە بۆ لام، یان نامەیەکم بۆ بنووسە، بۆ ئەوەی بتدەمێ، کە دەڵێی: وەرەوە بۆ لام، داوای لێ دەکەی کە بێتەوە بۆ لات، بەڵام لەبەر ئەوە نیە کە پێویستییت پێیەتی.

**٥)- ڕاستیی پێنجەم:** ئەم پرسیارە پەیوەستە بە سیفەتەکانی خواوە (سبحانه وتعالى)، نەك بە بوونی خواوە (سبحانه وتعالى)، کەواتە: ئەم پرسیارە سوودێکی بۆ بابای مولحید نیە: (خوا بۆچی داوای لێکردووین، بیپەرستین؟) پەیوەندیی بە سیفەتی خواوە هەیە و، پەیوەندیی بە بوونی خواوە نیە (سبحانه وتعالى).

هەروەها پرسیارەکانی دیکەی هاوشێوەی:

**١)** خوا بۆچی دروستی کردووم؟.

**٢)** بۆچی خوا پرسی پێ نەدەکردم بەر لەوەی دروستم بکات؟.

٣) بۆچی خوا (سبحانه وتعالى) گەردوونی بە شێوەیەکی دیکە دروست نەکردوە، وەك (ڕیتشارد داوکینز)و هەندێك لە مولحیدەکان دەڵێن، ئەمانە هەموویان پەیوەندییان بە سیفەتەکانی خواوە هەیە، نەك بە بوونی خواوە (سبحانه وتعالى).

ڕۆژێك گەنجێك هات بۆ لام، ئەم وتووێژەمان لە نێوان دابوو: گوتی: مامۆستا! ئێمە لە ژیانی دنیادا نەخراوینە تاقیکردنەوەوە؟

گوتم: با.

گوتی: ئێمە لە پێشبڕکێیەکدا نین داخۆ کێمان دەچێتە بەهەشت و کێمان دەچێتە دۆزەخ؟

گوتم: با.

گوتی: باشە بۆچی خوا منی خستوەتە ئەو تاقیکردنەوەوە، کە نازانم لێی دەردەچم یان نا، بۆچی پرسی پێ نەکردم؟

گوتم: لەبەر ئەوەی کە تۆ خوا (سبحانه وتعالى) ناناسی و خۆیشت ناناسی، بۆیە ئەو پرسیارە دەکەی، ئاخر تۆ کە نەبیت، چۆن خوا پرست پێ بکات، پاشان ڕاستە خوا (سبحانه وتعالى) بمانەوێ، یان نەمانەوێ ئێمەی دروستکردوە، ئەوە ڕاستە، هەروەها ئێمەشی خستۆتە تاقیکردنەوەوە، بەڵام پێشی فەرمووین: ئاوا و ئاوا بکەن بۆ ئەوەی دەربچن و، پێی خۆشە ئێمە دەربچین، بۆیەش وەك لە (المسند)ی ئیمام ئەحمەددا هاتوە[1]، کە خوا (سبحانه وتعالى) لە ئادەمەوە هەتا خاتەم (عليهم الصلاة والسلام) سەد و بیست و چوار هەزار (١٢٤٠٠٠) پێغەمبەری ناردوە (عليهم الصلاة والسلام)، کە سێ سەدو پازدەیان (رسول)ن، یانی: خاوەنی بەرنامەی سەربەخۆی تایبەت، بوون، ئەوانی دیکەش شوێنکەوتووی ئەوانە بوون کە بەرنامەی سەربەخۆیان هەبووە.

---

(١) {عن أبي أمامة قال ابوذر: قلت يارسول الله! كم وفَّى عِدَّة الأنبياء؟ قال: مائة ألفٍ وأربعة وعشرون ألفاً، الرُّسل من ذلك: ثلاث مائة وخمسة عشر، جَمَّاً غَفيراً} رواه أحمد: ٢٢٣٤٢، والطبراني: ٧٨٧١، والحاكم: ٣٠٣٩، وقال: صحيح شرط مسلم وصَحَّحه الألباني.

ئنجا ئەگەر خوا (سبحانه وتعالی) سەد و بیست و چوار هەزار (١٢٤٠٠٠) پێغەمبەر (علیهم الصلاة والسلام) بنێرێ، دیارە زۆر بەتەنگ بەندەکانیەوەیەتی کە بیپەرستن و بەهەڵەدا نەچن، بەڵام بۆچی دروستیکردوون؟ بۆ خۆی دەزانێ، خوا (سبحانه وتعالی) دەفەرموێ:

﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأنبياء.

واتە: ئەو (خوا) لێی ناپرسرێ بۆچی وا دەکات! بەڵکو ئەوان لێیان دەپرسرێتەوە، بۆچی خوا لێی ناپرسرێ؟ چونکە خوا (سبحانه وتعالی) هیچ ئیشێکی بێجێ ناکات.

هەر بۆیەش ئەو پرسیارە هەم نیشانەی خۆ نەناسینە و هەم خوا نەناسینە.

ئنجا خوا بۆچی گەردوونی بەم شێوەیە دروست کردوە و بە شێوەیەکی دیکە دروستی نەکردوە؟ خوا هەر بۆ خۆی دەزانێ، یەکێ لە سیفەتە بەرزەکانی خوا (سبحانه وتعالی) بریتیە لەوە کە ویستێکی ئازادی هەیە و خواستێکی ڕەهاو بێسنووری هەیە.

هەروەها بەنسبەت مرۆڤیشەوە: تۆ ئەو کتێبەت بۆچی وا داناوە و، بۆچی وات دانەناوە؟ تۆ بۆچی ئاوادەڵێی و بۆچی واناڵێی؟ لەبەر ئەوەی تۆ ویستێکی ئازادت هەیە، ئنجا کە تۆ ویستێکی بچووکی کەم بایەخت هەیە، کە بایی ئەوەندە پێی تاقی بکرێیەوە، بەو ویستە ئازادەت بە کەیفی خۆت: بەرگ دەپۆشیت و، خواردنەوە و خواردن دەخۆی و، دێی و دەچی و، دەڵێی، ئایا خوای پەروەردگار بە ویستێکی بێسنوورەوە، ڕەخنەی لێ دەگیرێ: کە بۆچی ئاوای کردوە و ئاوای نەکردوە؟!

ئێستاش دێینە سەر وەڵامدانەوەیەکی کورت و پوختی ئەو پرسیارە: (خوا چ پێویستییەکی بە پەرستنی بەندەکانی هەیە، کە فەرمانی پێکردوون: بیپەرستن؟!) خوا پشتیوان بێ لە دە (١٠) خاڵدا وەڵامی دەدەینەوە:

**١- خوا کارزان و زانا و شارەزایە و، هیچ شتێکی بێ حیکمەت نیە:**

وەك لە سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ ﴾.

واتە: ئایا پێتان وایە ئێوەمان بە گاڵتە و بە هەوەنتە، (بەبێ حیکمەت) دروستکردوە و بۆ لای ئێمە ناگێڕدرێنەوە، بەرزیی بۆ خوای پادشای هەق، جگە لە ئەو هیچ پەرستراو نین، خاوەنی بارەگای پڕ ڕێز و حورمەتە.

**٢- خوا هیچ پێویستییەکی بە هیچ کەس و هیچ شتێك نیە، چونکە هەموویان خۆی بوونی پێداون و هەرچی هەیانە، خوا پێی بەخشیون:**

وەك فەرموویەتی:

١- ﴿ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَىٰ كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾ طه.

واتە: پەروەردگارمان ئەو زاتەیە، بوونی بە هەموو شتێك داوە، دواییش ڕێنمایی کردوە.

٢- هەروەها خوا لە سوورەتی (الذاريات)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ مَا أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ ﴿٥٧﴾ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ ﴿٥٨﴾ ﴾.

واتە: جند و مرۆڤم تەنیا بۆ ئەوە دروستکردوون بەندایەتییم بۆ بکەن، بژیوم لێیان ناوێ و نامەوێ خواردنم پێ بدەن، بێگومان هەر خوا بژیوەدەری بەهێزی پتەوە.

٣- هەروەها لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ ﴿٩٧﴾ ﴾.

واتە: هەر کەسێك بێبڕوا بێت، خوا بێنیاز و دەوڵەمەندە لە جیهانییان.







٤- لە سوورەتی (الإخلاص)یشدا دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢﴾.

واتە: بڵێ: خوا تاکە، جێی نیاز و بێ نیازە.

کەواتە: خوا (سبحانه وتعالى) پێویستیی بە هیچ شتێك و بە هیچ کەس نیە.

**٣- پەرستانی خوا (سبحانه وتعالى) بە هۆی شایستە بوونیەوەیەتی بۆ پەرستان:**

خوا بۆچی داوای لێکردووین بیپەرستین؟ لەبەر ئەوەی شایستەی ئەوەیە بەندایەتیی بۆ بکرێ.

(راغب الأصفهاني) لە پێناسەی (العبودية)دا دەڵێ: (العبودية: إظهار التذلُّل والعبادة أبلغ منها، لأنَّها غاية التذلُّل)[1]، واتە: (عبودية) بریتیە لە پیشاندانی ملکەچیی و، عیبادەت لەوە بەهێزترە، چونکە ئەوپەڕی ملکەچیی پێنیشاندانە.

(إبن القيم) دەڵێ: (العبودية: آخر مراتب الحب، يقال: عَبَدَه وتَيَّمه إذا مَلَكَهُ، وذلك لمحبوبه، وكمال العبودية تابع لكمال المحبَّة، وكمال المَحَبَّة تابع لكمال المحبوب في نفسه، والله (سبحانه وتعالى) له كمال المطلق التام في كل وجه...)[2].

واتە: (عبودية) بریتیە لە دوا قۆناغی خۆشەویستیی، دەگوترێ: بەندایەتیی بۆ کردو زۆری خۆشویست، وەختێك کە بوو بە موڵکی ئەو، هی خۆشەویستەکەی، ئنجا تەواوی بەندایەتیی شوێن تەواوی خۆشەویستیی دەکەوێ و، تەواوی خۆشویستنیش، شوێن تەواوی ئەو خۆشویستراوە دەکەوێ لە خودی خۆیدا، خواش (سبحانه وتعالى) خاوەنی تەواویی بێ ڕەهایە لە هەموو ڕوویەکەوە.

(بۆیە دەبێت ئەوپەڕی خۆشویستنی بۆ ئەنجام بدرێ و، ئەگەر ئەوپەڕی خۆشویستنیشی بۆ ئەنجامدرا، ئەوپەڕی بەندایەتییشی بۆ ئەنجام دەدرێ)[3].

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، راغب الأصفهاني، ص٥٤٢.

(٢) مدارج السالكين" ج٣" ص٢٨.

(٣) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.





با لەو بارەوە چەند دەقێك بە نموونە بێنینەوە:

١- خوا (سبحانه وتعالى) لەسەر زمانی بەندەكانی دەفەرموێ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥﴾.

واتە: بەس تۆ دەپەرستین، داوای یارمەتیش تەنیا لە تۆ دەكەین.

٢- پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {لاَ أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ}، (أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: ٤٨٦)، واتە: (خوايه!) من ستايشی تۆ، مەدح و پێهەڵا گوتنی تۆ، تەواو ناكەم، بەڵكو وەك بۆ خۆت ستايشی خۆتت كردوە. (ئەی پەروەردگارم! منيش ئاوا ستايشت دەكەم).

٣- لە سوورەتی (القصص)یشدا خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْأُولَىٰ وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ۝٧٠﴾.

واتە: خوا، جگە لە ئەو هيچ پەرستراو نين، ستايش بۆ كران لە يەكەم و لە دواميندا (لە دنيا و لە دوارۆژدا) بەس هی ئەوە و، بڕیاردان تەنیا هی ئەوە و، بەس بۆ لای ويش دەگێڕدرێنەوە.

٤- فەرموودەی ڕاست (صحيح)[1] لەسەر زمانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتوە، كە دەفەرموێ: {حَقُّ اللهِ عَلَى الْعِبَادِ أَنْ يَعْبُدُوهُ، وَلاَ يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا}، (أَخْرَجَهُ البُخَارِي برقم: ٧٣٧٣، وَمُسْلِم برقم: ٣٠)، واتە: مافی خوایە لەسەر بەندەكانی كە بيپەرستن و، هيچ شتێك نەكەنە هاوبەشی.

**٤- دەستەڵات و چاكەكاریی ڕەهای خوا، لەگەڵ پەرستراندا گونجاوە، مادام خوا خاوەنی ئەوپەڕی دەستەڵات و چاكەكارییە، شايستەيەتی كە بەندايەتییشی بۆ بكرێ و بشپەرسترێ:**

وەك خوا لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ۝٨٣﴾.

---

(١) واتە: لە ڕووی سەنەد (زنجيرەی ڕاوییەكان)ەوە.

واتە: ئایا جگە لە ئایین و بەرنامەی خوا، دەخوازن، لە حاڵێکدا کە هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، چار ناچار بۆ ئەو ملکەچە و، هەر بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە.

هەروەها لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾.

واتە: هەرچی چاکەیەك هەیە لە ئێوەدا، لە خواوەیە، دواییش ئەگەر ناڕەحەتیی و ئازار و زیانێکیشتان پێ گەیشت، هەر پەنا دەبەنە بەر وی و، لەبەر وی دەکڕووزێنەوە و دەلاڵێنەوە.

**٥- مرۆڤ زۆر پێویستیی بە پەرستنی خوا هەیە، هەم بۆ خۆناسینی، هەم بۆ تینوێتیی شکانی، هەم بۆ ڕێك وەستانی، هەم بۆ پارێزرانی، هەم بۆ زیاتر ئیمان دامەزرانی، هەم بۆ زیاتر ڕێزلێگیرانی لەلایەن خواوە (سبحانه وتعالى):**

کەواتە شەش هۆکار هەن کە مرۆڤ بەندایەتیی بۆ خوا بکات و هەموویشیان پەیوەندییان بە خۆیەوە هەیە:

**یەکەم:** بۆ خۆناسینی، خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الحشر) ئایەتی (١٩)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ﴾.

واتە: وەك ئەوانە مەبن کە خوایان لەبیرچوو، خوا خۆیانی لەبیر بردنەوە، مرۆڤ کە خوای نەناسی، خۆی لەبیر دەچێتەوە، نازانێ چییە و لە کوێ هاتوە و بۆ کوێ دەڕوات و، کێ هێناویەتی و، دەبێ چی بکات و، چۆن بکات؟! خۆی لێ ون دەبێ، بەڵێ مرۆڤ بە خوا ناسینەوە، خۆی دەناسێت.

**دووەم:** بۆ ئەوەی تینووایەتیی بشکێ، پێشتر باسمان کرد، کە مرۆڤ لە ناخیەوە تینوویە بۆ پەرستن و بەندایەتیی بۆ خوا، بۆیەش خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (البقرة) لەئایەتی (١٨٦)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ﴾.





واتە: هەر کاتێك بەندەکانم لەبارەی منەوە پرسیاریان لێکردی، من لێیانەوە نیزیکم.

**سێیەم:** بۆ ئەوەی مرۆڤ ڕێك بوەستێ لە ژیانی دنیایدا، ڕێك بێ، پاك بێ، چاك بێ، وەك لە سووڕەتی (التكوير)دا دەفەرموێ:

﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ ﴾.

واتە: ئەم قورئانە بیرخەرەوەیە بۆ هەموو جیهانییان، بۆ هەر کام لە ئێوە کە بیەوێ ڕاست بێ.

بەڵێ مرۆڤ بۆ ئەوە پێویستە بەندایەتیی بۆ خوا بکات، کە ڕێك و ڕاست بێت، مافی ئەوانی دیکە پێشێل نەکات، لە زاتی خۆیدا ڕاست بێ، دڵی ڕاست بێ، زمانی ڕاست بێ، ڕواڵەت و پەنهانی ڕاست بێ، لەگەڵ خوا و لەگەڵ خەڵکدا ڕاست بێ، بە هۆی بەندایەتیی بۆ خواوە، مرۆڤ ڕێك دەبێ و ڕاست دەبێ.

**چوارەم:** بۆ ئەوە کە پارێزراو بێ، مرۆڤ پێویستیی بە بەندایەتیی کردنی بۆ خوا (سبحانه وتعالى) هەیە، بۆ ئەوەی:

**أ-** لە شەیتان پارێزراو بێ،

**ب-** لە هەواو ئارەزووی خۆی پارێزراو بێ،

**ج-** لە خۆ لەدەست دان پارێزراو بێ.

وەك خوا (سبحانه وتعالى) لە سووڕەتی (الفاتحة) دەفەرموێ:

﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ ﴾.

واتە: بەس تۆ دەپەرستین و پشت هەر بە تۆ دەبەستین، داوای یارمەتیی تەنیا لە تۆ دەکەین.

**٢-** لە سووڕەتی (هود) ئایەتی (١٢٣)دا دەفەرموێ: ﴿ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ﴾.

واتە: تەنیا خوا بپەرستە و پشت بەس بەوی ببەستە.

بەڵێ لە ڕاستییدا بە هۆی بەندایەتیی کردن بۆ خواوە، مرۆڤ دەپارێزرێ و، پشتی قایم دەبێ و ناخلیسکێ و بەملاولادا ناکەوێ.

٣- لە سوورەتی (الحجر) ئایەتی (٤٢)دا خوا (سبحانه وتعالى) بە ئیبلیس دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَـٰنٌ ﴾.

واتە: بەندەکانی من، تۆ دەسەڵاتت بەسەریاندا نیە.

کەواتە: بۆ ئەوەی بە شەیتان بوێری و، لە بەرانبەریدا وەستاو و دامەزراو و، پارێزراو بی لە فێڵ و پیلانەکانی، دەبێ بەندایەتیی بۆ خوا بکەی.

**پێنجەم:** بە هۆی بەندایەتیی کردنەوە بۆ خوا، ئیمان زیاتر دادەمەزرێ:

خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ﴾.

واتە: ئەی خەڵکینە! ئەو پەروەردگارەتان کە ئێوەو ئەوانەی پێش ئێوەی وەدیهێناوە، بپەرستن، بەڵکو پارێزراو بن، بەڵکو ببن بە ئەهلی تەقوا، واتە: بە هۆی تەقواوە ئیمانتان زیاتر دادەمەزرێ و خواناسییتان مەحکەمتر دەبێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ ﴾ محمد.

واتە: ئەوانەی هیدایەتی خوایان وەرگرتوە، خوا هیدایەتیان بۆ زیاد دەکات و، تەقواشیان پێ دەبەخشێ.

تەقوا دەبێتە داینەمۆیەك، هەمیشە ئیمانەکەت گەرم و گوڕ و توند و پتەو ڕادەگرێ.

شەشەم: ئێمە بۆیە پێویستییمانە: بەندایەتیی بۆ خوا (سبحانه وتعالى) بکەین، تاکو ڕێزێك کە لەلایەن خواوە لێمان دەگیرێ، دەستەبەری بکەین و ئەو ڕێزە بۆ خۆمان زیاد بکەین، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ﴾ الحجرات: ١٣.

بەڕێزترتان لەلای خوا، پارێزکارترتانە، کەواتە: تاکو زیاتر پارێز بکەین، (واتە: بەندایەتیی باشترمان هەبێت بۆ خوا)، لەلای خوا ڕێز لێگیراوتر و خاوەن حورمەتتر دەبین.

**٦- خواپەرستیی مرۆڤ، ماددەی تاقیکردنەوەیەتی لەلایەن خواوە:**

خوا بۆیە بەندایەتیی بۆ کردنی خۆی لەسەر ئێمە پێویست کردوە، چونکە ئێمە بە هۆی ئەو خواپەرستییەوە، تاقی دەکرێینەوە، وەك لە سووڕەتی (الذاريات)دا دەفەرموێ:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾.

واتە: جند و مرۆڤم تەنیا بۆ ئەوە دروستکردوون، کە بمپەرستن.

هەروەها لە سووڕەتی (الملك)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ ﴾.

واتە: ئەو (خوا) ئەو زاتەیە کە مەرگ و ژیانی ڕەخساندوون، تاکو تاقیتان بکاتەوە: کامەتان کردەوەکەی باشترە؟

کردەوە باشتربوونەکەش بریتیە لە چاکتر بەندایەتیی کردن بۆ خوا.

کەواتە: خوا (سبحانه وتعالى) بۆیە بەندایەتیی بۆ کردنی، لەسەر ئێمە پێویست کردوە، چونکە بەوە تاقیمان دەکاتەوە و ئێمەشی بۆ تاقیکردنەوە لەسەر ئەو زەوییە داناوە، حیکمەتی بوونی ئێمە بۆ تاقیکردنەوەیە و بۆ جێنشینایەتیی خوا کردنە لەسەر زەوی.

**٧- خوای بەخشەر پێی خۆشە بەندەکانی ڕازو نیازی لەگەڵدا بکەن و، داواکارییان لێی هەبێ:**

ئەدی ئەوە نیە لە سووڕەتی (الفاتحة)دا، خوا لەسەر زمانی بەندەکانی دەفەرموێ:

﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾ ﴾.





واتە: تەنیا تۆ دەپەرستین و، داوای یارمەتی بەس لە تۆ دەکەین، بمانخە سەر ڕێی ڕاست، ڕێی ئەوانەی چاکەت لەگەڵدا کردوون، نەك لێ تووڕە بووان و، نەك گومڕا بووان.

هەروەها لە سووڕەتی (غافر)دا خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾.

واتە: پەروەردگارتان فەرمووی: لێم بپاڕێنەوە، وەڵامتان دەدەمەوە، ئەوانەی کە لە بەرانبەر بەندایەتیی مندا خۆیان بەزل دەگرن، بە بچووکیی و بەزەبوونیی دەچنە دۆزەخەوە.

خوا (سبحانه وتعالى) پێی خۆشە لێی بپاڕێینەوە، پێی خۆشە داوای لێ بکەین و، پێی خۆشە ڕاز و نیازی لەگەڵدا بکەین، لەبەر ئەوەی بۆ خۆمان وا باشە، نەك بۆ خوا (سبحانه وتعالى).

ئنجا با لەو بارەوە تەماشای فەرموودەیەکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکەین، کە فەرموودەیەکی قودسییە و لە خوای بەخشەری دەگێڕێتەوە، خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: {عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ (رضي الله عنه)، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله (صلى الله عليه وسلم) يَقُول: قَالَ اللهُ تَعَالى: قَسَّمْتُ الصَّلَاةَ بَيْنِى وَبَيْنَ عَبْدِى نِصْفَيْنِ، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ، فَإِذَا قَالَ الْعَبْدُ: ﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾، قَالَ اللهُ تَعَالى: حَمِدَنِي عَبْدِي، وَإِذَا قَالَ: ﴿ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾، قَالَ اللهُ تَعَالى: أَثْنى عَلَيَّ عَبدِي، فَإِذَا قَالَ: ﴿ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴾ ، قَالَ: مَجَّدَني عَبْدِي "وَقَالَ مَرَّةً: فَوَّضَ إِلَيَّ عَبْدِي" فَإِذَا قَالَ: ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾، قَالَ: هَذَا بَيْنِي وَبيْنَ عَبْدِي، وَلِعَبدِي مَاسَأَلَ، فَإِذَا قَالَ: ﴿ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ، صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ ﴿٧﴾ ﴾ قَـالَ اللهُ: هَذَا لِعَبْدِي وَلِعَبدِي مَـاسَأَلَ} (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٨٧٦)).

واتە: ئەبو هوڕەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: خوا (عَزَّ وَجَلَّ) دەفەرموێ: نوێژم لە نێوان خۆم و

بەندەکەم دا کردۆتە دووبەش و، بۆ بەندەی من هەیە، هەر شتێك لێم داوابکات، هەر کاتێ بەندە گوتی: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾، خوا دەفەرمویێ: بەندەکەم ستایشی کردم و، هەر کات گوتی: ﴿الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾، خوا دەفەرمویێ: بەندەکەم مەدحی منی کرد و، هەر کات گوتی: ﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾، خوا دەفەرمویێ: بەندەی من منی بە خاوەن شکۆو پایە بەرز وەسف کرد، (جارێك گوتی: ئیش و کاری خۆی بە من سپارد) و، کاتێ گوتی: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾، خوا دەفەرمویێ: ئەوە لە نێوان من و بەندەکەم دایەو، بەندەکەم هەر شتێکم لێ داوا بکات، بۆی دەبێ (واتە: مادام منی بەو سیفەت و وەسفانە وەسف کرد، لەوەو دوا هەر شتێکم لێداوا بکات دەیدەمێ و پێی دەبەخشم) ئنجا هەر کات بەندە گوتی: ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ، صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّين﴾، خوا دەفەرمویێ: ئەوە بۆ بەندەکەمە و، بەندەی من هەر شتێکم لێ داوا بکات، پێی دەبەخشم.

**٨- خواپەرستیی هۆکاری بەرزیی مرۆڤ و شایستە بوونی پاداشت درانەوەیەتی:**

خوا (سبحانه وتعالى) بۆیە لەسەری پێویستکردووین: بیپەرستین، تاکو بەرز بین و شایستەی ئەوە بین پاداشتمان بدرێتەوە، فەیلەسووفی مولحید (کویتن سمیث) (Queten Smith) دەڵێ:

(إِنَّنَا جِئْنَا مِنْ لاَ شَيء، بلاَ شَيء، لأَجْلِ لاَ شَيء)، واتە: ئێمە لە هیچەوە هاتووین و، بە هیچەوە هاتووین و، بۆ هیچ هاتووین.

بەڵام خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (القيامة)دا دەفەرمویێ:

﴿أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾﴾.

واتە: ئایا مرۆڤ پێی وایە ئاوا بەبێ تەکلیف و بەبێ لێپرسینەوە و ئەرك خرانە سەر شان، وازی لێ بهێنرێ (بەرهەڵدا بکرێ، بەبێ ئامانج و بەبێ حیکمەت)؟ ئەوەی خەیاڵێکی ئاوا بکات، خەیاڵەکەی بەتاڵە.

**٩- خواپەرستیی سەرچاوەی وزەو داینەمۆی ئیمانە:**

١- خوا (سبحانە وتعالی) لە سوورەتی (طه) ئایەتی (١٤)دا دەفەرموێ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤﴾.

واتە: نوێژ بەرپا بکە بۆ یادی من (یانی: بۆ ئەوەی خوات لەیاد بێ، نوێژ بەرپا بکە).

٢- هەروەها خوا لە سوورەتی (العنكوت)دا دەفەرموێ: ﴿ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ ٤٥﴾.

واتە: ئەوەی لە کتێب بۆت نێردراوە (بۆت سروش کراوە) بیخوێنەوە و نوێژ بەرپا بکە، بێگومان نوێژ قسەی ناقۆلا و کردەوەی دزێو قەدەغە دەکات و، یادی خوا گەورەترە و خوا دەزانێ چی دەکەن!

٣- پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) لە دوای هەر نوێژێکی فەرز ئەم زیکرەی دەخوێند: (كَانَ رَسُولُ اللهِ (صلی الله علیه وسلم) يَقُولُ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ حِينَ يُسَلِّمُ «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ نَعْبُدُ إِلاَّ إِيَّاهُ، لَهُ النِّعْمَةُ، وَلَهُ الْفَضْلُ، وَلَهُ الثَّنَاءُ الْحَسَنُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ، وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ»} (أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: ١٣٧٢).

واتە: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کاتێك لە دوای هەر نوێژێکی فەرز سڵاوی دەدایەوە، دەیفەرموو: (پاکیی بۆ خوا، تەنیایە و هیچ هاوبەشی نین، موڵك و دەستەڵات هەر هی ئەوە، ستایش تەنیا هی ئەوە و ئەو لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، لادان نیە (لە گوناهان) و هێز نیە (بۆ چاکە)، مەگەر بە خوا، جگە لەو هیچ پەرستراو نین، جگە لەو کەس ناپەرستین، خاوەنی هەموو چاکەیەکە و خاوەنی هەموو بەخششێکە و شایستەی هەموو مەدح و پێهەڵا گوتنێکە، جگە لەو هیچ پەرستراو نین، ملکەچیی خۆمان بۆ ئەو ساغ دەکەینەوە، هەرچەندە کافرەکان پێی قەڵس بن).

**١٠- مرۆڤ بە هۆی بەندایەتیی بۆ کردن و پەرستنی خواوە، خۆی لەگەڵ سەرجەم گەردوون و تێکڕای دروستکراوانی خوادا هاو ئاواز دەکات:**

وەك خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرمویٚ:

﴿أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾﴾.

واتە: ئایا جگە ئایین و بەرنامەی خوا، دەخوازن؟! لە حاڵێکدا هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، خۆش و ناخۆش، چار و ناچار، بۆی ملکەچن و، هەر بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە!

هەروەها لە سوورەتی (الحج)دا، خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرمویٚ:

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ﴿١٨﴾﴾.

واتە: ئایا سەرنج نادەی! هەر کەس کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هەروەها خۆر و مانگ و ئەستێرەکان و، چیاکان و درەخت و زیندەوەر و ژیاندارەکان و، زۆرێك لە خەڵکیش، زۆرێکیش سزایان لەسەر پێویست بووە، هەرکەسێکیش خوا ڕیسوای بکات (بە هۆی ئەوەوە کە بەندایەتیی بۆ خوا ناکات)، هیچ ڕێز لێگرێکی بۆ پەیدا نابیٚ، بەدڵنیایی هەرچی خوا بیەویٚ ئەنجامی دەدات.

**لێرەدا پرسیارێك دەکریٚ:**

ئایا داواکردنی خوا (سبحانه وتعالى) لە مرۆڤەکان کە بیپەرستن، جۆرێك لە خۆ بەرزکردنەوەو خۆ بە گەورە دانانی تێدانیە؟ لە حاڵێکدا مرۆڤ ڕازی نابیٚ، مەگەر سەروەری کائینات بیٚ و، گەورە بیٚ و، بۆ کەس ملکەچ نەکات؟!

**لە وەڵامـدا دەڵێین:**

١-نکووڵیی کردن لە گەورەیی و بەرزیی خوا، هۆکارەکەی بریتیە لە خۆبەزلگرییەکی بۆشی مرۆڤ، کە بە هۆی خۆنەناسین و خوا نەناسینەوە، بۆی پەیدابووە، یانی: ئەی مرۆڤ! چۆن نکووڵیی دەکەی لە گەورەیی خوا؟ لە زانیاریی خوا؟ لە دەستەڵاتی خوا؟ لە میهرەبانیی خوا؟ کە سیفەتەکانی خوا (سبحانه وتعالی) هەموویان بێ سنوورن! تۆ گەردیلەیەکی لە موڵکی خوادا!

٢- مرۆڤ دروستکراویی خوا و بژیوپێدراو (مرزوق)ی خوا و، ژیێنراوی خوا و، مرێنراوی خوا و .. هتد، پەیوەندیی نێوان خوا و مرۆڤ، پەیوەندییەکی هاوئاست نیە، بەڵکو پەیوەندیی نێوان سفر و ڕەهایە.

٣- ئیشکالی ناوبراو بە هۆی قیاسکردنی خواوە، لەسەر مرۆڤ، لە ڕووی زات و سیفەتەکانیەوە، پەیدا بووە، بەڵام ملکەچیی مرۆڤ بۆ خوا (سبحانه وتعالی)، ڕێز و حورمەتە بۆ خۆی و، سوود و بەهرەکەشی تەنیا بۆ مرۆڤ خۆیەتی، بە پێچەوانەوەش: ملکەچیی مرۆڤ بۆ جگە لە خوا، مایەی سووکیی و ڕیسوایی و زەبوونیی و مایەی گچکە بوونەوەیەتی.

٤- ڕیشەی ئەم بیر و ئیشکالەش، دیسان پەیوەستە بە ئایینی نەصرانییەتی شێوێنراو و تێکدراوەوە، کە پێی وایە خۆشەویستیی خوا بۆ مرۆڤ خوازیاری خۆ بەکەمگریی (تواضع)ی خوایە لەگەڵیدایە، بە بەڵگەی ئەوە کە تاقە کوڕەکەی خۆی فیدای مرۆڤەکان کردوە! بەڵام ئەوە ئەفسانەیەکە عەقڵ و فیترەت و واقیعی مێژوویی ڕەتی دەکاتەوە، بەڵێ خوا (سبحانه وتعالی) میهرەبانە لەگەڵ مرۆڤەکاندا، بەڵام خۆ بەکەمگریی (تواضع) نانوێنێ، خوا (سبحانه وتعالی) لەگەڵیان میهرەبان و بەبەزەییە و، لەگەڵیان بەخشندەیە، بەڵام خوا مەزن و بەرزە، ئەو بیرۆکەیەش کە گوایە: خوا تاقە کوڕ و جگەرگۆشەکەی خۆی فیدای مرۆڤەکان کردوە، بۆ ئەوەی لە گوناهەکانیان پاکیان بکاتەوە، یان لەو گوناهەی کە ئادەم کردی کە لە درەختی زانستی خوارد {بەپێی قسەی (پەیمانی کۆن) نەك بەپێی قسەی خوا}، لەوە نەجاتیان بدات، بەهۆی ئەوەوە کە عیسا (علیه

السلام) لەدار دەدرێ، ئەوە ئەفسانەیەكی پووچە، هەر شتێكیش لەسەر ئەفسانە بنیات بنرێ، پووچە! خوا (سبحانه وتعالی) ئاوا باسی خۆی دەكات:

﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الحشر.

واتە: خوا، ئەو كەسەیە كە جگە لەو هیچ پەرستراو نین، پادشایە، پاكە، سەلامەتیی و ئاشتییە، دڵنیاكارە، باڵا دەستە، زاڵە، مل پێكەچكارە، خۆبەگەورە زانە، پاكیی بۆ وی لەوەی دەیكەنە هاوبەشی.

بەڵێ گەورەیی ڕەها، تەنیا هی خوایە، ئنجا ئەگەر خوا خۆی بە گەورەیی ڕەها، وەسف بكات، ئەوە باسی خۆی كردوە، بەڵام خۆبەزلگریی لە مرۆڤەكان ناجوانە، چونكە مرۆڤەكان بچووكن، مرۆڤەكان لەگەڵ یەكدیدا یەك ئاستن و، لە بەرانبەر خواشدا دروستكراوی خوان.

كەواتە: مرۆڤ ئەگەر لە بەرانبەر خوادا خۆی بە گەورە بگرێ، هەر زۆر زۆر عەیبە و نوقسانییەكی گەورەیە، چونكە درۆیەكی گەورەی كردوە و، ئەگەر لە ئاست مرۆڤەكانیشدا خۆی بە گەورە بگرێ، هەر شتێكی خراپی كردوە، چونكە مرۆڤەكان هەموویان لەیەك ئاستدان و، هەموو مرۆڤەكانیش لە بەرانبەر خوادا، پەیوەندیی نێوانیان، پەیوەندیی نێوان دروستكراو و بەدیهێنەرە، پەیوەندیی نێوان سفر و ڕەهایە.

بۆیەش خوا (سبحانه وتعالی) لە فەرموودەیەكی قودسییدا دەفەرموێ: {الكِبْرِيَاءُ رِدَائِي وَالعَظَمَةُ إِزَارِي فَمَنْ نَازَعَنِي وَاحِداً مِنْهُمَا قَذَفْتُهُ فِي النَّارِ} (أَخْرَجَهُ إبن حبان برقم: ٥٧٦١، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده قوي)، واتە: گەورایەتیی پۆشاكمە و مەزنایەتیی كراسمە {(رداء) ئەوەیە كە دیوی دەرەوەی جەستەی پێدا دەپۆشرێ و، (إزار)یش ئەوەیە كە دیوی نێوەوەی جەستەی پێدا دەپۆشرێ}، هەر كەسێك ناكۆكیی لەگەڵمدا هەبێ، لەسەر یەكێك لەو دووانە، فڕێی دەدەمە دۆزەخەوە (چونكە شایستەی هیچیان نیە).

لە کۆتاییدا دەڵێین:

١- عیبادەت فەرزە، ٢- پێویستییەکە، ٣- چاکەی خوایە بەسەرمانەوە.

١- فەرز و پێویستە، چونکە خوا شایستەیەتی.

٢- پێویستیی و ئاتاجیی ئێمەیە، چونکە مرۆڤ بەبێ ئەوە بەختەوەر و ساغ و سەلامەت نابێ و دەبێتە کۆیلەی مرۆڤەکانی دیکەی وەك خۆی، یاخود شتەکانی دیکە، کە لە خوار خۆیەوەن، کە مانگ و خۆر و ئەستێرەو ڕووەك و بەرد و دار و بت و سەنەمەکانن.

٣- هەروەها خواپەرستیی و عیبادەت، نیعمەتی خوایە بەسەر ئێمەوە، چونکە عیبادەت سێبەرێکە مرۆڤ لە سایەیدا پشوو دەدات و، ئارام دەبێ و ئۆخژنی بۆ دێ، خۆی دەناسێ و، بەرچاو ڕوون دەبێ لە بارەی ڕابردووی و، ئێستای و داهاتوویەوە.

خوا (سبحانه وتعالى) بە لوتف و کەرەمی خۆی عیبادەت و بەندایەتیی خۆی لە ئێمەدا چاکتر بکات، تۆختر و بەهێزتر بکات، تاکو بەختەوەرتر بین، ئازاتر بین، ئازادتر بین، سەربەرزتر بین لە دنیا و دوارۆژدا.





## بیانووی دەیەم: شوێن کام ئایین و بەرنامەی خوا بکەوین و، کام خوا بپەرستین؟

بەڕێـــزان!

ئەمەش یەکێکە لە بیانووەکانی بەشێك لەوانەی ڕێی ئلیحاد دەگرنە بەر، گوایە هیچ ئایین و بەرنامەیەکی ڕاستی خوایان پێ شك نایەت، کە شوێنی بکەون، هەروەها بۆیان ڕوون نیە خوا (سبحانە وتعالی) کێیەو کامەیە؟ لە نێو ئەو هەموو پەرستراوانەدا، کە گەلانی دنیا لە ڕابردوودا پەرستوویانن و، ئێستاش دەیانپەرستن، نازانن کامیان ئەو خوا (سبحانە وتعالی) ڕاستەقینەیە کە تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەن و مشووخۆری گەردوون و کائیناتە؟!

بەڵام بێگومان ئەمیش زیاتر لە بیانووگرتن و پاساو هێنانەوە، دەچێ، ئەگەرنا کەسێك بەڕاستیی بیەوێ خوا بناسێ و، بڕوای پێ بێنێ و، لە ناخەوە بەرەو خوا بجووڵێ و داوای لێ بکات، بڵێ: ئەی خاوەنی ئەم گەردوونە! ئەی بەدیهێنەری من و دەوروبەرم و گەردوون! دەمەوێ بەرەو تۆ بێم، خۆتم پێ بناسێنە و لە خۆتم نزیك بخەوە! بێگومان خوا (سبحانە وتعالی) بەدەنگیەوە دێ و نائومێدی ناکات و، بەرەو سەرچاوەی هیدایەت دەستی دەگرێ.

بۆ وەڵامی ئەو دوو پرسیارەش:

١) شوێن کام ئایین و بەرنامەی خوا بکەوین؟

٢) کام خوا بپەرستین؟

قسەو باس زۆرن و، پێویستییان بە شوێنی تەرخانکراو دەکات، بەڵام ئێمە بە کورتیی و بە گوشراویی لە شەش (٦) بڕگەدا، هەوڵدەدەین وەڵامی ئەو دوو پرسیارە بدەینەوە، بەڵام سەرەتا دەبێ هەڵەیەك لە پرسیارەکەدا ڕاست بکەینەوە، ئەویش ئەوەیە، کە بەڵێ مرۆڤ بۆی هەیە بڵێ: شوێن کام ئایین و بەرنامەی خوا بکەوم، چونکە زیاتر لە ئایین و بەرنامەیەکی خوا، خۆیان دەنوێنن، وەك

دوایی باسیان دەکەین: ئەوانەی کە خۆیان پاڵدەدەنە لای خواو ئاسمان، ئەوە ئیسلامە، ئەوە جوولەکایەتییە، ئەوە نەصرانییەتە، ئەوە زەردەشتایەتییە، ئەوە صابیئایەتییە، کە ئەوانە هەر پێنجیان ناویان لە قورئاندا هاتوە:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ ﴾ الحج.

خوا دەفەرمویَ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ واتە: مسوڵمانان، ﴿ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ ﴾ واتە: جوولەکەکان، ﴿ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ ﴾ صابیئەکان، ﴿ وَٱلنَّصَٰرَىٰ ﴾ نەصرانییەکان، ﴿ وَٱلْمَجُوسَ ﴾ مەجووسییەکان.

دیارە (مەجووس) ناوونیشانی ئەوانەیە کە خۆیان بە شوێنکەوتووی زەردەشت و، خۆیان بە پەیڕەوانی ئاڤێستا، کتێبە پیرۆزەکەی مەجووسییان، زەردەشتییان، لە قەڵەم دەدەن.

بەڵیَ ئەوە لەجێی خۆیدایە بڵێی: ئایا شوێن کام بەرنامەی خوا بکەوم؟ بەڵام ئەوەی کە پێویستیی بە ڕاستکردنەوەیە و، هەڵەیەکی زۆر زەق و بیَ مانایە، ئەوەیە کە بڵێی: کام خوا بپەرستم؟ چونکە خوا (سبحانه وتعالی)، بە کوردیی دەڵێین: (خوا)، بە فارسیی دەگوتریَ: (خُدا)، بە ئینگلیزیی دەگوتریَ: (God)، بە عەرەبیی دەگوتریَ: (أللە)، هەروەها لە هەموو زمانەکاندا ناوێك هەیە بۆ ئەو زاتەی کە مرۆڤەکان بڕوایان وایە، ئەو تاکە بەدیهێنەر و پەروەردگارو خاوەن و مشوورخۆری کەون و کائیناتە و، خوا هەر یەکێکە (سبحانه وتعالی)، هەر بۆیەش لە زمانی عەرەبییدا وشەی (أللە)، نە دەکرێتە دووان، نە کۆش دەکرێتەوە {(أللە) (نە (تثنیة) دەکریَ، نە (جمع)یش دەکریَ}، چونکە یەك خوا هەیە، بەڵام (إلە) کە زۆر کەس وشەی (إلە) و (أللە) تێکەڵ دەکەن، زۆر لە وتاربێژەکان و بانگخوازەکانیش گوێبیست بووم، لێیان تێکەڵ دەبن، بۆ وێنە: کاتێك وشەی (لا إله إلا الله) مانا دەکەن، کە مانا ڕاستەکەی ئەوەیە: (هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوا)، بەڵام ئەوان دەڵێن: (بێجگە لە خوا هیچ خوایەك نیە)، وشەی (أللە) یانی: خوا، بەڵام (إلە) واتە: پەرستراو، دەگونجیَ

پەرستراو خوا بێ، کە پەرستراوی بە هەقە، دەشگونجێ جگە لە خوا بێ، ئنجا کە دەگونجێ جگە لە خوا بێ، دەگونجێ دووان بن و، دەگونجێ سێ بن و، دەشگونجێ زیاتر بن.

کەواتە: (إله)، (إلهان)، (آلهه)، (إله) دەکرێتە دووان و دەکرێتە کۆش، چونکە ئەو شتانەی کە خەڵك دەیانپەرستێ، دەگونجێ یەك بێ، کە خوای بە هەقە، دەگونجێ دووان بن و هاوبەش بۆ خوا دابنرێ و، دەگونجێ سێ بن، وەك نەصرانییەکان سێیان دەپەرستن، هەروەها هیندۆسییەکان و، زۆر لە خاوەن دینە سەر لێ تێك چووەکان، بڕوایان بە سێکوچکە (ثالوث) هەبووە، هەروەها دەشگونجێ زۆر بن، وەك عەرەبەکانی سەردەمی نەفامیی: سێسەد و شەست (٣٦٠) بت و سەنەمی پەرستراویان لە کەعبەدا دانابوون.

بۆیە هەڵەیە بگوترێ: کام خوا بپەرستین؟ بەڵکو دەبێ بگوترێ: کام پەرستراو (إله) بپەرستین؟ ئنجا ئەگەر خوا بپەرستین، ئەوە پەرستراوی بە هەقە، بەڵام دەگونجێ کەسانێك هەبن دان بە بوونی خواش دا بێنن و خوا نەپەرستن و، دەشگونجێ کەسانێك هەبن، دان بە بوونی خوادا بێنن، بەڵام لەگەڵ خوادا شتی دیکەش بپەرستن، بەڵام ئەوەی کە هەر دان بە بوونی خوادا نەهێنێ، ئەوەیە پێی دەگوترێ: خوانەناس (ملحد).

کەواتە: خوا (أَللە) (سبحانە وتعالى) جیایە لە پەرستراو (إِلَه) بۆیە هەڵەیە بڵێی کام خوا؟ چونکە خوا لە یەکێك زیاتر نیە، تەنانەت - وەك دوایی باسی دەکەین - مەجووسییەکانیش و یەزیدییەکانیش پێیان وا نیە: دوو خوا هەبن، دەڵێن: یەك خوا هەیە، ئنجا یەزیدییەکان بەوەی کە لە بەرانبەر خوادایە، پێی دەڵێن: (طَاوس مَلَك)، کە هەر ئیبلیسە، مەجووسیەکانیش پێی دەڵێن: (ئەهریمەن)، کە ئەویش دەڵێن: هەر خوا دروستیکردوە، ئنجا کە هەر دروستکراوی خوا بێ، کەواتە: یەك خوا هەیە، تەنانەت ئەوانەش کە بڕوایان بە دووانەتیی (ثنوية) هەیە، ئەوانیش دەڵێن: ئەوەی دووەم دروستکراوی خوای پەروەردگارە.

ئنجا با بێینە سەر ئەو شەش (٦) بڕگانەی کە دەمانەوێ وەڵامی ئەو دوو پرسیارەیان تێدا بەرجەستە بکەین:







برگەی یەکەم: مرۆڤ بە زگماك خواناس و دیندارە، بۆیە هەمیشە لە گەڕان و پشكنیندا بووە لە بارەی خواوە (سبحانه وتعالی)، بۆ زانینی چۆنیەتی بەندایەتیی بۆ کردنی و ڕازییکردنی و خۆ لێ وەنیزیك خستنی:

وەك خوا لە سوورەتی (الروم)دا، دەفەرموێ: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ (٣٠) ﴾ الروم.

واتە: ڕووی خۆت ڕێك ڕاگرە، بە پاكیی بەرەو ئایین، (خۆت ڕێكخە لەگەڵ ئایین)، ئەو ئایینەی هەمان ئەو زگماك و خوارسكەیە كە خوا خەڵكی لەسەر سروشتاندوە، گۆڕین نیە بۆ دروستكراوی خوا، ئا ئەوە ئاینی ڕێك و ڕاستە، بەڵام زۆربەی خەڵكی نایزانن.

واتە: ئەو ئایینە ڕێك و ڕاستەی، كە خوا ناردوویەتی، بەپێی ئەو زگماك و خوارسكەیە كە خوا مرۆڤی لەسەر سروشتاندوە، بۆیە فیطرەت و شەریعەت، خوارسك و ئایین، دوو ڕووی ڕاستییەكن، ئەو ئایین و بەرنامەیەی خوا ناردوویەتی، وەك خوا دەفەرموێ: ئەو ئایینە ڕێك و ڕاستە، ئەگەر خەڵك بزانن، ڕێك بەپێی زگماك و سروشتێكە كە خوا خەڵكی لەسەر سروشتاندوە، بەڵام زۆربەی خەڵكی ئەو ڕاستییە نازانن، ئنجا چ خۆیانی لێ گێڵ بكەن، چ لەبەر ئەوە كە ئایینیان لێ شێوێنراوەو لێ تێكدراوە، نەیزانن.

هەڵبەتە سەرجەم ئەو بیردۆزانەی ویستوویانە، دیاردەی خواپەرستیی و دینداریی بە شتێكی دیكەی جیا لەو هەستە خوارسك و زگماكە بنەڕەتییەی ناخیی مرۆڤ، تەفسیر بكەن، هەموویان بە هەڵەدا چوون، وەك لە كتێبی: (خواناسیی، ئایین، ئیمان: ڕاستییەكانی ئیسلام دەدرەوشێنەوە و ئەفسانەكانی ڕێچكەكان دەپووچێننەوە)، لەوێدا باسم كردوە كە:

١) هەندێکیان بیردۆزەی ترسیان خستۆتە ڕوو، بۆ پەیدابوونی خواپەرستیی، گوایە: مرۆڤ لە ئەنجامی ئەوەدا کە لە دیاردە سروشتییەکان ترساوە، لە لافاو و هەورە تریشقەو، باران و، باو...هتد ترساوە، بۆیە خوای پەرستوە!

دەڵێین: بەڵێ مرۆڤ لەو شتانە ترساوە و بە هەڵە ئەوانەشی پەرستوە، بەڵام ڕیشەی خواپەرستیی، خواناسیی، دینداریی، ناگەڕێتەوە بۆ ئەو شتانە و، ئەوە جۆرێك بووە لە لادان لەو ڕاستە شەقامەی، لەو فیطرەت و خوارسکەی، خوا مرۆڤی لەسەر داناوە، کە لە ناخەوە بۆ خوا تینوو و عەوداڵە.

٢) هەندێکی دیکە باسی بیردۆزەی نەزانییان کردوە، گوتوویانە: مرۆڤ لەبەر ئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارانەی نەزانیوە:

هەورە تریشقە بۆچی ڕوودەدا؟

لافاو بۆچی دێ؟

باران بۆچی دەبارێ؟

بەفر و تەرزە بۆچی دەبارن؟

سەرما بۆچی دێ؟

گەرما بۆچی دێ؟

هەروەها دڕندەکان و...هتد، لە ئەنجامی ئەوەدا کە نەزانیی هەبووە بەرانبەر بەو شتانە، بۆیە ئەوە پاڵی پێوەناوە، پەنا بباتە بەر پەنهان (غیب) و خواپەرستیی!

بەڵام بە تەئکید ئەوەشیان وانیە، بەڵێ، مرۆڤ کاتێك کە نەیزانیوە ئەو شتانە چۆن ڕوودەدەن! لەبەر ئەوەی باش خوای نەناسیوە، ڕەنگە ئەو شتانەی بە پیرۆز گرتبن و، قوربانیی بۆ سەر بڕیبن و، ویستبێتی لە شەڕو خراپەیان ئەمین و دڵنیا بێ، بەڵام ئەمە ئەوەمان بۆ تەفسیر ناکات، کە هاندەری خواپەرستیی لە دەروونی مرۆڤدا، بریتی بێ لە نەزانیی، یان ترس، بە بەڵگەی ئەوە، کە دوایی خەڵك ترسیشی نەماوە لەو شتانە و، دەشزانێ چۆن ڕوو دەدەن، بەڵام خواش هەر دەپەرستن!

٣) هەروەها هەندێكی دیكەیان، دیاردەی خواپەرستیی و دینداریيان، بە هاندەرو پاڵنەری جینسیی لێك داوەتەوە، وەك (فرۆید) و هاوبیرانی گوتوویانە.

٤) هەندێكی دیكەشیان گوتوویانە: دینداریی و خواپەرستیی، بەرهەمی عادەت و نەریتی كۆمەڵگایە، وەك: (ئیمیل دورکایم)ی كۆمەڵناس گوتوویەتی.

٥) هەروەها هەندێكیان بە هۆكاری ئابووریی تەفسیریان كردوە، وەك (ماركس) گوتوویەتی.

بەڵام لە ڕاستییدا ئەو بیردۆزانە هەموویان باسی لادانەكانی مرۆڤیان كردوە، لە خواپەرستیی دا، كاتێك كە مرۆڤ لای داوە، لە ڕاستە ڕێی خوا پەرستیی، گیرۆدەی پەرستنی غەیری خوا بووە، ئنجا چ بە هۆی ترسەوە، چ بە هۆی نەزانییەوە، چ بە هۆكاری جینسیی، یان بەهۆی كەوتنە ژێر كاریگەریی خراپی كۆمەڵگا، یان بەهۆی فاكتەری ئابوورییەوە، دەگونجێ مرۆڤ بەولاو لادا لایدابێ، بەڵام ئەمە ئەوەمان بۆ تەفسیر ناكات، كە هاندەری مرۆڤ بۆ خواپەرستیی لە ناخەوە، بریتی بێ لەوانە.

بەڵكو ئەو حاڵەتانە زیاتر لە كاتی لادانی مرۆڤ لە فیطرەتی خۆی و، هەڵگەڕانەوەی لەو سروشت و زگماكەی خوا لەسەری سروشتاندوە، پەیدابوون.

بڕگەی دووەم: بە هەڵەداچوونی مرۆڤ لە چۆنیەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ خوادا، خاڵی بێهێزی مرۆڤ بووە و، حاڵەتی پەرستنی سروشت و دیمەن و دیاردە سروشتییەکان، پاشان بتپەرستیی، لێرەوە پەیدا بووە:

بەڵێ، خاڵی بێهێزی مرۆڤ ئەوە بووە کە لە ناسینی خوادا (سبحانه وتعالى) بەهەڵەدا چووە و، لە مامەڵەکردن لەگەڵ خوادا بە هەڵەدا چووە، لێرەوە دیاردەی پەرستنی دیاردە سروشتییەکان و، سەرەنجام بتپەرستیی سەری هەڵداوە.

هیچ کەس ناتوانێ نکووڵیی لەو ڕاستییە بکات، کە هەر لە سەرەتای مێژووی بەشەرەوە تا ئێستاش، مرۆڤ لە مامەڵەی لەگەڵ خوادا، تووشی هەڵەو لادانی زۆرو جۆراو جۆر بووە، کە لە پەرستنی دیاردە سروشتییەکان و بتپەرستییدا بە گشتی، خۆی دەنوێنێ، بەڵام ئەوە کاتێك بووە کە مرۆڤ دەستی نەگەیشتۆتە سەرچاوەی ڕوون و زوڵاڵی وەحیی، کە تاکە سەرچاوەیەکە خوامان (سبحانه وتعالى) بە شێوەیەکی ڕێك و ڕاست پێ بناسێنی و، ڕێی بەرەو خواچوونیشمان بۆ تەخت و ئاچووغ بکاو، بەرچاومان لەبارەیەوە ڕوون بکات.

ئنجا ئەوەی مێژوو بۆی تۆمار کردووین، کە مەرجیش نیە، هەمووی ڕاست بێ، ئەوەیە کە هەر کام لەو گەل و کۆمەڵگایانەی ئێستا باسیان دەکەین، بە جۆرێك لە جۆرەکان بە هەڵە پەرستنیان بووە، بە هەڵە پەرستنیان بۆ خوا (سبحانه وتعالى)، یاخود بۆ جگە لە خوا بووە، ئەمەش هەر چاوپێداخشاندنەوەیەکی مێژووی مرۆڤایەتییە[1]، لەو بارەوە و پێشتریش بە بۆنەیەکی دیکەوە ئاماژەیەکمان

-----------------------------

(١) بۆ ئامادەکردنی ئەم (چاوپێداخشاندنەوەیەی مێژووی مرۆڤایەتیی) بە پلەی یەکەم سوودم لە کتێبی: (البحث عن الحقيقة الكبرى) ص١٤١ - ٢٥٤، وەرگرتوە. شایانی باسیشە ئێمە پێشتر - لە بەشی یەکەمدا - وردتر باسی فەلسەفە و فەیلەسووفەکانمان کردوە، ئاماژەشمان بەسەرچاوەکان کردوە، بەڵام لێرە تەنیا مەبەستمان ئاماژەکردن بوو بە هەڵوێستی گەلانی پێشوو لە بارەی خوا ناسییەوە.

پێداوە، بەڵام لێرەدا لە بواری خواناسین و خواپەرستیی و مامەڵە لەگەڵ خوادا، قسەی لە بارەوە دەکەین:

## یەکەم: ڕۆمانییەکان:

ڕۆمانییەکان زیاتر لە سی هەزار (٣٠٠٠٠) پەرستراو (إله)یان هەبووە، بەڵام گوتوویانە: یەك زات هەموو شتێکی هێناوەتە دی و خاوەن و پەروەردگارە، ئەو شتانەی دیکەشیان کە پەرستوە، بۆ ئەوەیان بووە ئەو پەرستراوانە لە خوایان نیزیك بخەنەوە، وەك خوا لە سوورەتی (الزمر) ئایەتی (٣)دا لەسەر زمانی موشریکەکان دەفەرمویٚ:

﴿مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ﴾.

واتە: تەنیا بۆ ئەوە دەیانپەرستین لە خوامان نیزیك بخەنەوە.

ڕیشەو بناغەی هاوبەش بۆ خوا دانان (شرك) ئەوە بووە کە ئەو شتانە پەرستراون، تاکو لە خوایان نیزیك بخەنەوە و، شەفاعەتیان بۆ بکەن لە لای خوا.

## دووەم: یۆنانییەکان:

یۆنانییەکان پەرستراوێکی گەورەیان هەبووە، گەورەی پەرستراوەکانیان بووە، بە ناوی (زیوس) و، یۆنانییەکان بۆ هەر شتێك پەرستراوێکیان هەبووە بۆ وێنە: (ڤینۆس) پەرستراوی جوانیی بووە، فلاّن شتە، پەرستراوی فلاّن شت بووە، {ئەوان وشەی (خوا)یان بەکارهێناوە و لە ڕاستییدا هەڵە بوون، دەبووایە بڵێن: پەرستراوی فلاّن شت، یان پەروەردگاری فلاّن شت، خاوەنی فلاّن شت}[1]، پێیان وا بووە شوێنی پەرستراوەکانیان چیای (ئۆلۆمبیا)یە، ئەویٚ هەم چەقی

---

(١) دەشگونجیٚ ئەوان هەر وشەی پەرستراو (إله)یان بۆ بەکارهێنابیٚ و، بە هەڵە تەرجەمە کرابیٚ و لە جیاتی وی، وشەی (خوا) بەکارهاتبیٚ.





(زیوس)ە، کە گەورەی پەرستراوەکانیان بووە، هەم هی وردە پەرستراوەکانی دیکەیان، کە لە بەردەستی (زیوس)دا بوون!!

## سێیەم: فەیلەسووفەکانی پێش سوقراط:

ئێمە نۆ (٩) کەسیانمان لەوانە بە نموونە هێناونەوە:

١- (طالیس) کە لە ساڵی (٥٤٨)ی پێش زاییندا مردوە، (ئاو)ی پەرستوە، بەڵام کە (ئاو)ی پەرستوە، مەرج نیە وای زانیبێ: ئاو بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنە، بەڵام ئاوی بە پیرۆز گرتوە و، ڕەنگە ئاوی بە سەرچاوەی هەموو خێرو خۆشیی و چاکەکان دانابێ.

٢- (ئینکسیمانس)، کە لە ساڵی (٥٣٥)ی پێش زاییندا مردوە، (هەوا)ی پەرستوە، پێی وابووە (هەوا) خەمخۆرو مشوورخۆری ژیانە.

٣- (فیثاغورس)، کە لە سەدەی شەش (٦)ی پێش زاییندا مردوە، ژمارە (عدد)ی پەرستوە.

٤- (هیرەقلیطس)، کە لە ساڵی (٥١٠)ی پێش زایین لە دایك بووە، لە ساڵی (٤٨٠)ی پێش زایین دا کۆچی دوایی کردوە، تەمەنی سی (٣٠)ساڵ بووە، (ئاگر)ی بە پەرستراو داناوە.

٥- (ئەنکسیمەندەرس)، کە لە ساڵی (٦١٠)ی پێش زاییندا لە دایك بووە، لە ساڵی (٥٤٧)ی پێش زاییندا کۆچی دوایی کردوە، ئەویش دانی بە بوونی خوا داهێناوە، وەك زاتێکی سەرووی سروشت، بەڵام زەویشی بە جۆرێك لە جۆرەکان پەرستوە، یاخود بە شتێکی پیرۆزی داناوە.

٦- (بارمیندس)، کە لە ساڵی (٥١٥)ی پێش زاییندا کۆچی دوایی کردوە، خواناس بووە و تەنیا خوای پەرستوە.

٧- (ملیسوس)، کە لە ساڵی (٤٩٠)ی پێش زاییندا مردوە، ئەویش بەهەمان شێوە خواناس و خواپەرست بووە.

٨- (ئیمبیدوقلیس)، کە لە ساڵی (٤٥٠)ی پێش زاییندا مردوە، هەر چوار توخمەکەی بە سەرچاوەی هەموو شتێك داناون: (ئاو، هەوا، ئاگر، گڵ).

٩- (دیموقریطیس)، کە لە سەدەی پێنج (٥)ی پێش زاییندا مردوە، ئەو، وەك مارکس نووسیویەتی: یەکەمین ماتریالیست بووە و، بڕوای وا بووە کە ماددە سەرچاوەی هەموو شتێکە و گوتوویەتی: ماددە لە یەکەی زۆر بچووك دروست دەبێ و، وشەی ئەتۆم (Atom)، واتە: ئەو بەشەی کە بەش ناکرێ، (الجزء الذي لا یتجزء)، دەڵێن بۆ یەکەم جار (دیموقریطیس) ئەو وشەیەی بەکارهێناوە.

ئنجا ئەمانە یان هەر خوانەناس بوون، یان لە ناسینی خوادا بە هەڵەدا چوون و (خوا)یان بە یەکێك یان زیاتر لە دیاردە سروشتییەکانیان داناوە.

## چوارەم: سوکڕات و فەیلەسووفەکانی دوای خۆی:

شایانی باسە مەبەستم لە فەیلەسووفەکانی دوای سوکڕات بە پلەی یەکەم: هەر کام لە ئەفلاطوون و ئەرِەسطۆیە.

**١- سوکڕات:** لە ساڵی (٤٧٠)ی پێش زاییندا لە دایك بووە، لە ساڵی (٣٩٩)ی پێش زاییندا، ئیجبار کراوە لەسەر خواردنەوەی ژەهر و مردوە.

سوکڕات لە بارەی خواوە هەڵوێستێکی ژیرانە و پەسندی بووە و گوتوویەتی: خوا یەکە و پەرستراوەکانی یۆنانییەکانی {ئەو هەموو پەرستراوانە کە گوتوویانە: شوێنەکەیان چیای (أولومبیا)یە}، ڕەفز کردوون، هەروەها قوربانیی بۆ کردنیشیانی ڕەفز کردوە، ئیدی لەسەر ئەوە خەڵکەکە گوتوویانە: سوکڕات مێشکی گەنجەکانمان تێك دەدات، هەڵبەتە (سوکڕات) (باس نەکراوە، پێغەمبەر بوو بێ)، بەڵام وا دیارە خواناس و خوا بەیەکگر (موحدٌ) بووە و، ڕەنگە پەیامی هەندێ لە پێغەمبەرانی پێ گەیشتبێ، بەڵام وەك چۆن هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە نێو کۆمەڵگاکانی خۆیاندا کەمینە و چەوسێنراوە بوون، سوکڕاتیش لە تەمەنی حەفتا و یەك (٧١)ی ساڵییدا، ناچار کراوە ژەهر بخواتەوە، ڕێشی هەبووە ڕا بکات، بەڵام گوتوویەتی: نا، وەك ڕێزگرتن



لە بڕیاری دادگا و کلتووری شارەکەم، ناڕۆم، هەڵبەتە هەڵوێستەکەی: ڕێز گرتن بووە لە کەسایەتیی خۆیشی، کە ئامادەیە باج بدات لەسەر ئایینەکەی و بۆچوونەکانی و، سەرەنجام ژەهرەکەی خواردۆتەوەو مردوە.

**٢- ئەفلاطوون:** لە ساڵی (٤٢٧)ی پێش زایینذا لە دایك بووە و لە ساڵی (٣٤٧)ی پێش زایین کۆچی دوایی کردوە و، قوتابی سوکراتیش بووە، خاوەنی کتێبی: (کۆماری ئەفلاتوون)ە، کە کتێبێکی زۆر ناوداره، لە بارەی خواوە گوتوویەتی: خوا (سبحانه وتعالی) لە جیهانی ئایدیا (مثال) دایە، واتە: لە سەرووی ئەم دیاردە سروشتییانەوەیە و، بابایەکی خواناس بووە، بەڵام ئەو پێی وا بووە - وەك پێشتریش باسمان کرد - هەرچی کە هەیە لەسەر زەوی، هەمووی وێنەیەکی هەیە لە جیهانی ئایدیا (عالَمُ المُثل)دا، کە مەبەستی پێی ئەوە نەبووە، خەیاڵ بێ، بەڵکو مەبەستی پێی جیهانی ڕووح و پەنهان و نابەرهەست (لامحسوس) بووە.

**٣- ئەڕەسطۆ:** ئەویش قوتابی (ئەفلاطوون) بووە و لە ساڵی (٣٨٤)ی پێش زایینذا لە دایك بووە و لە ساڵی (٣٢٢)ی پێش زایینذا کۆچی دوایی کردوە، (ئەڕەسطۆ) کتێبی زۆرن، لە بارەی خواوە پێی وابووە، کە خوا جیهانی دروستکردوە و، وەك چۆن سەعاتێك قورمیشی دەکەی، وەگەڕی خستوە و لێی گەڕاوەو وازی لێ هێناوە! پێی وابووە خوا زۆر لەوە مەزنتر و بەرزترە، کە گرنگیی بە دروستکراوەکانی بدات و بیریان لێ بکاتەوە و، ئاگای لێیان بێ، پێی وا بووە مەقام و پایەی خوا لەوە بەرزترە، کە خۆی بەو وردە شتانەوە سەرقاڵ بکات!

کە بەدڵنیایی ئەوەش بۆچوونێکی هەڵەیە، چونکە خوا (سبحانه وتعالی) دروستکراوەکانی دروست کردوون و مشووریشیان لێ دەخوات، ڕێنماییشی کردوون و ئاگاشی لێیانە، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا فَوۡقَكُمۡ سَبۡعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلۡخَلۡقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ المؤمنون.

واتە: لە سەرووی ئێوەوە حەوت چینی ئاسمانمان دروست کردوون و، ئێمە لە دروستکراوەکانی خۆمان بێ ئاگا نین، ئاگامان لێیانە، مشووریان لێ دەخۆین.





ئەگەر خوا (سبحانه وتعالى) یەك چركە دروستكراوەكانی خۆی فەرامۆش بكات، هەموویان لە بەین دەچن، هەر بۆیەش لە (آية الكرسي)دا، كە ئایەتی ژمارە (٢٥٥)ی سوورەتی (البقرة)یە، خوا عزوجل فەرموویەتی:

﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞ ﴾.

واتە: خوا، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، هەمیشە ژیاوی سەرپەرشتییكارە، نە وەنەوز دەیگرێ و نە خەویشی لێ دەكەوێ.

## پێنجەم: میزۆپۆتامیا (بلاد الرافدين):

لە مێژووی دێریندا پێنج جۆرە نەتەوە لەو ناوچە جوگرافییەدا بوون:

### ١)- (سۆمەرییەكان):

كە لە ساڵی (٣٤٠٠)ی پێش زایین، تاكو ساڵی (٢٤٠٠)ی پێش زایین، واتە: (١٠٠٠) هەزار ساڵ سۆمەرییەكان، لەو شوێنەدا كە ئێستا پێی دەگوترێ: عێراق و كوردستان، دەوامیان كردوە، لە بارەی خواناسییەوە، ئەوانە زیاتر دیاردە سروشتییەكانیان پەرستوە و چەند پەرستراوێكی سروشتییان هەبوون، كە پێیان وابووە خوا لە دیاردە سروشتییەكاندا بەرجەستە بووە، پەرستراوە گەورە و ناودارەكانیان، ئەوانە بوون: (١- نیمو، ٢- ئینیل، ٣- ئۆتۆ، ٤- ئەنانا، ٥- دیموزیی)، ئەم پێنجە پەرستراوە سەرەكییەكانیان بوون و، زۆری دیكەشیان هەبوون.

### ٢)- (ئەكەدییەكان):

كە لە ساڵی (٢٣٦٠)ی پێش زایین، تاكو ساڵی (٢١٨٠)ی پێش زایین، دەوامیان كردوە، دەوڵەت و كۆمەڵگایان هەبووە، ئەوانە سێكوچكە (ثالوث)یان پەرستوە: (١-ئۆنۆ، ٢- ئینلیل، ٣- ئانكی).

١- (ئۆنۆ) گوتوویانە: پەروەردگاری ئاسمانە.

٢- (ئینلیل) گوتوویانە: پەروەردگارە لەسەر زەوی.

٣- (ئانکی) گوتوویانە: پەروەردگاری دەریایە، یانی: ئەوانە کە دروستکراوی خوان: ئاسمان و زەوی و دەریا، پێیان وابووە، کە هەر کامیان پەرستراوێك و مشوورخۆرێکەو پەروەردگارێکە.

**٣)- (بابلییەکان):**

کە لە ساڵی (١٨٣٩)ی پێش زایین، تاکو ساڵی (١٥٩٤)ی پێش زایین، بەردەوام بوون، ئەوانیش چەند پەرستراوێکیان پەرستوون، وەك: (ئەداد، نوسکو، عەشتار، تەمووز، مەردووك)، ئەم پێنج پەرستراوە سەرەکییەکانیان بوون و، لە هەڵکۆڵدراوەکان (حفریات) و لە شوێنەوارەکانیانەوە کە بەجێیان هێشتوون، ئەو زانیارییانەمان دەست کەوتوون.

**٤)- (ئاشوورییەکان):**

لە ساڵی (١٩٠٠)ی پێش زایین، تاکو ساڵی (٦١٢)ی پێش زایین، بەردەوام بوون، ئەوان پەرستراوی سەرەکییان بریتی بوون لە: ئاشوورو عەشتار، ئنجا جێی سەرسوورِمان ئەوەیە کە هەندێك لەو گەلانە پێیان وابووە، ئەو پەرستراوانە هاوسەرگیرییش دەکەن، بۆ وێنە: ئاشوورییەکان (ئاشوور)یان بە پیاو داناوە و (عەشتار)یان بە ژن داناوە، هاوسەری ئاشوور! کە بێگومان ئەوە هەمووی لادان بووە لە و خوا (سبحانە وتعالی)، بێ وێنەیەی کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ناساندوویانە:

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾ الشورى: ١١.

واتە: هیچ شتێك وەك خوا نیە.

**٥)- (کەنعانیی و فینیقییەکان):**

ئەوانیش سێ پەرستراوی سەرەکییان هەبوون: (١- بەعل، ٢- یەم، ٣- مووت)، ئنجا خوا (سبحانە وتعالی)، (ئیلیاس)ی ناردوە بۆ ئەو گەلە، کە پێی فەرموون:

﴿ أَتَدۡعُونَ بَعۡلٗا وَتَذَرُونَ أَحۡسَنَ ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴿١٢٥﴾ ﴾ الصافات.

واتە: ئایا لە بەعل دەپاڕێنەوەو، باشترین بەدیهێنەر واز لێ دێنن، پشتگوێ دەخەن؟ !.

## شەشەم: نەتەوەی هیند:

ئەمانیش چەند ئایینێکیان بوون، بەڵام دەتوانین بڵێین: سێ (٣)یان سەرەکیین:

**ئایینی یەکەم:** ئایینی هیندۆسیی، کە کتێبی (گیتا) (Geetha)یان هەیە و، هیندۆسیی بڕوای بە سێ پەرستراوان هەیە، {وەك پێشتر ئاماژەم پێدا زۆرێك لە گەلە پێشووەکان بڕوایان بە سێکوچکە (ثالوث) هەبووە} سێکوچکەکەی هیندۆسیی: (١- براهما، ٢- فشنو، ٣- شیفا، -کریشنا) گوتوویانە: ئەمانە بە هەرسێکیان خوای بەدیهێنەر پێك دێنن، وەك چۆن نەصرانییەکان دەڵێن: (باب و کوڕو گیانی پیرۆز) بە هەر سێکیان خوا پێکدێنن، وا پێدەچێ ئەوەی نەصرانییەکان، هەر هی هیندۆسییەکان بێ، چونکە هی هیندۆسییەکان پێشتر بووە و، لەوانەوە دزەی کردبێ.

ئنجا بەپێی ئایینی هیندۆسیی: کۆمەڵگا دابەش دەکرێ بۆ چوار چین:

أ- چینی یەکەم: چینی (براهمان)، ئەوانەن کە پیاوی ئایینییان پێ دەڵێن، گوایە: ئەوانە خوا لە زارو لە سەری خۆی، ئەو چینەی دروستکردوە.

ب- چینی دووەم: چینی (کاشتریا)، سەربازان، گوایە: خوا ئەوانەی لە شان و دەستی خۆی دروستکردوون.

ج- چینی سێیەم: چینی (ویشیا)، کاسبکارو جووتیاران، گوایە: خوا ئەوانەی لە ئەژنۆو ڕانی خۆی دروستکردوون.

د- چینی چوارەم: چینی (شودرا)، خزمەتکاران، گوایە: خوا ئەوانەی لە پێیەکانی خۆی دروستکردوون.

ئنجا بە پێی سیستمی هیندۆسیی: هەرگیز (شودرا) نابێتە (ویشیا) و (ویشیا) ناچێتە ئاستی (کاشتریا) و ئەویش ناچێتە ئاستی (براهمان)، وەك چۆن لە نێو ئایینی یەزیدییشدا ئەوە هەیە، چونکە لە نێو ئایینی یەزیدییشدا، کۆمەڵگا سێ چینە و هەرگیز چینی خوارێ، نابێ بچێتە نێوەڕاست و، نێوەڕاست ناچێتە سەرێ و، بۆشیان نیە هاوسەرگیریی لەگەڵ یەکدیدا بکەن!

ئەو یەکسانیی و بێ فەرقیی و بێ جیاییەی کە لە ئیسلامدا هەیە و، لە هەموو بەرنامەکانی پێغەمبەراندا (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ) هەبووە، پێش ئەوەی تێکبدرێن، لە فیکری بەشەردا نیە، بەشەر هەمیشە کارتێکراوە بەو کۆمەڵگایەو فیکر و کلتوورەی کە تێیدا دەژی، ئەوە تەنیا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بوون، کە ئەو کلتووره غەڵەت و پەڵەتانەیان تێکشکاندوەو، خەڵکیان گێڕاوەتەوە سەر ئەسڵی سروشت زگماکی خۆیان و، گێڕاویاننەوە دەوری چرای وەحیی، کە خوا مرۆڤەکانی هەموویان وەك یەك خوڵقاندوون، نەك هەندێکیان لە کەرەستەیەکی بەرزترو، ئەوانی دیکە لە کەرەستەیەکی نزمتر! ئەوە لە ئەفسانەیەك بەولاوە چی دیکە نیە.

**ئایینی دووەم:** ئایینی (سیخ): لە ئەسڵدا (سیخ)، (سیك)، بە مانای سیستم (نظام) دێ، ئەم ئایینە (جوروناناك) کە لە ساڵی (١٤٦٩ز)دا لە دایك بووە و لە ساڵی (١٥٣٩)ی زایینی دا مردوە، لە بەنجاب دایمەزراندوە.

ئایینی (سیك) لە چەند خاڵێکدا:

١- ئایینی (سیك) ئایینێکی تێکەڵەیە لە هیندۆسیی و ئیسلام.

٢- یەك خوا دەپەرستن.

٣- بەڵام بڕواشیان بە دۆنا و دۆن (تناسخ) هەیە، کە دەڵێ: (مرۆڤ کاتێك دەمرێ، ئەگەر کردەوەی باشی هەبێ، ڕووحەکەی دەچێتە بەر ژیاندارێکی باش و، ئەگەر کردەوەی خراپی هەبێ، ڕووحەکەی دەچێتە بەر ژیاندارێکی خراپ)،

٤- بڕوایان بە یەکیەتی بوون (وحدة الوجود)یش هەیە، کە خواو جیهان یەکن.

٥- دیسان بڕواشیان بە (نیرڤانا) هەیە، (نیرڤانا)ش ئەوەیە کە ئینسان جەستەی خۆی کۆنترۆڵ بکات و ڕووحی خۆی ئازاد بکات.

٦- بڕواشیان بە پێنج فەرزەی نوێژو بە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانیش هەیە، بۆیە گوتمان: ئەم ئایینی (سیك) تێکەڵەیەکە لە ئایینی هیندۆسیی و ئیسلام.

ئێستاش (سیك)ییەکان دوو گرووپن:

أ- هەندێکیان (نەرن کاریی)یان پێ دەڵێن، کە ئەمانە زۆر دەمارگیرو شەڕەنگێزن دژی مسوڵمانان.

ب- ئەوانی دی (ئەکالیی خالیصە)یان پێ دەڵێن، یانی: (ئەکالیی ڕووت) کە ئەوانە ئاشتییخوازن.

**ئایینی سێیەم:** ئایینی (بووذایی)، پاڵدراوەتەوە لای (بووذا)، کە لە ساڵی (٥٦٤)ی پێش زاییندا لە دایك بووە و، لە ساڵی (٤٨٣)ی پێش زاییندا مردووە.

ئایینی (بووذایی) سێ پایەی هەن:

**١)** بڕوایان بە دۆنادۆن (تناسخ) هەیە، گوایە: ڕووحی مرۆڤ دەچێتە بەر شتێکی دیکە و، کاتی خۆی لە شتێکی دیکەدا بووە و، هاتۆتە نێو جەستەی وی - کە ئەوە بێجگە لە ئەفسانە هیچی دیکە نیە - ئنجا پێیان وابووە کە (بووذا) بەرجەستە بوونی خوایە و، ڕووحی خوای تێدا بەرجەستە بووە.

**٢)** بڕوایان بە لایەنی ڕووحانیی هەیە و، هەرچەند (بووذا) بۆ خۆی ڕازی نەبووە، بەڵام لە دوای خۆی (بووذا)یان پەرستوە.

**٣)** نکووڵییان کردوە لە ڕۆژی دوایی و لە قیامەت و لە زیندووبوونەوە.

بووذاییەکان دوو کتێبی سەرەکییان هەن:

**یەك:** (مەهایانا) (العِجْلَةُ الكبيرة) (Mahayana)، واتە: گۆلکە مێی گەورە، کە پەیڕەوانی ئەم کتێبە بە شێوەیەکی ڕەها (بووذا) بە پەرستراو دەزانن.



**دوو:** (هینایانە) (العِجْلَةُ الصغيرة) (Hinaina) واتە: گۆلکە مێی گچکە، کە ئەمەیان لە ڕێنماییەکانی (بووذا)وە نیزیکترە.

## حەوتەم: کۆمەڵگای (چین):

لە کۆمەڵگای چین دا سێ (٣) بەرنامە و ڕێڕە و هەن:

١- ئیلحادو بتپەرستیی و داننەهێنان بە بوونی خوادا.

٢- ئاییني تاوییزم (الطاوية) (Toism)، کە لاوتزۆ (Laotzo) دامەزرێنەریەتی، لە ساڵی (٦٠٤)ی پێش زاییندا مردوە و، کتێبێکی داناوە بە ناوی: (گاوتیی کەنغ)، کە باسی پێکەوە ژیانی ڕەها دەکات و زۆر دژی عەقڵە و، زۆر زێدەڕۆیی دەکات لە دنیا بە کەمگرتن و، ئەزیەتدانی جەستەو خزمەتکردنی ڕووحدا.

٣- ڕێبازێکی دیکەی فیکریی، کە مەرج نیە وەك ئاييني ئاسمانیی لە قەڵەم بدرێ، ئەویش (کۆنفوشیوسیی)یە، کە دیارە (کۆنفوشیوس) کە لە ساڵی (٥٥١)ی پێش زاییندا لە دایك بووە و لە ساڵی (٤٧٩)ی پێش زاییندا مردوە، دامەزرێنەری بووە و، ئاييني (کۆنفوشیوسیی) سێ پایەی هەن:

أ- یەك خواپەرستیی، تەنیا خوا دەپەرستن و، بڕوایان بە پەرستنی هیچ شتی دیکە نیە.

ب- بڕوا نەبوون بە قیامەت.

ج- کۆنفوشیوس ڕەفزی کردوە، کە بیپەرستن.

## هەشتەم: وڵاتی فارس:

لە وڵاتی فارس دا کۆمەڵێك ئاینییان هەبوون، بەڵام ئەوەی کە زۆر ناودار بووە، ئاييني زەردەشتییە و، (زەرادەشت) لە ساڵی (٦٦٠)ی پێش زاییندا لە دایك بووە و لە ساڵی (٥٨٠)ی پێش زاییندا مردوە، هەندێکیش مێژوویەکی دیکە دیاریی دەکەن.





چەند وردە خاڵێك لە بارەی ئایینی زەردەشتییەوە:

١- (زەردەشت)، یان (زەرادەشت)، کتێبێکی بووە بە ناوی (ئاڤێستا).

٢- زەردەشت بڕوای بووە بە (ئاهو - ڕا - موزدا)، مانایەکەی: (أنا الوجود الخالق) من بوونی بەدیهێنەرم.

٣- لە ئایینی زەردەشتییدا خواپەرستیی هەیە و، بڕوا بوون بە ڕۆژی دوایی هەیە.

٤- زەردەشتییەکان - وەك لە ئاڤێستای ئێستادا دیارە - بڕوایان بە دوو پەرستراوان هەیە:

أ- یەکیان: (یەزدان)، کە (ئاهو ڕا مەزدا)شی پێ دەڵێن.

ب- ئەوی دیکەیان: (ئەهریمەن)، ڕەمزو هێمای (یەزدان) بریتیە لە ڕووناکیی و ئاگریش هەر بە ڕەمزو هێمای خوا دادەنێن، هەروەها خۆریش.

بەڵام ڕەمزو هێمای (ئەهریمەن) بریتیە لە تاریکیی.

هەڵبەتە لە نێو ئەوانیشدا ڕاجیایی هەیە، کە ئایا ئەو دووانە: (یەزدان و ئەهریمەن)، یان: (ئاهوڕامەزدا و ئەهریمەن)، هاوتای یەکن؟

زۆربەیان دەڵێن نا، هەر یەزدان یان ئاهوڕامەزدا، ئەهریمەنی دروستکردوە: بیری کردۆتەوە لە خراپە و، یەکسەر ئەهریمەن دروستبووە!

٥- کێشەی نێوان یەزدان (ئاهوڕامەزدا) و ئەهریمەن:

(ئەهریمەن) کاری بریتیە لە تێکدان و خراپەکاریی و مردن و نەخۆشیی و ئازارو ناڕەحەتیی، بەڵام (یەزدان) تەنیا کاری چاك دەکات.

کە بێگومان ئەو ئەهریمەنەی ئەوان دەیڵێن، هەروەك (طاوس ملك)ەکەی یەزیدییان، هەر ئیبلیسە، ئەو ئیبلیسەی کە لە فەرمانی خوا دەرچوو و لە خوا هەڵگەڕایەوە، خوای کارزانیش مۆڵەتی دا بمێنێتەوە بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان و جندەکان، بەڵام ئەوان لە قاڵبی خۆی گەورەتریان کردوە و، بردوویانەتە ئاستی خوا.

٦-لە ڕاستییدا دوایی دوا نوسخەی ئایینی زەردەشتایەتیی گۆڕا بۆ مەجووسییەت، کە چەند گۆڕانکارییەکی بەسەردا هاتن و، سەرەنجام مەجووسییەتیش لە ئاگر پەرستیی و بە پیرۆزگرتنی ئاگردا خۆی دەبینێتەوە.



برگەی سێیەم: خوای میهرەبان و کارزان هەر لەسەرەتای دابەزاندنی ئادەم و حەوواوە سەلامی خوایان لێ بێ، بۆ ژیانی سەر زەوی، بەڵێنی ناردنی بەرنامەو ڕێنمایی پێدان و بەڵێنەکەشی بردە سەر:

وەك خوا لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ:

﴿قُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ مِنْهَا جَمِيعًا ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٣٩﴾﴾.

واتە: فەرموومان: تێکڕا لە (ئاسمان، بەهەشت) دابەزن، (ئادەم و حەووا لەلایەك و ئیبلیسیش لەلایەك) هەر کاتێك لە منەوە ڕێنماییتان بۆ هات، هەر کەسێك شوێن ڕێنمایی من بکەوێ، نە ترسیان لەسەر دەبێ، نە پەژارە دادەگرن، بەڵام ئەوانەی کە بێبڕوادەبن و ئایەتەکانی ئێمە بە درۆ دادەنێن، ئەوانە خاوەن و هاوەڵی ئاگرن و بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

هەروەها خوا لە سوورەتی (طه)دا فەرموویەتی: ﴿قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾﴾.

واتە: (خوا) فەرمووی: تێکڕا لێی دابەزن (واتە: لە بەهەشت، چونکە بەهەشتیش لە ئاسمانە)، هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن (واتە: ئیبلیس

دوژمنی ئادەم و حەوواو وەچەکەیان دەبێ) هەر کات لە منەوە ڕێنماییتان بۆ هات، هەر کەس شوێن ڕێنمایی من بکەوێ: نە گومڕا دەبێ و نە بەدبەخت و ژین تاڵ دەبێ، بەڵام هەر کەس پشت لە بەرنامەو ڕێنمایی من بکات، بێگومان ژیانێکی تەنگ و تاڵی دەبێ لە دنیادا و، لە ڕۆژی هەڵسانەوەشدا، بە کوێریی کۆیدەکەینەوەو دەیهێنین.

هەر بۆیەش پەیتان پەیتا پێغەمبەرانی خوا (عليهم الصلاة والسلام) هاتوون، کە وەك چەندجاری دیکەش گوتوومانە: ژمارەی پێغەمبەران سەدو بیست و چوار هەزار (١٢٤٠٠٠) بووە، سێ سەدو پازدە (٣١٥)یان (رسول) بوون، ئەوانی دیکە هەموو (نبي) بوون[1].

(رسول) واتە: خاوەن بەرنامەیەکی سەربەخۆ، بەڵام (نبيّ) مەرج نیە بەرنامەی سەربەخۆی هەبێ، بەڵام دەبێ شوێن بەرنامەی ئەو (رسول)ەی پێش خۆی بکەوێ، هەروەك پێغەمبەرانی بەنو ئیسرائیل زیاتر (أنبياء) بوون و، شوێن مووسا (عليه السلام) کەوتوون کە (رسول) بووە و عیساش (عليه السلام) هەر (رسول) بووە، چونکە بەرنامەی خۆی هەبووە، هەرچەندە شوێن تەوڕاتیش کەوتوە، وێڕای ئەوە کە بەرنامەو کتێبی تایبەت بە خۆیشی هەبووە، کە ئینجیلە، وەك خوا باسی ژمارەیەك لە پێغەمبەران دەکات، دوایی دەفەرموێ:

﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا ۖ كُلَّ مَا جَاءَ أُمَّةً رَسُولُهَا كَذَّبُوهُ ۚ فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُم بَعْضًا وَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ ۚ فَبُعْدًا لِّقَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ المؤمنون.

واتە: دوایی پێغەمبەرانی خۆمان پەیتا پەیتا ناردن، هەر کاتێك پێغەمبەرێك دەچوو بۆ لای کۆمەڵگایەکەی، بە درۆیان دادەنا، (ئێمەش بۆ سزادان و فەوتاندنیان) هەندێکیانمان بە دوای هەندێکیان خست و، کردمانن بە قسەی

---

(١) پێشتر دەقی ئەو فەرموودەیەمان هێنا کە باسی ژمارەی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) دەکات، کە: أحمد: ٢٢٣٤٢، والطبراني: ٧٨٧١، والحاكم: ٣٠٣٩، هێناویانە و (الألباني) بە (صحيح)ی داناوە.

کۆڕو مەجلیسان (واتە: چۆنیەتیی فەوتێنرانیانمان کردنە بەسەرهات کە لە مەجلیسان بگێڕدرێنەوە) دووریی بۆ کۆمەڵێك کە بڕوا ناهێنن.

خوا (سبحانە وتعالی ) ئەو ڕاستییە باس دەکات، کە تاکو پێغەمبەرو هیدایەت بۆ گەلێك نەنێرێ، سزایان نادات، نە لە دنیادا سزایان دەدات و، نە لە دوارۆژدا، دوای ئەوەی زیندوویان دەکاتەوە، سزایان دەدات لەسەر ئەوەی بۆچی شوێن هیدایەتی خوا نەکەوتوون و، ڕێی خواپەرستییان نەگرتوە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾﴾ الإسراء.

واتە: ئێمە سزادەر نین، ئازاردەر نین (بۆ کۆمەڵگایەکان) تاکو ڕەوانەکراو نەنێرین.

هەروەها لە سوورەتی (فاطر)دا پێمان ڕادەگەیەنێ و ڕوونی دەکاتەوە، کە هیچ کۆمەڵگایەك نەبووە: خوا ڕەوانەکراوو ترسێنەرێکیان بۆ نەنێرێ: وەك فەرموویەتی:

﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۚ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾﴾.

بێگومان ئێمە تۆمان بە هەق بە دڵخۆشکەرو ترسێنەر، (یان موژدەدەرو وشیارکەرەوە) ڕەوانە کردوە و هیچ کۆمەڵگایەك نەبووە، مەگەر ترسێنەرو هۆشیار کەرەوەیەکی تێدا ڕەوانە کراوە.

کەواتە: خوا (سبحانە وتعالی ) بێ مشوور نەبووە لە دروستکراوەکانی خۆی، هەر لەو ڕۆژەوە کە ئادەم و حەووای دابەزاندوون، دیارە هاوکات ئیبلیسشی دابەزاندوە: بەردەوام پێغەمبەرانی بۆ نەوەی ئادەم ناردوون، هەروەها ئادەم (علیە السلام) خۆیشی پێغەمبەر بووە، وەك ئیمام ئەحمەد لە (المسند)دا هێناویەتی کە (أبوذر) لە پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) دەپرسێ: ئایا ئادەم (علیە السلام) پێغەمبەر بووە؟ دەفەرموێ: بەڵێ، پێغەمبەرێکی دوێنراو بوو (نعم نبيٌّ مكلَّمٌ)[1].

---

(١) المسند: ٢٢٣٤٢، والمعجم الكبير للطبراني: ٧٨٧١، والمستدرك للحاكم: ٣٠٣٩، وصححه الألباني.

ئنجا لەو کاتەوە تاکو پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) زنجیرەی پێغەمبەران نەپساوە و، دوورترین ماوە لە نێوان دوو پێغەمبەراندا بوو بێ، ئەو ماوەیە کە لە نێوان عیسا (علیه السلام)و موحەممەددا (صلی الله علیه وسلم) بووە، کە ئەگەر عیسا (علیه السلام) لە ساڵی (١)ی زایینی لە دایك بوو بێ، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لە ساڵی (٥٧٠)ی زایینی دا لە دایك بووە، واتە: ماوەی نێوان لە دایك بوونیان (٥٧٠) ساڵ بووە، هەر بۆیەش خوا (سبحانه وتعالی) دەفەرمویێ:

﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ عَلَىٰ فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُواْ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٖ وَلَا نَذِيرٖۖ فَقَدۡ جَآءَكُم بَشِيرٞ وَنَذِيرٞۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٩ ﴾.

واتە: ئەی خاوەن کتێبەکان! ڕەوانەکراوی ئێمە بۆ لاتان هات، لە دوای پچڕانێك لە ناردنی پێغەمبەران (تاکو بیانووتان نەبێ) بڵێن: هیچ موژدەدەرو ترسێنەرێکیان نەهاتۆتەلا! ئەوە موژدەدەرو ترسێنەرتان بۆ هات و، خواش لەسەر هەموو شتێك بە توانایە

(عَلَىٰ فَتۡرَةٖ) یانی: (علی انقطاع) دوای پچڕانێك، چونکە (٥٧٠) ساڵ کەوتۆتە نێوان لە دایك بوونی ئەو دوو پێغەمبەرەوە، صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ.

بڕگەی چوارەم: دوو هۆکار هەن بۆ بە زەقیی دیار نەبوونی شوێنەواری پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)؟ لە مێژووی بەشەردا:

یەکەم: دژایەتیی کرانیان لەلایەن دەستەڵاتدارانی خۆ فەرزکەرو، خەڵکە چەواشەکراوەکەشیانەوە.

دووەم: گۆڕان و دەستکاریی کرانی ڕێبازەکانیان بە لای بتپەرستییدا.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش: کوا شوێنەواری ئەو ئایین و بەرنامەیەی کە خوا بۆ پێغەمبەرانی ناردوە؟ بۆچی ئێمە زیاتر شوێنەواری بتپەرستیی و پەرستنی پەیکەرەکان و دیاردە سروشتییەکان و، پەرستنی خڕۆکەکان و مانگ و خۆرو ئەستێرەکان، هەروەها پەرستنی ژیاندارانی دیکە، وەك لە هیندو چین هەیە: مانگا و ماری کوبڕا دەپەرستن، مشك دەپەرستن، ڕووەك دەپەرستن، بۆچی ئێمە زیاتر شوێنەواری پەرستنی جگە لە خوا دەبینین؟

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەو حاڵەتە دوو هۆکاری سەرەکیی هەن:

**١- هۆکاری یەکەم:** لە سۆنگەی ئەوەوە کە پێغەمبەران صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، دژی حوکمڕانە خۆسەپێن و خەڵك چەوسێنەرەوەکان بوون، دژی ئەو حوکمڕانانە بوون کە خۆیان بە پەروەردگاری خەڵك زانیوە و، خۆیان بە پەرستراوی خەڵك زانیوە، وەك: فیرعەون دەیگوت:

﴿أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ٢٤﴾ النازعات.

واتە: من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم، چونکە: وشەی (رب) بە مانای: پەرستراو، سەروەر، پەروەردگار، یاسادانەر، بە پیرۆزگیراو، دێ[١].

هەروەها وەك فیرعەون دەیگوت: ﴿قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذۡتَ إِلَٰهًا غَيۡرِي لَأَجۡعَلَنَّكَ مِنَ ٱلۡمَسۡجُونِينَ ٢٩﴾ الشعراء.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص٢٠١، المكتبة العصرية، ط٢٠١٢م.

واتە: (ئەی مووسا!) ئەگەر جگە لە من پەرستراوێكی دیكە بگری، ڕەگەڵ گیراوانت دەخەم، واتە: تۆش بە مەرەدی ئەوان دەبەم و زیندانییت دەكەم.

هەروەها فیرعەون بە دەست و پێوەندەكانی و پیاوماقووڵانی مەجلیسەكەی دەڵێ: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى فَأَوْقِدْ لِى يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ٣٨﴾ القصص.

واتە: فیرعەون گوتی: ئەی پیاوماقووڵان و قسە ڕۆیشتووان! جگە لە خۆم بۆ ئێوە پەرستراوێكی دیكەم پێ شك نایەت، تەنیا من پەرستراوتانم...

ئنجا پێغەمبەران علیهم السلام دژی حوكمڕانە خۆسەپێن و ستەمكارەكان بوون، وەك گوتراوە: (لِكُلِّ فِرْعَوْنٍ مُوسى) واتە: بۆ هەر فیرعەونێك مووسایەك هەیە، بەڵێ پێغەمبەران صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، دژی ئەو حوكمڕانە خۆسەپێن و خۆ بە پەرسترا و زانانە بوون و، بە گژیان داچوونەوەو یەخەیان گرتوون و، خەڵكیان لە دژ هانداون، بۆیە ئەوانیش نەیانهێشتوە شوێنەوارو ڕێبازەكەیان دیار بێت، كوژیاندوونەتەوەو سڕیویانەتەوە و، ویستوویانە ناویان لە كوولەكەی تەڕدا نەهێڵن.

هەروەها پێغەمبەران (عَلَيْهِمِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دژی بتپەرستیی و ئەفسانە سازیی خەڵكەكەش بوو ون، ئەو خەڵكەش كە بۆتە كۆیلە و بندەستی ئەو حوكمڕانە خۆسەپێن و خۆ پێ پەرستراوانە، پێغەمبەران (عَلَيْهِمِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لەگەڵ ئەوانیشدا ڕووبەڕوو بوونەتەوە و، ئەوانیش شوێنەواری ئەو پێغەمبەرانەیان نەهێشتۆتەوەو بزر كردوە.

**٢- هۆكاری دووەم:** زۆرجار لە دوای خۆیان، شوێنكەوتووانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ڕێبازەكەیان لە یەكتاپەرستییەوە گۆڕیوە بۆ شیرك و بتپەرستیی، وەك ئەوە بە زەقیی دەبینین لە شوێنكەوتووانی هەر سێ بەرنامەی: جوولەكایەتیی و گاورایەتیی و مسوڵمانەتیی دا، هی جوولەكایەتیی و نەصرانییەت دیارە و، بە

داخەوە لە نێو مسوڵمانانیشدا، تا ڕاددەیەك پەرستنی غەیری خوا، بە شێوەیەك لە شێوەكان هەیە، هەر بۆیەش پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆر ئوممەتەكەی خۆی ئاگادار كردۆتەوە، لەوە كە گیرۆدە ببن بە شیرك و بتپەرستییەوە، چ شیركی گەورە، چ شیركی گچكە.

برگەی پێنجەم: هەموو ئەو بیرۆكەو فەلسەفانەی بە جۆرێك لە جۆرەكان پەرستنیان تێدایە، بۆ: دیاردە سروشتییەكان، مرۆڤەكان، مانگ و خۆرو ئەستێرەكان، ژیانداران، پەیكەرەكان .. هتد، ڕیشەكەیان دەگەڕێتەوە بۆ خواپەرستیی، بەڵام لادانی تێدا كراوە:

یانی: ئەسڵ لە لای مرۆڤ لە بواری پەرستندا، خواپەرستیی و خوا بەیەكگرتن بووە، بەڵام دوایی بەلاڕێدا براوە و لادان ڕوویداوە و، مێژوونووسان و شارەزایانی ئایینەكان، ئەو ڕاستییەیان زۆر بە جەخت كردنەوە ڕاگەیاندوە، بۆ وێنە: ناوی پێنج مێژوونووس دێنین، كە هەر پێنجیان كەسایەتیی دیارو ناودارن:

١- Lange - لانگ.

٢- Pascal - پاسكال.

٣- Schmitt - شمیت.

٤- Bruce - بروس.

٥- Coopers - كوپرز.

وەك (دكتور محمد عبدالله دراز) لە كتێبی: (الدين: بحوث مُمَهِّدَة لدراسة تأريخ الأديان)[1]دا ئەوەی ڕاگەیاندوە و ناوی ئەو مێژوونووسانەشی هێناوە،

---

(١) واتە: (ئایین: چەند باسێكی ڕێ خۆشكەر بۆ لێكۆڵینەوە لە مێژووی ئایینەكان)، ص١٤٩ و ١٥٠.

هەروەها (دکتۆر هیثم طلعت)یش لە کتێبی: (العودة إلى الإيمان)دا[١]، ئەویش دیسان ئەو ڕاستییەی خستۆتە ڕوو.

ئەم دەقەی (صحیح البخاري)یش لە (إبن عباس)ەوە خوا لێیان ڕازی بێ، تیشکێکی چاك دەخاتە سەر ئەو مەسەلەیە:

{عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: صَارَتْ الْأَوْثَانُ الَّتِي كَانَتْ فِي قَوْمِ نُوحٍ فِي الْعَرَبِ بَعْدُ، أَمَّا وَدٌّ كَانَتْ لِكَلْبٍ بِدَوْمَةِ الْجَنْدَلِ، وَأَمَّا سُوَاعٌ كَانَتْ لِهُذَيْلٍ، وَأَمَّا يَغُوثُ فَكَانَتْ لِمُرَادٍ، ثُمَّ لِبَنِي غُطَيْفٍ بِالْجَوْفِ عِنْدَ سَبَأٍ، وَأَمَّا يَعُوقُ فَكَانَتْ لِهَمْدَانَ، وَأَمَّا نَسْرٌ فَكَانَتْ لِحِمْيَرَ لِآلِ ذِي الْكَلَاعِ، أَسْمَاءُ رِجَالٍ صَالِحِينَ مِنْ قَوْمِ نُوحٍ، فَلَمَّا هَلَكُوا أَوْحَى الشَّيْطَانُ إِلَى قَوْمِهِمْ: أَنْ انْصِبُوا إِلَى مَجَالِسِهِمْ الَّتِي كَانُوا يَجْلِسُونَ، أَنْصَابًا وَسَمُّوهَا بِأَسْمَائِهِمْ، فَفَعَلُوا فَلَمْ تُعْبَدْ حَتَّى إِذَا هَلَكَ أُولَئِكَ وَتَنَسَّخَ الْعِلْمُ، عُبِدَتْ} أخرجه البخاري، كتاب التفسير، رقم: ٤٦٣٦.

واتە: ئەو بتانەی گەلی نووح (علیه السلام) دوایی کەوتنە لای گەلی عەرەب:

١- وەدد کەوتە لای هۆزی (کەلب) لە (دَوْمة الجندل).

٢- سواع کەوتە لای هۆزی (هوذەیل).

٣- یەغووث کەوتە لای هۆزی (موراد) دوایی (بەني غەطیف) لە (جُرف) لەلای (سەبەء).

٤- یەعووق کەوتە لای هۆزی (هەمذان).

٥- نەسر کەوتە لای هۆزی (حیمەیر)ی (آل ذي الکلاع).

ئەوانە ناوی پیاوانێکی چاك بوون لەگەلی نووح، دوای مردنیان شەیتان خوتخوتەی بۆ خەڵکەکەیان کرد: کە پەیکەرانێك لەو شوێنانەی لێیان دادەنیشتن، دابنێن و، ناویانیان لەسەر بنووسن، ئەوانیش وایانکرد، سەرەتا نەپەرستران، بەڵام کە ئەو پێشینانەیان فەوتان و زانیاریی (وەحیی) کوێر بۆوە، پەرستران (کرانە هاوبەشی خوا عزوجل).

---

(١) واتە: (گەڕانەوە بەرە و ئیمان)، ص١٣٥ - ١٣٧.

**بڕگەی شەشەم: ئەوەی لەم ڕۆژگارەدا لەبەر دەستی مرۆڤ دا هەیە، بە ناوی ئایینی ئاسمانیی (الدين السماوي)یەوە و، کتێبی هەبێ، چ پارێزراو بووبێ، چ دەستکاریی کرابێ، پێنجن: جوولەکایەتیی و نەصرانییەت و صابیئایەتیی و مەجووسییایەتیی (زەردەشتایەتیی) و ئایینی ئیسلام:**

بەڵێ بەڕێـــــزان!

ئێستا لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، مرۆڤ تەنیا پێنج جۆرە ئایینی لەبەر دەستن، کە خۆیان پاڵبدەنە لای خواو پێغەمبەران و کتێبی خوا، یاخود کە (بەناو کتێبی خوا)یان لەبەر دەستدا هەبێ.

بێگومانیش ئایینی ئاسمانیی، بەبێ هەبوونی کتێبێك کە ببێتە پەیڕەو و بەرنامەی پەیڕەوانی، هیچ مانایەکی نیە، بە واتایەکی دیکە: کتێبی هەر ئایینێکی ئاسمانیی، تەرازوو و پێوەرو سەنگی مەحەکی ئەو ئایینەیە، بۆیە ئێمە پێویستە سەرنجێکی خێرای هەر کام لە کتێبەکانی ئەو پێنج ئایینە بدەین، بۆ ئەوەی لێمان حاڵی بێ: کام لەو پێنج ئایینە بە کەڵکی ئەوە دێن و شایستەی ئەوەن، مرۆڤ وەك: بەرنامەی خواپەرستیی شوێنیان بکەوێ، لە هەردوو بواری دینداریی و دنیاداریی دا، دینداریی واتە: مامەڵە لەگەڵ خوا و، دنیاداریی واتە: مامەڵەی مرۆڤەکان لە نێو خۆیاندا.

هەڵبەتە ئێمە بە پێی ڕیزبەندیی کاتیی، جارێ تەنیا سەرنجێکی خێرای ئەو پێنج کتێبەی ئەو پێنج ئایینە دەدەین، ئەگەرنا دوایی لە باسی چوارەمی ئەم بەشی سێیەمەدا: (هۆکارە ڕاستەقینەکانی ئیلحاد)، لە بڕگەی چوارەمدا: (تێکدران و شێوێنرانی کتێب و بەرنامەکانی خوا) لەوێدا ئەو کتێبانە هەڵدەسەنگێنین، بەڵام جارێ هەروا وەك ناساندنێك ئەو کتێبانە باس دەکەین:

## یەكەم: كتێبی ئایینی جوولەكایەتیی (الیهودیة):

جوولەكەكان وەك نەتەوەیەك، بە لای كەمەوە: سێ هەزار و پێنجسەد (٣٥٠٠) ساڵ پێش ئێستا سەریان هەڵداوە، ئێستاش لە چوار كورتە خاڵدا باسی كتێبی ئایینی جوولەكایەتیی (یهودیة) دەكەین:

**خاڵی یەكەم:**

هەرچەندە خوای زاناو توانا تەنیا باسی (توراة)ی كردوە كە بۆ مووسای ناردوە، كە تەوڕاتیش بە مانای بەرنامەو شەریعەت دێ، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ بِمَا ٱسۡتُحۡفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيۡهِ شُهَدَآءَۚ فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ المائدة.

واتە: ئێمە تەوڕاتمان دابەزاند، ڕێنمایی و ڕووناكیی تێدابوو، پێغەمبەرانێك كە ملكەچ بوون بۆ خوا، حوكمڕانیی ئەوانەیان پێدەكرد كە جوولەكەن، هەروەها ڕەببانیی و ئەحبارەكان (كە دوو جۆر لە زانایانی جوولەكەكانن) ئەوانیش لە دوای پێغەمبەران حوكمیان بە تەوڕات دەكرد، لە سۆنگەی ئەوەوە كە پاراستنی كتێبی خوایان پێ سپێررابوو و، بەسەریشیەوە چاودێر بوون، كەواتە: (ئەی خاوەن كتێبینە!) لە خەڵك مەترسن و، تەنیا لە من بترسن و نرخێكی كەمیش بە ئایەتەكانم مەكڕن و، هەر كەسێكیش حوكم بەوە نەكات كە خوا دایبەزاندوە، ئەوانەن بێبڕوایان.

كەچی ئێستا جوولەكەكان كۆمەڵێك كتێبیان هەن، كە بە هەموویان (پەیمانی كۆن) (العهد القدیم)یان پێدەگوترێ و، سەرجەم ئەو كتێبانە، بە پێنج (سیفر)ەكەی

تەوراتەوە، سی و نۆ (٣٩) کتێبن، کە جوولەکەکان دانیان پێدادێنن، هەڵبەتە نەصرانییەکانیش بە هەموو بەشەکانیانەوە، دان بەو پەیمانی کۆنەدا دێنن.

لە لاپەڕە (٢)ی پێشەکی (التفسيرُ التطبيقي للكتاب المقدس)دا هاتوە: (وَقَدْ قَامَ بِإِعْدَاد التّفسيرُ التطبيقِي للكِتَابِ المُقَدَّس فَرِيقٌ مِنَ الرُّعَاةِ وَالمُعَلِّمِينَ مِنْ مُخْتَلَفِ الطَّوَائِفِ المَسِيحِيَّة وَهَيْئَاتِ الخِدْمَةِ المُخْتَلِفَة، وَقَدِ اسْتَغْرَقَ إِعْدَادُهُ سَنَوَاتٍ مِنَ العَمَلِ الجَادّ).

واتە: تیمێك لە زانایان و شارەزایانی کۆمەڵە مەسیحییە جۆرا و جۆرەکان و، دەستە جیاجیایەکانی خزمەتکردن -ی کتێبی پیرۆز- دوای کاری جیددیی ساڵانێك، ئەم کتێبەی (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس)یان ئامادەکردوە.

کەواتە: (الكتاب المُقَدَّس) بە هەردووك پەیمانی کۆن و نوێشیەوە، مەسیحییەکان بە هەموو بەشەکانییانەوە تەبەنییان کردوە و، جوولەکەکانیش پەیمانی کۆنیان لێ تەبەنیی کردوە، کە سی و نۆ (٣٩) کتێبە، بەپێی هەرکام لە:

١- (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس) کە لەلایەن: (پڕۆتستانت) و (کاثولیك) و (ئەرثذۆکس)ەوە تەبەنیی کراوە.

٢- (الكتاب المقدس: قراءة رعائية)، کە لەلایەن: (کلدان) و (سریان)ەوە تەبەنیی کراوە.

ناوی سی و نۆ (٣٩) کتێب، یان (سیفر)ەکەی[1] پەیمانی کۆن:

١- التكوين
٢- الخُروج.
٣- اللاَّوِين.
٤- العَدَد.
٥- التَثْنِية.

---

(١) جوولەکە و نەصرانییەکان وشەی (سِفر) کە بە (أسفار) کۆدەکرێتەوە، بۆ ناوی سەرجەم کتێبەکانی (پەیمانی کۆن) و (پەیمانی نوێ) بەکاردێنن.

ئەم پێنجە تەوڕات پێك دێنن، بە قسەی جوولەكەكان، خوا (سبحانه وتعالى) ئەوانەی بۆ مووسا ناردوون.

٦- يُوشَع.
٧- القُضَاة.
٨- رَاعُوث.
٩- صموئيل الأول.
١٠ صموئيل الثاني.
١١- الملوك الأول.
١٢- الملوك الثاني.
١٣- أخبار الأيام الأول.
١٤- أخبار الأيام الثاني.
١٥- عَزرا.
١٦- نَحْميَا.
١٧- أستير.
١٨- أَيُّوب.
١٩- المَزَامِير.
٢٠- الأَمْثَال.
٢١- الجَامِعَة.
٢٢- نَشِيدُ الأَنَاشِيد.
٢٣- إِشْعِيَاء.
٢٤- إِرْمِيَاء.
٢٥- مَرَاثِي إِرْمِيَاء.
٢٦- حَزْقِيَال.
٢٧- دَانِيال.
٢٨- هُوشَع.
٢٩- يُوئِيل.
٣٠- عَامُوس.
٣١- عُوبيديا.



٣٢- يونان.
٣٣- مِيخَا.
٣٤- نَاحوم.
٣٥- حَبْقُوق.
٣٦- صَفْنِيا.
٣٧- حَجَاي.
٣٨- زَكَرِيَّا.
٣٩- مَلاخِي.

کۆی (إصحاح)ەکان = **٩٢٩**، ئیصحاح[١].

ئەم سی و نۆ (**٣٩**) کتێبە کە پەیمانی کۆن پێکدێنن، کە وێڕای نەصرانییەکان بەگشتی لەلایەن جوولەکەکانیشەوە تەبەننیی کراون، بەڵام دە (**١٠**) کتێبی دیکەش هەن کە: (الكتاب المقدَّس: قراءة رعائية) هێناونی[٢]، کە جوولەکەکان دانیان پێداناهێنن، دەڵێن: ئەوانیش ئەم دەیەن:

١- طوبيت (طوبيا).
٢- يهوديت.
٣- أستير يوناني.
٤- الحكمة.
٥- يشوع بن سيراخ.
٦- باروخ.
٧- إرميا.
٨- دانيال يوناني.
٩- المكابيين الأول.
١٠- المكابيين الثاني.

---

(١) (إصحاح) وەك (سورة)ی قورئان وایە.

(٢) لە پێشەکییەکەدا نووسیویانە: (من الترجمة اليونانية السبعينية).

کەواتە: ژمارەی (سیفر)ەکانی پەیمانی کۆن بە پێی سەرژمێری هەرکام لە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس) و (الكتاب المقدَّس: قراءة رعائية)، **٣٩ + ١٠ = ٤٩** سیفرە.

هەڵبەتە هەر (سفر)ێکیش چەند (إِصحاح)ێکە و، کۆی ئیصحاحەکانی پەیمانی کۆن (العهد القديم) بریتیە لە:

١- {التفسير التطبيقي للكتاب المقدس (العهد القديم)} = **٩٢٩** ئیصحاح.

٢- دە (١٠) سیفرە تایبەتەکەی {الكتاب المقدَّس: قراءة رعائية} = **١٤٢** ئیصحاح {وێڕای (٩٢٩) ئیصحاحەکەی کتێبی پێشیٚ} **٩٢٩ + ١٤٢ = ١٠٧١** ئیصحاح.

**خاڵی دووەم:**

شایانی باسە جوولەکە جگە لە پەیمانی کۆن، سێ کتێبی دیکەشیان هەن، کە بە کتێبی پیرۆزیان دادەنێن:

١- (مَشْنَاه) کە پێی دەگوترێ: (شرح الشريعة) و شەست و سێ (٦٣) نامیلکەیە، (رسالة) لە شەش بەرگدا.

٢- (جَمَارَاه) کە پێی دەگوترێ: (فقه الشريعة) ئەمە لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی تەوراتە بە زمانی ئارامیی.

٣- (تلمود) کە دەڵێن: ڕێنماییە نهێنییەکان (التعاليم السرِّية)ی تێدان، کە کتێبێکە لە دەقەکانی (مَشناه) و (جَمَارَاه) پێکهاتوە و، لە چل (٤٠) بەرگدا خۆی دەبینێتەوە.

**خاڵی سێیەم:**

گەلی جوولەکە بەسێ ناوان ناسراون:

١- (العِبْرانيُّون): (عابر) یان ناوی یەکێك بووە لە باپیرەکانی ئیبراهیم (عليه السلام)، یاخود مەبەست پێی ئەوانە بووە کە پەڕیونەوە لە ڕووباری (فورات)، لە باب و باپیرانی گەلی جوولەکە.

٢- (بنو إسرائيل) واتە: وەچەی ئیسرائیل، (إسرائيل)یش کە بە زمانی عیبریی یانی: (عبدالله)، نازناوی یەعقووبە (عليه السلام).

٣- (اليهود) یان بە هۆی مەملەکەتی یەهوداوە کە چوارەم کوڕی یەعقووبە (عليه السلام)، ئەم ناوەیان لێنراوە، یاخود یەهوود، بە مانای گەڕاوە (تائب)، وەك لە قورئانیشدا هاتوە:

﴿لِلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ بِمَا ٱسۡتُحۡفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيۡهِ شُهَدَآءَۚ فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ المائدة.

(هادوا أي: تابوا) واتە: گەڕاونەوە بۆ لای خوا.

**خاڵی چوارەم:**

بێگومان هەڵسەنگاندنی کتێبی پیرۆزی جوولەکەکان، بە تایبەت (پەیمانی کۆن) (العهد القديم) کاتی زۆر دەوێ، یانی: ئەو سی و نۆ (٣٩) کتێبە، جگە لە (مَشْناه) و (جَمَارَاه) و (تلمود)، بەڵام ئێمە لە باسی چوارەمی ئەم بەشی سێیەمەدا: (هۆکارە ڕاستەقینەکانی ئیلحاد) خوا پشتیوان بێ، لە بڕگەی چوارەمدا: (تێکدران و شێوێنرانی کتێبەکانی خوا) هەڵسەنگاندنی خۆمان دەکەین بۆ (پەیمانی کۆن).

لێرەدا تەنیا ئەوەندە دەڵێین کە:

خوا (سبحانه وتعالى) تەنیا باسی تەوڕاتی کردوە کە بۆ مووسای دابەزاندوە، بەڵام ئێستا سی و چوار (٣٤) کتێبی دیکەش خراونە گەڵ ئەو پێنج (سفر)ەی کە تەوڕات پێکدێنن، جگە لە هەرسێك کتێبی: (مَشْناه) و (جَمَارَاه) و (تلمود).

## دووەم: کتێبی زەردەشتایەتیی:

کتێبی (ئاڤێستا) بە کتێبی ئایینی زەردەشتایەتیی دادەنرێ و، بە حیساب دەبێ وەحیی خوا بووبێ و بۆ (زەرادەشت)، یان (زەردەشت)ی ناردبێ و، من ئێستا تەرجەمەیەکی عەرەبیی (ئاڤێستا)م لەلایە بە ناوی (نصوص أڤیستا)[1]، کە بێگومان بەشێکی کەمی (ئاڤیستا)ی ئەسڵییە و ئەو کتێبە، لە پێنج بەشان پێکهاتوە:

١- (النسك الأول: یاسنا).

٢- (النسك الثاني: فیسبرد).

٣-- (النسك الثالث: فیندیدات).

٤- (النسك الرابع: یاشت).

٥- (أفیستا الصَّغیر).

ئنجا وەك دوایی باسی دەکەین - لە بڕگەی چوارەمی باسی چوارەم: (تێکدران و شێوێنرانی کتێب و بەرنامەکانی خوا)دا - وەك چۆن لە پەیمانی کۆندا زۆر شتی تێدایە بە هەموو شتێك دەچێ، بە فەرمایشتی خوا نەبێ، (ئاڤیستا)ش بە هەمان شێوە، گەلێك شتی تێدایە ناچێتەوە سەر وەحیی خوای پەروەردگارو، لەگەڵ عەقڵ و مەنتیق و لەگەڵ ڕووحیی خواپەرستیی و خوا بەیەکگرتندا ناگونجێ.

## سێیەم: کتێبی نەصرانییەکان:

لە چوار وردە خاڵاندا باسی کتێبی ئایینی نەصرانییەکان دەکەین:

**خاڵی یەکەم:** بە نسبەت نەصرانییەکانەوە، خوای بێ وێنە تەنیا باسی ئینجیل دەکات کە بۆ عیسا (علیه السلام)ی دابەزاندوە، (ئینجیل)یش بە مانای

---

(١) نصوص أفستا وقراءة في النص الأفستاني، إبراهيم محمود، ط٢٠١٣، تموز/ طباعة، نشر، توزيع.

موژدەو هەواڵی خۆش دێ، ئنجا لە قورئاندا خوای پەروەردگار تەنیا باسی دابەزاندنی یەك ئینجیلی كردوە، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾ المائدة.

واتە: بەدوای وان (واتە: پێغەمبەران)دا عیسای كوڕی مەریەممان نارد، كە ئەو تەوراتەی لە پێشیەوە بوو بە ڕاستیی دەزانی و ئینجیلیشمان پێدا، كە ڕێنمایی و ڕووناكیی تێدابوو....

كەواتە: خوا (سبحانه وتعالى) باسی ئەوە دەكات یەك كتێبی بۆ عیسا (عليه السلام) ناردوە، بەڵام ئێستا نەصرانییەكان - جگە لە پەیمانی كۆن بە هەر سی و نۆ (٣٩) كتێبەكەیەوە، بەڵكو بە هەر چل و نۆ (٤٩) كتێبەكەیەوە، چونكە (الكتاب المقدس: قراءة رعائية) دە (١٠) كتێبی تەرجەمە یۆنانییەكەشی خستوونە گەڵ - چوار (٤) ئینجیلیان هەن و دە (١٠) كتێبی دیكەشیان خستوونە گەڵ (٤+١٠=١٤) بە هەموویان دەڵێن: پەیمانی نوێ (العهد الجديد).

**خاڵی دووەم:** ئینجیلێكی دیكەش كە نەصرانییەكان دانی پێداناهێنن، بریتیە لە ئینجیلی بەڕنابا (إنجيل برنابا)، ئنجا هەرچەندە ئەوان دانی پێداناهێنن، بەڵام ئەم ئینجیلە ڕاستیی زۆر گرنگی تێدان و نەصرانییەكان زۆر پێی قەڵسن، چونكە ئەوەی كە لەم ئینجیلی (بەڕنابا)یەدا هاتوە، لەگەڵ ئەوەی كە لە قورئاندا هاتوە، زۆربەی تێكدەكاتەوە، بە تایبەت لە بارەی عیساوە (عليه السلام) كە خوا چۆن دەربازی كرد؟!

ئەمەش دەقی ئەوەیە كە لە (ئینجیلی بەڕنابا)دا هاتوە لەو بارەوە:

{الفصل الخامس عشر بعد المئتين:

١) ولما دنت الجنود مع يهوذا من المحلِّ الذي كان فيه يسوع، سمع يسوع دنوَّ جمّ غفير، ٢) فلذلك انسحب إلى البيت خائفاً، ٣) وكان الأحد عشر نياماً، ٤) فلما رأى الله

الخطر على عبده، أمر جبريل وميخائيل ورفائيل وأوريل سُفراءَهُ، أن يأخذوا يسوع من العالم، ٥) فجاءَ الملائكة الأطهار، ٦) وأخذوا يسوع من النافذة المشرفة على الجنوب، ٧) فحملوه ووضعوه في السماءِ الثالثة في صحبة الملائكة التي تُسبحِّ الله إلى الأبد}.

دەربارەی گۆڕانی (یهوذا)ش بۆ سەر شێوەی (عیسی) ئەمە هاتوە:

{الفصل السادس عشر بعد المئتين:

١) ودخل يهوذا بعنفٍ إلى الغرفة التي أُصعِدَ منها يسوع، ٢) وكان التلاميذ نياماً، ٣) فأتى الله العجيب بأمرٍ عجيب، ٤) فتغيَّر يهوذا في النطقِ وفي الوجه فصار شبيهاً بيسوع حتى أننا اعتقدنا أنه يسوع، ٥) أما هو فبعد أن أَيْقَظَنَا أَخذ يُفتِّشُ لينظر أين كان المعلِّم؟ ٦) لذالك تعجَّبنا وَأَجَبْنا: أنت ياسيد هو مُعلِّمنا، ٧) أنسيتنا الآن؟ ٨) أما هو فقال مُبتَسماً: هل أنتم أغبياء، حتى لاتعرفون يهوذا الأسخريوطي؟!}

چونکە لە هەر چوار ئینجیلەکاندا دەڵێ: عیسا لە سێدارە درا، کە ئەوە ناڕاستە و ئەفسانەیە، خوا بە دەقی ئایەت دەفەرموێ:

﴿ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ ﴾ النساء.

واتە: هەروەها ئەو قسەیان (هی جوولەکەکان): ئێمە مەسیح عیسای کوڕی مەریەم پێغەمبەری خوامان کوشتوە! نەیانکوشت و هەڵیاننەواسی، بەڵکو وێنەی ویان بۆ برایە سەر یەکێکی دی، {ئەوی دیکە کە ناوی یەهووذای ئەسخەریوطیی بوو لە سێدارە درا لە جیاتی عیسا (علیه السلام)}[1]. ئەوانەش کە تێیدا ڕاجیان، لە بارەیەوە لە دوو دڵییی دان، جگە لە گومان هیچ زانیارییان لە بارەیەوە نیە، بە دڵنیاییش نەیانکوشت.

---

(١) لە تەفسیری سووڕەتەکانی: (النساء) و (المائدة)دا بە تەفصیلْ باسی ئەو مەسەلەیەمان کردوە.

لە ئینجیلی (بەڕنابا)دا زۆر بە وردیی ئەوە باس دەکات[1]، کە لە کاتێکدا هەردوازدە حەوارییەکە لەگەڵ عیسادا (علیه السلام) لە شوێنێك دەبن، ڕۆمەکان دێن دەوری ئەو شوێنە دەگرن و خواش (سبحانه وتعالی) عیسا (علیه السلام) بە کڵاو ڕۆژنەدا سەر دەخات و، وێنەی عیسا دەچێتە سەر یەهووذای ئەسخەڕیوطیی - کە سیخوڕیی لەسەر عیسا کردوە لە بەرانبەر پارەدا - ئیدی ڕۆمەکان یەهووذا دەگرن، هەرچەندە دەڵێ: من عیسانیم و عیسا بەرز کرایەوە، نەخێر لێی ناسەلمێنن و، تاجێکی لە دڕکی لەسەر دەنێن، وەك ئیهانە و سووکایەتیی پێکردن و، لە سێدارەی دەدەن.

کە ئێستاش لەگەڵدابێ نەصرانییەکان هەر وادەزانن هەر عیسایە لە سێدارە دراوە، بۆیە خاچ بە ملی خۆیاندا دەکەن!

ئنجا چوار ئینجیلەکان و ئەو دە (١٠) کتێبانەی دیکەش، کە نەصرانییەکان وەك کتێبی پیرۆزی خۆیان تەبەننییان کردوون، ئەمانە ناوەکانیانن:

١- إنجيل متى/ ٢٨ إصحاح

٢- إنجيل مرقُس/ ١٦ إصحاح

٣- إنجيل لوقا/ ٢٤ إصحاح

٤- إنجيل يوحنا/ ٢١ إصحاح

= ٨٩ إصحاح

٥- أعمال الرسل

٦- رسائل بولس (الأربعة عشر)

---

(١) بڕوانە: (إنجيل برنابا) تَرْجَمَهُ عن الإنجليزية: الدكتور خليل سعادة/ط١/١٩٠٨م ص ٣٠٧ - ٣١٥. ئەمەش دەقی قسەکەی (يهوذا الأسخريوطي)یە کە ئیعتیراف دەکات وێنەی عیسای براوەتە سەر و عیسا بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان: {(٤٤) أجاب يهوذا: صدِّقني ياسيد إنك اذا أمرت بقتلي ترتكب ظلماً كبيراً لأنك تقتل بريئاً، ٤٥) لأني أنا يهوذا الأسخريوطي لايسوع الذي هو ساحِرٌ فحوَّلني هكذا بِسِحرِهِ}. إنجيل برنابا، ص٣١٢، الفصل: ٢١٦.

٧- رسالة يعقوب

٨- رسالة بطرس الأولى

٩- رسالة بطرس الثانية

١٠- رسالة يوحنّا الأولى

١١- رسالة يوحنّا الثانية

١٢- رسالة يوحنّا الثالثة

١٣- رسالة يهوذا

١٤- رؤيا يوحنّا

= ١٣٤ إصحاح

٨٩ + ١٣٤ = ٢٢٣ إصحاح

**خاڵی سێیەم:**

نەصرانییەکان ئێستا سێ کۆمەڵی لە یەك جیان:

١- (کاثولیك).

٢- (پروتستانت).

٣- (ئەرثذۆکس).

ئەو سێ کۆمەڵە وەك خاوەنی سێ ئایینی جیاواز و سەربەخۆ بن، دیارن.

**خاڵی چوارەم:**

بۆ هەڵسەنگاندنی سەرجەم کتێبەکانی خاوەن کتێبان، بە جوولەکەو نەصرانییەوە، ئەوەندە بەسە کە ئێمە ئەم چەند دێڕە لە پێشەکی (الكتاب المقدس: قراءة رعائية) بخوێنینەوە، کە دواییش لەو بارەوە زیاتر دەدوێین:





(حِينَ نُلقي نظرة إلى فهرس الكتاب المقَدَّس، فَنكشف أَنَّنَا أَمَام مَجْمُوعَة مِنَ الأَسفار أو الكُتُب المُخْتَلِفَة، وَدُوِّنَت عَلَى مُدَى عَشَرَة قُرُون مِنَ الزَّمَن، بيد كتابٍ مختلفين بثلاث لغات هي: العبرية والآرامية واليونانية).

واتە: کاتێك ئێمە چاو بە پێڕستی کتێبی موقەددەسدا دەگێڕین، خۆمان لە بەرانبەر کۆمەڵێك کتێبی جیاوازدا دەبینینەوە، کە لە ماوەی دە (١٠) سەدەدا نووسراونەوە، بە دەستی کۆمەڵێك نووسەری جیا جیا و، بە سێ زمانی جیا جیا: عیبریی و ئارامیی، یۆنانیی.

کەواتە: ئەم کتێبە لە ماوەی دە (١٠) سەدەدا، واتە: لە ماوەی هەزار (١٠٠٠) ساڵدا نووسراوەتەوە، لەیەلان کۆمەڵێك نووسەرەوە و بە سێ زمانی جیا جیا!!

## چوارەم: کتێبی ئایینی صابیئە:

بۆیە ئەوەم خستە دوای کتێبی نەصرانییەکان، چونکە بە حیساب یەکێك لە دوو کتێبەکانی (صابئة): (دِرَاشَة أَدِيهيا، مَوَاعِظ وَتَعَالِيم يَحْيى بن زَكَرِيَّا (عليه السلام))یە.

ئنجا یەحیای کوڕی زەکەرییا لەگەڵ عیسادا سەلامی خوایان لەسەر بێت، دایکیان خوشکن و دەبنە کوڕە پلکی یەکدی و، هاوکات بوون پێکەوە.

(صابئة) دوو کتێبیان هەن:

١- (كنزا ربّا: الكنز العظيم: الكتاب المقدس للصابئة المندائيين) ئەم کتێبە لە دوو بەش پێکهاتوە، کە یەکەم کتێبە من بەو شێوە بیبینم:

بەشی لای ڕاستیی: سێسەد و نۆ (٣٠٩) لاپەڕە.

بەشی لای چەپی: سەد و سی و شەش (١٣٦) لاپەڕە.

٢- (دِرَاشَة أَدِيهيا، مَوَاعِظ وَتَعَالِيم يَحْيى بْن زَكَرِيَّا (عليه السلام)):

کە ئێمە دوایی لە کاتی هەڵسەنگاندنی ئەم دوو کتێبەدا، قسە لەسەر نێوەڕۆکیان دەکەین[١].

---

(١) چ وەك ئاماژەی قورئان و چ وەك واقیعی مێژوویی، بێجگە لە مسوڵمانان، تەنیا ئەو چوار کۆمەڵە خەڵکە: (جوولەکە، مەجووسیی، نەصرانیی، صابیئە)، کتێبی خوایی و ئاسمانییان بۆ باسکراوە، خەڵکی دیکەی جیا لەم چوار کۆمەڵە، ئەگەر ئیددیعای هەبوونی کتێبی ئاسمانییشیان کردبێ، لێیان نەسەلمێنراوە، هیچ بەڵگەیەکیان نەبووە، بۆ نموونە: یەزیدییەکان (الیزیدیون) ئنجا لێرەدا - لەم پەراوێزەدا - بە باشی دەزانم (لا باسێك لە بارەی یەزیدییەکانەوە) بنووسم تاکو هەر کەس بیەوێ لە بارەی ئەو کۆمەڵە خەڵکەوە بەرچاو ڕوونیی هەبێ و، دڵنیاش بێ کە هیچ کتێبێکی ئاسمانییان نیە و، تەنیا یەکێکن لەو پیر و تاقمە زۆرانەی لە مێژووی مسوڵماناندا، گیرۆدەی لادان (إنحراف) بوون لە ڕاستە شەقامی شەریعەت: {شایانی باسە ئەو (لاباس)ە، دەقی ئەو وتارەیە کە لە کتێبی سێیەمی مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی...)دا لەبارەی یەزیدییەکانەوە هێناومانە، بڕوانە لاپەڕە: ١٨٨ - ١٩٢}.

**لاباسێك لە بارەی یەزیدییەکانەوە**

یەزیدییەکان (الیزیدیة):

یەزیدییەکانیش قسە زۆرن لە بارەیانەوە، هەوڵ دەدەم بە کورتیی و بە ئینصافەوە، هەرچی پێویستە لە بارەیانەوە بیهێنم، واقیعی خۆیان چۆنە ئاوا.

شایانی باسە: کاتی خۆی {٢٠١٠-٢٠١٤ز} من لە ئەنجوومەنی نوێنەران لە بەغداد، هەندێ یەزیدییم لەگەڵدا بوون، دەیانگوت: ئێمە ئایینەکەمان، پێش ئیسلامیشە! هەروەها دەیانگوت: ئێمە ناومان (ئێزدیی) یان (ئێزەدیی)یەو ناوی خۆمان دەبەینەوە سەر یەزدان!! بەڵام ئەوەی کە ڕاستەو، قەناعەتم پێیەتی و مێژوو دەیگەیەنێ، ئەوەیە کە ئێستا لە سێ خاڵاندا بۆتان باس دەکەم:

**یەکەم: پێناسەی یەزیدییەکان:**

(اليزيدية فرقة نشأت سنة (١٣٢)هـ إثْر انهيار الدولة الأموية، كانت في بدايتها حركة سياسية لإعادة مجد بني أمية، ولكن الظروف البيئية وعوامل الجهل انحرفت بها، فأوصلتها إلى تقديس يزيد بن معاوية، وإبليس الذي يطلقون عليه إسم (طاوس ملك) وعزازيل).

واتە: یەزیدییەکان گرووپێکن لە دوای ساڵی (١٣٢)ك، لەو ساڵەدا کە دەوڵەتی ئومەویی ڕووخا، دامەزراون، لە سەرەتاوە ئەمانە کۆمەڵێکی سیاسیی بوون، ئامانجیان ئەوەبوو حوکمی

بەنو ئومەییە بگێڕنەوە، بەڵام هەل و مەرجی ژینگەیی و نەزانیی، ئەوانەی لاداو، گەیاندنی بە ئەندازەیەك (کە دوایی باسی دەکەین، چۆن؟) کە یەزیدی کوڕی موعاویە زۆر بە پیرۆزو پاك بگرن، پاشان ئیبلیسیش (ئەوان پێی ناڵێن: ئیبلیس و پێشی ناڵێن: شەیتان) کە پێی دەڵێن: تاوس مەلەك، یان مەلەك تاوس و پێشی دەڵێن: عەزازیل.

**دووەم: چۆنیەتی سەرهەڵدانیان:**

دوای ئەوەی کە دەوڵەتی ئومەویی و سوپای ئومەوییەکان، لە ڕووباری گەورە لە باکووری عێراق لە ساڵی (١٣٢ك)دا تێك شکا، لەبەرامبەر سوپای عەبباسییەکاندا، کە تازە شۆڕشیان دەکردو ڕادەپەڕین، فەرماندەی سوپایەکە کە ناوی: (إبراهيم بن حرب بن خالد بن يزيد) بوو، دوای ئەوەی تێك شکا، ڕای کرد بەرەو باکووری عێراق و، سوپا تێك شکاوەکەی ئومەوییەکانی کۆ کردەوەو، بانگەشەی ئەوەی کرد کە یەزیدی کوڕی موعاویە، زۆر شایستەتر بووە بە جێنشینایەتیی، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە مسوڵمانان بە گشتی گوتوویانە، ئنجا ئەوەشی خستە پاڵ و گوتی: یەزیدی کوڕی موعاویە ئەو سوفیانییەیە کە چاوەڕێ دەکرێ، بێ، ئنجا بۆچی چوونە باکوور (ناوچە کوردییەکان)؟ چونکە دایکی مەڕوان (مەڕوانی دووەم) ئەو مەڕوانەی کە لە ڕۆژگاری ئەودا دەوڵەتی ئومەویی ڕووخا، دایکی ئەو مەڕوانە کورد بووە، ئنجا چوونەتە لای خزمانیان لەوێ، لەسەرەتاوە بیرۆکەکە هەروا هاتوە، ئیدی وردە وردە هەر تێیان پەڕاندوەو تەقدیسیان کردوەو مەدحیان کردوە.

**سێیەم: دامەزرێنەرانی:**

چوار کەسی سەرەکیی دامەزرێنەری گرووپی یەزیدیین:

کەسایەتیی یەکەم: (عَدِي بن مُسافر) کە یەکێ بووە لەوانەی کاتی خۆی دوای ئەوەی عەبباسییەکان دەسەڵاتیان هەبووە، هەر خۆیان شاردۆتەوە، لە سەدەی پێنجەمی کۆچییدا ژیاوە، لەچەنگ عەبباسیەکان ڕایکردوەو دوایی لە لوبنانەوە دەچێ بۆ ناوچەی {هەکاریی} ڕەچەڵەکی دەچێتەوە سەر مەڕوانی کوڕی حەکەم، شۆرەتی (شرف الدين) بووەو (أبو الفضائل) یشیان پێگوتوە، ئەو پیاوە بە شێخ عەبدولقادری گەیلانیی گەیشتوەو تەریقەتی تەصەووفی لێ وەرگرتوەو، یەکێ بووە لە خەلیفەکانی، دەڵێن: پیاوێکی زۆر چاك بووە (إبن تيمية) لە کتێبەکانی خۆیدا مەدحی دەکات، دەڵێ: عەدی پیاوێکی دیندارو پارێزکارو چاکەکار بووە، لە ساڵی (١٠٧٣ز) یان (١٠٧٨ز)دا، لەدایك بووە، لە تەمەنی نەوەد (٩٠) ساڵییدا وەفاتی کردوەو، لە {لالش} ئەو لالشەی ئێستای ناوچەی شێخان، بەخاك سپێردراوە.

کەسایەتی دووەم: (صخر بن صخر بن مسافر)ە، نازناوەکەی (أبو البركات) بووە، ئەویش لەگەڵ مامیدا ڕۆیشتوەو لەدوای خۆیشی بۆتە جێنشینی.

کەسایەتیی سێیەم: (عدي بن أبي البركات) کە (أبي المفاخر)یشیان پێ گوتوەو بە (الكوردي) ناودار بووە، لە ساڵی (٦١٥ك)دا وەفاتی کردوە.

کەسایەتیی چوارەم: (شمس الدين أبو محمد) کە ناسراوە بە: (شيخ حسن) (٥٩١-٦٤٤ك)، لەسەردەمی ئەودا یەزیدییەکان لادەدەن و زێدەڕۆیی دەکەن لە خۆشویستنی یەزیدو عەدی کوڕی موسافیرداو، جۆرێك لە پەرستنیان بۆ دەکەن، دوایی ئەو زێدەڕۆییە سەر دەکێشێ بۆ پەرستنی ئیبلیسیش! ئنجا ئەو (شێخ حسن)ە، یەکەم کتێب بۆ یەزیدییەکان دادەنێ بەناوی (الجلوة لأصحاب الخلوة)، هەروەها کتێبی (موصحەفی ڕەش)یشیان هەیە، کە کۆمەڵێك بیرۆکەی فەلسەفەو ئایینە کۆنەکانیان هێناوە، بە تێکەڵ و پێکەڵیی.

ئەگەر بەشێوەیەکی زنجیرەی یەك لەدوای یەك، سەرنجی مێژووی سەرهەڵدانی ئایینی یەزیدیی بدەین، دەبینین، بەمجۆرەیە:

١- دوای شەڕی (کەربەلاء) کە ئاشکرایە لەلای هەمووان لەسەردەمی (یەزید)دا شەڕی کەربەلا و ڕووەدات و، حوسەینی کوڕی عەلی خوا لێیان ڕازی بێ، لەگەڵ کۆمەڵێك لە خزمانی، بە زوڵم دەکوژرێن.

٢- دوای ئەوە شیعە دەست دەکەن بە جنێو پێدان و لەعنەت لێکردنی یەزیدی کوڕی موعاویە.

٣- ئنجا بەشێك لە کوڕو کچ و نەوەکانی یەزیدو خزمەکانیان بە تایبەت و، ئومەوییەکان بە گشتیی، لە کاردانەوەی شیعەدا کە قسان بە یەزید دەڵێن، دێنن زۆر تەقدیس و ستایشی یەزید دەکەن.

٤- دوایی نکووڵیی دەکەن لە نەفرین لێکردنی یەزیدو، دێن نکووڵیی دەکەن لە نەفرین لێکردن لە هەر شتێك.

٥- پاشان تەماشا دەکەن خوا لە قورئاندا لەعنەتی لە ئیبلیس کردوە، چی بکەن؟ دەڵێن: خوا لەعنەتی لە ئیبلیس نەکردوە کە ئەوان ناڵێن: ئیبلیس، دەڵێن: (مەلەك تاووس) بەڵکو ئەوە مسوڵمانان بۆخۆیان ئەوەیان خستۆتە نێو قورئانەوە، ئەگەرنا ئەو زاتێکی زۆر گەورەیەو، هی ئەوە نیە نەفرینی لێ بکرێ، پێشتر دیارە بڕوایان بە قورئان بووە.

٦- دوایی بۆ پاساودانەوەی ئەوە کە نابێ لەعنەت لە ئیبلیس بکرێ، دەڵێن: ئیبلیس ئەو زاتە بووە کە ئامادە نەبوو سەجدە بۆ غەیری خوا بەرێ.

من جارو بار کە قسەم لەگەڵ یەزیدییەکاندا کردوە، گوتوومە: ئەو برادەرەی ئێوە ئەوەندە خوای لەلا گەورە بووە، بەقسەی خواشی نەکردوە! چونکە ئەوان دەڵێن: مەلەك طاووس سەجدەی بۆ ئادەم نەبردوە، چونکە گوتوویەتی: سەجدە بۆ غەیری خوا نابەم!



## پێنجەم: کتێبی مسوڵمانان (قوڕئان):

ئاشکرایە کتێبی مسوڵمانان، قوڕئانی مەزن (القرآن العظیم)ە[1].

هەڵبەتە ئێمە دوایی بەراوردێك دەكەین لە نێوان (پەیمانی كۆن) كە جوولەكەكان تەبەننییان كردوە، هەروەها (ئاڤێستا)ی مەجووسییەكان، زەردەشتییەكان، ئنجا (پەیمانی كۆن) و (پەیمانی نوێ)ی نەصرانییەكان، پاشان (كَنْزَا رَبَّا) و (دِرَاشَة

---

بەڵام ئەو سەجدە بردنە - وەك زۆر جاری دیکەش باسمان کردوە - بریتیی بووە لە سڵاو لێکردن و ڕێز لێگرتن، وەك لە تەفسیری سووڕەتی (یوسف) و (النحل)دا بەدرێژیی لەو بارەوە دواوم، بەڵام ئەوان ئەوە بە فەزیڵەت بۆ ئیبلیس لەقەڵەم دەدەن!

لە کۆتایی ئەم (لاباس)ە شدا، ئەم سێ خاڵە دەنووسین:

١)- زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە یەزیدییەت لە ئەسڵدا دەگەڕێتەوە بۆ (الشیخ عدي بن مسافر) کە لە ساڵی (٤٧٦ك/١٠٧٤ز)دا لە گوندێکی ناوچەی (البقاع اللبناني) لە دایك بووە و، دوایی چۆتە بەغداد و لەسەر دەستی (الشیخ عبدالقادر الجیلاني) تەریقەتی وەرگرتوە.

٢)- خاوەنی کتێبی: (الدیانة الإیزیدیة بین السائل والمجیب) دەڵێ: (الدیانة الإیزیدیة لم تؤسَّس على يدَ نبيٍّ مُحَدَّدٍ، وهي تؤمن بسائر أنبياء ورسل الله عزوجل، بدءاً من آدم ... ومروراً لخاتمهم).

کەواتە: ئەمەش ئەو ڕایە پشت ڕاست دەکاتەوە کە یەزیدییەکان ئۆممەتێکی خاوەن پێغەمبەر و خاوەن کتێبی ئاسمانیی نین و، گرووپێکی لادەری نێو مسوڵمانانن.

٣)- لە کتێبی ناوبراودا ناوی هەشتا و سێ (٨٣) کتێب و نامیلکەی یەزیدییان هاتوە کە دەماودەم (شفاهاً) نەقڵ کراون و، نووسراوە نین و، نکووڵییش کراوە لە ڕاستیی هەرکام لە (جِلْوة) و (المصحف الأسود - مسحفا ڕەش) کە هی ئایینی یەزیدیی بن و، گوتراوە: ساختە (مُزَوَّر)ن.

کەواتە: یەزیدییەکان هیچ کتێبێکی نووسراوی جێی متمانەی خۆیشیانیان نیە!

(١) بێگومان ڕێبازی پێغەمبەر (سُنَّة النبي)یش لەگەڵ قوڕئاندا تێکهەڵکێشە و جیاواز نیە، چونکە سوننەت بریتیە لە چۆنیەتی پڕاکتیزە (تطبیق)کردنی قوڕئان لەسەر ئەرزی واقیع و، کاکڵ و جەوهەری سوننەتیش قوڕئانە.

أَدِیهیا)ی صابیئە، هەروەها قورئانی مسوڵمانان، بۆ ئەوەی دەربکەوێ ئایا کام لەو کتێبانە - وەك واقیعی ئێستایان کە هەن، نەك وەك ئەسڵەکەیان کە (جگە لە قورئان) هیچ کامیان دیار نین - بە فەرمایشتی خوا دەچێ و، کام لەوانە دەگونجێ دەستکاریی نەکرابێ و، بە کەڵکی ئەوە بێ، ئێمە چ وەك ڕێنمایی و هیدایەت و چ وەك بەرنامەو ئایینی خوا، پەیڕەویی لێ بکەین و بمانگەیەنێ بە خواناسیی ڕاستەقینە و، پەرستنی ڕاستەقینە و، بە دینداریی ڕاستەقینە و، ڕێکخستنی کاروباری دینداریی و دنیادارییمان لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییماندا؟! تاکو وەڵامی ئەو پرسیارەمان دەست بکەوێ کە دەڵێ: شوێن کام ئایین و بەرنامەی خوا بکەوین و، چ پەرستراوێك بپەرستین؟!







# باسی چوارەم



## هۆكارە ڕاستەقینەكانی ئیلحاد

دەســـــتپێك

بەڕێـــــزان! دوای ئەوەی لە ڕابردوودا - لە باسی سێیەمدا - باسی بیانووە پووچەڵەكانی ئیلحادمان كرد، لەم باسی چوارەم و كۆتاییەی ئەم بەشی سێیەمەدا، باسی هۆكارە ڕاستەقینەكانی ڕووكردنە ئیلحاد و خوا نەناسیی و پشتكردنە خوای بەرز و مەزن دەكەین و، هۆكارە ڕاستەقینەكانی ڕووكردنە ئیلحادی مولحیدانیش - بە ڕای من - ئەم حەوتەن:

١) خوتخوتەو دنەدانی شەیتان.

٢) خۆبەزلگریی و لە خۆبایی بوونی بابای مولحید.

٣) ئارەزوو پەرستیی و دنیا ویستیی.

٤) تێكدران و شێوێنرانی كتێب و بەرنامەكانی خوا.

٥) پشت نەبەستن بە وەحیی ڕاست و دروست و دەستكاریی نەكراویی خوا.

٦) واقیعی پێشكەوتووانەی ئەهلی كوفرو، واقیعی دواكەوتووانەی ئەهلی ئیسلام.

٧) ڕەواج پێدانی ئیلحاد لەلایەن زلهێزە باڵادەست و دەستڕۆیشتووەكانەوە.

بەڵێ بەڕای بەندە:

ئەم حەوتە، هۆکارو هاندەرەکانی ئیلحادن لەم ڕۆژگارەی ئێستای ئێمەدا.

بەڵێ بەڕێزان! دوای ئەوەی ئێمە دە (١٠) دانە لە بیانووە پووچ و بۆشەکانی ڕووە لە ئیلحاد کردنی هەندێك لە مولحیدەکانمان خستنە ڕوو و، بە تەرازووی عەقڵ و زانست هەڵمانسەنگاندن، ئێستا نۆرەی خستنەڕووی هۆکارو هاندەرە ڕاستەقینەکانی ڕووە لە ئیلحاد کردنی ئەو کەسانەیە، کە بەرەو زەلکاو و هەڵدێری ئیلحادو خوانەناسیی ڕۆیشتوون:

## هۆکاری یەکەم: خوتخوتەو دنەدانی شەیتان (وسوسة الشيطان):

ئیبلیس هەر لەو ڕۆژەوە کە لەلایەن خوای کارزان و دادگەرەوە لەسەر بێ فەرمانیی کردنی - کە بریتی بوو لە کڕنووش نەبردنی ڕێزلێنان بۆ ئادەم (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) - نەفرینی لێکرا، لەو ڕۆژەوە ئیعلانی دوژمنایەتییەکی سەرسەختی لەگەڵ ئادەم و وەچەکەیدا کرد، وەك لە سوورەتی (الأعراف)دا خوا (سبحانە وتعالى) ئەو بەسەرهاتەمان بۆ باس دەکات، کە دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ مَكَّنَّٰكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ ۗ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿١٠﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿١١﴾ قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ ۖ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾ قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿١٣﴾ قَالَ أَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤﴾ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿١٥﴾ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ قَالَ ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا ۖ لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٨﴾ ﴾.





لەم نۆ (٩) ئایەتەدا، خوا (سبحانه وتعالى) بەسەرهاتی چۆنیەتی دەستپێکردنی دوژمنایەتیی ئیبلیس بۆ ئادەم و وەچەکەیمان بۆ دەخاتەڕوو، کە بە کورتیی مانایان دەکەین و، ئێمە لەبەرگی حەوتەمی تەفسیری خۆماندا (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)، کە تەرخان کراوە بۆ ڕوون کردنەوەی ماناو مەبەستەکانی ئایەتە پیرۆزەکانی سووڕەتی (الأعراف) بە درێژیی لەو بارەوە قسەمان کردوە.

خوا دەفەرموێ: بەدڵنیایی ئێوەمان لە زەویدا دەستڕۆیشتوو کرد و، هۆکارەکانی ژیان و گوزەرانمان بۆ ڕەخساندن، بەڵام بە کەمیی نەبێ سوپاسگوزاریی ناکەن. ئێمە ئێوەمان وەدیهێناو دوایی وێنەمان کێشان، دوایی بە فریشتەکانمان فەرموو: کڕنووش بۆ ئادەم بەرن، هەموویان کڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس لە کڕنووش بردووان نەبوو. (کە دیارە مەبەست لە کڕنووش بردن، ڕێز لێ گرتن و سڵاو کردن بووە لە ئادەم) (خوا) فەرمووی: چ شتێك ڕێی لێگرتی کە کڕنووش بەری کاتێك فەرمانم پێکردی؟ (ئیبلیس) گوتی: من لەو چاکترم، منت لە ئاگر دروستکردوە و ئەوت لە قوڕ دروستکردوە. (خوا) فەرمووی: لێی دابەزە خوار (لە بەهەشت، یان لە ئاسمان)، بۆت نیە لەوێدا خۆت بە زلبگری، لێی بچۆ دەرێ تۆ لە زەبوونانی. (ئیبلیس) گوتی: مۆڵەتم بدە تا ئەو ڕۆژەی تێیدا زیندوو دەکرێنەوە! (خوا) فەرمووی: تۆ لە مۆڵەتدراوانی، (بەڵام نەك تا ئەو ڕۆژە، بەڵکو تا ئاخیر زەمان، وەك لە شوێنی دیکەدا هاتوە)، (ئیبلیس) گوتی: بە هۆی ئەوەوە کە منت گومڕا کرد، لەسەر ڕاستە شەقامی تۆ بۆیان دادەنیشم، دوایی لە پێشیانەوە و لە دوایانەوە و لە لای ڕاستیان و لە لای چەپیانەوە بۆیان دەچم و، زۆربەیانت سوپاسگوزار چنگ ناکەوێ، (دەیانبینی زۆربەیان سپڵەو ناسپاس دەکەم)، (خوا) فەرمووی: لێی بچۆ دەرێ بە سەرزەنشتکراویی و بەتێکشکاویی، هەر کەسێ شوێن تۆ بکەوێ، دۆزەخ لە تێکڕاتان پڕ دەکەم.

ئیبلیس هەر لەو ڕۆژەوە، کاری ئەوە بووە کە مرۆڤەکان لە خوا دووربخاتەوە، هەر بۆیەش خوا (سبحانه وتعالى) زۆرجار هۆشداریی پێداوین، لەبارەی دوژمنایەتیی شەیتانەوە، بۆ وێنە، خوا دەفەرموێ:

﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ٢٧ ﴾ الأعراف.

(خوا بانگمان دەكات)، واتە: ئەی وەچەی ئادەم! شەیتان هەڵتان نەخەڵەتێنێ، وەك چۆن باب و دایكتانی لە بەهەشتێ دەركرد، پۆشاكەكەی لێدادەڕنین، تاكو عەیب و عاری خۆیانیان پیشاندا، ئیبلیس خۆی و وەچەكەی دەتانبینن، بەبێ ئەوەی ئێوە ئەوان ببینن، ئێمە شەیتانەكانمان كردوون بە دۆست و نیزیكی ئەوانەی بڕوا ناهێنن.

هەروەها لە سووڕەتی (فاطر)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ٥ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ٦ ﴾.

(خوا بانگمان دەكات)، واتە: ئەی خەڵكینە! بەڵێنی خوا ڕاستە، با ژیانی دنیا فریوتان نەدات و، با فریودەر بەرانبەر بە خوا هەڵتانەخەڵەتێنێ، (فریودەر، واتە: شەیتان)، بە دڵنیاییی شەیتان دوژمنتانە، ئێوەش بە دوژمنی بگرن، ئەو كۆمەڵەكەی خۆی بانگ دەكات تاكو بیانكاتە هاوەڵی كڵپەی دۆزەخ.

بەڕێـــزان!

ئێمە دەتوانین خوتخوتەو دنەدانی شەیتان بۆ تێگەیشتن، بەراورد بكەین لەگەڵ كاریگەریی میكرۆب و ڤایرۆسدا، خوتخوتەی شەیتان دژی ڕووحە، بەڵام میكرۆب و ڤایرۆسەكان دژی جەستەن، زیان بە جەستە دەگەیەنن، بە شێوەیەكی پەنهان، خوتخوتەی شەیتانیش زیان بە ڕووح و نەفس دەگەیەنێ، بە شێوەیەكی پەنهان.

بە داخەوە كە زۆربەی خەڵكی لە شەیتان و لە فێڵەكانی بێ ئاگان، هەر بۆیەش خوا (سبحانه وتعالى) لە چەند شوێنی قورئاندا، مرۆڤایەتیی ئاگاداركردۆتەوە و هۆشداریی پێداوە، كە وریابن لە فێڵ و پیلان و تەڵەكەی شەیتان!

ئەگەرنا بە ڕاستیی زۆر سەیرە کە هەندێك لە مرۆڤەکان بە قسەی: فیطرەتی خۆیان، ناخی خۆیان و بە قسەی عەقڵ و، بە قسەی زانست و، بە قسەی وەحیی و پەیامی خوا نەکەن، بەڵام بە قسەی شەیتان بکەن و پشت لە خوا بکەن! بۆیە ئەوە هیچ گومانی تێدانیە، کە ئەوانەی پشت لە خوا دەکەن، واتە: خوانەناسن، یانی: گوێ نادەنە، بانگ کردنی ناخیان، فیطرەت و زگماکیان، گوێ نادەنە عەقڵ و یاساکانی، گوێ نادەنە زانست و بەرهەمەکانی، گوێ نادەنە وەحیی و ئەو پەیامانەی کە خوا ناردوونی بە پێغەمبەراندا بۆ مرۆڤایەتیی، کەسێك وا بکات، دیارە هێزێکی دیکە هەڵیدەخەڵەتێنێ، کە ئەویش بریتیە لە شەیتان و وەسوەسەی شەیتان، بۆیە ئەگەر بڵێین: ئیلحاد ئایینێکی شەیتانییە، ئایینێکی ئیبلیسییە، شتێکی زۆر ڕاستمان گوتوە.

لە سوورەتی (یس)دا خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٦٠ وَأَنِ ٱعۡبُدُونِيۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ٦١﴾.

واتە: ئەی وەچەی ئادەم! ئایا پێم ڕانەگەیاندن: شەیتان مەپەرستن! ئەو دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئێوە و، تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن، ئەوە ڕێی ڕاستە.

لەم دوو ئایەتە موبارەکەوە دەتوانین ئەوە هەڵبهێنجین: کە هەر کەسێك خوای نەپەرست، بە شێوەیەك لە شێوەکان شەیتان دەپەرستێ، چونکە خوا (سبحانە وتعالى) زۆر بە ڕوونیی دوای ئەوەی بانگی مرۆڤایەتیی دەکات و بە وەچەی ئادەم دەیاندوێنێ، دەفەرموێ: ئەی وەچەی ئادەم! ئایا پێم ڕانەگەیاندن، ئامۆژگارییم نەکردن، وەسیەتم بۆ نەکردن؟ لە چ ڕێیەکەوە؟ لە ڕێی پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام) لە ڕێی کتێبەکانیەوە کە دایبەزاندوون، ئایا پێم ڕانەگەیاندن و ئامۆژگارییم نەکردن، کە شەیتان مەپەرستن، ئەو دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئێوە، ئایا پێم ڕانەگەیاندن کە هەر بەندایەتیی بۆ من بکەن و، بەس من بپەرستن، ئەوە ڕێی ڕاستە.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە هەر کەسێ خوای نەپەرست، بە شێوەیەك لە شێوەکان شەیتان دەپەرستێ: بەڵێ، بە ڕواڵەت پەیکەرێك دەپەرستێ، مرۆڤێك دەپەرستێ، زیندوویێك، مردوویێك، ئەستێرەیەك! خرۆکەیەك! ژیانداریك، ماریك، دووپشکێك، بەڵام شەیتان بۆی جوان دەکات، وەك خوا لە سوورەتی (الأنفال) ئایەتی (٤٨)دا دەفەرموێ:

﴿زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾.

واتە: شەیتان کردەوەکانی بۆ ڕازاندوونەوە.

کەواتە: هۆکاری بنەڕەتیی ئیلحادو خوانەناسیی و، پشتکردنە خوا و بێ دینیی، بریتیە لە شەیتان و دنەدان و هاندان و خوتخوتەی شەیتان، کە بێگومان بەشێوەیەکی پەنامەکییە، هەروەك چۆن کاریگەریی میکرۆب و ڤایرۆسەکان، بە شێوەیەکی پەنامەکییە، بەڵام نەخۆشیی بڵاودەکەنەوە لە جەستەدا، خوتخوتەو دنەدانەکانی شەیتانیش، نەخۆشیی بڵاودەکەنەوە لە ڕووح و ناخیی مرۆڤدا بە شێوەیەکی پەنهان.

## هۆکاری دووەم: خۆبەزلگریی و لە خۆبایی بوونی مرۆڤی مولحید:

ئەگەر تەماشای قورئان بکەین، زۆر جوان دیارە: بنەڕەتیی ترین وەسفێك کە خوا عزوجل بێ دینەکان و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان و کافرەکانی پێ وەسف دەکات، بریتیە لە خۆبەزلگریی، بۆ وێنە:

١- لە سووڕەتی (الزمر)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ بَلَىٰ قَدْ جَآءَتْكَ ءَايَـٰتِى فَكَذَّبْتَ بِهَا وَٱسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٥٩﴾ ﴾.

واتە: با، ئایەتەکانی منت بۆ هاتن، بەڵام خۆت بە زلگرت و لە بێبڕوایان بووی.

یانی: بە هۆی خۆبەزلگرتنتەوە، بێبڕوا بووی لە بەرانبەر خوا و ئایەتەکانی خوادا و، لە بەرانبەر پێغەمبەرەکانی خوادا خۆت بە زلگرت، ئەی مرۆڤی بێبڕوا!

٢- هەر لە سووڕەتی (الزمر)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾.

واتە: لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، ئەوانەی درۆیان بە ناوی خواوە کردووە، ڕوویان بە ڕەشیی دەبینی، ئایا لە دۆزەخدا جێگای حەوانەوە بۆ خۆ بەزلگران نیە؟

٣- دیسان هەر لە سووڕەتی (الزمر)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ قِيلَ ٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۖ فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٢﴾ ﴾.

واتە: گوترا: بچنە نێو دەروازەکانی دۆزەخەوە، بە هەمیشەیی تێیدابن، خراپترین شوێن، دۆزەخە بۆ خۆبەزلگران.

٤- دیسان لە سووڕەتی (البقرة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾.

واتە: یاد بکەوە کاتێك بە فریشتەکانمان فەرمووی: کڕنووش بۆ ئادەم بەرن، هەموویان کڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس ئامادە نەبوو و، خۆی بەزل گرت و لە بێبڕوایان بوو (بە هۆی خۆ بەزلگرییەکەیەوە کافر بوو).

٥- هەروەها لە سووڕەتی (الأنعام)دا خوا دەفەرمویێ: ﴿ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَـٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾.

واتە: (خوا بە بێبڕوایان دەفەرمویێ:) ئەمڕۆ سزای ڕیسواکەر دەچێژن بە هۆی ئەوەوە کە بە ناوی خواوە قسەی ناهەقتان دەکرد و، بە هۆی ئەوەوە کە لە بەرانبەر ئایەتەکانی دا خۆتان بە زلدەگرت.

٦- هەروەها لە سووڕەتی (غافر)دا خوا دەفەرمویێ: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾.

واتە: پەروەردگارتان فەرمووی: لێم بپاڕێنەوە، وەڵامتان دەدەمەوە، بەدڵنیایی ئەوانەی لە بەرانبەر بەندایەتیی کردن بۆ مندا خۆ بە زلدەگرن، بە زەبوونیی دەچنە دۆزەخەوە.

٧- لە سووڕەتی (الفرقان)یشدا خوا دەفەرمویێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا ۗ لَقَدِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ وَعَتَوْ عُتُوًّا كَبِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾.

واتە: ئەوانەی کە بە ئومێدی دیداری ئێمە نین، گوتیان: دەبێ فریشتەکان دابەزنە سەرمان، یان پەروەردگارمان ببینین، ئنجا بڕوا دێنین، لە دڵی خۆیاندا، خۆیان بە زلگرتوە و، بە یاخیی بوونێکی گەورە لە خوا یاخیی بوون.

بەڵێ هۆکارێکی دیکەی بنەڕەتیی ئیلحاد، بریتیە لە خۆبەزلگریی بابای مولحید، من کتێبی زۆر لە مولحیدەکانم تەماشا کردوە، کە تەرجەمە کراون و، لەگەڵ خەڵکێکی مولحیدا بەدرێژایی ئەوەندە تەمەن و ژیانەم کە گوزەراندوومە، زۆرجار قسەم کردوە.




بابای مولحید خۆبەزلگرە، خۆی پێ زۆرە، لە کەوڵی خۆی دەرچووەو بوغرا بووە:

١- هەیانە دەڵێ: بۆچی خوا نامەیەکی تایبەتیی بۆ نەناردووم؟

٢- هەیانە دەڵێ: بۆچی خوا پرسی پێ نەکردووم کە دروستیکردووم؟

٣- هەیانە دەڵێ: بۆچی خوا منی خستۆتە پێشبڕکێیەکەوە، بەبێ ئەوەی ڕاوێژم پێ بکات؟

ئایا ئەوە خۆ بەزلگریی نیە؟ ئایا ئەو داواکاریی و داخوازییانە، شتی مەحاڵ نین؟ تۆ کە نەبی، خوا چۆن پرست پێ بکات؟ ئنجا خوا (سبحانە وتعالی) خاوەنی ئەو گەردوونەیە، کە هەر بۆ خۆی دەزانێ سنوورەکان و ئەوپەڕەکانی تا کوێن، ئەی مرۆڤ! تۆ شتێکی زۆر بچووکی لە گەردوونی خوادا، بەڵێ، خوا ڕێزی لێ ناوی، وەك لە سوورەتی (الإسراء) ئایەتی (٧٠)دا دەفەرموێ:

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ﴾.

واتە: بەدڵنیایی ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوە.

بەڵام ئەی مرۆڤ! نابێ لە کەوڵی خۆت دەربچی، نابێ خۆت لێ ون بێ، نابێ خۆت نەناسی و لە بەرانبەر خوادا خۆت بە زلبگری، بۆیە ئەگەر تەماشای بەرهەمی مولحیدەکان بکەی و، تەماشای ژیانیان بکەی، تەماشای قسەو هەڵوێست و هەست و نەستەکانیان بکەی، خۆبەزلگرییەکی بێ ڕەزایان تێدا دەبینی، بۆیەش گوتمان: هۆکارێکی دیکەی سەرەکیی ڕاستەقینە بۆ ئیلحاد، بریتیە لە خۆبەزلگریی.

## هۆکاری سێیەم: ئارەزوو پەرستیی و دنیا ویستیی:

کەسانێك کە باوەش بە دنیادا دەکەن و، دەیانەوێ ژیانی دنیایان بۆ تەخت و ئاچووغ بێ و، چۆنیان پێ خۆش بێ وا بکەن و، چی ئارەزوویان لێ بوو وا بکەن، سەریان بۆ ئیلحاد و بێ دینیی دەخورێ، بۆیە دەڵێین: ئارەزوو پەرستیی و دنیا ویستیی هۆکارێکی دیکەی بنەڕەتیی تەشەنە کردنی ئیلحادە، چونکە بێگومان لەگەڵ بیرۆکەی ئیلحاددا، ڕەوشت و ئایین و ویژدان و هەق و دادگەریی و چاکەکاریی و خزمایەتیی و هاوەڵایەتیی و وەفا و .. هتد، هیچ مانایان نامێنێ.

بەڵێ وەك پێشتریش باسمان کردوە: ئەگەر حیسابت بۆ خوا نەکرد و، حیسابت بۆ دیداری خوا نەکرد: ئایین و ڕەوشت و ویژدان و هەق و دادگەریی و چاکەکاریی و خزمایەتیی و ڕەفاقەت و وەفاو ئەمەگ، ئەو بەها بەرزانە هیچیان واتایان نامێنێ و، لەگەڵ خوانەناسیی دا، هیچ واتایەك بۆ حەڵاڵ و حەڕام و، بۆ چاکەو خراپە، نامێنێ، بۆیە ئەوانەی کە دەیانەوێ ژیانی دنیایان بە ئارەزوو پەرستانە، دنیا ویستانە بگوزەرێنن: پشت لە خوا دەکەن، ڕوو لە ئیلحاد دەکەن و نکووڵیی دەکەن لەو بانگەی کە لە ناخەوە بانگیان دەکا، لە زگماکەوە و لە خوارِسکەوە بانگیان دەکات: کە پەروەردگارت بپەرستە! تۆ هی خۆت نی، خوا تۆی هێناوە و لاشت دەبات و لێت دەپرسێتەوە! نکووڵیی لەو دەنگە دەکەن، خۆیان لەو دەنگەی ویژدانیان دەکەنە کەڕەی شەربەت و نادیدەی دەگرن، وەك خوا (سبحانه وتعالى) لەو بارەوە دەفەرموێ:

﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ
ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ
ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾﴾ ص.

واتە: ئاسمان و زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە بە پووچ و بێ حیکمەت نەمانهێناونە دی، ئەوە گومانی ئەوانەیە کە بێبڕوان، هاوار بۆ ئەوانەی کە بێبڕوان، لە ئاگر، ئایا ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، وەك ئەوانەیان تەماشا دەکەین، کە خراپەکاریی دەکەن لە زەویدا؟ یان ئایا پارێزکاران وەك تاوانباران مامەڵە لەگەڵدا دەکەین؟!

ئایا ئەوە دەگونجێ؟ بە تەئکید ناگونجێ و، ئەوە پێچەوانەی لۆژیکە و، خوای دادگەر و کاربەجێ (سبحانه وتعالى) ئەوەی لێ ناوەشێتەوە.

وەك لە سوورەتی (القيامة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿بَلْ يُرِيدُ ٱلْإِنسَٰنُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُۥ ﴿٥﴾ يَسْـَٔلُ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿٦﴾﴾.

بەڵکو مرۆڤ، (واتە: مرۆڤی بێبڕوا)، دەیەوێ بە گوناهو تاوان بیداتەبەر، بۆیە دەپرسێ: ڕۆژی هەڵسانەوە کەنگێ دێ؟ (نکوولیی لێ دەکات).

دیارە ئەو پرسیارکردنە، پرسیار کردنێکی نکوولییلێکەرانەیە، واتە: قیامەت نیە، بابای کافر چونکە دەیەوێ بە تاوان و بە گوناهو بە خراپەوە بژی، بۆیە نکوولیی لە ڕۆژی دوایی و لە دیداری خوا دەکات.

هەروەها لە سوورەتی (الجاثية)، ئایەتەکانی: (٢٣ و ٢٤)دا، خوا (سبحانه وتعالى) ئەو کەسانەی کە لە مێژووی ئیسلامدا بە بێدینەکان (الزنادقة)، یان بە دەهرییەکان (الدهريون) واتە: ڕۆژگار پەرستان، یان دنیا پەرستان، ناسراون، ناخیانمان بۆ دەخاتە ڕوو و دەفەرموێ:

﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾﴾ الجاثية.

واتە: ئایا ئەو کەسەت بینیوە کە ئارەزووی خۆی کردۆتەوە پەرستراوی خۆی و، زانیارییشی هەیە، بەڵام خوا گومڕای کردوە، (چونکە کار بە زانیارییەکەی

ناكات) و، خوا مۆری بەسەر گوێ و دڵیەوە ناوە و، پەردەی بەسەر چاو هەڵكێشاوە، ئایا لە دوای خوا، كێ ڕێنمایی دەكات و دەیخاتە سەر ڕاستە ڕێ؟ ئایا بۆچی بیرناكەنەوە؟ (ئەو بێبڕوایانە) گوتیان: ژیان تەنیا ژیانی دنیایە و تەنیا ڕۆژگار دەمانفەوتێنێ، {واتە: بڕوایان بەوە نەبووە كە ئەم ژیانە دنیاییە، ژیانێكی دیكەی بەدوادا دێ، بڕواشیان وا نەبووە كە خوایەك دەشیانمرێنێ و زیندووشیان دەكاتەوە، بۆیە زانایانی ئیسلام بە مولحیدەكانیان گوتوە (الدهرّية)، یان (الدهريون)، واتە: ڕۆژگارپەرستان، ئەوانەی دەڵێن: تەنیا ڕۆژگار ئێمە دەفەوتێنێ}.

خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ﴾، زانیارییان لەو بارەوە نیە، ﴿إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾، بەس گومان دەبەن.

لە ڕاستییدا بابای مولحید هەرگیز لە ئیلحادی خۆیدا ناگاتە جێی دڵنیایی، هەروا بە گومان و بە ئەگەرو مەگەر، خۆی فریوداوەو، شەیتان كڵاوی لەسەر ناوە.



## هۆکاری چوارەم: تێکدران و شێوێنرانی کتێب و بەرنامەکانی خوا (سبحانە وتعالی):

بەڕێـــــزان!

هۆکاری چوارەمی گرنگ و کاریگەری ڕوو لە ئیلحادکردنی زۆرێك لە مولحیدەکان بریتیە لە: (تێکدران و شێوێنرانی کتێب و بەرنامەکانی خوا)، (تحريف وتشويه كتب وشرائع الله تعالى).

لە سۆنگەی ئەوەشەوە کە بەڕای بەندە ئەم هۆکارە - لە ڕووی واقیعی ئێستای خوانەناس و مولحیدەکانەوە لە دنیادا بەگشتی و لە ئەورووپا و ڕۆژئاوادا بەتایبەت - لە هەموو هۆکارەکانی دیکە ڕۆڵ و کاریگەریی زیاتری هەبووە، لە پەلکێشکرانی ژمارەیەکی زۆری مولحیدەکانەوە بەرە و زەلکاوی ئیلحاد و، تەشەنە کردنی دیاردەی ئیلحاددا، لەم لێکۆڵینەوەیەماندا پانتاییەکی زۆری بۆ تەرخان دەکەین و، هەڵوەستەیەکی تێر و تەسەلی لەبەردەم دا دەکەین.

بەڵێ بەڕێـزان!

گرنگترین و سەرەکییترین هۆکاری ئیلحاد لەم ڕۆژگارەماندا بریتیە لەوە کە کتێبەکانی خوا (سبحانە وتعالی)، بەرنامەکانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کە ناردوونی، بۆ ڕێنمایی کردنی بەشەر و بەرچاو ڕوونکردنی بەشەر، کە چۆن خوا بناسیّ؟ چۆن خوا بپەرستیّ؟ چۆن بەندایەتیی بۆ خوا بکات؟ چۆن ژیانی دنیا بگوزەرێنیّ؟ چ لە ڕووی تاکیی، چ لە ڕووی خێزانیی، لە ڕووی کۆمەڵایەتیی، چ لە ڕووی سیاسییەوە؟ ئەو کتێب و بەرنامانەی خوا (سبحانە وتعالی) تێکدراون و شێوێنراون، ئنجا لە ئەنجامی تێکدران و شێوێنرانی کتێب و بەرنامەکانی خوادا (سبحانە وتعالی)، ئەوانەی کە دەستیان نەگەیشتۆتە دوایین نوسخەی هیدایەتی خوا و، دوایین کتێبی خوا - کە قورئانە - لە ڕاستە شەقامی خواناسیی و دینداریی ڕاست و دروست بێبەش بوون و

تووشی ئیلحاد بوون، شایانی باسیشە: خوا تەنیا ئەم قورئانەی ناردوە بۆ کۆی مرۆڤەکان، بۆ هەموو بەشەر بە پانایی زەمین، بە درێژایی زەمان، هەر بۆیەش خوا ئەم قورئانەی پاراستوە، لە گۆڕران و تێکدران و شێوێنران - وەك دوایی باسی دەکەین - بەڵام کتێبەکانی دیکە: ١- ئەگەر (صُحُف)ی (إبراهیم)ە، ٢- ئەگەر (تەورات)ی (مووسا)یە، ٣- ئەگەر (زەبوور)ی (داوود)ە، ٤- ئەگەر (ئینجیل)ی عیسایە، ئەگەر کتێبەکانی دیکەن، کە وەك باسمان کرد: هەرکام لە زەردەشتییەکان و، صابیئەکانیش ئیددیعای ئەوە دەکەن، کە کتێبی خواییان لەبەردەستدایە، ئەوانە هەموویان تێکدراون، شێوێنراون.

هەر بۆیە شوێنکەوتووانی ئەو ئایینانە، پەیڕەوانی ئەو کتێبانە، کاتێك ویستوویانە خوا بناسن و گەڕاونەوە بۆ کتێبەکانی خۆیان، وێنەیەکی گەچڵێنراو[1] و شێوێنراوی خوایان لە کتێبەکانی خۆیاندا بینیوە، هەروەها کە ویستوویانە پێغەمبەران بناسن، کاتێك گەڕاونەوە بۆ کتێبەکانی خۆیان، وێنەیەکی زۆر شێوێنراو، بەڵکو قێزەونکراویان بۆ پێغەمبەرانی خوا لە کتێبەکانی خوادا (سبحانه وتعالى) بینیوە، دیسان کاتێك ویستوویانە دینداریی بکەن، کاتێك گەڕاونەوە بۆ کتێبەکانی خۆیان، بینیویانە: تێکەڵیی و پێکەڵیی و بێسەرو بەرییەکی زۆر هەیە.

ئەمە هۆکارێکی زۆر گرنگ و بنەڕەتیی بەرەو ئیلحاد چوونی خەڵکێکی زۆرە، لەوانەی کە کەوتوونەتە زەلکاوی ئیلحادەوە و، لە هەڵدێری ئیلحاد، هەڵدێراون و ملیان شکاوە.

بەڵام ئێمە بەپێی ڕیزبەندیی: خستمانە بڕگەی چوارەمەوە، چونکە بە ڕاستیی کە کتێبەکانی خواو بەرنامەکانی خواش تێکدراون و شێوێنراون، ئەویش هەر بە خوتخوتەی شەیتانە، هەروەها هەر کام لە: خۆبەزلگریی مولحیدەکان و، ئارەزوو پەرستیی و دنیا ویستیشیان، لە ڕووی ڕێزبەندیی عەقڵییەوە، دەکەونە پێش ئەم هۆکاری چوارەمە، شایانی باسیشە ئەم هۆکارە کە درێژترین هەڵوەستەی لە بەرانبەردا دەکەین، لەبەر ئەوەیە کە زۆرترین شوێنەواری شوومی بوون، لە ژیانی

---

(١) گەچڵێنراو: شێوێنراو و بێزراوو.

مولحیدەکان و لە تەشەنەکردنی ئیلحادو خوانەناسیی و پشت لە خوا کردندا، بۆیە ئێمەش زۆرترین پانتایی لەم باسی چوارەمەدا، بۆ تەرخان دەکەین.

سەرەتاش دەڵێین: خوا (سبحانه وتعالى) کە لە سوورەتی (الروم)دا دەفەرمووێ:

﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾.

واتە: خراپەکاریی وشکانیی و دەریای گرتەوە، بە هۆی کردەوەی دەستی خەڵکەوە، (بە هۆی خراپەکانیانەوە)، تاکو بەشێك لە سزای ئەوەی دەیکەن، پێیان بچێژێ، بەڵکو بگەڕێنەوە.

بەشەر کاتێك دەستکاریی سروشت دەکات، دەستکاریی دروستکراوەکانی خوا دەکات، تێکیان دەدات و سەرەنجام زیانبار دەبێ: بۆ نموونە: ئێستا چینی (ئۆزۆن)، - وەك پێشتریش باسمان کرد - بێهێز بووە، یان لە چەند شوێنێکەوە کونی تێبووە، بە هۆی ئەو دووکەڵ و غازەوەی لەو کارگانەوە دەردەچێ، کە چەکی مرۆڤ کوژیان پێ دروست دەکرێ، بە تایبەتی چەکە قورسەکان، ئنجا بە هۆی کوون بوونی چینی ئۆزۆنەوە، تیشکی سەرووی وەنەوشەیی و، تیشکی ژێر سوور، بەڕێژەیەکی زیاتر لەوەی کە پێویستە بۆ ژیانی مرۆڤ، لێیەوە دێ و سەرەنجام زیان دەگەیەنێ بە دەریا، بە وشکانیی، بە ژیانداران و مرۆڤیش و، هاوسەنگیی ژینگە تێك دەدات و، تا ڕاددەیەکیش تێکیداوە.

ئنجا هەروەك چۆن بەشەر ئەگەر دەستکاریی شتەکانی خوا، دەستکاریی سروشت بکات، خراپەکاریی دەردەکەوێ لە وشکانی و لە دەریادا، بەهەمان شێوەش: کاتێك مرۆڤ دەستکاریی وەحیی و پەیامی خوا دەکات و تێکی دەدا، دەیەوێ لەگەڵ ئارەزووەکانی خۆیدا، لەگەڵ بۆچوونەکانی خۆیدا، لەگەڵ بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانی خۆیدا، بیگونجێنێ: پەیام و بەرنامەکانی خوا ئەو حاڵەتە سروشتیی و هاوسەنگییەی کە لەسەری بوون، نایانمێنێ و تێکدەچن و، سەرەنجام ئەگەر خەڵك لە ئەنجامی پابەندیی بە کتێب و بەرنامەکانی خواوە

بەختەوەر دەبوون و، ژیانێکی مرۆڤانەیان دەگوزەراند، ژیانێکی ڕێك و ڕاستیان دەبوو، لە دوای شێوێنران و دەستکاریی کرانی کتێب و بەرنامەکانی خواوە و، بە هۆی پەیڕەویی کردنیانەوە، لەو کتێبە تێکدراو و شێوێنراو و بەرنامە دەستکاریی کراوانە، گرفتاریی زۆریان بۆ پەیدا دەبێ.

باشترین نموونەش لەو بارەوە هەر کام لە تەوڕات و ئینجیل و ئایینی جوولەکایەتیی و نەصڕانییەتن، کە دەبینین: پەیڕەوان و شوێنکەوتووانی ئەو دوو کتێب و بەرنامەیە - کە لە ئەسڵدا هیدایەتی خوایان گرتۆتە خۆیان - دووچاری چەندان گرفت و کێشەی عەقیدەیی و فیکریی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی بوون و، سەرەنجام لەژێر فشاری واقیعدا: زۆربەی هەرە زۆریان دەسبەرداری کتێبە ئایینییە شێوێنراوەکانیان بوون، تاکو لەو واقیعە سەخت و تاڵ و دژوارە و، لەو هەل و مەرجە نەگونجاوەی کە بە هۆی شوێنکەوتنی ئەو کتێب و بەرنامانەوە، گیرۆدەی بوون، دەربازیان ببێ، وەك لە باسی یەکەمی ئەم بەشی سێیەمەدا: (سەرگوزشتەی سەرهەڵدانی ئیلحاد لە ئەورووپاو ڕۆژئاوادا) بە وردیی باسی ئەوەمان کرد.

ئێستاش هەڵدەستین بە سەرنج لێدانێکی ئەو پێنج کتێبە، کە ئەو پێنج ئایینە[1]، بە کتێبی پیرۆزی خۆیان و بە کتێبی ئاسمانیی خۆیانیان دەزانن.



---

(١) ئایینەکانی: ١- جوولەکایەتیی و، ٢- زەردەشتایەتیی و، ٣- نەصڕانییەت و، ٤- صابیئایەتیی و، ٥- ئیسلام.



## ئەو پێنج کتێبەی، کە شوێنکەوتووانیان
## بە پەیامی خوایان دادەنێن










كنزا ربا
الكنز العظيم
الكتاب المقدس
للصابئة المندائيين
اليمين


دراشة اديهيا
مواعظ وتعاليم
يحيى بن زكريا
عليه السلام


إنجيل برنابا


إبراهيم محمود
نصوص أفستا
وقراءة في النص الأفستاني

# هەڵسەنگاندنی کتێبەکانی پێنج ئایینە ئاسمانییەکان

بەڕێـــزان!

لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئێمە لە بڕگەی شەشەم و کۆتایی باسی سێیەمی ئەم بەشی سێیەمەدا، کورتە پێناسەیەکی کتێبەکانی هەر کام لەو پێنج ئایینەمان کرد:

١- جوولـەکایەتیی، ٢- زەردەشتایەتیی، ٣- نەصرانییەت، ٤- صابیئایەتیی، ٥- ئیسلام،

لێرەدا بە پێویستیی نازانین بچینەوە نێو وردەکارییەکانی پێناسە کردنیان و، ڕاستەوخۆ دەچینە سەر هەڵسەنگاندن و، لە مەحەکی عەقڵ و زانست و لۆژیك دانیان:







## یەکەم: پەیمانی کۆن (العهد القديم):

سەرەتا بە گشتیی باسی (پەیمانی کۆن) دەکەین، (پەیمانی کۆن)یش وەك گوتمان: بە سەرژمێرێك سی و نۆ (٣٩) کتێبە و، بە سەرژمێرێکیش چل و نۆ (٤٩)یە و، (پەیمانی نوێ)ش چواردە (١٤) کتێبە، چوار (٤) ئینجیل لەگەڵ دە (١٠) کتێبی دیکەش کە خستوویاننە گەڵ چوار ئینجیلەکان.

ئێمە لە پێشەکی (الكتاب المُقَدَّس: قراءة رعائية)، ئەم چەند دێڕە دێنین کە ماهییەت و جەوهەری هەر کام لە پەیمانی کۆن و نوێمان، لە ڕووی ئەوەوە کە تا چ ڕاددەیەك بە کتێبی خوا و بە فەرمایشتی خوا دادەنرێن و، پشتیان پێ دەبەسترێ بۆ دینداریی، بۆ دەردەخات:

(حِيْنَ نُلْقِي نَظْرَةً إلى فِهْرِس الكِتَاب المُقَدَّس أو البِيْبلِيَا "فِي ارْتبَاطٍ مَعَ بيبلُوس عَاصِمَةُ الكِتَاب" فَنَكْتَشِفُ أَنَّنا أَمَامَ مَجْمُوعَةٍ مِنَ الأَسْفَارِ أَو الكُتُبِ المُخْتَلِفَةِ، وَيَكْفِي أَن نَقْرَأَ مُقَدِّمَةَ كُلِّ سِفْرٍ لِنَفْهَمَ التَنوّعَ فِيهَا، دُوِّنت عَلَى مَدَى عَشْرَةَ قُرُونٍ مِنَ الزَّمَن، بيَد كُتَّابٍ مُخْتَلِفين، وَفِي ثَلاَثِ لُغَات هِي العِبْرِية وَالآرَامِية وَاليُونَانية، فِيهَا الخَبَرُ التأريخِي وَالقَوَانِيْن وَالشَّرَائِع والوَعظ والكَرَّازَةَ والنَّشِيد وَالصَّلاَة وَالرِّسَالَة وَالقِصَّة، التَقوِّيَّة، فِي العَرَبيّة القَدِيمَة تُدْعَى هَذِهِ الأَسْفَار: التَّوْرَاة وَالإِنْجِيل، حَيْثُ التَّورَاة تُشِيرُ إِلى أَسْفَار العَهْدِ القَدِيم، وَالإِنْجيلُ يُشِير إِلى أَسْفَارِ العَهْدِ الجَدِيد..)[1].

واتە: کاتێك ئێمە چاوێك بە پێڕستی کتێبی پیرۆزدا دەگێڕین، یاخود بیبیلیا (کە ئەمە پەیوەندیی هەیە بە بیبلوس، ئەو پایتەختەی کە ئەو کتێبەی لێوە هاتوە)، خۆمان لە بەرانبەر کۆمەڵێك کتێبدا، کتێبی جۆراو جۆردا دەبینینەوە و، ئەوەندە بەسە کە ئێمە پێشەکی هەر کام لەو کتێبانە بخوێنینەوە، تاکو جۆراو جۆریی ئەو کتێبانە ببینین، ئەو کتێبانە (پەیمانی کۆن و پەیمانی نوێ) لە ماوەی دە (١٠) سەدەدا نووسراونەوە، (لە ماوەی هەزار (١٠٠٠) ساڵدا، کەواتە: مرۆڤەکان نووسیویانەوە)، بە دەستی نووسەرانێکی جۆراو جۆر و بە سێ زمانان:

---

(١) الكتاب المقدس: قراءة رعائية، ط٣/ ٢٠١٥م.

کە عیبریی و ئارامیی و یۆنانیین، لەو کتێبانەدا: هەواڵی مێژوویی و یاسایەکان و حوکمە شەرعییەکان و ئامۆژگاریی و بانگەواز و سروود و پاڕانەوە و نامە و بەسەرهاتی تەقوا، هەموو ئەوانە دەبینین، لە زمانی عەرەبیی کۆندا، بەو کتێبانە گوتراوە: (تەوڕات و ئینجیل)، تەوڕات ئاماژەی کردوە بۆ کتێبەکانی پەیمانی کۆن و، ئینجیلیش ئاماژە دەکات بۆ کتێبەکانی پەیمانی نوێ.

بەڕێـــــزان!

ئەم دەقە زۆر گرنگە، وەك: پێشینان دەڵێن: (مِنْ فَمِكَ أَدِينُكَ) واتە: لە زاری خۆتەوە حوکمت دەدەم.

وەك دەبینین: هەر کام لە جوولەکەکان و نەصڕانییەکان (پەیمانی کۆن هی هەردووك لایانە)، دەڵێن: هەردووك پەیمانی کۆن و نوێ لە ماوەی هەزار (١٠٠٠) ساڵدا، بە دەست نووسەرانێکی جۆراو جۆر و، بە سێ زمانان نووسراونەوە.

کەواتە: ناتوانین بڵێین: (پەیمانی کۆن و پەیمانی نوێ) وەحیی خوای پەروەردگارن، چونکە وەحیی خوا دەبێ لە دەمی ئەو پێغەمبەرەوە وەرگیرابێ لە کاتێکی دیاریی کراودا و، بە زمانێکی دیاریی کراو و، لە شوێنێکی دیارییکراودا.

بە ڕاستیی ئینسان تا زیاتر سەرنجی ژیان و بەرهەم و هەست و نەست و هەڵوێستی مولحیدەکان بدات، زیاتر ئەو ڕاستییەی لەلا ئاشکرا و نمایان دەبێ، کە بێگومان تێکدران و شێوێنرانی کتێبەکانی خوا و بەرنامەکانی خوا، هۆکارێکی زۆر کاریگەر بووە، کە ژمارەیەکی زۆر لە مولحیدەکان بەرەو زەلکاوی ئیلحاد بچن.

بۆ وێنە: (ڕیتشارد داوکینز) لە کتێبی: (The God Delusion - خوای خەیاڵیی - وَهمُ الإلَه)دا[1]، لە چەندان شوێندا - لەو کتێبەی دا - مومارەسەی هەڵەی دیندارانی جوولەکە و نەصڕانیی و، هەندێ غەڵەت و پەڵەتی هەندێك لە مسوڵمانان، بۆ وێنە: هەندێك لە ڕێکخراوە پەڕگیرەکانی نێو جیهانی ئیسلامیی،

---

(١) ڕیتشارد داوکینز: ١٩٤١م - بابایەکی داروینیستە و، لە ساڵی ٢٠٠٦زدا ئەو کتێبەی نووسیوە و تەرجەمەی عەرەبییش کراوە.

پاشان هەندێك لە دەقە تێكدراوەكانی (پەیمانی كۆن و پەیمانی نوێ)، هەندێك لەو ئەفسانانەی كە بە ناوی خواپەرستیی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای دنیادا هەن، لەلای ئەوانەی كە خۆیان بە دیندارو خوا پەرست دەزانن، هەموو ئەوانە دەكاتە بەڵگەی ئەوە كە ئیلحاد بریتیە لەو بژاردە پەسندەی كە بە لای ئەوەوە بێ بەدیلە، نەك لەبەر ئەوەی عەقڵ و زانست و زگماك دەیخوازن، بەڵكو لەبەر ئەو شتانەی ئەو بە بیانوویان دێنێتەوە، دەڵێ: تەماشا بكەن: لە پەیمانی كۆندا وا گوتراوە! لە پەیمانی نوێدا وا گوتراوە! لە میسرِ كاتی خۆی وایانزانیوە خوا فڵان شتەیە! لە هیند وایانگوتوە! ئەها یۆنانییەكان وایان گوتوە! یاخود ئەها نەصرانییەكان بەو شێوەیە دەڵێن، جوولەكەكان وا دەكەن! مسوڵمانان هەندێكیان وا دەكەن!

بۆیە شێوێنران و تێكدرانی كتێب و بەرنامەكانی خوامان، بە هۆكارێكی گەورە و گرنگی بەرەو ئیلحاد چوونی ژمارەیەكی زۆری لە مولحیدەكان لە قەڵەمداوە.

ئنجا ئێستا با سەرنج بدەین:

ئایا ئەو (پەیمانی كۆن)ە، كە خاڵی هاوبەشی نێوان جوولەكەو نەصرانییەكانە و، هەردووكیان لەسەری یەكدەنگن و، بە كتێبی پیرۆزی خۆیانی دەزانن، دەگونجێ بە پەیام و فەرموودەی خوا عزوجل دابنرێ؟!

بۆ ئەوەی بزانین داخۆ بە (بەڵێ) یان (نەخێر) وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە، با سەرنجێكی خێرای ئەو پازدە (١٥) نموونەیە بدەین، كە لە (پەیمانی كۆن) دەیانهێنینەوە، دوازدە (١٢) یان لە بارەی خوای تاك و پاك و بەرز و بێ وێنەوە و، سێ (٣)شیان لە بارەی پێغەمبەرانەوە علیهم الصلاة والسلام:

لە (سفر التكوين)دا، چوار نموونەمان هێناوەتەوە:

١)- نموونەی یەکەم: لە ئیصحاحی دووەم، بڕگەی دووەمدا باسی ڕۆژەکانی هەفتە دەکات، دوایی دەڵێ: (وَفِي اليومِ السَّابعِ أَتَمَّ الله عَمَلَهُ الَّذِي قَامَ بِهِ، فاستَرَاحَ فِيهِ مِنْ جَمِيع مَا عَمِلَهُ)[1]، واتە: (خوا لە ڕۆژی شەممەدا فڵان شتەی دروست کردو، یەك شەممە فڵان و، دوو شەممە فڵان و، سێ شەممە فڵان و، چوارشەممە فڵان و، پێنج شەممە فڵان شت، دوایی دەڵێ:) لە ڕۆژی حەوتەمدا (واتە: لە ڕۆژی هەینیی دا) خوا ئەو کارەی کە پێی هەڵسا، هەمووی تەواو کرد و، لەو ڕۆژەدا پشوویدا.

کە گومانی تێدانیە ئەمە وێنا کردنێکی بەشەرییە بۆ خوای بێ وێنەو بێ هاوتا، یانی: خوا ماندوو دەبێ و، پێویستیی بە پشوودان و ئیسراحەت هەیە!!

٢)- نموونەی دووەم: لە ئیصحاحی سێ دا، بڕگەکانی: (٨ و ٩ و ١٠ و ١١ و ١٢) لە باسی (سقوط الإنسان)دا[2]، هاتوە:

((٨)ثُمَّ سَمِع الزَّوْجَان صَوْتَ الرَّبِّ الإِلَهِ مَاشِيَاً فِي الْجَنَّةِ عِنْدَ هُبُوبِ رِيحِ النَّهَارِ، فَاخْتَبَئَا مِنْ حَضْرَةِ الرَّبِّ الإِلَهِ بَيْنَ شَجَرِ الْجَنَّةِ (٩) فَنَادَى الرَّبُّ الإِلَهُ آدمَ: «أَيْنَ أَنْتَ؟» (١٠) فَأَجَابَ: سَمِعْتُ صَوْتَك فِي الجَنَّةَ فَاخْتَبَأْتُ خَشْيَةً مِنْكَ لإِنِّي عُرْيَانٌ، (١١) فَسَأَلَهُ: مَنْ قَالَ لَكَ إِنَّكَ عُرْيَانٌ؟ هَلْ أَكَلْتَ مِنْ ثَمَرِ الشَّجَرَةِ الَّتِي نَهَيْتُكَ عَنْهَا؟ (١٢) فَأَجَابَ آدَمُ: إِنَّهَا المَرْاءَةُ الَّتِي جَعَلْتَهَا رَفِيقَةً لِي هِيَ الَّتِي أَطْعَمَتْنِي مِنْ ثَمَرِ الشَّجَرَةِ فَأَكَلْتُ).

واتە: دوای ئەوەی ژن و مێردەکە (مەبەست پێی ئادەم و حەووایە سەلامی خوایان لێ بێ) گوێیان لە دەنگی پەروەردگاری پەرستراو بوو کە لە بەهەشتی

---

(١) التَّفْسيرُ التَّطْبيقِي للكِتَاب المُقَدَّس، العَهْدُ القَدِيم، سِفْرُ التكوين، الإِصْحَاح: ٢/٢، ص٩.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ص١٣و١٤.

دەڕۆیی پیاسەی دەکرد، لە کاتێکدا کە شنە بای ڕۆژگار هەڵیکردبوو، ئەوانیش خۆیان لە پەروەردگار شاردەوە لە نێو درەختەکانی بەهەشتدا (خۆیان پەنهان کرد بۆ ئەوەی خوا نەیانبینێ!)، پەروەرگاری پەرستراو بانگی ئادەمی کردو فەرمووی: لە کوێی؟! وەڵامی دایەوە: گوێم لە دەنگی تۆ بوو لە بەهەشتدا لە ترسی تۆ خۆم شاردەوە، چونکە من ڕووتم! پرسیاری لێکرد: کێ پێی گوتی: تۆ ڕووتی؟! ئایا لە میوەی ئەو درەختەت خوارد کە لێم قەدەغە کردبووی؟ ئادەم وەڵامی دایەوە: ئەو ژنەی کە کردت بە هاوەڵی من، ئەو لە میوەی ئەو درەختەی پێدام و خواردم.

**چەند سەرنجێك لەسەر ئەم دەقە:**

ئەم دەقە چەندان شتی تێدان، کە لە ڕاستییدا لەگەڵ زاتی پاکی خوا و، لەگەڵ ئەو ئایینە ڕێك و ڕاستەی کە خوا بە هەموو پێغەمبەراندا ناردوویەتی، ناگونجێن هەروا بە خێرایی سەر و ئاماژەیان پێ دەدەین:

١) دەڵێ: ژن و پیاوەکە گوێیان لە دەنگی خوا بوو!

خوا دەنگی نیە تاکو ببیسترێ، ئەو دەنگەی کە مرۆڤەکان دەیبیستن.

٢) دەڵێ: پەروەردگاریان دەڕۆیی پیاسەی دەکرد لە بەهەشتێ!

خوا (سبحانە وتعالی) پیاسە ناکات و لە هیچ شوێنێکیش نیە لە نێو دروستکراوەکانیدا، بەڵکو لە دەرەوەی دروستکراوەکانیەتی.

٣) دەڵێ: خۆیان پەنهان کرد.

وەك ئەوەی خوا نەیانبینێ!

٤) دەڵێ: خوا بانگی کرد: ئادەم لە کوێی؟! ئادەم دەڵێ: گوێم لە دەنگی تۆ بوو خۆم لێ شاردیەوە، چونکە ڕووتم، خوا لێی دەپرسێ: کێ پێی گوتی کە تۆ ڕووتی؟

کەواتە: خوا ئادەمی نەدیوە کە ڕووتە!!

٥) دەڵێ: ئایا لەو درەختەت خوارد کە لێم قەدەغە کردی؟!

کەواتە: خوا (سبحانە وتعالی) نەیزانیوە کە لەو درەختەی خواردوە!!





٦) دەڵێ: ئادەم گوتی: ئەو ئافرەتەی کە کردت بە هاوەڵی من، ئەو لەو درەختە پێی دام و خواردم.

لێرەدا خەتایەکە دەخاتە ئەستۆی حەووا، زۆر لە کۆلکە عەلمانییەکانی ئێمە، دەڵێن: لە ڕوانگەی ئیسلامەوە: ئافرەت بنچینەی خراپە و تاوانە، بەڵام ئەوە قسەی پەیمانی کۆنە، قسەی تەوراتی تێکدراو و شێوێنراوە! ئەگەرنا لە قورئاندا خوا هەردووکیان پێکەوە باس دەکات:

﴿ فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَاتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ ۚ وَعَصَىٰ آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ﴾ طه.

واتە: پێکەوە لێیان خوارد...

وەك دەبینین: لە قورئانی دا: خەتای حەووا نەگیراوە لەوەدا کە لەو درەختە قەدەغەیان خواردوە، بەڵکو دەفەرموێ: هەردووکیان پێکەوە هەڵەکەیان کردوە.

٣)- **نموونەی سێیەم:** لە ئیصحاحی سێ، بڕگەی بیست و دوو (٢٢)دا هاتوە[١]:

(٢٢) (ثُمَّ قَالَ الرَبُّ الإِلَهُ: هَا الإِنْسَانُ قَدْ صَارَ كَوَاحِدٍ مِنَّا يُمَيِّزُ بَيْنَ الخَيْرِ وَالشَّرِّ، وَقَدْ يَمُدُّ يَدَهُ وَيَتَنَاوَلُ مِنْ شَجَرَةِ الحَيَاةِ، وَيأْكُلُ فَيَحْيَا إِلى الأَبَد).

(دوای ئەوەی بە حیساب کە ئادەم و حەووا لەو دەرختەیان خواردوە، کە درەختی زانست بووە، خوا پێی ناخۆش بووە، ئادەم و حەووا زانستیان پەیدابێ)، واتە: دوایی پەروەردگاری پەرستراو گوتی: ها ئەوە مرۆڤ وەك ئێمەی لێهات، چاکەو خراپە لە یەك جیا دەکاتەوە، (وەك یەکێك لە ئێمە! یانی: خوا یەك نیە!) ڕەنگە دوایی دەستدرێژ بکات بۆ میوەی ژیان و لێی بخوات و، هەتا هەتایە بژیەت.

لێرەدا دوو شت پاڵدراونە لای خوا (سبحانه وتعالى):

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ص١٦.

**یەکەم:** خوا پێی ناخۆش بووە مرۆڤ لە درەختی زانست بخوا و، چاکە و خراپە لەیەك جیابکاتەوە.

**دووەم:** خوا پێی ناخۆش بووە کە مرۆڤ لە درەختی ژیان بخوات و، ژیانی هەمیشەیی دەست بکەوێ!

ئەوانەش هەردووکیان پێچەوانەی کەرەم و بەزەیی و بەخششی خوان و، پێچەوانەی دەقی قورئانیشن!! چونکە خوا لە قورئاندا دەفەرموێ:

﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ﴿٣١﴾ ﴾ البقرة.

واتە: خوا ئادەمی فێری هەموو ناوەکان کرد، دوایی بە ئادەم دەفەرموێ: ناوەکان فێری فریشتەکان بکە، ئنجا دوای ئەوەی ئادەم ناوەکانیان پێ دەڵێ، بە فریشتەکان دەفەرموێ: کڕنووشی ڕێزگرتنی بۆ بەرن، یانی: بۆتە مامۆستا و فێرکەرتان!

لە ئیسلامدا کە بە تەئکید لە تەوڕاتیشدا هەروا بووە، بەڵام تێکدراوە، خوا مرۆڤی بەوە ئیمتیاز پێداوە کە زانا و شارەزا و بەرچاو ڕوونی کردوە.

هەروەها خوا (سبحانە وتعالی) دەفەرموێ: بە ڕاستە شەقامی من دابڕۆن، تاکو ژیانی هەتاییتان دەست بکەوێ، ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴾، نەك خوا پێی ناخۆش بێ و حەسوودیی بە مرۆڤ بەرێ، پاکیی بۆ خوا! بەڵکو پێی خۆشە مرۆڤ لە تاقیکردنەوەی ژیانی دنیادا سەرکەوتووبێ، تاکو ژیانی هەمیشەیی و هەتا هەتایی بەهەشت و جێگای ڕەزامەندیی خوای دەستبکەوێ.

٤)- **نموونەی چوارەم:** لە ئیصحاحی بیست و سێ (٢٣) بڕگەی: (٢٤ - ٢٨) دا، بە ناوونیشانی: (يعقوب يصارع في فنيئيل) ئەم دەقە هاتوە، کە باسی یەعقووب (علیه السلام) دەکات:

(..وبَقِيَ يَعْقُوبُ وَحْدَهُ وَصَارَعَهُ إِنْسَانٌ حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ (٢٥)، وَعِنْدَمَا رَأَى أَنَّهُ لَمْ يَتَغَلَّبْ عَلَى يَعْقُوبَ، ضَرَبَه عَلَى حُقّ فَخْذِهِ، فَانْخَلَعَ حُقُّ مِفْصَلُ فَخْذِ يَعْقُوبَ فِي مُصَارَعَتِهِ مَعَهُ (٢٦)، وَقَالَ لَهُ: أَطْلِقْنِي، فَقَدْ طَلَعَ الْفَجْرُ، فَأَجَابَهُ يَعْقُوبُ: لاَ أُطْلِقُكَ

حَتَّى تُبَارِكَنِي (٢٧)، فَسَأَلَهُ: مَا اسْمُكَ؟ فَأَجَابَ: يَعْقُوبُ (٢٨)، فَقَالَ: لاَ يُدْعَى اسْمُكَ فِي مَا بَعْدُ يَعْقُوبَ، بَلْ إِسْرَائِيلَ (وَمَعْنَاهُ: يُجَاهِدُ مَعَ اللَّهِ) لأَنَّكَ جَاهَدْتَ مَعَ اللَّهِ وَالنَّاسِ وَقَدَرْتَ)[1].

واتە: یەعقووب هەتا بەیانی مایەوە، مرۆڤێك هەتا سپێدەی بەیانی زۆرانی لەگەڵ گرت، (دوایی بۆمان دەردەکەوێ مەبەست پێی خوایە لە شێوەی مرۆڤدا)، کاتێك کە بۆی دەرکەوت، {واتە: خوا بۆی دەرکەوت} بە یەعقووب ناوێرێ! {پاکیی بۆ خوا}، دەستێکی لە ئەژنۆی دا و جومگەی ئەژنۆی یەعقووب دەرچوو (لە زۆرانبازییەکەی لەگەڵ خوادا)، خوا پێی فەرموو بەرمدە: چونکە ئەوە ڕۆژ بۆوە، بەرەبەیان بۆوە، یەعقووب گوتی: بەرت نادەم تاکو پیت و پێزم تێنەخەی، خوا لێی پرسی ناوت چییە؟! (ناوەکەشی نازانێ؟!) یەعقووب وەڵامی دایەوە: ناوم یەعقووبە، خوا فەرمووی: لەمەو دوا پێت ناگوترێ: یەعقووب، بەڵکو پێت دەگوترێ: ئیسرائیل، واتە: ئەو کەسەی لەگەڵ خوا زۆران دەگرێ، {لەگەڵ خوادا تێدەکۆشێ، یان لەگەڵ خوا بەشەڕ دێ}، چونکە تۆ لەگەڵ خوا و لەگەڵ خەڵکدا بەشەڕهاتی و بەسەریاندا زاڵبووی.

پاکیی بۆ خوا، ئەوە چ بیر و بۆچوونێکی منداڵانە و نەفامانەی دوور لە مەقام و پایەی بەرز و بێ وێنەی خوایە (سبحانه وتعالى)، ئا لێرەوە دەزانین کە بابایەکی وەك (ڕیتشارد داوکینز) و کێ و کێ .. هتد، لە مولحیدەکانی ڕۆژئاوا، بۆچی لە ئایین ڕادەکەن، ئاوا خوایان بۆ وێنا و پێناسە کراوە!

## لە (سفر الخروج)یش چوار نموونەمان هێناونەوە:

**٥) نموونەی یەکەم:** لە ئیصحاحی حەوت (٧) بڕگەی (١)دا، دەڵێ: (الرَّبُّ يُخَاطِبُ مُوسى وَهَارُون: فَقَالَ الربُّ لِمُوسى: أَنَا جَعَلْتُكَ كَإِلَهٍ لِفِرْعَوْن وَهَارُونُ أَخُوكَ يَكُونُ كَنَبيٍّ لَكَ)[2].

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص٨٧، ٨٨.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص١٤٣.

واتە: پەروەردگار مووسا و هارِوونی دواندن، پەروەردگار بە مووسای فەرموو: من تۆم وەك پەرستراو (وەك خوا) بۆ فیرعەون داناوە و، هارِوونی براشتم وەك پێغەمبەرێك بۆ تۆ داناوە.

مرۆڤ چۆن وەك پەرستراوو وەك خوای لێدێ! كە دیارە وشەی (إله) لە زاراوەی تەورِات (پەیمانی كۆن)دا واتە: خوا (سبحانه وتعالى) نەك بە مانای (إله) پەرستراو بێ.

**٦) نموونەی دووەم:** لە ئیصحاحی سی و دوو (٣٢) برِگەی (١١ و ١٢ و ١٣) دا، ئەم دەقە هاتوە: ((١١)فَابْتَهَلَ مُوسى إِلى الربِّ، وَقَالَ: لِمَاذَا يَحْتَدِمُ غَضَبكَ عَلَى شَعْبكَ الَّذِي أَخْرَجْتَهُ مِنْ دِيَار مِصْرَ بقُوَّةٍ عَظِيمَةٍ وَذِرَاعٍ مُقْتَدِرَةٍ (١٢)، لِمَاذَا يَشْمَتْ المِصرِيونَ فِيْنَا قَائِلِينَ: لَقَدْ احتَال عَلَيْهِم إِلَهُهُمْ فَأَخْرَجَهُمْ مِنْ هَهُنَا لِيُهْلِكَهُم فِي الجِبَالِ وَيُفنِيهُمْ عَنْ وَجْهِ الأَرْضِ، إِرْجِع مِنْ حُموِّ غَضَبِكَ وَلاَ تُوقِع هَذَا العِقَابَ بشَعْبِكَ، اذْكُر وُعُودِكَ لِعَبيدِكَ إِبْرَاهِيم وَإِسْحَاقَ وَإِسْرَائِيلَ الَّذِينَ أَقَمْتَ لَهُمْ بنَفْسِكَ قَائِلاً: أُكْثِرُكُمْ كَنجُومِ السَّمَاءِ وَأَهَبُكُمْ جَمِيعَ هَذِهِ الأَرْضَ الَّتِي وَعَدْتُ بهَا، فَتَمْلِوكونَهَا إِلى الأَبَد (١٣) فَتَرَاءَفَ الربُّ، وَلَمْ يُوقِع بشَعْبِهِ العِقَابَ الَّذِي تَوَعَّدَ بهِ).

تەماشای ئەم عاجباتییە بكەن، بە ناوی فەرمایشتی خواوە!

واتە: مووسا لە پەروەردگاری پارِایەوە و گوتی: بۆچی وا توند لە گەلەكەت (واتە: گەلی بەنو ئیسرِائیل) توورِەبووی، كە تۆ لە میسرِ بەهێزێكی مەزن و باسكێكی بەقوەت دەرت هێنان لە چنگی فیرعەون، بۆچی میسرِییەكان دوایی شەماتەمان پێ بكەن (خۆشحاڵ بن بە بەڵای ئێمە) و بڵێن: خوایەكەیان فێڵی لێكردن، لێرە دەری هێنان، تاكو لە چیاكان بیانفەوتێنێ و لەسەر رِووی زەوی نەیانهێڵێ، (لێرەدا مووسا - پاكیی بۆ خوا - ئامۆژگاریی خوا دەكات! هەروەها پاكیی بۆ پێغەمبەرانی خوا، كە ناماقووڵیی وا بكەن)، لەو هەمووو توورِەییەی خۆت بگەرِێوە، ئەو سزایەت بەسەر گەلەكەتدا مەسەپێنە، ئەو بەڵێنانەت وەبیر خۆت بێنەوە، كە بە بەندەكانی خۆت: ئیبرِاهیم و ئیسحاق و ئیسرِائیل (واتە: یەعقووب)ت داون، كە سوێندت بۆ خواردن بە نەفسی خۆت و پێتگوتوون: زۆرتان دەكەم وەك ئەستێرەكانی ئاسمان و، هەموو ئەو زەوییەی كە بەڵێنم داوە،





بۆ هەمیشه ئەو زەوییەتان پێ دەدەم، ئنجا پەروەردگار نەرم بۆوە و میهرەبان بۆوە و، ئەو سزایەی کە هەڕەشەی پێ کردبوو، بەسەر گەلەکەیدا، نەیچەسپاند.

(وەك تەنیا بەنو ئیسرائیل گەلی خوا بن!)

سەرنج بدەنە ئەم جۆرە تێڕوانینە بۆ خوا! هەروەها ئەم جۆرە مامەڵەیە کە گوایە پێغەمبەران لەگەڵ خوادا کردوویانە، کە بوونە ئامۆژگارییکاری خوا، بەڵکو جۆرێك لە سەرزەنشتیشیان کردوە! پاکیی بۆ خوا و پاکیی بۆ پێغەمبەرانی خوا.

**٧) نموونەی سێیەم:** لە ئیصحاحی بیست (٢٠) بڕگەی (٥)دا، دەڵێ: (لاَ تَسْجُدْ لَهُنَّ، وَلاَ تَعْبُدْهُنَّ، لأنِّي أَنَا الربُّ إِلَهُكَ إِلَه غَيُور، أَفْتَقِدُ آثَامَ الآبَاءِ فِي البَنِيْنَ حَتَّى الجِيْلِ الثَّالِثِ والرَّابع مِنْ مُبْغِضِيَّ)[1].

واتە: (گوایە خوا بە یەکێك لە پێغەمبەران دەفەرموێ) کڕنووش مەبە بۆ بتەکان و مەیانپەرستە، چونکە من پەروەردگاری پەرستراوم و پەرستراوێکی زۆر بە غەیرەم (قەڵسم بەوەی کەس بکرێتە هاوبەشم)، گوناهی باب و باپیرەکان لە کوڕەکانیاندا بۆیان دەگەڕێم، تاکو جیلی سێیەم و چوارەم، لەوانەی کە ڕقیان لەمن هەڵدەستێ.

واتە: تۆڵە لە جیلی سێیەم و چوارەم دەکەمەوە، لەبەر ئەوەی کە باب و باپیرانیان هەڵەیان کردوە! ئایا ئەوە لەگەڵ دادپەروەریی خوا و بەزەیی خوادا، دەگونجێ، کوڕ و نەوە و نەوەی کوڕ چی بکەن، کە باپیرەیان کاتی خۆی خۆی هەڵەیەکی کردوە!

لە قورئاندا خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ١٦٤﴾ الأنعام.

واتە: هیچ گوناهبارێك گوناهی کەسی دیکە هەڵناگرێ.

**٨) نموونەی چوارەم:** لە ئیصحاحی دوو (٢) بڕگەی (٢٤)دا، دەڵێ: (فَأَصْغَى اللهُ إِلَى أَنِيْنِهِمْ وَتَذَكَّر مِيثَاقَهُ مَعَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوب)[2].

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص١٧٢.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص١٣٤.

واتە: خوا گوێی هەڵخست بۆناڵەیان و، ئەو پەیمانەی وەبیر هاتەوە کە لەگەڵ ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقووبدا بەستبووی.

یانی: خوا پەیمانەکەی خۆی لەبیر چۆتەوە و، بە ناڵە ناڵی ئەوانە کە دیل بوون و زەلیل بوون لە بەنی ئیسرائیل، پەیمانەکەی وەبیر هاتەوە!!

ئایا ئەمە لەگەڵ خوادا دەگونجێ؟!

پێغەمبەران دەفەرموون: ﴿لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ۝٥٢﴾ طه.

واتە: پەروەردگارم نە ڕێی لێ تێکدەچێ و، نە هیچی لەبیر دەچێ.

**٩) لە سیفری (یشوع):** ئیصحاحی (٦) بڕگەی (١٦ و ١٧ و ٢١)، لە ژێر ناوونیشانی (سُقُوط أَرِيحَا) (ڕووخان و گیرانی شاری ئەریحا)دا، ئەمە هاتوە:

(١٦)قَالَ يَشوعُ للشَعْب: اهْتِفُوا لأَنَّ الربَّ قَدْ وَهَبَكُمُ المَدِيْنَة (١٧)، وَاجْعَلُوا المَدِيْنَةَ وَكُلَّ مَا فِيهَا مُحَرَّماً للربِّ باسْتِثْنَاءِ رَاحَاب الزَّانِيَّة، وَكُلَّ مَنْ لاذَ ببَيْتِهَا فَاسْتَحِيوهُمْ ... (٢١) وَدَمَّروا المَدِينَةَ وَقضَوا بحَدِّ السَّيْفِ عَلَى كُلِّ مَنْ فِيهَا مِنْ رِجَالٍ وَنِسَاءٍ وَأَطْفَالٍ وَشيُوخٍ حَتَّى البَقَرِ وَالغَنَمِ وَالحَمِيرِ)[١].

واتە: یەشووع (گوایە یەکێکە لە پێغەمبەرانی بەنو ئیسرائیل) بە گەلەکەی خۆی گوت: هاوار بکەن، چونکە پەروەردگار ئەم شارەی بە ئێوە داوە (دوای ئەوەی کە شارەکەیان گرتوە)، ئەو شارە هەر شتی کە تێیدایە، هەمووی بۆ پەروەردگار قەدەغە بکەن، (واتە: هەمووی بفەوتێنن)، جگە لە (ڕاحاب)ی داوێن پیس، (چونکە هەندێ لە بەنو ئیسرائیلی پەنا داون)، هەروەها هەر کەسێك کە پەنای بردۆتە بەر ماڵی ئەو، ئەوانە بهێڵەوە، (جگە لەو ئافرەتە داوێن پیسە)، ئەوانی دیکە هەموویان بفەوتێنن، (دوایی دەڵێ:) شارەکەیان هەموو کاول کرد و بە تیژایی شمشێر هەر کەسێك کە تێیدابوو، هەموویان لەبەین برد، لە پیاوان و ژنان و منداڵان و پیران و، تەنانەت لە ڕەشە وڵاخ و مەڕ و بزن و گوێدرێژەکانیش.

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص٤٣٥.

ئنجا ئایا دەگونجێ پێغەمبەرێك فەرمانێکی وا بکات و، دەگونجێ خوا بە شتی وا ڕازی بێ؟! بێگومان نەخێر.

**١٠) لە سیفری (المَزَامِیر):** ئیصحاحی (٨٢) بڕگەی (٧)دا هاتوە، گوایە خوا فەرموویەتی:

(أَنَا قُلْتُ: إِنَّكُمْ آلِهَةٌ وَجَمِيعُكُم بَنُو العَلِي، لَكِنَّكُمْ سَتَمُوتُونَ مِثْلَ البَشَر)[١].

واتە: من گوتم: ئێوە خوا (پەرستراو)ن و تێکڕای بەنو عەلی (دیارە هۆزێك بوون)، هەمووتان پەرستراون، بەڵام وەك مرۆڤان دەمرن.

ئایا دەگونجێ خوا بە مرۆڤان بڵێ: پەرستراون!!

**١١) لە سیفری (إِشْعِيَاء):** ئیصحاحی (٦٦) بڕگەی (١)دا، گوایە خوا دەفەرموێ:

(.. وَأَيْنَ مَقَرُّ رَاحَتِي؟)[٢]، واتە: ئایا شوێنی پشوودانی من کوێیە؟! شوێنی ئیسڕاحەت کردن و پشوودانی من کوێیە؟!

**١٢) لە سیفری (إِرْمِيَاء):** ئیصحاحی (٤٢) بڕگەی (١٠ و ١١)دا هاتوە:

(هَذَا مَا يُعْلِنُهُ الربُّ إِلَه إِسْرَائِيل الَّذِي أَرْسَلْتُمُونِي لأَرْفَع توسُّلكُم إِلَيْهِ: إِنْ أَقَمْتُمْ فِي هَذِهِ الأَرْضِ، فَإِنِّي أَبْنِيْكُمْ وَلاَ أَهْدِمُكُم، وَأُغْرِسُكُمْ، وَلاَ أَسْتَأْصِلُكُمْ، لأَنِّي أَسِفْتُ عَلَى الشَّرِّ الَّذِي أَلْحَقْتُهُ بكُمْ)[٣].

واتە: ئەمە ئەوەیە کە پەروەردگار پەرستراوی ئیسڕائیل ڕایدەگەیەنێ کە منتان ناردوە، تاکو پاڕانەوەی ئێوەی بۆلا بەرزبکەمەوە (کە گوایە ئیرمیا و یەکێکە لە پێغەمبەرانی بەنو ئیسڕائیل ئاوا بە خەڵکەکەی دەڵێ: پەروەردگار دەفەرموێ:) ئەگەر لەسەر ئەم زەوییە ڕێك و ڕاست بوون، ئەوە ئێوە دروست

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص١٢١٩.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص١٤٦٨.

(٣) هەمان سەرچاوە، ص١٥٥٠.

دەکەم و ناتان فەوتێنم و، دەتانڕوێنم و ڕیشە کێشتان ناکەم، چونکە لەسەر ئەو خراپەیەی کە بەسەر ئێوەم هێنا، پەشێمانم.

پاکیی بۆ خوا کە بە بەنو ئیسرائیل بفەرمویَ: لەسەر ئەو خراپە و زیانەی تووشی ئێوەم کرد، ئێستا پەشێمان بوومەوە! ئایا دەگونجێ خوا (سبحانه وتعالی) شتی وا بفەرمویَ؟!

ئەمە چەند نموونەیەکی کەم لە پەیمانی کۆن، دەربارەی ئەوە کە چۆن باس و وێنای خوا عزوجل دەکات، کە بەهیچ جۆرێك لەگەڵ خوای بەرز و مەزن و بێ وێنەدا ناگونجێ.




## بابەتی دووەم: لەبارەی پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ):

لەو بارەوەش سێ (٣) نموونە لە (پەیمانی کۆن) دێنینەوە:

**١) لە سیفری (تكوين):** ئیصحاحی نۆزدە (١٩)، بڕگەکانی: (٣٠ - ٣٨) دا، باسی دوو کچەکەی لووط دەکات، لووط کە پێغەمبەری خوایە و برازای ئیبراهیمە (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ):

(وَغَادَرَ لُوطٌ وَابْنَتَاهُ بَعْدَ ذَلِكَ صَوْغَرَ، وَاسْتَقَرُّوا فِي الْجَبَلِ، لأَنَّهُ خَافَ أَنْ يَسْكُنَ فِي صوغَرَ، فَلَجَأَ هُوَ وَابْنَتَاهُ إِلَى كَهْفٍ هُنَاكَ (٣١)، فَقَالَتْ الإِبْنَةُ الْبِكْرُ لأُخْتِهَا الصَّغِيرَةِ: إِنَّ أَبَانَا قَدْ شَاخَ وَلَيْسَ فِي الأَرْضِ رَجُلٌ يَتَزَوّجُنا كَعَادَةِ كُلِّ النَّاسِ (٣٢)، فَتَعَالَيْ نَسْقِيهِ خَمْرَاً وَنَضْطَجِعُ مَعَهُ، فَلاَ تَنْقَطِعُ ذُرِّيَّةُ أَبِينَا (٣٣)، فَسَقَتَا فِي تِلْكَ اللَّيْلَةِ أَبَاهُمَا خَمْراً، وَأَقْبَلَتْ الإِبْنَةُ الْكُبْرَى وَضَاجَعَتْ أَبَاهَا، فَلَمْ يَعْلَمْ بِاضْطِجَاعِهَا وَلاَ بِقِيَامِهَا... (٣٤)، وَفِي اليوم الثَّانِي قَالَت: الإِبْنَةُ البِكْرُ لأُخْتِهَا الصَّغِيْرَة: إِنِّي قَدْ اضْطَجَعْتُ مَعَ أَبِي لِيْلَةَ أَمْسِ، فَتَعَالِي نَسْقِيهِ اللَّيْلَة أَيْضَاً خَمْراً، ثُمَّ ادخُلِي وَاضْطَجِعِي مَعَهُ فنحي مِنْ أَبِيْنَا نَسْلاً.... (٣٧)، فَوَلَدَتِ الكُبْرَى ابْنَاً دَعَتْهُ "مُوآب" (وَمَعْنَاهُ مِنَ الأَب) وَهُوَ أَبُو الموآبيين اليوْم (٣٨)، أَمَّا الصُّغْرَى فَوَلَدَت ابْنَاً وَدَعَتْهُ: بْن عَمِّي (وَمَعْنَاهُ ابْنُ قَوْمِي) وَهُوَ أَبُو بَنِي عَمّون إِلى اليَوْمِ)(١).

تەماشا ئەو شتە قێزەونە بکەن! پەیمانی کۆن چۆن باسی پێغەمبەران علیهم السلام و ماڵ و منداڵی پێغەمبەران دەکات!

واتە: لووط و دوو کچەکەی دوای ئەوەی صەوغەریان بەجێهێشت (صەوغەر: ناوی شوێنێکە) لە چیا نیشتەجێ بوون، چونکە ترسی لە خۆی هەبوو ئەگەر لە صەوغەر نیشتەجێ بێ (تووشی زیان ببێ)، بۆیە خۆی و هەردوو کچەکەی پەنایان بردە بەر ئەشکەوتێك لە چیا، ئنجا کچە گەورەکەی بە خوشکە گچکەکەی گوت: بابمان کەوتۆتە تەمەنەوە، لەسەر زەوییش هیچ پیاوێکی دیکە نیە ئێمە

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، ص٥٢ء٥٣.

بێنێ و هاوسەرگیرییمان لەگەڵدا بکات، وەك عادەتی هەموو خەڵك، وەرە با شەراب (مەی) بدەینە بابمان و لەگەڵی بخەوین، بۆ ئەوەی وەچەی بابمان نەبڕێتەوە، لەو شەوەدا شەرابیان دا بە بابیان و، کچە گەورەکە لەگەڵ بابی خەوت (واتە: پێکەوە جووت بوون) بابی نە بەڕاکشانەکەی زانی و نە بە هەڵسانەوەکەشی، لە ڕۆژی دووەمدا کچە گەورەکە بە خوشکە بچووکەکەی گوت: دوێنێ شەوێ من لەگەڵ بابم نوستم، وەرە ئەم شەویش شەرابی بدەینێ و، دووبارە تۆش بچۆ لەگەڵی بخەوە، بۆ ئەوەی لە بابمانەوە وەچە پەیدا بکەین، ئیدی کچە گەورەکە لە بابی کوڕێکی بوو بە ناوی (موئاب) واتە: لە باب، کە ئەوە باپیرەی موئابییەکانە تا ئەمڕۆ، (گەلێك بوون لە شام)، کچە بچووکەکەش کوڕێکی بوو، ناوی لێنا: (بْنَ عمِّي) واتە: کوڕی گەلەکەم، ئەویش بابی (بەنو عەموون)ە، تاکو ئەمڕۆ (تاکو ئەو قسانە نووسراون).

بەڵێ، خاوەن کتێبەکان ئاوا باسی پێغەمبەران دەکەن! لووط (علیه السلام) پێغەمبەری هەڵبژێردراوی خوا، شەرابی درابێتێ و دوایی زینای کردبێ لەگەڵ دوو کچەکەی خۆیدا، بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ، بەڵام بێگومان پێغەمبەران پارێزراون نەك لە زینا، بەڵکو لە شتی زۆر بچووکتریش لە زینا، هەتا لە نەزەریش کە بە ئارەزووەوە تەماشای ئافرەتیان کردبێ، خوا پاراستوونی، چ جای ئەوەی لەگەڵ کچی خۆیاندا زینا بکەن!!

ئاوا پەیمانی کۆن باسی پێغەمبەران و هەڵگرانی پەیامی خوا دەکات، بۆیە خەڵکی ڕۆژئاوا وا لە خوا عاسێ دەبن!

**٢) لە سیفری (صموئِیل الثَّانِي):** ئیصحاحی یازدە (١١) بڕگەکانی: (١ - ٢٧)دا، لە ژێر ناوونیشانی: (خَطِيْئَةُ دَاوُد وَخِدَاعُهُ)، (گوناهی داود و فێڵەکەی)دا، ئەم دەقە هاتوە، کە جێی مەبەست هەمووی دێنم، چونکە لە هەندێك لە تەفسیرەکاندا بە داخەوە، ئەم بەسەرهاتە هەیە و پاڵدراوەتە لای داوود (علیه السلام) و خەڵکێك وا دەزانێ ئەوە ڕاستە و، وا دەزانێ ئەوە پەیوەندیی بە ئیسلامەوە هەیە! لە کاتێکدا ئەوە لە (پەیمانی کۆن)ی تەحریفکراوو شێوێنراودا هەیە، کە دەستی تەحریفی جوولەکەکانی گەیشتۆتێ:

(... (٢) وَفِي إِحْدَى الْأُمْسِيَاتِ نَهَضَ دَاوُدُ عَلَى سَرِيرِهِ وَأَخَذَ يَتَمَشَّى عَلَى سَطْحِ قَصْرِهِ فَشَاهَدَ امْرَأَةً ذَاتَ جَمَالٍ أَخَّاذٍ تَسْتَحِمُ (٣)، فَأَرْسَلَ دُاوُدُ مَنْ يَتَحَرَّى عَنْهَا، فَأَبْلَغَهُ أَحَدُهُمْ: هَذِهِ بِتْشَبَعْ بنْتِ أَلِيعَام زَوجَةُ أُورِيَّا الحِثِّيِّ (٤)، فَبَعَثَ دَاوُدُ يَسْتَدْعِيهَا، فَأَقْبَلَتْ إِلَيْهِ وَضَاجَعَهَا إِذْ تَطَهَّرَت مِنْ طَمْثِهَا، ثُمَّ رَجَعَتْ إِلى بَيْتِهَا (٥)، وَحَمَلَتِ المَرْأَةُ فَأَرْسَلَتْ تَبَلِّغُ دَاوُدَ بذَلِكَ ... (١٤)، وَفِي الصَّبَاحِ كَتَبَ دَاوُدُ رِسَالَةً إِلى يُوابَ بَعَثَ بهَا مِعَ أُورِيَّا، جَاءَ فِيهَا: اجْعَلُوا أُورِيَّا فِي الخُطُوطِ الأُولَى حَيْثُ يَنْشِبُ القِتَالُ الشرِسُ، ثُمَّ تَرَاجعُوا مِنْ وَرَائِهِ لِيَلْقَى حَتْفَهُ ... (٢٦)، وَعِنْدَمَا عَلِمَتْ زَوْجَةُ أُورِيَّا أَنَّ زَوْجَهَا قَدْ قُتِلَ نَاحَتْ عَلَيْهِ (٢٧)، وَحَيْثُ انْقَضَتْ فَتْرَةَ الحِدَادِ أَرْسَلَ دَاوُدُ وَأَحْضَرَهَا إِلى القَصْرِ وَتَزَوَّجَهَا وَوَلدت ابْنَاً، وَلَكِن الربَّ اسْتَاءَ مِنْ هَذَا الأَمْرِ الَّذِي آرْتَكَبَهُ دَاوُد)[١].

واتە: لە ئێوارەیەکدا داوود لەسەر تەختەکەی هەڵسا و لەسەربانی کۆشکەکەی پیاسەی دەکرد، ئافرەتێکی زۆر جوانی بینی لە دوورەوە، خۆی دەشۆرد، {ئایا پێغەمبەرێکی پایەبەرز تەماشای ماڵی خەڵك دەکات، هی ئافرەتێك کە خۆی دەشوات؟ ئنجا لەوە خراپتر}، داوود کەسێکی نارد و پشکنی داخۆ ئەو ئافرەتە کێیە؟ یەکێکیان گوتی: ئەوە (بِتْشَبَعْ) کچی (أَلِيعَام)ە، ژنی (أُورِيَّا الحِثِّيِّ) داوود بە دوای ئەو ئافرەتەیدا نارد، ئافرەتەکە هات و داوود لەگەڵی نووست (زینای لەگەڵ کرد)، چونکە لە بێنوێژیی پاك بوو بووەوە، دوایی ئافرەتەکە گەڕایەوە ماڵی خۆیان، ئافرەتەکە دووگیان بوو، داوودی ئاگادار کردەوە، هەواڵی بۆ نارد کە ئەوە من لە تۆ دووگیان بووم، لە بەرەبەیاندا داوود نامەیەکی بۆ (یوئاب) نارد لەگەڵ (ئۆرییا)دا نامەکەی نارد (ئۆرییا کە هاوسەری ئەو ژنەیە زینای لەگەڵ کردوە)، لە نامەکەدا هاتوە: (ئۆرییا) بنێرن بۆ بەرەکانی پێشەوەی جەنگ، تاکو شەڕێکی توند ڕووبدات، ئنجا بۆ خۆتان بکشێنەوە، تاکو بکوژرێ، (بەو شێوەیە تەڵەیان بۆ داناو ئۆرییا کوژرا)، کاتێك ژنی ئۆرییا زانی مێردەکەی کوژراوە، شینی لەسەر گێڕا، ئنجا دوای ئەوەی تازیەی بەسەر چوو، داوود بە دوایدا نارد و هێنای بۆ کۆشك و هاوسەرگیریی لەگەڵ کرد و

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص ٦٥٩، ٦٦٠.







کوڕێکی لێی بوو (کە بە حیساب دەبێ سولەیمان بوو بێ!) بەڵام پەروەردگار لەو کارەی کە داوود کردی، تووڕە بوو (هەر تووڕە بوو و هیچی دی)!!

**٣)- لە سیفری (الملوك الأول):** لە بارەی پێغەمبەر (سولەیمان)ەوە، ئیصحاحی یازدە (١١) بڕگەکانی: (١ - ٥)دا، دەڵێ:

(١)(وَأَولَعُ سُلَيْمَانُ بِنِسَاءِ غَرِيبَاتٍ كَثِيرَات، فَضْلاً عَنِ ابْنَةِ فِرْعَوْنَ، فَتَزَوَّجَ نِسَاءً مُوآبِيَّاتٍ وَعَمُّونِيَّاتٍ وَأَدُومِيَّاتٍ وَصِيدُونِيَّاتٍ وَحِثِّيَّاتٍ (٢) وَكُلُّهَا مِنَ بَنَاتِ الأُمَمِ الَّتي نَهَى الرَّبُّ بَنِي إِسْرَائِيل عَنِ الزَّوَاجِ مِنْهُم قَائِلاً لَهُمْ: لاَ تَتَزَوَّجُوا مِنْهُمْ وَهُمْ مِنْكُمْ، لأَنَّهُمْ يُغْوونَ قُلُوبَكُمْ وَرَاءَ آلِهَتُهُمْ، وَلَكِن سُلَيْمَانَ التَّصَقَ بِهِنَّ لفَرْطِ مَحَبَّتِهِ لَهُنَّ (٣) فَكَانَتْ لَهُ سَبْعُ مِئَةٍ زَوْجَةٍ وَثَلاَثُ مِئَة مَحْظِيَّة، فَانْحَرَفْنَ بقَلْبِهِ عَنِ الرَّبّ (٤)، فَاسْتَطَعْنَ فِي زَمَنِ شَيْخُوخَتِهِ أَنْ يُغْوِينَ قَلْبَهُ وَرَاءَ آلِهَةٍ أُخْرَى: فَلَمْ يَكُنْ قَلْبُهُ مُسْتَقِيماً مَعَ الرَّبِّ إِلَهِهِ كَقَلْب دَاوُدَ أَبِيهِ (٥)، وَمَا لَبِثَ أَنْ عَبَدَ عَشْتَارُوت إِلَهَة الصِّيدونِيين، وَمَلكُوم إِلَه العَمُّونيين البَغِيْض)[1].

واتە: سولەیمان دڵی چووە سەر ئافرەتانی بیانی زۆر، جگە لەوە کە کچی فیرعەونیش ژنی بوو، ژنانێکی زۆری هێنان لە موئابییەکان و عەموونییەکان و ئەدوومییەکان و صیدوونییەکان و حیثثییەکان (ئەوانە هەمووی عەشیرەت و نەتەوە بوون)، هەمووشیان لە کچانی ئەو نەتەوانە بوون کە پەروەردگار لە بەنو ئیسرائیلی قەدەغە کردبوو: ژنیان لێ بێنن و پێشیانی فەرموو بوو: ژنیان لێ مەهێنن و ژنیان پێ مەدەن، چونکە ئەوانە دوایی دڵتان بە دوای پەرستراوەکانی خۆیاندا گومڕا دەکەن، بەڵام سولەیمان ئەو ژنانەی زۆر خۆشدەویستن و دڵی بەو ژنانەوە نووسا، (هەرچەندە بتپەرستیش بوون)، سولەیمان حەوتسەد (٧٠٠) ژن و سێسەد (٣٠٠) کەنیزەکی هەبوون!! دڵیان لە پەروەردگاری لادا و، کە سولەیمان کەوتە تەمەنەوە، توانیان دڵی بە دوای هەندێ پەرستراوی دیکەدا بەرن و، دڵی لەگەڵ پەروەردگاری دا ڕاست نەبوو، وەك دڵی داوودی بابی، ئنجا هێندەی پێ نەچوو: سولیمان عەشتاڕووتی پەرست، کە پەرستراوی صیدوونییەکان،

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص٧٣١، ٧٣٢.

هەروەها مەلكوومی پەرست كە پەرستراوی عەمونییەكان بوو، ئەو پەرستراوە ناخۆشویستراوە!

یانی: سولەیمان جگە لەوەی كە ئەو هەموو ژنانەی هێناون (٧٠٠) ژن و (٣٠٠) كەنیزەك كە دەكاتە (١٠٠٠)! بتیشی پەرستوون! كە بە داخەوە لە هەندێك لە تەفسیرەكانی خۆشماندا بەشێك لەو درۆیانە هاتوون، كە هەمووی لێرە وەرگیراوە، لە پەیمانی كۆن!!

بەڵام خوا (سبحانه وتعالى) چۆن باسی سولەیمان دەكات؟ دەفەرموێ:

﴿ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَ ۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ ﴾ ص.

واتە: سولەیمانمان بە داوودمان بەخشی، كە باشترین بەندە بوو، زۆر بۆ لای خوا دەگەڕایەوە!

پێش ئەوەی باسی جوولەكە كۆتایی پێ بێنین، ئاماژەیەكی كورت بە (تلمود) دەكەین، كە ئەویش كتێبێكی دیكەی پیرۆزی جوولەكەكانە:

## ئـاماژەیەك بە تەلموود:

١- (تەلموود) دانراوی (رابیین)ە، كە جۆرێك لە پیاوانی ئایینی جوولەكەن و، هەزار (١٠٠٠) ساڵ بە دانانیەوە بوون و، هەزاران لە (رابیین) و زانایان تێیدا بەشدار بوون.

٢- (تەلموود) وەك تەفسیر و ڕوونكەرەوەی تەوڕات لە قەڵەم دەدرێ.

٣- بناغەی (تەلموود) بە (الرابی جیهودا) (Jehuda) - كە یەكێك بووە لە زانایانیان - دەستی پێكردوە، ئەو هەموو تەفسیرە زارەكییانەی پاڵدراونەتە لای مووسا، لە كتێبێكدا بە ناوی: (سیفری مِیشْنَاه ئووت) واتە: (القانون المساعد)، (یاسای یارمەتیدەر) كۆی كردوونەوە.

٤- دوای ئەوەی تەفسیرەکان لە دوای (میشناه) زۆربوون، ئەو تەفسیرانە لە کتێبێك نووسرانەوە بە ناوی (جماراه) و، دوایی لە: (میشناه و جماراه) هەردووکیان (تەلموود) پێکهات کە لە شەست و سێ (٦٣) کتێب پێکهاتوە و، هەموو جۆرە بابەتەکانی دینیی و دنیایی تێدان، وێڕای هەندێك پاشکۆ: (توسیفوت) (Tosephot).

٥- (تەلموود) بە کتێبی پەنهانی جوولەکەکان دادەنرێ و، ناکەوێتە دەست خەڵکە گشتییەکەی جوولەکەکان و، ئەو ڕێنماییانەی تێیدان، بە زارەکیی وەریاندەگرن، چونکە تەنها لە دەستی زاناکانیاندا هەیە.

٦- دوو قسەی تەلموود لە بارەی عیساوە (علیه السلام):

**یەکەم:** (إِنَّهُ ابْن غَيْر شَرْعِي حَمَلَتْهُ أُمُّهُ خِلاَلَ فَتْرَةِ الحَيْضِ، هَرَبَتْ مِنْ زَوْجِهَا، وَاقْتَرَفَتِ الزِّنَى، إِنَّهُ مَجْنُونٌ، إِنَّهُ وَثَنِيٌّ مُضَلِّل، إِنَّهُ مَدْفُون فِي جَهَنَّمْ).

واتە: ئەو (عیسا) منداڵێکی زۆڵە، دایکی کاتێك لە حەیز دابووە، پێی دووگیان بووە، دوایی لە مێردەکەی ڕای کردوە و زینای کردوە، ئەو (عیسا (علیه السلام)) شێت بووە و، بتپەرست و گومڕاکەر بووە و لە دۆزەخدا نێژراوە و شێردراوەتەوە.

**دووەم:** لە بارەی (مەریم)ەوە دەڵێ:

(إِنَّهَا العَاهِرَة أم ذَاكَ الَّذِي شُنِقَ، هَرَبَتْ مِنْ زَوْجِهَا، وَاقْتَرَفَتِ الزِّنَى).

واتە: ئەوە ئەو داوێن پیسەیە، دایکی ئەو کابرایەی کە لە سێدارە درا، لە مێردەکەی ڕای کرد و زینای کرد، (لە کاتێکیشدا کە بێ نوێژ بوو، عیسای لەو کاتەدا کەوتە سك و پێی دووگیان بوو)[1].

---

(١) ئەم زانیارییانەی لە بارەی (تەلموود)ەوە هێنامانن، لە کتێبی: (فَضحُ التَّلْمُود)، هی (الأب ئای . بی . براناتیس) لاپەڕە (٥٧ - ٩١)دا هاتوون، منیش لە کتێبی: (البحث عن الحقیقة الكبرى) لاپەڕە (٢٩٧ - ٣٠٠) هێناومە.

دیارە ئەگەر بمانەوێ زیاتر پەیمانی کۆن هەڵبسەنگێنین و، بژاری بکەین و بزانین چی تێدایە، لە شتی زۆر ناشایستە و نەگونجاو، بەرانبەر خوا و پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) و، دژی عەقڵ و زانست و زگماك و لەگەڵ واقیعدا تێککگیرا و، ئەو هەویرە ئاوێکی زۆری دەوێ، بەڵام بەو چەند نموونەیە واز لە پەیمانی کۆن دەهێنین[1].



---

(١) لە کتێبی پێنجەم (الكتاب الخامس)ی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا کە تەرخانمان کردوە بۆ لێکۆڵینەوە لە بارەی کتێبەکانی خواوە، وردتر لێرە باسی (پەیمانی کۆن) و (پەیمانی نوێ)مان کردوە و، لە مەحەکی عەقڵ و شەرع و زانستمان داون.

## دووەم: كتێبی زەردەشتایەتیی (ئـاڤێســتا):

بەڕێــــزان!

هەوڵدەدەین لە دە (١٠) كورتە خاڵ دا باسی (زەردەشت / زەڕادەشت) و زەردەشتایەتیی و مەجووسییەت و (ئاڤێستا)بكەین و، ئەو كتێبەش سەرنج بدەین و هەڵیسەنگێنین، كە ئایا - ئەسڵەكەی هەر چۆن بووبێ: خوایی بووبێ یان مرۆڤكرد - ئەوەی ئێستا وەك (ئاڤێستا) باوە و ناسراوە، بەكەڵكی ئەوە دێ: وەك كتێبی خوا و پەیام و بەرنامەی خوا، پشتی پێ ببەسترێ، بۆ خواناسیی و خواپەرستیی و دیندارییەكی ساغ و دنیا دارییەكی ڕاست؟!

**یەكەم:** لەلایەن زانایانی ئیسلامەوە مشت و مڕی زۆر كراوە لەو بارەوە، كە ئایا مەجووسییەت (المجوسية) و زەردەشتایەتیی (الزَّرادشتية)یش یەكێكە لە ئایینە ئاسمانییەكان، كە كتێبەكەیان (ئاڤێستا)یە؟!

هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەوانیش ئایینەكەیان بە ئایینێكی ئاسمانیی لە قەڵەم دەدرێ و، كتێبەكەشیان كتێبێكی ئاسمانیی بووە، بەڵام تێكدراوەو شێوێنراوەو گۆڕدراوە.

هەندێكیشیان دەڵێن: نەخێر زەردەشت یەكێك نەبووە لە پێغەمبەران كە وەحیی بۆ هاتبێ، بەڵكو بابایەكی بیرمەندو فەیلەسووف بووە، ویستوویەتی كە كۆمەڵگایەكەی چاك بكات و بۆ خۆی كتێبی (ئاڤێستا)ی نووسیووە، نەك لە خواوە بۆی نێردرابێ.

شایانی باسیشە تەنیا لە یەك ئایەتی قوڕئاندا وشەی (مجوس) هاتوە، كە ئایەتی حەڤدە (١٧)ی سووڕەتی (الحج)ە:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلۡمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ ﴾.





واتە: بە دڵنیایی بڕواداران و جوولەکە و صابیئە و نەصرانییەکان و مەجووس و هاوبەش (بۆ خوا) دانەران، خوا لە ڕۆژی قیامەتدا، لێکیان هەڵداوێرێ دادوەرییان لە نێوان دا دەکات بێگومان خوا ئاگادار و چاودێری هەموو شتێکە.

هەروەها پێغەمبەرییش (صلى الله عليه وسلم) لە بارەی مەجووسییەکانەوە فەرموویەتی: {سُنُّوا بِهِمْ سُنَّةَ أَهْلِ الْكِتَابِ} (أَخْرَجَهُ أَبُو يَعْلَى برقم: (٨٦٢)، وَالبَزَّار برقم: (١٠٥٦)، وَغَيْرهم، قَالَ حُسين سَلِيم أَسَد: رِجَالُهُ ثِقَات إِلاَّ أَنَّهُ مُنْقَطِعٌ).

واتە: (مەجووسییەکان) وەك خاوەن کتێبەکان مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن.

کە ئەمەش ئەو ئەگەرە زاڵ دەکات: ئەوانە (مەجووسیی و زەردەشتییەکان) ئەسڵێکی ئاسمانییان هەبێ، بۆیەش زۆرێك لە زانایان گوتوویانە: ئەوانە بە خاوەنی: شێوە کتێبی ئاسمانیی (شبه كتاب سماوي) دادەنرێن.

**دووەم:** (زەردەشت) دەبێ لە ساڵی (٦٦٠) پێش زایین لە دایك بووبێ و لە ساڵی (٥٨٠)ی پێش زایین کۆچی دوایی کردبێ، بەڵام هەندێکیشیان مێژووی دیکەی زۆر لەوە کۆنتر دادەنێن، هەندێکیشیان مێژووی لەوە نیزیك و جیاواز، دادەنێن.

دەربارەی ناوی: (زەردەشت)یش لە شێوەی گۆکردن (تلفظ)ی ناوەکەیدا جیاوازیی هەیە:

أ- هەندێك دەڵێن: (زەڕادەشت).

ب- هەندێك دەڵێن: (زەڕاتەشت).

ج- هەندێك دەڵێن: (زەردەشت) بەهەر حاڵ، بە پێی زمانە جیاوازەکان ئەو وشەیە گۆڕانی بەسەردا هاتوە.

**سێیەم:** کتێبی (ئاڤێستا) ئەوەی کە ئێستا هەیە، کە ئەم کتێبە: (نُصُوص أَفِيستَا)[1]، نووسەرێکی سووریایی بە ناوی: (إبراهيم محمود) ئامادەی کردوە، هەرچی دەستی کەوتوە لە دەقەکانی ئاڤێستا - ئەوانەی کە ماون - هێناونی و،

---

(١) لەو کاتەدا کتێبەکەم بەدەستەوە بوو ئاماژەم بۆ دەکرد.

ژمارەیەك لە خەڵكی پسپۆڕ بەشەكانیان تەرجەمە كردوون، (ئاڤێستا) بە پێی ئەوەی لەم كتێبەدا هاتوە و، سەرچاوەكانی دیكەش[1] دابەش كراوە بۆ پێنج بەش:

١)- (النَّسْك الأَوَّل: یاسنا): نەسكی یەكەم: پێی دەگوترێ: (یاسنا)، زۆرینەی كتێبی (ئاڤێستا) ئەم نەسكی یەكەمە پێكیی دێنێ، بریتیە لە كۆمەڵە (هایتی) یك، كە ژمارەیان: حەفتا و یەك (٧١) هایتییە، هەر هایتییەك لە چەند تەرنیمە (ترنیمة)یەك پێكهاتوە، بۆ وێنە: دوا هایتی: هایتی (٧١)، (٣١) تەرنیمەیە، هەروەها هایتی (٦) بریتیە لە (١٣) تەرنیمە، كە لە ژێر ناوونیشانی: (تَقْدِیس النَّار) بە پیرۆزگرتنی ئاگردا هاتوە!

٢- (النَّسْكُ الثاني: فِیسْبَرْد): نەسكی دووەم: فێسبەرد، (ڕەنگە بە جۆری دیكەش بخوێنرێتەوە)، لە بارەی سرووتی قوربانییە پیرۆزەكانەوەیە.

٣- (النَّسْكُ الثَّالِث: فَندِیدَات): نەسكی سێیەم: ڤەندیدات، پێش سەرەتای گریمانی كراو.

٤- (النَّسْكُ الرَّابع: یاشت): نەسكی چوارەم: یاشت، (ئیشتا)شی پێ دەڵێن.

٥- (أڤیستا الصُغْرَى): ئاڤێستای گچكە.

**چوارەم:** ئایا ئەم (ئاڤێستا)یەی كە ئێستا هەیە و دەقەكانی كۆكراونەوە، تا چ ڕاددەیەك متمانەی پێدەكرێ و، تا چ ڕاددەیەك دەگونجێ بڵێین: ئەوە ئەو كتێبەیە كە خوا (سبحانە وتعالی) بۆ زەردەشتی ناردوە؟ (گریمان ئەگەر زەردەشت پێغەمبەر بووبێ)؟

با تەماشا بكەین:

(موسوعة الأدیان في العالم، الدیانات القدیمة) كە دە (١٠) بەرگە و كۆمەڵە خەڵكێكی بیانی پسپۆڕ دایانناوە، ئاوا باسی كتێبی (ئاڤێستا) دەكات:

---

(١) موسوعة الأدیان في العالم، المجلد الأول: الأدیان القدیمة، ص٢٧٨.

(وَحَسَب المصادر التأريخية يَظْهَرُ أَنَّ الزَّرادشتية تعرَّضت لحادثٍ عَنيفٍ في تأريخهِ عَلَى يَدِ الأَسْكَنْدَر المَقْدُوني، فَالزَّرَادَشْتِيون يَعْتَقِدُونَ أَنَّ نَبيّهُم زَرَادَشْت، قَدْ كَتَبَ عِشْرِينَ كِتَاباً كُلٌّ مِنْهَا يَتَأَلَّفُ مِنْ مِئَةِ أَلْف أَيَة أَوْ مَقْطَع، وَنُسِخَت عَلَى اثْنَي عَشَرَ أَلْف جِلْد مِنْ جُلُودِ البَقَر، وَعِنْدَمَا انْتَصَرَ الأَسْكَنْدَر الكَبير عَلَى دَارَا الفُرُس، أَحْرَقَهَا وَكَانَ ذَلِكَ عَام (٣٣٠) قَبْلَ المِيلاد، وَبَعْدَ ذَلِكَ قَامَ المَزْدِيون (نِسْبَةً إِلى أَهُورَامَزْدَا الفُرْس) بجَمْعِ مَا وَجَدُوا مِن رِوَايَةٍ تَنَاقَلَهَا النَّاسُ مِنْ كِتَابِ "الأَفِيستا" المَنْسُوب إِلى زَرَادَشْت وَعَدُّوهُ كِتَابهُمْ المُقَدَّس، وَقَد تَمَّتْ تَرْجُمَتَهُ إِلى اللُّغَة الفَارِسِيَّة الفَهْلَوِيَّة، مَا بَيْنَ القَرْنَين، الثَّالِث وَالعَاشِر الميلادِيَيْن، وَأَقْدَمُ مَخْطُوطَةٍ مَوْجُودَةٍ، تَعودُ إِلى القَرْنِ الثَّالِث العَشر المِيلاَدِي وَبالتَحْدِيد إِلى سَنَة (١٢٥٨) وَالمَشْهُور أَنَّ عَمَلِيَةَ الجَمْعِ هَذِهِ كَانَتْ فِي عَهْدِ أَرْدَشِير الأَوَّل، وَجَاءَ بَعْدَهُ آبْنُه سابُور الأَوَّل الَّذِي أَضَافَ إِلى الأَفِيستا بَعْضَ النصُوصِ الَّتِي لَيْسَتْ لَهَا عِلاَقَةٌ بالأُمُور الدِّينية، والعقيدةُ الزَّرادشتية فِي الإله الخَالِق، تُماثِلُ عَقِيدَة الصابِئة، فالخَالِق عِنْدَهُم يخلقُ الخَيْرَ وَلاَ يُمكن أَنْ يَصْدُرُ الشَّرَّ عَنْهُ، وَهَذَا مَا دَفَعَهُمْ إِلى القَوْلِ بقُوَّةِ تَعَارض الإِلَه أَهُورَامَزْدَا، يَصْدُرُ عَنْهُ الشر، هِيَ أَهْرِيْمَن)[1].

واتە: بە پێی سەرچاوە مێژووییەکان دەردەکەوێ کە زەرادەشتییایەتیی تووشی ڕووداوێکی زۆر توند بووە، لە مێژووی خۆیدا لەسەر دەستی ئەسکەندەری مەقدۆنیی، زەردەشتییەکان قەناعەتیان وایە کە پێغەمبەرەکەیان (زەردەشت) بیست (٢٠) کتێبی نووسیون، هەر کامێکیان لە سەد هەزار (١٠٠٠٠٠) ئایەت، یان بڕگە پێکهاتوە و، لەسەر پێیستی دوازدە هەزار (١٢٠٠٠) ڕەشە وڵاخ نووسراونەوە، بەڵام کاتێك ئەسکەندەری گەورە (مەقدۆنیی) بەسەر (دارا) پادشای فارسدا سەرکەوت، لە ساڵی (٣٣٠) پێش زایینی، هەموو ئەو چەرم و پێستانەی کە ئاڤێستایان لەسەر نووسرابۆوە، سووتاندنی.

بەڵام دوای ئەوە مەزدییەکان - پاڵدرانە بۆ لای (ئاهوڕامەزدا)ی فارسەکان - {واتە: ئەوانەی بڕوایان بە (ئاهو ڕا مەزدا) هەیە}، دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی ئەو ڕیوایەتانەی کە خەڵك بە زارەکیی گێڕاویاننەوە، لە کتێبی (ئاڤێستا)ەوە

---

(١) موسوعة الأديان في العالم، المجلد الأول: الأديان القديمة، ص٢٧٨.

{کە پاڵدراوەتەوە لای (زەردەشت )}، کۆیان کردەوە و کردیان بە کتێبی پیرۆزی خۆیان، دواییش تەرجەمە کرا بۆ زمانی فارسیی فەهلەویی، لە ماوەی سەدەی سێی زایینی و سەدەی دەیەمدا، {واتە: لە ماوەی حەوت سەد ساڵدا (ئاڤێستا ) نووسراوەتەوە}.

کۆنترین دەستنووس دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سێزدە (١٣)ی زایینی و بە دیاریی کراوی: ساڵی (١٢٥٨)ی زایینی، ئنجا ئەوەش زانراوە کە ئەو پرۆسەی کۆکردنەوەی ئەو گێڕراوانە، لە سەردەمی (ئەردەشێری یەکەم)دا، ئەنجامدراوە و، دوای خۆیشی کوڕەکەی (سابووری یەکەم) هەندێك شتی پاڵداوەتە لای ئاڤێستا وەك دەق، کە پەیوەندییان بە کاروباری ئایینییەوە نیە.

عەقیدەی زەردەشتایەتییش لە بارەی خوای بەدیهێنەرەوە، شێوەی عەقیدەی صابیئە دەکات و، پێیان وایە بەدیهێنەر ناگونجێ خراپەی لێوە پەیدابێ، بۆیە ئەوە پاڵی پێوەناون کە بڵێن: هێزێکی نەیاری (ئەهووڕا مەزدا) هەیە، کە خراپەی لێوە دەردەچێ، ئەویش (ئەهریمەن)ن.

**پێنجەم:** لەمەوە کە ڕابرد بۆمان دەردەکەوێ کە: وەك چۆن (پەیمانی کۆن) و (پەیمانی نوێ ) وەك باسمان کرد، لە ماوەی هەزار (١٠٠٠) ساڵدا نووسراونەوە، ئەم کتێبەش لە ماوەی حەوت (٧٠٠) ساڵدا نووسراوەتەوە، ئنجا وەك چۆن ئەگەر (پەیمانی کۆن) و (پەیمانی نوێ ) هەندێك دەستنووسیشیان بووبن، ئێستا هیچیان دیار نین، بە هەمان شێوە (ئاڤێستا )ش هیچ دەستنووسێکی دیار نیە.

ئنجا بە داخەوە دەڵێم: کەسانێکیش هەن لە نێو ئەو نەتەوە کەساس و بێ کەسەی ئێمەدا (کە بەشێك لە خەڵکەکەی بە ئاسانیی کڵاوی لەسەر دەنرێ و فێڵی لێدەکرێ )، دەیانەوێ خەڵك لە قورئان و سوننەتەوە، لە ڕاستە ڕێی خواوە، بگێڕنەوە، بۆ (ئاڤێستا )، بۆ ئایینی مەجووسیی و زەڕادەشتایەتیی، کە نە مێژووی زەڕادەشت دیارە و، نە دەقێکی جێی دڵنیایی (ئاڤێستا )مان لەبەر دەست دایە، جگە لەوەی کە بە زارەکیی و دەماو دەم، کۆکراوەتەوە لە ماوەی حەوتسەد (٧٠٠) ساڵدا !!.

**شەشەم:** ئنجا ئەوە کە زەردەشتییەکان پێیان وایە: (ئاهو ڕا مەزدا) بەدیهێنەرو پەروەردگارە و خراپەی لێ دەرناچێ و، ئەوەی خراپەی لێ دەردەچێ، بریتیە لە (ئەهریمەن) و تەنیا ئەو خەڵك بۆ خراپە هاندەدات!

من پێم وایە (ئاهو ڕا مەزدا) ناوی خوای پەروەردگارە، چونکە دەڵێن: (ئەهریمەن)یش هەر (ئاهو ڕا مەزدا) دروستیکردوە، هەروەها پێم وایە: ئەو (ئەهریمەن)ە، هەر هەمان ئیبلیسە کە لە کتێبە ئاسمانییەکاندا هەیە، کە شەیتانە، هەروەك یەزیدییەکانیش ناویان لێناوە: (ملك طاوس) کە هەر ئیبلیسەو، گەورەیان کردوەو، لە کەوڵی خۆی بردوویانەتە دەر، وەك شتێکیان داناوە لە بەرانبەر خوادا، هەروەك مەجووسییەکانیش (ئەهریمەن)یان بردۆتە ئاستی خوا، کە ئەوە لە ڕاستییدا ئیبلیسە، ئەو ئیبلیسەی کە لە کتێبە ئاسمانییەکاندا هاتوە.

**حەوتەم:** پێویستە بزانرێ کە ئایینی زەردەشتیی، ئایینێکی داخراوە، چەند ئایینێك هەن کراوەن و، چەند ئایینێکیش داخراون، لە ئایینە داخراوەکان:

١- ئایینی جوولەکایەتیی، قبووڵ ناکەن کەسێك ببێتە جوولەکە مەگەر دایکی جوولەکە بووبێ.

٢- هەروەها ئایینی زەردەشتایەتیی، ئەوانیش خەڵك بانگ ناکەن[1].

٣- پاشان ئایینی یەزیدییەتییش ئایینێکی داخراوە - کە پێشتر تیشکێکمان خستە سەر - کەس بۆی نیە لە خۆڕا ببێتە یەزیدیی، ئەگەر لە دایك و بابەوە یەزیدیی نەبووبێ.

**هەشتەم:** لە بارەی مامەڵە کردنەوە لەگەڵ مەجووسییەکاندا، کە هەر زەردەشتییەکان بوون، ناویان بەو جۆرە گۆڕاوە: چونکە مەجووسییەکانیش و زەردەشتییەکانیش هەر ئاگریان پەرستوە، وەك لە دەقەکانی (ئاڤێستا)شدا هاتوە و، دوایی تەماشایەکی دەکەین، لەوێشدا باسی بە پیرۆز گرتنی ئاگر، بەڵکو

---

(١) ڕەنگە لەو بارەوە ڕاجیایی هەبێ.

جۆرێك لە پەرستن و بە مەزنگرتنی ئاگر، هاتوە و ئەوە خاڵی هاوبەشی نێوان مەجووسییەكان و زەردەشتییەكانە، چونكە هەندێك دەڵێن: لێك جیان، بەڵام پێم وایە مەجووسیی، هەر ناوی زەردەشتییەكانە، بۆیەش دوا كتێبی خوای پەروەردگار (قورئان) هەر ناوی مەجووسیی هێناوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یش لێی گێڕدراوەتەوە، پرسیاری لێكراوە: چۆن مامەڵە لەگەڵ مەجووسدا بكرێ؟ فەرموویەتی: {سُنُّوا بِهِمْ سُنَّةَ أَهْلِ الْكِتَابِ} (أَخْرَجَهُ أَبُو يَعْلَى برقم: (٨٦٢)، وَالبَزَّار برقم: (١٠٥٦)، وَغَيْرهم، قَالَ حُسين سَلِيم أَسَد: رِجَالُهُ ثِقَات إِلاَّ أَنَّهُ مُنْقَطِعٌ).

واتە: مەجووسیش وەك خاوەن كتێبەكان مامەڵەیان لەگەڵدا بكەن.

پێشتریش گوتمان: وشەی (مەجووس) لە قورئاندا لە یەك شوێندا هاتوە، ئەویش لە ئایەتی (١٧)ی سوورەتی (الحج)دا خوا دەفەرمویٚ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلۡمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ١٧ ﴾.

واتە: بە دڵنیایی بڕواداران (كە مسوڵمانانن) و جوولەكەكان و صابیئە و نەصڕانییەكان و مەجووسەكان و ئەوانەی هاوبەشیان (بۆ خوا) داناوە، (واتە: بتپەرستەكان)، بێگومان خوا دادوەرییان لە نێوان دا دەكات لە ڕۆژیی دوایی دا و، بێگومان خوا چاودێرو ئاگاداری هەموو شتێكە.

بۆیەش هەندیٚ لە زانایان ئەوە دەكەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی كە مەجووسییەكانیش بە خاوەن كتێب لە قەڵەم دەدرێن، كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: وەك خاوەن كتێبەكان مامەڵەیان لەگەڵدا بكەن، چونكە ئەگەر كتێبێكی سەلمێنراوو دانپێداهێنراویشیان نەبیٚ، بەلای كەمەوە شوبهە كتێبێكیان هەیە.

**نۆیەم:** ژمارەی مەجووسییەكان لە جیهاندا وا دەزانریٚ زۆر زۆرن، بەڵام بۆ زانیارییتان! (ڕۆستەم شەهزادیی) مەرجیعی دینیی باڵای زەردەشتییەكان لە ئێران، دەڵیٚ: ژمارەی زەردەشتییەكان لە ئێران نەوەدو یەك هەزار (٩١،٠٠٠)

کەسە، ئنجا ئەو ژمارەیە ئەگەر هی چەند ساڵێکیش لەمەو پێش بێ، با شتێکیش زیادیان کردبێ و، بە زۆریی لە شارەکانی تاران و کرمان و ئەسفەهان و شیرازدا هەن، لە هیندیش سەد هەزار (١٠٠٠٠٠) کەس دەبن و، لە پاکستان پەنجا هەزار (٥٠٠٠٠) کەس و، لە وڵاتانی ئەورووپا پەنجا هەزار (٥٠٠٠٠) کەس و لە ئەمریکا بیست هەزار (٢٠٠٠٠) کەس و لە ئەفریقیای باشووریش بیست هەزار (٢٠٠٠٠) کەس، بە پێی ئەو سەرژمێرییانە کە (ڕۆستەم شەهزادیی) کردوونی: سێ سەدو سی هەزار (٣٣٠٠٠٠) کەسی مەجووسیی لە هەموو دنیادا هەیە، لەو کاتەدا کە ئەو چاوپێکەوتنەی لەگەڵدا کراوە.

**دەیەم:** دوو دەقی ئاڤێستا کە جەوهەری ئاڤێستای ئێستا دەردەخەن:

بۆ زیاتر دڵنیایی هەموو لایەك، دوو دەق لەم کتێبی (ئاڤێستا)یە دێنمەوە:

**دەقی یەکەم:** لە نەسکی یەکەم: هایتی: (٦)، کە (٢١) تەرنیمەیە و[1] لەو (٢١) تەرنیمەیە، تەنیا دووانیان ماون، چونکە هایتی وا هەیە، پەنجا (٥٠) تەرنیمەیە، تەنیا شەش، حەوتێکیان ماون:

تەرنیمەی یەکەم: (بقَرَابِينِنَا نَعْبُدُ الخَالِق، آهُورَامَزدَا، وَنَعْبُدُ الخَالِدِينَ الطَّيِّبِينَ الَّذِينَ يَحْكُمون بشِكْلٍ صَّحِيحٍ، وَيَتَصَرَّفُونُ بكُلِّ شَيءٍ عَلَى نَحْوٍ قويمٍ)[2].

واتە: بە قوربانییەکانمان بەدیهێنەر ئاهوڕامەزدا دەپەرستین، هەروەها هەر ژیاوە پاکەکان کە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست دادوەریی دەکەن و شێوەیەکی ڕاست و دروست مامەڵە دەکەن.

هەڵبەتە مەبەست پێی حوکمڕانان بن، یان مەبەستی پێ فریشتەکان بن، (ئاڤێستا) دەڵێ: وێڕای خوا ئەوانیش دەپەرستین!

---

(١) "ترنيمة"، واتە: لاواندنەوە، پیاهەڵگوتن.

(٢) نصوص أفستا وقراءة في النص الأفستاني، ص١٢٥، ط١/ ٢٠١٣م.

تەرنیمەی دووەم: (بقَرَابينِنَا نُقَدِّس أَسْنِيَا، هَاوَان، سافَاتكِي، وفيسيا، أسياد الطُّقُوس المقَدَّسِين، كَمَا نُقَدِّسُ ميثرَا، ذا المراعي الواسعة، ذا الألف أذن، وعشرات الألاف من العيون، ويازاد، ذا الإِسم المنطوق، كَمَا نُقَدِّسُ رَامَانَ هفاسرا)[١].

واتە: بە قوربانییەکانمان (أَسْنِيَا، هَاوَان، سافَاتكِي، وفيسيا) بە پیرۆز دەگرین، ئەوانە کە گەورەی سرووتە پیرۆزەکانن و، (میثرا)ش بە پاك دەگرین، خاوەنی لەوەڕگا فرەوانەکانە و، خاوەنی هەزار گوێیە و دەیان هەزار چاوی هەیە، هەروەها (یازاد) خاوەنی ئەو ناوەیە کە گۆی (تلفظ)ی پێدەکرێ، هەروەها (ڕامان هفاسرا) بەرزو پیرۆز دەگرین.

هەڵبەتە شتێك هەزار گوێ و، دەیان هەزار چاوی هەبێ، بە تەئکید شتێکی خوڕافییە و لەسەر ئەرزی واقیع بوونی نیە، کەچی (ئاڤێستا) دەڵێ: قوربانیی بۆ دەکەین و دەیپەرستین!

**دەقی دووەم:** دەقێکی دیکە، کە سەرنجێکی سەرپێی لێدەدەین، هەر لە نەسکی یەکەم، لە هایتی ژمارە (٦٢)دا[٢]، کە لە ئەسڵدا (٢٣) تەرنیمە بووە، بەڵام چەند تەرنیمەیەکی کەمی لێ ماون:

کە بریتین لە تەرنیمەکانی: (١ و ٢ و ٣ و ٧ و ٨ و ١٠ و ١٢) بەڵام تەرنیمەکانی دیکە فەوتاون، ئەمەش دەقی تەڕنیمەی یەکەم لەو (٧) تەڕنیمەیە:

{تقديس النار:

((١) مثل السيد الأفضل وكقاض الذي يَمنحُ من خلال أشا، ومن خلال الفكر الخَيِّر عطايا أفعال مازدا، من ساعد الفقير يجعل أهورا يحكم.

بالتقديس والمديح، بالقربان الخيِّر، القربان السَّعيد، وبالقربان المحبوب، نباركك أَيَّتها النار، نقدِّسك ونمدحك أيَّتها النار التي ستكون في بيت الزائلين، سيُصيب النعيم

---

(١) هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

(٢) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە: ٢٩٩.



ذلك الإنسان الذي يُقَدِّسك بصدق بالحَطَب بين يديه، بالبارسمان بين يديه، بالحليب بين يديه، وبالجرن بين يديه).

پوختەی مەبەست لەم تەرنیمەیەی یەکەمی هایتی (٦٢) کە لە ژێر ناوونیشانی بە پیرۆز گرتنی ئاگر (تقديس النار)دا، هاتوە، ئەوەیە کە (ئاگر) بە بەرز و پیرۆز بگیرێ و، قوربانیی پێشکەش بکرێ و، مەدح و ستایشی بکرێ، چونکە هەر کەسێك ئاگر بە بەرز و پیرۆز بگرێ (واتە: بپەرستێ) خێر و خۆشیی و ناز و نیعمەت ڕووی تێ دەکات.

هەڵبەتە بە پێویستیی نازانم مانای هەموو تەرنیمەکان بکەین، چونکە بە ڕاستیی واتایەکی ڕۆشنیان نیە و، قرتانی زۆریشیان لە نێودا هەیە، بۆ وێنە: لە نێوان بڕگەی (٣) و (٧)دا: بڕگەکانی: (٤ و ٥ و ٦) قرتێنراون، دیارە دواتر بڕگەی (٧) کە دێ، بێگومان پەیوەستە بەوەی پێش خۆیەوە، هەروەها لە نێوان بڕگەکانی: (٨) و (١٠)دا، بڕگەی (٩) قرتێنراوە و، لە نێوان: (١٠) و (١٢) دا بڕگەی (١١) پچڕێنراوە، پاشان لە بڕگەی (١٢) تاکو کۆتایی: بڕگەی (٢٣) هەمووی قرتاوە!

پێشتریش باسمان کرد: گوایە دەبێ (ئاڤێستا) لەسەر پێستی دوازدە هەزار (١٢٠٠٠) گا و مانگا، نووسرابێتەوە، بەڵام ئێستا ئەوەندەی لێ ماوەتەوە، کە لەو کتێبەدا خۆی دەبینێتەوە، ئەویش بە شەرح و ڕوونکردنەوەوە و، کتێبەکەش هەمووی (٤٩٨) لاپەڕەیە و، سەد (١٠٠) لاپەڕەی پێشەکیی و پێناسە و قسە و باسی نووسەر (إبراهيم محمود)ە و، هەموو دەقەکانی: (ئاڤێستا) بە شەرحیشەوە کە شەرحەکەی چەند بەرانبەری دەقی (ئاڤێستا)یە، لە (٣٩٨) لاپەڕەدا کۆکراونەوە!

بەڕێزان! ئەمە کورتەیەك بوو لە بارەی (ئاڤێستا)وە، کتێبی پیرۆزی مەجووسییەکان، یان زەردەشتییەکان، کە بە تەئکید نە متمانەی پێدەکرێ لە ڕووی سەنەدەوە، نە لە ڕووی نێوەڕۆکەوە، چونکە خوا بەیەکگرتنی تێدانیە، بەڵکو پڕە لە شیرك و ئەفسانە و شتی بێ مانا و، لەوە ناوەشێتەوە کە بە کتێبی خوا لە قەڵەم بدرێ.

کەسێکیش وەك کتێب و فەرمایشتی خوا تەماشای بکات و، بۆ دینداریی و دنیاداریی پشتی پێ ببەستێ، هیچی دەستگیر نابێ، بەڵکو دەستی لە بنی هەمبانەی خاڵییەوە دەردەچێ و، خۆیشی نازانێ چی دەکات!![1]



---

(١) هەڵبەتە لەو دەقانەدا کە بە ناوی (ئاڤیستا)ی زەردەشتەوە نووسراونەوە، هەندێك قسەشیان تێدان کە تاڕاددەیەك مانایەکی جوانیان هەیە و دەچنە قاڵبی پەند و حیکمەتەوە بۆ وێنە بڕوانە: الملحق الثالث: (من ترانيم زرادشت)، ترنيمة: (٢٨ و ٢٩ و ٣٠ و ٣١ و ٣٢ و ٣٣ و ٣٤ و ٤٣ و ٤٤ و ٤٥ و ٤٦ و ٤٧ و ٤٨ و ٤٩ و ٥٠ و ٥١)، لە کتێبی: (الزَّرادشتيه: الفجر - الغروب)دا، ص ٤٢١ - ٥٠٣، ر. س. زيهنير، أستاذ الديانات الشرقية في جامعة أكسفورد، بەڵام بێگومان شتی دووبارەو قسەی بێ سەروبەری زۆریشیان تێدایە و، هەر چۆن لێیان وردبیەوە شتێکی وایان تێدا نابینی کە مرۆڤ فێری بووناسییەکی ڕاست، یان ئیمان و عەقیدەیەکی ساغ، یان خواپەرستییەکی شایستە بکەن، چ جای ڕێکخستنی کاروباری خێزان و کۆمەڵگا و دەوڵەت!!




## سێیەم: کتێبی صـــابیئە[1]:

بەڕێـــزان!

خوا پشتیوان بێ لە پێنج (٥) خاڵدا، باسی صابیئە و کتێبەکەیان دەکەین، کە پێیان وایە لەلایەن خوای بەرز و مەزنەوە دابەزێنراوە و، کورتە هەڵسەنگاندنێکی بۆ دەکەین، کە ئایا دەگونجێ وەك کتێب و پەیامی خوا دابنرێ و، بۆ خواناسیی و خواپەرستیی و، پاشان دینداریی و دنیادارییەکی ڕاست و ساغ بەهرەی لێوەربگیرێ و، پشتی پێ ببەسترێ؟!

### خاڵی یەکەم: پێناسە:

لە بارەی صابیئەوە کە ئایا: کێن و چین و چۆنن؟! زانایان زۆر مشت و مڕیان بووە، بۆ وێنە:

١)- خاوەنی (لِسَانُ العَرَب) (إِبْنُ منظور) دەڵێ: (الصَّابِئُونَ: قَوْمٌ يَزعُمُونَ أَنَّهُمْ عَلَى دِين نُوحٍ (عليه السلام) بكَذِبِهِم)[2]، واتە: صابیئەکان کۆمەڵێکن، بە درۆی خۆیان پێیان وایە کە لەسەر ئایینی نووح (عليه السلام)ن.

٢)- (جمال الدين القاسمي) خاوەنی (محاسن التأويل) دەڵێ: صابیئە دوو بەشن:

أ/ ئەو صابیئانەی یەکخواپەرستن (صابئة حنفاء موحِّدون).

ب/ ئەو صابیئانەی هاوبەشدانەرن (صابئة مشركون).

---

(١) صبأ: خرج من دين إلى آخر كما تَصْبَأُ النجومُ أي تخرج من مطالعها، صبأ من شيء إلى شيءٍ: انتقل، ويقال: صبأ الرجل: ترك دينهُ ودان بآخر. المعجم الوسيط، ص٥٠٥

(٢) لسان العرب، ج٤، ص٢٣٨٥.

٣)- (عبدالرزاق الحسيني) له كتێبەكەی خۆی: (الصَّابئُونَ حَاضِرُهُم وَمَاضيهِم) دا، دەڵێ: بە پێی كتێبی (كَنْزَا رَبَّا) دەبێ صابیئەكان خوابەیەكگربن[١].

٤)- (الشهرستاني) دەڵێ: (زَعْمُهُم أَنَّ اللهَ تَعَالَى أَجَلُّ مِنْ أَنْ يَخْلُقَ الشرُورَ، بَلْ هِيَ كُلّهَا وَاقِعَة ضَرورَة عَنِ اتِّصَالاَتِ الكَوَاكِب سَعَادَةً وَنُحُوسَةً)[٢]، واتە: صابیئەكان پێیان وایە كە خوا لەوە بەرزترە دروستكراوە خراپەكان بخوڵقێنێ (وەك دووپشك، مار، لافاو .. هتد)، بەڵكو ئەوانە هەموویان لە ئەنجامی پەیوەندیی بەستنی خڕۆكەكان، بە باری بەختەوەریی و بە باری نەگبەتییدا پەیدادەبن.

## خاڵی دووەم: كتێبی صابیئە:

**یەك:** صابیئەكان دوو كتێبیان هەن:

١- (كَنْزَا رَبَّا: الكنز العَظِيم: الكتاب المقدَّس، للصَّابئَة المِنْدَائيين)، ئەم كتێبە، كە بە حیساب بۆ ئادەم (عليه السلام) نێرراوە، لە دوو بەش پێكهاتوە، كە یەكەم كتێبە من بەو شێوە بیبینم:

بەشی لای ڕاستی: (٣٠٩) لاپەڕەیە.

بەشی لای چەپی: (١٣٦) لاپەڕەیە.

٣٠٩ + ١٣٦ = ٤١٥.

٢- (دِرَاشَة أَدِيهيا، مَوَاعِظ وَتَعَالِيم يَحْيى بْن زَكَرِيَّا (عليه السلام)): ئەم كتێبەشیان بە حیساب: ئامۆژگارییەكانی یەحیای كوڕی زەكەرییان سەلامی خوایان لێبێ، ژمارەی لاپەڕەكانی: (٢٢٢)ە.

شایانی باسە هەردووك كتێبەكە، لە ئەسڵدا بە زمانی غەیری عەرەبیی بوون:

---

(١) ص ٢٦.

(٢) موسوعة الأديان في العالم، ج١، الأديان القديمة، ص٢٤٥.

أ- بەنسبەت (كنزا ربَّا)وە، نووسراوە: (تَمَّتْ تَرْجَمتُهُ مِنَ اللُّغَة المِندائية مباشرة إلى اللغة العربية...).

ب- بەنسبەت (دراشه أديهيا)وەش نووسراوە: (قام بترجمته من اللغة المندائية - الآرامية إلى اللغة العربية: أمين فيصل خطاب).

**دوو:** صابیئەكان دیار نیە پێغەمبەرێكی دیاریی كراویان هەبێ، بەڵام گوایە: (كَنْزَا رَبَّا) بۆ ئادەم (عليه السلام) هاتوە و (دراشه أديهيا)ش ئامۆژگارییەكانی یەحیای كوڕی زەكەریيان.

## خاڵی سێیەم: باسكرانی صابیئە لە قورئاندا

(صابئة) لە سێ شوێنی قورئاندا، لەگەڵ مسوڵمانان و جوولەكە و نەصرانییەكاندا باسكراون:

١- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ ....﴾ البقرة -٦٢-.

٢- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـُٔونَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ ....﴾ المائدة -٦٩-.

٣- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ ....﴾ الحج -١٧-.

هەڵبەتە ئەو باسكرانەشیان لە سێ ئایەتی قورئاندا و، لە ڕیزی مسوڵمانان و جوولەكە و نەصرانیی - و لە شوێنێكیش مەجووسیی - یەكاندا، ئەگەری ئەوە بەهێز دەكات كە لە ئەسڵدا كتێبێكی ئاسمانییان هەبوو بێ.

## خاڵی چوارەم: ژمارەی صابیئەكان:

لە هەموو دنیادا ژمارەی صابیئەكان، نزیكەی سەد و پەنجا هەزار (١٥٠،٠٠٠) كەسێك دەبێ و، زۆربەیان لە عیراقن و، لە عیراقیش بە زۆریی لە لای هۆڕەكان (أهوار)ن، بە تایبەت لە نزیك بەسرە، لەو شوێنانەی كە





ڕووبارو جۆگەلە ئاوەکانی لێن، چونکە کۆمەڵێك سرووتی ئایینییان هەیە، دەبێ زوو زوو خۆیان بشۆن و، ئاوێك بە کاربێنن کە شۆقی ئەستێرەکان و خرۆکەکان لێی بدات و بە دەرەوە بێ(١).

## خاڵی پێنجەم: هەڵسەنگاندنی کتێبی صابیئەکان:

**یـــەك:** ئەگەر تەماشای هەردووك کتێبی: (كَنْزَا رَبَّا: الكِتَابُ المُقَدَّس، للصَّابِئَة المِنْدَائيين) و (دِرَاشَة أَدِيهيا، مَوَاعِظ وَتَعَالِيم يَحْيى بْن زَكَرِيَّا (عليه السلام)) بکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە زۆر بەڕێزو مەزنەوە، تێیاندا باسی خوای تاك و پاك دەکرێ، بۆ وێنە:

أ- لە کتێبی: (كنزا ربَّا/ اليمين)دا، هەر لە سەرەتای کتێبەکەوە ناوونیشانێك هاتوە: (التسبيح الأول/ التوحيد) دەڵێ:

((١) مُسَبَّحٌ رَبٌّ بِقَلْبٍ نَقِيٍّ، هُوَ الحَيُّ العَظِيم، البَصِيرُ القَدِيرُ العَلِيم، العَزِيزُ الحَكِيم، (٢) هُوَ الأَزَلِيُّ القَدِيم، الغَنيُّ عَن أَكْوَانِ النُّور، (٣) هُوَ القَوْلُ وَالسَّمْعُ وَالبَصَرُ، الشِّفَاءُ وَالظَّفَرُ وَالقُوَّةُ وَالثَّبَات، (٤) هُوَ الحَيُّ العَظِيم، مَسَرَّةُ القَلْبِ، غُفْرَانُ الخَطَايَا، مُسَبَّحٌ رَبٌّ بِقَلْبٍ نَقِي، (٥) يَا رَبَّ الأَكْوَان جَمِيْعَاً! مُسَبَّح مُبَارَكٌ مُمَجَّدٌ مُعَظَّمٌ مُوَقَّرٌ قَيُّومٌ، (٦) العَظِيم السامِي، مَلِكُ النُّورِ السامِي، (٧) الحَنَّانُ التَّوَّابُ الرَّؤُوفُ الرَّحِيم الحَيُّ العَظِيم، (٨) لاَ حَدَّ لِبَهَائِهِ وَلاَ مَدَى لِضِيَائِهِ، (٩) المُنْتَشِرة قوَّتُهُ، العَظِيمَةِ قُدْرَتُهُ، (١٠) هُوَ العَظِيمُ الَّذِي لا يُرَى وَلاَ يُحَدّ، (١١) لاَ شَرِيكَ لَهُ فِي سلْطَانه، وَلاَ صاحِبَ لَهُ فِي صَولَجَانِهِ، (١٢) مَنْ يتَّكِلْ عليَهِ فلن يُخيب، وَمَنْ يُسَبِّح باسمِهِ، فَلَنْ يَسْتَرِيب، وَمَنْ يَسْأَلُهُ فَهُو السَّمْيع المُجِيب، (١٣) مَا كَانَ لأَنَّهُ ما كَانَ، وَلاَ يَكُونُ لأَنَّهُ لاَ يَكُون، (١٤) خَالِدٌ فَوْقَ كُلِّ الأَكْوَان لاَ مَوتٌ، لايدنو مِنْهُ، وَلاَ بُطْلاَن (١٥))(٢).

---

(١) موسوعة الأديان في العالم ص، ج١، الأديان القديمة، ص٢٥٤، موسوعة: الأديان الحية في العالم، ص١٥٦، عبدالرحيم مارديني، ط٢٠٠٩، دار المحبة.

(٢) كنزا ربَّا، الكتاب الأول، ص١، ٢، ط٥/ ٢٠١٠ مطبعة جعفر العصامي.

کە ئەمە بەگشتیی لەگەڵ ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) تێکدەکاتەوە، ئنجا دەگونجێ وەحییەکی پێغەمبەران بووبێ و مابێتەوە، دەشگونجێ لە قورئانەوە وەریان گرتبێ، گرنگ ئەوەیە باسی تەوحیدێکی باشی خوای بەرزو مەزن و بێ هاوتایە و، کۆمەڵێك سیفەتی خوا (سبحانه وتعالى) باس دەکات، کە خوا جیایە لە دروست کراوەکانی و، لە سەرووی دروست کراوەکانیەتی و، خوا بێ سنوورەو سیفەتەکانی ڕەهان و، هەر مرۆڤێك بیپەرستێ و، پشتی پێ ببەستێ و، داوای لێ بکات و ڕووی تێبکات، نا ئومێد و بێ مرادی ناکات.

**ب-** هەروەها لە کتێبی: (دراشة أديها، مواعظ وتعالمٍ يحيى بن زكريا)دا، کۆمەڵێك ئامۆژگاریی جوان هەن، بۆ نموونە:

{النص الحادي والأربعون

نداء الحياة

باسم الحيِّ العظيم

نداء الحياة صرخة مُدَوِيَّة.

إنه ينادي ويقول: طوبى لِمَن حَفِظَ نَفسَهُ، الرجل الذي يحفظ نَفسَهُ لايُضارعة أحد.

طوبى للأعمال النَّافعة التي تقيكم من كل سوء.

ويلٌ لمن يمتلك قلباً يَمْلَؤُهُ السوء، ولا تجودُ يداه بِمَنح الطَّيِّبَات.

ويلٌ لمن يراودهُ فكر حاقد، هو من فكر الشيطان، يُطلِقُ العِنان للرغبات الجامحة في هذا العالم، فكما فَتحَ فَمهُ لُعِنَ ولم يَرَ موضع النور.

الأيدي المتعالية التي تَمْتَدُّ على أسيادها، تُقطعُ بالسيف.

وَيْلٌ للكروش الكبيرة التي لا تَشْبعُ مَهْمَا أَكَلَتْ...}[١].

---

(١) ص١٢٨.





وەك دەبینین: بەگشتی ئەم ئامۆژگارییانەش شتی پەسندن و، لەگەڵ عەقڵ و زگماك و شەریعەت دا گونجاون.

**دوو:** بەڵام هەر دوو کتێبەکە، ناوی ژمارەیەکی زۆر لە دروستکراوانی دیکەیان تێدان کە شەیتانن، یاخود دروستکراوی خەیاڵن و، زۆر کاروباریان پاڵدراونەلا، کە ئەوەش لەگەڵ تەنیایی خوادا تێکدەگیرێ، بۆ وێنە:

باسی (بثاهیل) زۆر کراوە، کە لە (مصطلحات كَنْزَا رَبَّا) لە لای ڕاست، ئاوا باسی (بثاهیل) دەکات، دەڵێ:

(بثَاهِيل: مَلاكٌ أثريٌّ يُمثِّلُ الحَيَاةَ الرَّابعَة، شَارَكَ فِي عَمَلِيَّةَ الخَلْقِ وَالتَّكْوين وَلَهُ مُطَهِّرٌ)[1] واتە: (بثاهِیل) فریشتەیەکی (أثري)یە، نوێنەرایەتیی ژیانی چوارەم دەکات، لە پڕۆسەی دروست کردن و هێنانەدی دا، بەشدار بووە.

کە بێگومان ئەمە هاوبەش دانانە بۆ خوا تاك و تەنیا.

هەروەها (بەثاهیل) بە بەدیهێنەری سەرجەم دروستکراوەکان، دانراوە، بەسەر و خوار و ورد و درشتەوە، بۆ وێنە: باسەرنجی ئەم دەقە بدەین:

(کنزا رباً/ الیمین، ص٩. (٤٢) وَبِبَثاهيل سَيَستَنيرُ العَالَم (٤٣) قَالَ مَلَكُ النُّورِ السّامِي قَوْلهُ، فَكَانَ كُلّ شَيء، (٤٤) نَزَلَ بثَاهِيل، رَفَعَ السَّمَاء وَبَسَطِ الأَرْض، وَنَادَى مَلاَئِكَةِ النَّار، (٤٥) وُهِبَتِ الشَّمْسُ ضِيَاءً، وَوُهِبَ القَمَرُ بَهَاثَاً، وَالنُّجُومُ سَنَاءً، وَرُفِعَت كلُّ إلى مَدَار، (٤٦) وتكوَّنَتِ العواصفُ والماء والنَّار، (٤٧) وَتَكَوَّنَتِ الثِّمَارُ وَالأَعْنَابُ وَالأَشْجَار، (٤٨) وَكُوِّنَ الحيوانُ الأَلِيفُ وَالوحشُ الكَاسِر، (٤٩) وَمِنَ التُّرَابِ وَالطِّيْنِ الأَحْمَر، وَالدَّمِ وَالمَرَارَة ومن سِرِّ الكون، جُبِلَ آدم وحواء وحلَّ فيهما نَشمَثَا[2] بقُدْرَةِ مَلَكِ النُّور)[3].

---

(١) ص٣١٠.

(٢) نَشمَثَا: النفس وهي جوهر الحياة، ومصدرها عالم النور وهي هبة الخالق سبحانه للإنسان. مصطلحات کنزا ربا/ الیمین.

(٣) کنزا ربا / الیمین، ص٩.

واتە: بەهۆی (بەثاهیل)ەوە دنیا ڕووناك دەبێتەوە: فریشتەی نووری پاك قسەی کرد و هەموو شتێك هاتەدی، (بثاهِیل) دابەزی، ئاسمانی بەرز کردەوە و، زەوی ڕاخست و، بانگی فریشتەکانی ئاگری کرد، وایکرد کە خۆر تیشکی بدرێتێ و، مانگ ڕووناکیی بدرێتی و، ئەستێرەکان جوانییان بدرێتێ و، هەموو شتێك بۆ سووڕگەی خۆی بەرزکرایەوە، هەروەها گەردەلوولەکان و ئاوو ئاگر دروستکران و، میوەکان و جۆرەکانی ترێ و درەختەکان دروستکران و، ئاژەڵی ماڵیی و دڕندە تێکشێنەرەکان دروستکران، ئنجا لە گڵ و قوڕی سوور و لە خوێن و لە تاڵیی و لە نهێنیی گەردوون، ئادەم و حەووا دروستکران و، ڕووحیان بە بەردا کرا، بە دەستەڵاتی فریشتەی ڕووناکیی.

کە بێگومان ئەوە هەمووی شیرکە.

**سێ:** ئنجا ئەگەر تەماشای ئەو دوو کتێبە بکەین، بە تایبەت (كَنْزَا رَبَّا) دەبینین: ژمارەیەکی زۆر لەو دروستکراوانەی کە ناویان هاتوە، هیچ کەس نازانێ:

کێن؟ چین؟ چۆنن؟!

من چاوێکم بە (کنزا رباً) داخشاند ناوی: چل و چوار (٤٤)یانم هێناوە، کە ناوی زۆر سەیر سەیریان تێدا هەن، کە ئەمانەن[1]:

١- أُثريون.

٢- أَنوش.

٣- أَباشر.

٤- أوكاس زيوا.

٥- أناثان رقن.

٦- أَور.

٧- إِيواث.

---

(١) هەر بە ئیملای عەرەبیی دەیاننووسین، چونکە سەرچاوەکە بە زمانی عەرەبییە.

٨- إدثان ويَدثان.

٩- تورئيار.

١٠- جبرائيل.

١١- حام زيوا ونهور زيوا.

١٢- دين مليخ.

١٣- رام و رود.

١٤- روهة

١٥- رواز طفنا.

١٦- زرتاي وزرتناي.

١٧- زهرييل.

١٨- زان هززبان.

١٩- زرزييل زيوا.

٢٠- شورمباي وشرهبيد.

٢١- شيتل.

٢٢- شلاّوم.

٢٣- شلماي وندباي.

٢٤- شهلون.

٢٥- قهزئيل.

٢٦- قن.

٢٧- كبار زيوا.

٢٨- طاف وطافان.

٢٩- طيو.

٣٠- كرون.

٣١- میندادا هیي.

٣٢- مانا.

٣٣- ماراد ربوثا.

٣٤- نباز هایلا.

٣٥- نباط العظیم.

٣٦- نصاب.

٣٧- هیبل زیوا.

٣٨- هاغ وماغ.

٣٩- هیبل.

٤٠- یاور.

٤١- یوشامن.

٤٢- یثرون.

٤٣- یوربا.

٤٤- یوسمیر أَثر

کە بە حیساب هەر کام لەمانە، یان فریشتەن، یاخود کائینی باش، یان خراپن، لە تاریکیی، یان لە ڕووناکیی دان.

بەڵام وەك پێشتریش گوتمان: لە هەردووك کتێبەکەی صابیئەدا، پەندو قسەی جوان جوانیش هەن و مەدح و سەنای زۆر باشی خوای بەرز کراوەو، وا پێدەچێ کتێبەکانی صابیئەش ئەصڵێکیان بوو بێ، بەڵام وا تێکدراون، کەس سەری لێیان دەرناچێ و، شتی دژو پێچەوانەی یەکدییان زۆر تێدا هەیە و، پێم وانیە هیچ خاوەن عەقڵ و ویژدانێك ئەو ڕاستییە نەسەلمێنێ، کە هەردووك کتێبی ئایینی صابیئەکان، هیچ کامیان کەڵکی ئەوە ناگرێ بە پەیام و فەرمایشتی خوا دابنرێ و، بۆ خواناسیی و خواپەرستیی و دینداریی و، دنیاداریی پشتیان پێ ببەسترێ، هەڵبەتە وەك واقیعی ئێستایان، نەك وەك حاڵەتی ئەسڵییان، کە نازانین چۆن بووە؟!

## چوارەم: کتێبی نەصرانییەکان:

بەڕێـــــزان!

چوارەمین کۆمەڵە خەڵکی ئەم ڕۆژگارە، کە خۆیان بە خاوەنی کتێبی ئاسمانیی و خوایی دادەنێن، نەصرانییەکان (نَصارى)ن و، کتێبی ئایینی نەصرانییەکانیش، بریتین لە هەردووك کتێبی:

١- پەیمانی کۆن (العهد القديم).

٢- پەیمانی نوێ (العهد الجديد).

پێشتریش باسمان کرد کە (پەیمانی کۆن) (٣٩ - ٤٩) سیفرە، کە جوولەکە تەنیا دان بە سی و نۆ (٣٩)یان دادەنێن، بەڵام هەرسێك کۆمەڵەکانی نەصرانیی:

١- کاثولیك.

٢- ئەرثذۆکس.

٣- پرۆتستانت.

دان بە هەر چل و نۆ (٤٩) سیفرەکان دادێنن - بەگشتی -، ئنجا لەبەر ئەوەی پێشتر لەو بارەوە قسەمان کرد، لێرە دووبارەی ناکەینەوە، ئەوەندە دەڵێین: کە ئێمە پێشتر (پەیمانی کۆن)مان هەڵسەنگاندوە، مانای وایە: وێڕای کتێبی ئایینی جوولەکەکان، نیوەی کتێبی نەصرانییەکانیشمان هەڵسەنگاندوە و، ماوەتەوە نیوەکەی دیکەی کە (پەیمانی نوێ)یە.

پێشتریش باسمان کرد کە (پەیمان نوێ) نەصرانییەکان بە هەر سێ بەشەکانیانەوە: (کاثولیك، ئەرثذۆکس، پرۆتستانت)، - ئەوانیش لق و پۆپیان لێ دەبنەوە - بەڵام هەرسێك لایەکانی نەصرانییەکان (پەیمانی نوێ)یان تەبەننیی کردوە، (پەیمانی نوێ)ش لە چوار ئینجیلەکان پێکدێ: (مَتَّى، لُوقا، مَرْقُس،

یُوحَنَّا)[1]، هەروەها لە دە (١٠) كتێبی دیكەش، بە تایبەت نامەكانی بۆڵس {كە (بولس الرسول)یشی پێ دەڵێن}، كە بە هەموویانەوە (پەیمانی نوێ) دەبێتە چواردە (١٤) كتێبی سەرەكیی و، پێشتر ناویانمان هێنا.

وەك چۆن لە پەیمانی كۆندا، دوازدە (١٢) مەسەلەمان هێنان وەك نموونە، كە هەشت (٨)یانمان لە (سِفْر التكوین) و (سِفْر الخروج) وەرگرت بوون و چوار (٤) یان لە (سفر)ەكانی دیكە، كە لە پەیمانی كۆندا بە شێوەیەكی زۆر ناشایست، باسی خوا كراوە، هەروەها سێ (٣) نموونەشمان لە پەیمانی كۆندا هێنا بوونەوە، دەربارەی هەر كام لە پێغەمبەران: ١)- لووط ٢)- داوود ٣)- سولەیمان، صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، كە شتی وایان پاڵدراوەتە لا، لەگەڵ مسوڵمانێكی سادە و ئاساییش دا، ناگونجێ، چ جای پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوا.

ئێمە لە پەیمانی نوێ (العهد الجدید)ش دا، دە (١٠) نموونەمان هێناونەوە، لەو بارەوە كە (پەیمانی نوێ)یش وەك پەیمانی كۆن (العهد القدیم) پشتی پێ نابەسترێ، لە بواری خواناسیی و خواپەرستیی و دینداریی و دنیادارییەكی ڕاست و ساغ دا، چونكە ئەویش گەلێك شتی وای تێدایە، كە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ پاكیی و بێ خەوشیی و، پایە بەرزیی خوای بەرز و مەزن و، پێغەمبەرانی لە هەڵە و گوناهـ پارێزراو (معصوم)ی دا، ناگونجێ.

شایانی باسیشە كاتی خۆی لە مەوسووعەی: (الإسلام كما یتجلّی في كتاب الله) (الكتاب الخامس: الإیمانُ بكتبِ الله (سبحانه وتعالی))دا، لێكۆڵینەوەیەكم لەو بارەوە كردوە، كە بۆ ئەم بابەتەی ئێستا خەریكی توێژینەوەینی، سوودی لێ وەردەگرم و، پشت بەو سەرچاوەیە دەبەستم[2]:

---

(١) ناوەكانیانمان بە عەرەبیی نووسیوە، چونكە مامەڵەمان لەگەڵ تەرجەمە عەرەبییەكەی (پەیمانی نوێ - العهد الجدید)ە.

(٢) بڕوانە: ص٤٥ -٨٧، ط٢/ ٢٠١٧م، كە هەركام لە (پەیمانی كۆن) و (پەیمانی نوێ)مان تێدا هەڵسەنگاندوە.

## نموونەی یەکەم: بڕوا بوون بە سێ کوچکە (ثالوث):

نەصرانییەکان کە پەیمانی کۆن و نوێ، هەردووکیان تەبەننیی دەکەن و شەرحێکی درێژو فراوانیان لەسەر کردوون و، هەردووکیان پێکەوە کۆکردوونەوە لە دوو توێی کتێبێکدا بە ناوی: (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس)، هەروەها نوسخەیەکی دیکەی (الكتاب المقدس) بە هەردوو پەیمانی کۆن و نوێیەوە هەیە، بەڵام لە ژێر ناوونیشانی: (الكتاب المقدس: قِرَاءَة رِعَائِيَّة)دا - پێشتریش باسی هەردووکیانمان کرد - ئنجا هەموو نەصرانییەکان بە هەر سێ بەشەکانیانەوە: (کاثولیك، ئەرثذۆکس، پروتستانت) سێ کوچکە (ثالوث)ی (باب و کوڕ و گیانی پیرۆز - الأب والإبن والروح القدوس)یان تەبەننیی کردوە و دەڵێن: خوا یەکە، بەڵام لە هەمان کاتدا سێشە، باب (الأب) مەبەستیان پێی خوایە و کوڕ (إبن) مەبەستیان پێی عیسایە و، گیانی پیرۆز (الروح القدس)یش وەك لەو کتێبەدا ئاماژەم پێداوە، لە ڕاستییدا دیار نیە مەبەستیان پێی چییە؟ ئایا مەبەستیان پێی جبریلە؟ یان مەبەستیان پێی دایکی عیسایە؟ یاخود مەبەستیان پێی شتێکی دیکەیە، زۆر ڕوون نیە، هەرچەندە زۆر بە وردییش (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس)م خوێندۆتەوە.

هەڵبەتە لە هەر چوار ئینجیلەکاندا، بەرچاوم نەکەوتوە، بە ڕوونیی و ڕاشکاویی باسی ئەوە بکات کە خوا لە سێ بەش پێکهاتوە: سێ توخمەکان (الأقانيم الثلاثة) سێ پێکهێنەرەکان، بەڵام لە شەرح و تەفسیری ئینجیلەکاندا، لە نێو نەصرانییەکاندا، ئەوە باوە کە ئەوان دەڵێن: خوا یەکەو سێشە و، خوا لە سێیان پێکهاتوە، بۆ وێنە:

لە ڕوونکردنەوەی (پەیمانی نوێ - العهد الجديد)دا، هاتوە:

(يَذْكُرُ الرَّسُولُ بُولس فِي بَرَكَتِهِ الوِدَاعِيَّة الأَقَانِيمَ الثَّلَاثَةَ: الأَب، وَالإِبْن، وَالرُّوح القُدُس، وَمَعَ أَنَّ عَقِيدَةَ الثَّالُوثِ لا تُذْكَرُ صَرَاحَةً فِي الكِتَابِ المُقَدَّس، إلاَّ أَنَّ آيَةً مِثلَ هَذِهِ، تُثْبِتُ أَنَّ هَذَا مَا كَانوا يُؤْمِنُونَ بِهِ)[1].

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد الجديد: الرسالة الثانية إلى مؤمني كورنثوس،

واتە: (الرسول بولس) لە پێزی خوا حافیزیی خۆیدا، باسی سێ ئوقنووم (پێکهێنەر)ەکان دەکات: باب و کوڕو گیانی پیرۆز، ئنجا هەرچەندە عەقیدەی سێ کوچکەیی بە ڕاشکاویی لە کتێبی پیرۆزدا باس نەکراوە، بەڵام ئایەتێکی وەك ئەمە: (کە دیارە قسەی بۆڵسیش بە ئایەت دادەنێن)، ئەوە دەچەسپێنێ کە ئەوان بڕوایان بەوە هەبووە.

قسەکەی (بۆڵس)یش ئەوە بووە، گوتوویەتی: (لِيُسَلِّمْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ، بِقُبْلَةٍ طَاهِرَة، جَمِيع القِدّيسين يُسَلّمُونَ عَلَيْكُم، وَلْتَكُنْ مَعَكُمْ جميعاً نِعْمَةُ رَبِّنَا يَسُوع المَسْيِح، وَمَحَبَّةُ الله، وَشَرِكَةُ الرُّوحُ القُدس)[1].

واتە: هەندێکتان بە ماچێکی پاك سەلام لە هەندێکتان بکەن، هەموو قیددیسەکان[2] سڵاوتان لێدەکەن و، با چاکەی پەروەردگارمان یەسووعی مەسیح لەگەڵ هەمووتان بێ، هەروەها خۆشەویستیی خوا، هەروەها بەشداریی گیانی پیرۆز.

کە ئەمە لە ڕاستییدا هیچ باسی سێ توخمەکان ناکات، بەڵام ئایا ئەی نەصرانییەکان! ئەمەتان لە کوێ هێنا، کە بۆ خۆتان دەڵێن: بە ڕاشکاویی لە کتێبی پیرۆزدا، باسی ئەو سێیانە نەکراوە؟! شتێکی هێندە گرنگ، بیکەی بە بناغەی عەقیدەکەت، کەچی لە کتێبەکەتدا بە ڕاشکاویی باس نەکرابێ! کەواتە: تۆ بوختان بە کتێبەکەی خۆت دەکەی، کتێبەکەش کە دەستکاریی کراوەو گۆڕراویشە، بەڵام ئێستاش لەگەڵ دابێ بە دانپێداهێنانی خۆیان، بە ڕوون و ڕاشکاویی (پەیمانی نوێ) باسی سێ پەرستراویی تێدانیە و تەنانەت بۆڵسیش باسی نەکردوە!!

---

الإصحاح: ١٣، ص٢٤٨٩.

(١) ئەمەیان بەوە داناوە کە بۆڵس مەبەستی پێ: باب و کوڕو گیانی پیرۆزە.

(٢) واتە: پیاوانی باش ئەوانەی کە خۆیان یەکلاکردۆتەوە بۆ خواپەرستیی.

## نموونەی دووەم: گوایە عیسا لە سێدارە دراوە، وەك بەلاگێڕەوە بۆ مرۆڤایەتیی و سڕانەوەی گوناهەکانیان:

١- لە سەرچاوەی ئاماژە بۆ کراودا لە ژێر ناوونیشانی: (التَّعْرِيفُ بِإِنْجِيلِ لوقا) پێناسەی ئینجیلی (لووقا)دا دەڵێ:

(يَصِفُ لُوقَا كَيْفَ دَخَلَ ابْنُ اللهِ تَأْرِيخَ البَشَرِيَّة، فَقَدْ عَاشَ يَسُوعُ كَنموذَجٍ مِثَالِيّ كَامِلٍ للإِنْسَانِ، وَبَعْدَ خِدْمَةٍ كَامِلَةٍ، قَدَّمَ ذَاتَهُ ذَبِيْحَةً تَامَّةً عَنْ خَطَايَاهَا حَتَّى نَخْلُصَ نَحْنُ)[١].

واتە: لووقا باس دەکات چۆن کوڕی خوا "پاکیی بۆ خوا" هاتە نێو مێژووی مرۆڤایەتییەوە، یەسووع وەك نموونەیەکی تەواو بۆ مرۆڤ، ژیا و دوای خزمەتێکی تەواو، خۆی وەك قوربانییەك پێشکەش کرد، تاکو گوناهی مرۆڤایەتیی بسڕێتەوەو ئێمە دەرباز ببین.

٢- هەروەها هەر لەو بارەوە گوتوویەتی:

(يَسُوعُ هُوَ قَائِدُنَا الكَامِلُ، مُخَلِّصُنَا، فَهُوَ يُقَدِّمُ غُفْرَاناً لِكُلِّ مَنْ يَقْبَلُونَهُ رَبَّاً وَسَيِّداً لِحَيَاتِهِم وَيُؤْمِنُونَ أَنَّ كَلّ ما يَقُولُه هُوَ حَقّ)[٢].

واتە: یەسووع فەرماندەی تێرو تەواومان و دەربازکەری ئێمەیە و، لێبوردن پێشکەش دەکات بۆ هەموو ئەوانەی کە وەك پەروەردگارو سەروەری ژیانی خۆیان قبووڵی دەکەن و، بڕوا بە هەرچی کە دەیڵێ دێنن، کە هەقە.

٣- هەروەها هەر لەوێدا دەڵێن:

(وَقَدَ صَارَ اللهُ بَشَرَاً فِي يَسُوع حَتَّى يَمُوتَ الرَّبُّ يَسُوع مِنْ أَجْلِ خَطَايَانَا)[٣].

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ص٢٠٥٤.

(٢) هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

(٣) هەمان سەرچاوە، إنجيل يوحنّا، الإصحاح: ٣، ص٢١٧٨.





واتە: خوا بوو بە مرۆڤ لە یەسووعدا، بۆ ئەوەی پەروەردگار (یەسووع) بمرێ لە پێناوی گوناهەکانماندا.

کە بێگومان ئەمە ئەفسانەیەکە لە هیچ عەقڵێکەوە ناچێ، چونکە پشت ئەستوور نیە، بە هیچ بەڵگەیەك و، خوا لە دوا نوسخەی هیدایەتیی و وەحیی خۆیدا، کە قورئانە، زۆر بە ڕاشکاویی ئەمە بە درۆ دەخاتەوە.

جارێ خەڵك گوناهی کردوە، بۆچی دەبێ عیسا لە سێدارە بدرێ؟! عەقڵ و لۆژیك ئەمە قبووڵ ناکات، ئنجا خوای پەروەردگاریش لە قورئاندا دەفەرموێ:

﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿١٦٤﴾﴾. واتە: هیچ گوناهبارێك گوناهی کەسێکی دیکە هەڵناگرێ.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾﴾الإسراء.

واتە: هیچ گوناهبارێك گوناهی کەسێکی دیکە هەڵناگرێ و، ئێمە خەڵك سزا نادەین تاکو پێغەمبەریان بۆ نەنێرین.

ئنجا خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (النساء) ئایەتەکانی: (١٥٧ و ١٥٨)دا زۆر بە ڕوونیی و ڕاشکاویی، وەك ئێمە لە کاتی خۆیدا لە تەفسیری سوورەتی (النساء)دا باسمان کردوە، ئەوە بە درۆ دەخاتەوە، کە مەسیح لە سێدارە درابێ، وەك باسی جوولەکەکان دەکات و دەفەرموێ:

﴿وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا اتِّبَاعَ الظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾﴾.

واتە: "جوولەکە یەکێکی دیکە لە گوناهو تاوانەکانیان ئەوە بوو"، کە گوتیان: ئێمە مەسیح عیسای کوڕی مەریەم ڕەوانە کراوی خوامان کوشتوە "خوا دەفەرموێ":

نە كوشتیان و نە لە سێدارەشیاندا، بەڵكو وێنەی مەسیحیان بۆ برایە سەر یەكێكی دیكە (ئەو كەسەیان لە جیاتی مەسیح هەڵواسی) و، ئەوانەی كە تێیدا لە ڕاجیایی دان، هەر لێی لە دوو دڵیی دان، زانیارییان لە بارەیەوە نیە، جگە لە شوێنكەوتنی گومان، بە دڵنیاییش نەیانكوشت، بەڵكو خوا بۆ لای خۆی بەرزی كردەوە و خوا زاڵی كارزانە.

ئنجا وەك پێشتریش باسمان كرد: ئەمەش یەكی دیكەیە لە ئەفسانەكانی نەصرانییەكان، كە لە كتێبەكەی خۆیاندا بە ناوی پەیامی خواوە، چەسپاندوویانە.

**نموونەی سێیەم: گوایە هەموو دەستەڵاتە سیاسییەكان لەلایەن خواوە دانراون و، لەسەر هەموو لایەك پێویستە بە قسەی حوكمڕان و دەستەڵاتدارە سیاسییەكان بكەن و، بەرهەڵستییان نەكەن، هەر كەسێك بن و هەرچۆنێك بن!**

بۆ وێنە: (بۆڵس) لە نامەیەكیدا كە بە حیساب بۆ خەڵكی بڕواداری ڕۆما: (إلى مؤمني روما)ی دەنووسێ، لەوێدا لە ژێر ناوونیشانی: (گەردنكەچكردن بۆ حوكمڕانان - الخضوع للسلطات)دا گوتوویەتی:

(عَلَى كُلِّ نَفْسٍ أَنْ تَخْضَعَ للسلطَاتِ الحَاكِمَةَ، فَلاَ سُلْطَةَ إِلاَّ مِنْ عِندِ الله وَللسُّلْطَات القَائِمَةُ مُرَتَّبَةٌ مِنْ قِبَلِ الله، حَتَّى إِنَّ مَنْ يُقَاوم السُّلْطَةَ يُقَاوم تَرْتِيبَ الله، وَالمُقَاوِمون سَيَجْلِبونَ العِقَابَ عَلَى أَنْفُسِهِم)[1].

واتە: لەسەر هەموو كەسێك پێویستە ملكەچ بكات بۆ ئەو حوكمڕانانەی كە دەسەڵاتیان هەیە و، هیچ دەسەڵاتێك نیە مەگەر لەلایەن خواوە ڕیز كراوەو دانراوە و، هەر كەسێك بەرهەڵستیی ئەو دەسەڵاتە بكات كە خوا دایناوە، ئەوانەی بەرهەڵستیی دەكەن، سزا بۆ خۆیان پەلكێش دەكەن (خوا سزایان دەدات).

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، الرسالة إلى مؤمني روما، الإصحاح: ١٣، ص٢٤٠٨.

بە ڕاستیی ئەمە وەك وەحیی خوا نەبێ، وەك هەموو شتێك دەچێ، کەچی نەصرانییەکان دەڵێن: ئەمە وەحیی خوایە، کە هەر کەسێك کە حوکمڕان بوو، دەبێ بە قسەی بکەی، هەر چۆن و هەر کەسێك بوو، ئەگەرنا خوا لە خۆت تووڕە دەکەی! ئەمە بە چ پێوەرێك لەگەڵ وەحیی خواو بەرنامەی پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) تێکدەکاتەوە؟! بە تەئکید ئەمە وا دەکات کە گەلان و کۆمەڵگەیەکان، ملکەچ بکەن بۆ حوکمڕانە ستەمکارەکانی خۆیان، ئنجا پێش هەموو کەس خەڵکی ڕۆژئاواو ئەورووپا، فەرمانبەریی ئەو قسەیان نەکردوە و، لە حوکمڕانەکانی خۆیان هەڵگەڕاونەوەو بەرۆکیان گرتوون، چونکە ئەو قسەیە پێچەوانەی عەقڵ و مەنتیق و واقیعە.

### نموونەی چوارەم: گوایە عیسا (علیه السلام) لە ئێوارە خوانێکدا - کە ئەوان پێی دەڵێن: (عَشَاءُ الفِصْح) یان (العَشَاءُ الأَخِير) - شەڕابی خواردۆتەوە:

گوایە لە دوا ئێوارە خواندا، عیسا (علیه السلام) لەگەڵ حەوارییەکان (قوتابییەکان)یدا نان دەخوات، دوایی نانەکە ورد دەکات و شەڕابیش دەخواتەوە، دوایی هەم نانەکەی داوە بە قوتابیەکانی، هەم شەڕابەکەشی داونێ و گوتوویەتی: نانەکە گۆشتی منە و، شەڕابەکەش خوێنی منە! ئەمەش دەقی ئەوەیە کە لە ئینجیلی (متَّى)دا هاتوە:

(وَبَيْنَمَا كَانُوا يَأْكُلُونَ، أَخَذَ يَسُوعُ رَغِيْفَاً، وَبَارَكَ وَكَسَّرَ وَأَعْطى التَّلاَمِيذَ، وَقَالَ: خُذُوا كُلُوا هَذَا جَسَدِي، ثُمَّ أَخَذَ كَأْساً وَشَكَرَ وَأَعْطَاهُمْ قَائِلاً: إشْرَبُوا مِنْهَا كُلُّكُمْ، فَإِن هَذَا هُوَ دَمِي الَّذِي للعَهْدِ الجَدِيد، وَالَّذِي يُسْفكُ مِنْ أَجْلِ كَثِيرينَ لمغفرة الخَطَايَا، عَلَى أَنِّي أَقُولُ لَكُم إِنِّي لا أَشْرَبُ بَعْدَ اليَوْم مِن نِتَاجِ الكَرْمَة هَذَا، حَتَّى يَأْتِي اليَوم الذي أشربهُ مَعَكُمْ جَدِيداً فِي مَلَكُوتَ أَبِي)[1].

---

(١) هەمان سەرچاوە، ئینجلیی: مەتتا، ئیصحاحی: (٢٦)، ص ١٩٥٨، هەروەها بڕوانە:





واتە: لە کاتێکدا کە ئەوان دانیشتبوون، ئێوارە خوانێك بوو نانیان دەخوارد، یەسووع (واتە: عیسا) نانێکی هەڵگرت و دوعای لێخوێندو، نانەکەی شکاندو بەش بەشی کرد، هەر پارچەی دا بە یەکێ لە قوتابییەکانی و پێی گوتن: بخۆن! ئەوە جەستەی منە، دواییش ئەو قاپەی کە شەڕابی تێدابوو وەریگرت و (لێی خواردەوەو) سوپاسی خوای کرد، پاشان پێیدان و گوتی: بخۆنەوە هەمووتان لێی بخۆنەوە، ئەوەش خوێنی منە بۆ پەیمانی نوێ، ئەو خوێنەم کە دەڕێژرێ لە پێناوی کەسانێکی زۆردا، کە گوناهەکانیان لێ بسڕێتەوە، بەڵام من پێتان دەڵێم: لەمڕۆ بە دواوە جارێکی دیکە لە بەرهەمی دار مێو ناخۆم (واتە: شەڕاب ناخۆمەوە)، هەتاکو ئەو ڕۆژەی کە لەگەڵتان دەخۆمەوەو لە موڵکی بابمدا (واتە: لە بەهەشت).

کە ئەمە هیچ گومانی تێدانیە درۆیەکی گەورەیە بە ناوی عیساوە (علیه السلام) چونکە: نان نابێتە جەستەی یەسووع و، شەڕابیش نابێتە خوێنی وی!! بەڵێ نەصرانییەکان هەر لە خۆیانەوە ئەو ئەفسانەیان کردۆتە بۆنەیەکی گرنگ کە پێی دەگوترێ: (عَشَاءُ الفِصح) و (العشاء الأخير) و (عَشاء الربّ) ئێوارە خوانی فیسح و، ئێوارە خوانی کۆتایی و، ئێوارە خوانی پەروەردگار.

---

ئینجیلی مەرقوس، ئیصحاحی: (١٤)، ص٢٠٣٧.





## نموونەی پێنجەم: گوایە: عیسا پێش ئەوەی لە سێدارە بدرێ، گلەیی لە خوا کردوە:

ئێمە مسوڵمانانی ئاسایی، زۆرجار یەکێکمان دەکوژرێ و لە سێدارە دەدرێ و گلەییش لە خوا ناکات، بەڵکو ڕازییە بە قەدەری خواو سوپاسی خواش دەکات، پێغەمبەرێکی پایە بەرزی وەك عیسا (عليه السلام) چۆن دەبێ گلەیی لە خوا کردبێ!

کە ئەمە دەقی ئەوەیە کە لە ئینجیلی مەتتادا هاتوە:

(وَنَحْوَ السَّاعَةِ الثَّالِثَةِ، صَرَخَ يَسُوعُ بِصَوْتٍ عَظِيمٍ إِلِي إِلِي! لِمَا شَبَقْتَنِي؟ أَيْ: إِلَهِي إِلَهِي! لِمَاذَا تَرَكْتَنِي؟)[1].

واتە: لە دەوری سەعات سێ دا (ڕەنگە مەبەست سێی شەو بێ)، یەسووع بە دەنگێکی مەزن هاواری کرد: پەرستراوم پەرستراوم! بۆچی وازت لێهێنام؟ (گلەیی لە خوا دەکات، بۆچی لێیگەڕاوە کە لە سێدارە بدرێ!).

لە ئینجیلی (مرقس)دا دەڵێ: (أُلوي أُلوي) لە جیاتی (إِلي، إِلي) کە هەردووکیان (أُلوي) لەگەڵ (إِلي) وشەی عیبریین، بە مانای (إلهي) (ئەی خوایە)! یاخود (ئەی پەرستراوم) هاتوون.

کە بێگومان ئەم قسەیە بوختانێکە بە دەم عیساوە کراوە، چونکە عیسا (عليه السلام) زۆر لەوە بڕوادارترو ملکەچتر بووە بۆ خواو، ڕێزو خۆشەویستیی و مەزنیی خوای لە دڵدا زیاتر بووە لەوەی گلەیی لێ بکات!

ئنجا ئەوە ئێستا لە ئینجیلەکاندا هەیە، کە بە حیساب ئەوە کتێبی پیرۆزی نەصڕانییەکانە، ئنجا بە حیساب ئەوە مەدحی عیسای تێدایە، بەڵام ئەوە گەورەترین زەم و نوقصانییە بۆ عیسا (عليه السلام) کە گلەیی لە پەروەردگاری بکات!

---

(١) هەمان سەرچاوە، ئینجیلی (متَّى) ئیصحاحی: ٢٧، ص١٩٦٨، هەروەها ئینجیلی (مرقُس) ئیصحاحی: ١٥، ص٢٠٤٦.

**نموونەی شەشەم: هەندێك قسە پاڵ دانە لای عیسا (علیه السلام)، کە لێیان دەفامرێتەوە: عیسا لە کاتی لە سێدارەدانی دا (کە ئەسڵەن لە سێدارەش نەدراوە) دەبێ زۆر لە مردن ترسا بێ و، داوای لە خوا کردبێ کە ئەو مردنەی لە کۆڵ بکاتەوە!**

ئەمەش دەقی قسەی ئینجیلی مەتتایە لەو بارەوە:

(ثُمَّ انْطَلَقَ وَذَهَبَ كَعَادَتِهِ إِلى جَبَلِ الزَّيْتُونِ، وَاتَّبَعَهُ تَلاَمِيذُهُ أَيْضاً، وابتَعَدَ عَنْهُم مَسَافَةً تُقَارِبُ رَمْيَةَ حَجَرٍ، وَرَكَعَ يُصَلِّي، قَائِلاً: يَا أَبِي! إِنْ شِئتَ أَبْعِد عنِّي هذه الكأس، وَلَكِن لِتَكُونَ لاَ مَشِيئَتي بَلْ مَشِيئَتُكَ، وَظَهَرَ لَهُ مَلاَكٌ مِنَ السَّمَاءِ يُشَدِّدُهُ)[1].

واتە: دوایی وەك عادەتی خۆی ڕۆیی بۆ چیای زەیتوون، قوتابیەکانیشی شوێنی کەوتن، ئنجا بە ئەندازەی بەرد هاوێژێك لێیان وەدوور کەوت، دوایی چووە ڕکووع نوێژی کردو پاڕایەوەو گوتی: ئەی بابە! (یانی: ئەی خوایە!) ئەگەر بتەوێ، ئەمجارەش ئەم مردنەم لێ دووربخەوە، بەڵام با ویستی تۆ بێ، نەك ویستی من، ئنجا فریشتەیەك لە ئاسمان بۆی دەرکەوت، دڵی بەهێز دەکرد (کە مەترسێ لە مردن!).

یانی: عیسا (علیه السلام) داوای لە خوا کردوە: نەیمرێنێ! کە بێگومان ئەمەش دیسان لە قسە هەڵبەستراوەکانی نەصرانییەکانە، کە بەزاری عیساوە (علیه السلام) دەیانکەن، چونکە ئێمە لەبارەی زۆر لە بڕواداران و زانایان و جەنگاوەرانەوە لە ئەهلی ئیسلام بیستوومانە و بگرە بینیوومانە، کە ڕووبەڕووی ژیان و کوژران و بوونەتەوە، لە پێناوی خوادا، بە سینگ فراوانیی و بە دڵێکی چەسپاوەوە، چ جای پێغەمبەرێکی پایە بەرزی وەك عیسا (علیه السلام) کە یەکێکە لە پێنج پێغەمبەرە ناودارەکان (ئیبراهیم، نووح، مووسا، عیسا، موحەممەد) (علیهم الصلاة والسلام).

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ئینجیلی: (متّی)، ئیصحاحی: ٢٦، ص ١٩٥٩، هەروەها ئینجیلی: (لوقا)، ئیصحاحی: ٢٢، ص٢١٥١، ٢١٥٢.





بۆ نموونە: یەکێك لە گەورە پیاوان و گەورە موجاهیدانی ئیسلام بە ناوی (سەید عیرفان) لە هیندو پاکستان، کاتی خۆی کە لەلایەن ئینگلیزەوە حوکمی لە سێدارەدانی بەسەردا دەدەن، دەڵێ:

(هَذَا الَّذِي كَانَتِ الأَيَّامُ تَنْتَظِرُ فَلْيَوفَّ لله أَقْوَامٌ بِمَا نَذَروا).

واتە: ئەمە ئەوەبوو کە ڕۆژانم بۆ دەژماردن، کەسانێك کە شتێکیان لەسەر خۆیان نەزر کردوە، با وەفادار بن و پێیەوە پابەندبن.

ئینگلیزەکان سەریان سووڕ دەمێنێ و دەڵێن: بۆچی وا دڵخۆشی؟ دەڵێ: زۆر دڵخۆشم کە لە پێناوی خوادا لە سێدارەم دەدەن! ئەوانیش پەشێمان دەبنەوەو دەڵێن: مادام هێندەت پێخۆشە، نابێ بەو ئاواتەت بگەی و نەفی دەکەن بۆ دورگەیەك لە جیاتی ئەوەی کە ئیعدامی بکەن! مەبەستم ئەوەیە هەندێك لە مسوڵمانان ئاوان، چ جای پێغەمبەرێکی پایە بەرزی وەك عیسا (علیه السلام)!!

## نموونەی حەوتەم: تۆمەتبار کردنی عیسا بە عەلمانییەت: گوایە عیسا گوتوویەتی: (أَعْطُوا مَا للقَيْصَر للقَيْصَر، وَمَا للهِ لِله) واتە: ئەوەی کە هی قەیسەرە بیدەن بە قەیسەر (واتە: پادشای ڕۆم) و ئەوەش کە هی خوایە، بیدەن بە خوا.

ئەو قسەیە لە ئینجیلی (لووقا) لە ئیصحاحی (٢٠) دا لە ژێر ناوونیشانی: (دَفْعُ الجِزيَةِ لقِيَصْر)، واتە: (سەرانەدان بە قەیصەر)دا هاتوە، لە ئینجیلی (مەرقوس)یشدا بە هەمان شێوە هاتوە و[1]، هەروەها لە ئینجیلی (مەتتا)شدا هەمان بەسەرهات هاتوە و[2]، ئەمە دەقی ئەوەیە کە لە ئینجیلی (لووقا)دا هاتوە:

(فَجَعَلوا يُرَاقِبُونَهُ وَبَثُّوا حَوْلَهُ جوَاسِيسَ، يتَظَاهَرُون أَنَّهم أَبْرَارَ لِكَي يُمْسِكُوهُ بكَلِمَةٍ يَقُولُهَا فَيُسْلِّمُوهُ إِلى قَضَاءِ الحَاكِمِ وَسُلْطَته، فَقَالوا: يَسْئَلونَهُ يَا مُعَلِّم! نَعْلَمُ أَنَّكَ تَتَكَّلَمُ

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، إنجيل: مرقُس، الإصحاح: ١٢، ص٢٠٢٦.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، إنجيل: متى، الإصحاح: ٢٢، ص١٩٤٣.

وَتُعَلِّمُ الصِّدْقَ، فَلا تُرَاعِي مَقَامَاتِ النَّاس، بَلْ تُعَلِّمُ طَرِيقَ اللهِ بالحَقِّ، أَفَيَحِلُّ لَنَا أَنْ نَدْفَعُ الجِزْيَةَ للقَيْصَرِ أَمْ لاَ؟ فَأَدْرَكَ مَكْرَهُمْ، وَقَالَ لَهُمْ: أَرُونِي دِيْنَاراً، لِمَنِ الصُّورَةُ وَالنَّقْش عَلَيْهِ فَأَجَابَوه: للقَيْصَر، فَقَالَ لَهُمْ: إِذَاً أَعْطُوا مَا للقَيْصَر للقَيْصَر، وَمَا للهِ لِله)[1].

واتە: جوولەکەکان چاودێرییان دەکرد و جاسووس و سیخوڕیان بە دەوری دا بڵاوکردووبونەوە و وایان خۆ پێشاندەدا کە ئینسانی چاکەکارن، بۆ ئەوەی وشەیەکی لێ بگرن و تەسلیمی دەسەڵاتداری بکەن ( تەسلیمی حوکمڕانانی بکەن) لێیان پرسی؟ ئەی مامۆستا! دەزانین کە تۆ قسە دەکەی و بە شێوەیەکی ڕاست خەڵك فێر دەکەی و، گوێ نادەیە پێگەو پایەکانی خەڵك، بەڵکو ڕێی خوا بە هەق پێشان دەدەی، ئایا ئێمە بۆمان حەڵاڵە سەرانە بدەین بە قەیسەر یان نا؟ (جوولەکەکان لە ژێر دەسەڵاتی ڕۆمەکاندا بوون)، ئەویش فێڵەکەی زانین، پێی گوتن: دینارێکم پێشانبدەن (دراوی ئەو کاتەی ڕۆم، دیناری زێڕ بووە) کە پێشانیاندا گوتی: ئەو نەخشە و ئەو وێنەیە هی کێیە کە لەسەر دینارەکەیە؟ گوتیان: ئەوە هی قەیسەرە، گوتی: کەواتە: ئەوەی هی قەیسەرە بیدەن بە قەیسەر و، ئەوەش کە هی خوایە، بیدەن بە خوا.

واتە: لە دنیادا مل بۆ قەیسەر کەچ بکەن، لە قیامەتیشدا مل بۆ خوا کەچبکەن! کە بە تەئکید ئەمە هەر هەمان ئەو بیر دینایەتییەیە، ئەو سکۆلاریزمەیە کە دوایی لە ڕۆژئاوادا بۆتە باو، بەڵام هەرگیز عیسا (علیه السلام) ناگونجێ قسەی وا بکات، چونکە ئەوەتا خوا، پێچەوانەی ئەوەی لێ دەگێڕێتەوە:

١)- لە سوورەتی (آل عمران)دا، کە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُۗ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾.

واتە: بێگومان خوا پەروەردگاری من و ئێوەشە، بەندایەتیی تەنیا بۆ وی بکەن، تەنیا ئەوە ڕێی ڕاستە.

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، إنجيل: لوقا، الإصحاح: ٢٠، ص٢١٤٣.





٢)- بەهەمان شێوە لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِى بِهِۦٓ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ﴿١١٧﴾ ﴾.

واتە: هیچم پێ نەگوتوون (بە نەصرانییەکان) مەگەر ئەوەی تۆ فەرمانت پێکردبووم، کە خوا بپەرستن پەروەردگاری منیش و ئێوەشە.

٣)- هەروەها لە سوورەتی (الزخرُف)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦٤﴾ ﴾ .

واتە: بە دڵنیایی تەنیا خوا پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە، بەس بەندایەتیی بۆ وی بکەن، ئەوە ڕێی ڕاستە.

ئا ئەمە قسەی عیسایە (علیه السلام).

٤)-هەروەها لە ئینجیلی (لووقا)، ئیصحاحی (٤)دا، هاتوە، کە گوایە عیسا فەرموویەتی:

(قَدْ كُتِبَ لِلرب إِلَهَكَ تَسجُدُ، وَإِيَّاهُ وَحَدَهُ تَعْبُدُ)[1]، واتە: نووسراوە تەنیا بۆ پەروەردگاری پەرستراوت، کڕنووش ببە و، تەنیا بەندایەتیی بۆوی بکەو ملکەچ بکە.

## نموونەی هەشتەم: ئەو قسەیە پاڵدراوەتە لای عیسا، گوایە گوتوویەتی: لە بەهەشتدا ژیانی جینسیی نیە، هاوسەرگیریی نیە، وەك لە ئینجیلی (لووقا) ئیصحاحی (٢٠)دا، هاتوە:

کاتێك هەندێك لە جوولەکەکان کە (الصَّدُّوقيون)یان پێ دەڵێن، لە بارەی ئافرەتێکەوە پرسیاری لێ دەکەن، کە شووی بە حەوت برایان کردوە، یەك لە دوای یەك، یەکیان مردوەو شووی بە یەکێکی دیکە کردوە .. هتد، ئایا بۆ کامیان دەبێ، دوای ئەوەی کە دەمرێ؟ عیساش گوایە بە پێی قسەی ئینجیلەکان وەڵامی داونەوەو گوتوویەتی:

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص٢٠٧٧.





(أَبْنَاءُ الزَّمَانِ الحَاضِرِ يُزَوِّجُونَ وَيُزَوَّجُونَ، أَمَّا الَّذِين حُسِبوا أَهْلاً للمُشَارَكَةِ فِي الزمَان الأَتِي وَالقِيَامَةِ مِنْ بَيْنِ الأَمْوَات، فَلاَ يُزَوِّجُون وَلاَ يُزَوَّجُونَ.... لأَنَّهُم يَكُونُونَ مِثْلَ المَلاَئِكَة)[1].

واتە: خەڵكی ئەم ڕۆژگارەی ئێستا ئافرەتیش بە شوو دەدەن و ئافرەتیشیان پێ دەدرێ (لێ مارە دەكرێ)، بەڵام ئەوانەی كە لە ڕۆژگاری ئایندەدا و، لە هەڵسانەوەی نێو مردوواندا دەبن، (واتە: لە قیامەت) نە ژن بە كەس دەدەن و، نە كەسیش ژنیان پێدەدا، بەڵكو وەك فریشتەكان دەبن.

واتە: لە وێدا ژیانی جنسیی و هاوسەرگیریی نیە، ئەمەش یەكی دیكەیە لەو شتانەی كە پێچەوانەی هەموو بەرنامەكانی خوایە، كە بۆ پێغەمبەرانی علیهم الصلاة والسلام ناردوونی، كە ژیانی بەهەشت لە هەموو ڕوویێكەوە لە ژیانی دنیا تەواوترە و، هەموو ئەو نیعمەتانەی لە دنیادا هەن، لەوێ بەشێوەی تەواوتر هەن.

**نموونەی نۆیەم: پاڵدانی هەندێك قسە بۆ لای عیسا، لە بواری هەڵس و كەوتدا، كە ئەنجامەكەیان ئەوەیە، گوایە: عیسا (علیە السلام) فەرمان دەكات بە شوێنكەوتووانی كە ملكەچ بكەن بۆ ستەم و، دەستەوكەریی و بەرگریی نەكەن لە بەرانبەر دەستدرێژكاران و خراپەكاران:**

ئەمیش ئینجیلی (لووقا) لە ئیصحاحی (٦)دا، هێناویەتی:

(وَأَمَّا لَكُمْ أَيُّهَا السَّامِعُون! فَأَقُولُ: أَحِبُّوا أَعْدَاءَكُمْ، أَحْسِنُوا مَعَامَلَةَ الَّذِينَ يُبْغِضُونَكُم، بَارِكوا لاعنيكُم، صَلّوا لأَجلِ الَّذِينَ يُسيئون إِلَيْكُم، وَمَنْ ضَرَبَكَ عَلَى خَدِّكَ، فَأَعْرِضْ لَهُ الخَدَّ الأَخر أَيضاً، وَمَنْ انْتَزَعَ رِدَاءَكَ، فَلاَ تَمْنَع عنْهُ ثَوْبَك أَيْضاً، "أي: مَنْ طَلَبَ مِنْكَ شَيْئَاً فَأَعطه، وَمَنِ اغتَصَب مَالَكَ، فَلاَ تُطَالِبْهُ)[2].

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص٢١٤٣.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص٢٠٨٨.





واتە: بەڵام ئێوە ئەی بیسەران! پێتان دەڵێم: دوژمنەکانی خۆتان خۆشبوێ، {گەورەترین دوژمنی ئێمە ئیبلیسە، ئایا دەبێ ئیبلیسمان خۆشبوێ؟}، چاکە لەگەڵ ئەوانەدا بکەن کە ڕقیان لێتانە، ئەوانەی نەفرینتان لێ دەکەن، دوعای پیرۆزیان بۆ بکەن، ئەوانەی خراپەتان لەگەڵدا دەکەن، بۆیان لە خوا وە پاڕێن و دوعایان بۆ بکەن، هەر کەسێك زللەیەکی لە لایەکی ڕوومەتتدا، ڕوومەتەکەی دیکەشی بۆ ڕاگرە، هەر کەسێك عەبایەکەی لێستاندی، کراسەکەشی بۆ دانێ، یانی: هەر کەسێك شتێکی لێ داوا کردی، بیدەیە و، هەر کەسێکیش ماڵ و سامانەکەشی لێ زەوت کردی، لێی داوا مەکەوە!

دەڵێین: بێگومان ئەگەر ئینسان چاوپۆشیی لە خراپەی خەڵك بکات، لە کاتی هەڵس و کەوتی تاکیی دا، بەڵام بە مەرجێك نەبێتە مایەی شوول لێ هەڵکێشانیان، ئەوە ڕێی تێدەچێ، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ ﴾ فصلت.

واتە: چاکە و خراپە یەکسان نین، بە کام سیفەتەی باشترە، خراپە پاڵ پێوە بنێ، ئەو کەسەی لە نێوان تۆو ئەودا دوژمنایەتیی هەیە، وەك دۆستی نیزیکی لێ دێ.

بەڵام بە مەرجێك ئەو کەسە، جەوهەر و کانزایەکەی باش بێت، بەڵام کەسی وا هەیە کانزایەکەی وەك هی دڕندەیە، دڕندە تاکو خۆت فەقیر بکەی، زیاتر سواری سەر شان و ملت دەبێ، ئەوەیان دەبێ بە شێوەیەکی دیکە مامەڵەی لەگەڵ دا بکەی.

بەڵێ، پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) وەك لە (صحيح البخاري) و (صحيح مسلم)دا هاتوە، باسی پێغەمبەرێك دەکات کە ئەوان ئەزیەتیان داوەو بە خوێنیان داهێناوە، ئەویش خوێنی دەم و چاوی سڕیوە و فەرموویەتی: (اللَّهُمَّ اغْفِر لِقَوْمِي فَإِنَّهُمْ لاَ يَعْلَمُون}[1]، واتە: خوایە! لە گەلەکەم ببوورە، چونکە ئەوان

---

(١) {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) يَحْكِي نَبِيًّا مِنَ الأَنْبِيَاءِ، ضَرَبَهُ قَوْمُهُ فَأَدْمَوْهُ، وَهُوَ يَمْسَحُ الدَّمَ عَنْ وَجْهِهِ وَيَقُولُ: (أَللَّهُمَّ اغْفِرْ لِقَوْمِي فَإِنَّهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ} أَخْرَجَهُ

نازانن، بەڵێ: ئەمەش هەیە، بەڵام ئەوەی کە لە شەرعدا جێی نابێتەوە، لەگەڵ عەقڵدا تێکدەگیرێ، ئەوەیە کەسێك دوژمنت بێت و، تۆش خۆشت بوێت!! چونکە مسوڵمان کێ دوژمنیەتی؟ بێگومان کافرو مونافیق و زاڵم و خراپەکار، ئنجا چۆن دەبێ خۆشت بوێن، هەروەها گەورەترین دوژمنی ئێمە ئیبلیسە، ئایا دەگونجێ خۆشمان بوێ؟

ئنجا بە هیچ شێوەیەك ئەوە لە شەرعدا جێی نابێتەوە: تۆ مل بۆ کەسێك کەچبکەی، کە زوڵمت لێ دەکات، وڵاتت داگیر دەکات، ماڵت لێ دەستێنێ، تەعدای ناموس دەکات، تەعدای جەستەیی دەکات، چۆن دەبێ ملی بۆ کەچ بکەی؟ یان کاتێك ئەو شتێکی لێ ستاندی، چۆن ڕەوایە زیاتریشی پێ بدەی؟ بە تەئکید ئەوە لەگەڵ عەقڵدا و، لەگەڵ شەرعدا ناگونجێ.

ئنجا نەصرانییەکان هەرگیز ئاوایان نەکردوە: ئەوە دەوڵەتانی نەصرانیی، ئەوە ئەورووپا ئەوە ئەمریکا! نەك قبووڵ ناکەن لە وڵاتی خۆیاندا تەعدایان لێ بکرێ، بەڵکو هاتوون ستەم و تەعدا لە هەموو جیهانیش دەکەن!

بەڵێ هەرگیز ئەوە لە دیندا جێی نابێتەوە کە لێبوردن و چاوپۆشییکردن، بکەی بە پیشە، بەبێ هەڵاواردن، لە حاڵێکدا کە سەر بکێشێ بۆ شوول لێ هەڵکێشانی لایەنی بەرانبەر!! هەروەها لە شەرعدا جێی نابێتەوە کە هەرچی مرۆڤ لێی داوا کرا، هەر بڵێ: بەڵێ و ملی بۆ کەچ بکات! نە عیسا (علیه السلام) وای کردوە و، نە هیچ کام لە پێغەمبەران و، عەقڵ و شەرعیش ئەوە ڕەفز دەکەن.

ئنجا ئێمە کاتێك تەماشا دەکەین: عیسا (علیه السلام) ژیانی کردەوەیی خۆی وا نەبووە، بۆ وێنە: لە ئینجیلی (مەتتا) لە ئیصحاحی (٢٣)، لە ژێر ناوونیشانی: (يُسوعُ يُعنِّف الكتبة والفَرِّيسيين) واتە: (عیسا سەرزەنشتی نووسەرەکان و فەڕریسییەکان دەکات) کە دوو جۆرە توێژ بوون، عیسا علیه السلام هەشت (٨) جاران پێیان دەڵێ: (الوَيلُ لكم) سزای سەخت بۆ ئێوە.

---

البُخَارِيّ: ٣٢٩٠، ومسلم: ١٧٩٢.

هەروەها هەر کام لەم تەعبیرانە جارێك یان زیاتر دووبارە دەکاتەوە:

١- - أَيُّهَا الكَتَبَة والفَرِّيسيِيون المُرَائُون!

ئەی نووسەر و فەرریسییە ڕیا بازەکان!

٢- أَيُّهَا القَادَةُ العُمْيَان!

ئەی سەرکردە کوێرەکان!

٣- أَيُّها الجُهَّال والعميان!

ئەی نەفام و کوێرەکان!

٤- أيها العميان!

ئەی کوێرینە!

٥- إِنَّكُمْ تُصَفُّون المَاءَ مِنَ البَعُوضَة وَتَبْلَعُون الجَمَل!

ئێوە ئاوی مێشوولە دەپاڵێون و، حوشترێ قوت دەدەن!

٦- ولكنكم في الداخل مُمتَلئون بالرياء والفسق!

بەڵام ئێوە لە ژوورەوە، پڕن لە ڕیابازیی و گوناهباریی!

٧- فبهذا تشهدون على أنفسكم بأنكم أبناءُ قاتلي الأنبياء!

ئێوە بەوە شایەدیی لەسەر خۆتان دەدەن، کە کوڕانی بکوژانی پێغەمبەرانن!

٨- أيها الحيات، أوكار الأفاعي!

هۆ مارەکان، کونە مارەکان!

٩- كيف تُفلِتون من عقاب جَهَنَّمَ!

چۆن لە سزای دۆزەخ دەرباز دەبن؟

١٠- الحق أقول لكم: إن عقاب ذلك كلِّه سَيَنْزِلُ بهذا الجيل!

هەقتان پێدەڵێم: سزای ئەوە هەمووی بەسەر ئەم پشت (جیل)ەدا، دێتە خوار.







هەتا دوایی لە ئینجیلی (مرقس) لە ئیصحاحی (١١)دا دەڵێ:

(وَوَصَلوا إِلى أُورشَلِيم فَدَخَل يَسُوعُ الهَيْكَل، وَأَخَذَ يَطْرُدُ الَّذِينَ كَانُوا يَبِيعُون وَالَّذِينَ كَانُوا يَشْتَرُونَ فِي الهَيْكَل، وَقلَّبَ مَوَائِدَ الصَيارِفَ وَمَقَاعِدَ الحَمَام، وَلَمْ يَدَعَ أَحداً يَمرُّ وَهُو يَحْمِل المتَاع)[1].

واتە: عیساو قوتابیەکانی چوون بۆ ئۆڕشەلیم، (واتە: قودس)، چووە نێو هەیکەل (واتە: چووە نێو مزگەوتەکە، یان ئەو شوێنەی کە پەرستگایان بوو)، ئنجا هەموو ئەوانەی کە لەوێ شتیان دەفرۆشت و شتیان دەکڕی، دەری کردن، هەروەها ئەوانەی پارەیان دەگۆڕییەوە، مێزەکانی لێ هەڵگێڕانەوە و، ئەوانەی کە کۆتریان دەفرۆشت، کورسییەکانی لێ لابردن و، ڕێگای بە هیچ کەس نەدا کە کەل و پەلێك هەڵبگرێ و، بەنێو ئەو پەرستگایە دا بڕوات!

کەواتە: عیسا (علیه السلام) وەك ئەوان وێنایان کردوە، بەو شێوەیە نەبووە.

هەروەها عیسا (علیه السلام) لێی گێڕدراوەتەوە، بە پێی قسەی خۆیان کە لە ئینجیلی (لووقا) لە ئیصحاحی (١٢)دا هاتوە، گوتوویەتی:

(جِئْتُ لأُلْقِيَ عَلَى الأَرْضِ نَاراً، فَلَكَمْ أَوَدُّ أَن تكُونَ قَدِ اشْتَعَلَت ... أَتَظنُّونَ أَنِّي جِئْتُ لأُرْسِلَ السَّلاَمَ عَلَى الأَرْضِ؟ أَقُولُ لَكُم: لا، بَل بالأحرى الإنْقِسَام)[2]!

واتە: هاتووم کە ئاگر بخەمە سەر زەوی، چەند پێم خۆشە ئەم سەر زەوییە گڕ بگرێ .. پێتان وایە هاتووم کە ئاشتیی سەقامگیر بکەم لە زەوییدا؟! پێتان دەڵێم: نەخێر، بەڵکو هاتووم دابەش بوون و دووبەرەکیی پەیدا بکەم! (یانی: لە نێوان ئیمانداران و کافراندا، لە نێوان مەزڵوومان و زاڵماندا)[3].

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص٢٠٢٣، ٢٠٢٤.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص٢١١٩.

(٣) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.



**نموونەی دەیەم و کۆتایی: قوتابییەکانی عیسا و حەوارییەکانی هەموویان، وا پێناسە و وەسف کراون، کە زۆر ترسنۆك بوون و، هەڵاتوون و، پشتی عیسایان بەرداوەو بە تەنیایان جێهێشتوە!!:**

ئەمەش لە ئینجیلی (مەتتا) لە ئیصحاحی (٢٦) و، لە ئینجیلی (مەرقوس) لە ئیصحاحی (١٤)دا هاتوە:

أ- ئەمە عیبارەتی ئینجیلی (مَتَّى)یە لە ژێر ناوونیشانی: (القَبْضُ على يَسُوع)، (گرتنی یەسووع)دا، دەڵێ:

(عِنَدَئِذٍ تَرَكَهُ التَّلاميذ كُلُّهُم وَهَرَبوا)[1]، واتە: لەو کاتەدا هەموو قوتابییەکانی بە جێیانهێشت و ڕایان کرد.

**ب-** عیبارەتی (مرقُس) لە ئیصحاحی (١٤)دا دەڵێ:

(وعِنْدَئِذٍ تَرَكَهُ الجَميعُ وَّهَرَبوا، وَتَبِعَهُ شَابٌّ لاَ يَلْبَسُ غَيْرَ إِزَارٍ عَلَى عَوْرِهِ، فَأَمْسَكُهُ فَتَرَكَ الإِزَارَ وَهَرَبَ عُرْيَاناً)[2].

واتە: لەو کاتەدا هەموویان ڕۆیشتن و بەجێیانهێشت و ڕایان کرد (کاتێك کە ڕۆمەکان هاتن عیسا بگرن)، گەنجێك شوێنی کەوت هیچی لەبەر نەبوو جگە لە شەرواڵ، کاتێك کە بە دوای کەوتن بیگرن، شەرواڵەکەشی داناو، بە ڕووتیی ڕای کرد.

ئەمە بە ڕاستیی زەم و نوقصانیی پاڵدانێکی زۆر بێ ڕەزایە، بۆ حەوارییەکانی عیسا، کە عیسا بە حیساب ئەو دوازدە (١٢) کەسە، قوتابی تایبەتیی بوون، کە چی (١٢) حەوارییەکەی لە تەنگانەدا هەموویان بەجێیان هێشتوە!

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص١٩٦١.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص٢٠٤٠.

بەڵام با تەماشا بکەین، خوا دەربارەی حەوارییەکانی عیسا (علیه السلام) چی فەرمووە:

١- دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾ رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلْتَ وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٣﴾﴾ آل عمران.

واتە: کاتێك عیسا هەستیکرد بە کوفر (لە ڕۆمەکان و لە جوولەکەکان و بڕوایان پێ نەهێنا)، فەرمووی: کێ دەبێتە هاوکار و پشتیوانی من بۆ لای خوا؟ حەوارییەکان گوتیان: ئێمە پشتیوانانی خواین، بڕوامان بە خوا هێناو، تۆش شایەد بە، کە ئێمە بۆ خوا ملکەچین. (گوتیان:) پەروەردگارمان! بڕوامان بەوە هێناوە کە تۆ داتبەزاندوە و شوێن پێغەمبەرەکەت کەوتووین، ئنجا لەگەڵ شایەداندا بماننووسن.

٢- هەروەها لە سووڕەتی (المائدة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى ٱلْحَوَارِيِّـۧنَ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِى وَبِرَسُولِى قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَٱشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ ﴿١١١﴾﴾.

واتە: یاد بکەوە: کاتێك وەحییم نارد بۆ حەوارییەکان {مەبەست ئیلهام بۆ کردنە، چونکە غەیری پێغەمبەران علیهم السلام وەحییان بۆ نەچووە، وەك دەفەرموێ:

﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ﴾ القصص: ٧.

واتە: ئیلهاممان بۆ دایکی مووسا کرد، {یانی: خستمانە دڵی}. کە بڕوا بە من و بە ڕەوانەکراوەکەم بێنن!

{ یانی: کاتێك ئیلهاممان بۆ حەوارییەکان کرد کە بڕوا بە من و بە ڕەوانەکراوەکەی من بێنن}، گوتیان: ئەوە ئیمانمان هێنا و شایەدبە کە ئێمە ملکەچین.





٣-هەروەها لە سوورەتی (الصف)دا خوا ئاوا مەدحی حەوارییەکان دەکات، دەفەرمویٚ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞۖ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ ﴿١٤﴾ ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پشتیوانانی خوابن، وەك چۆن عیسا بە حەوارییەکان (قوتابییەکان)ی گوت: کیٚ هاوکار و پشتیوانمە بۆ لای خوا؟ حەوارییەکان گوتیان: ئێمە پشتیوانانی خواین، ئنجا کۆمەڵێك لە بەنو ئیسرائیل بڕوایان هێنا و، کۆمەڵێکیش بێبڕوا بوون و، سەرەنجام ئەوانەمان پشتگرت و سەر خست کە بڕوادار بوون، بەسەر ئەوانەدا کە بێبڕوا بوون.

(واتە: لە ڕووی بەڵگەو بورهانەوە سەرمان خستن).

کەواتە: ئەمەش دە (١٠) نموونە لە (پەیمانی نویٚ) کەهەم بە نسبەت خوای پەروەردگارەوە و، هەم بە نسبەت عیسا (علیه السلام)ەوە، شتی ناشایستی تێدایە، ئنجا ئایا کتێبێکی ئاوا، دەگونجیٚ بە فەرمایشتی خوا لە قەڵەم بدریٚ؟ بێگومان نەخێر، وێڕای ئەوەی کە پێشتریش گوتمان: خوا عزوجل تەنیا باسی یەك (إنجیل)ی کردوە کە بۆ عیسای ناردوە، بەڵام نەصرانییەکان چوار ئینجیلیان هەن: (١- متَّى، ٢- مرقُس، ٣- لوقا، ٤- یوحنَّا) وێڕای چەندان کتێبی دیکەش.

هەروەها ئەو چوار ئینجیلەش گوڵبژێری نێو حەفتا (٧٠) ئینجیلن، وەك پێشتر - لە باسی یەکەمی ئەم بەشەدا - باسمان کرد.

هەر کەسێکیش بە وردیی و تێفکرینەوە (پەیمانی نویٚ) - هەر چوار ئینجیلەکە و دە (١٠) کتێبەکەی دیکەش - بخوێنیتەوە، دەزانیٚ کە هەموو ئەو نووسراوانە، یادداشت و بیرەوەریی ژمارەیەك لە نیزیکانی عییسان و، هیچ کامیان قسەی ڕاستەوخۆی عیساش (علیه السلام) نین، چ جای هی خوا عزوجل!

هەڵبەتە ئێمە لە باسی یەکەمی ئەم بەشی سێیەمەدا: (سەرگوزشتەی سەرهەڵدانی ئیلحاد لە ڕۆژئاوا و ئەورووپا)دا بە تەفصیلْ باسمان کرد، کە ئینجیل چۆن گۆڕدرا و، چۆن ئەو چوار ئینجیلە لە نێو حەفتا (٧٠) ئینجیلدا هەڵبژێردراون، چۆن (قسطنطین) لە کۆبوونەوەی (نیقیة) لە ساڵی (٣٢٥)ز دا، بە زۆر سێکوچکەیی (ثالوث) (باب و کوڕ و گیانی پیرۆز)ی فەرز کرد، دژی خوا بەیەکگرەکان.

بەڵێ (پەیمانی نوێ)ش شتی وای تێدایە، کە بە تەئکیدا ناتوانین بڵێین: ئەوە وەحیی و کتێب و فەرمایشتی خوایە و، بە کەڵکی ئەوە نایەت بیکەین بە بناغەی: خواناسیی و خواپەرستیی و دینداریی و دنیادارییەکی ڕاست و ساغ.

## پێنجەم: کتێبی مسوڵمانان (قورئـــان):

بەڕێـــــــزان!

کتێبێکمان ماوە لەو کتێبانەی کە شوێنکەوتووانیان بە کتێب و پەیام و فەرمایشتی خوایان لە قەڵەم دەدەن، ئەویش قورئانە، قورئانی بەرز و مەزن، قورئانی بەخشندە، با بزانین قورئان چییە و چۆنە؟ ئایا ئەویش وەك کتێبەکانی دیکە کە باسمان کردن، شتی وای تێدایە کە عەقڵ ڕەتی بکاتەوە و، لەگەڵ وەحیی خوا بووندا نەگونجێ، لەگەڵ بەرژەوەندیی مرۆڤدا نەگونجێ، لەگەڵ زانستدا تێکبگیرێ، لەگەڵ واقیعدا تێکبگیرێ؟ یاخود هەرچی تێیدایە، هەمووی عەقڵ پەسندی دەکات، با بە تەواویی لە هەمووشی تێنەگات، چونکە تەنیا خوا (سبحانە وتعالى) بە زانیاریی ڕەهاو بێ سنووری هەموو ئەو نهێنییانەی لە قورئاندان، دەیانزانێ، بەڵام هیچ شتێك لە قورئاندا نیە کە لەگەڵ عەقڵدا تێکبگیرێ، لەگەڵ زانستدا تێکبگیرێ، لەگەڵ زگماك و ناخ و خوارسکی مرۆڤدا تێکبگیرێ، لەگەڵ بەرژەوەندییدا تێکبگیرێ.

ئێستاش ئێمە لە حەڤدە (١٧) خاڵاندا باسی کتێبی ئیسلام و مسوڵمانان (قورئانی مەزن) دەکەین:

١-) کتێبی ئایینی مسوڵمانان، وەك لە فەرمایشتی خوادا هاتوەو پێناسە کراوەو قورئانە، وەك عزوجل دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ ﴾ الحجر.

واتە: بەدڵنیایی (ئەی موحەممەد!) ئێمە بە تۆمان بەخشیوە: حەوت (لە ئایەتە) دووبارە کراوەکان و قورئانی مەزن.

حەوت ئایەتە دووبارەکراوەکان، واتە: سووڕەتی (الفاتحة) کە وەك پێڕست وایە بۆ قورئان، هەر بۆیەش خوا لەگەڵ قورئاندا باسیکردوە، قورئان و پێڕستەکەی،

خوا پێکەوە باسی کردوون، چونکە سوورەتی (الفاتحة) سەردێڕو پێڕستی هەموو قورئانە، هەموو نهێنییەکانی قورئان بە کوشراویی و کورتیی لە سوورەتی (الفاتحة)دا هەن، وەك لە تەفسیری سوورەتی (الفاتحة)دا باسم کردوە[١]، هەروەها لەو بەرهەمەشدا کە لە (سجن)ی کرۆپەری ئەمریکادا نووسیومە: مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)، کە ئێستا بۆ جاری دووەم، لە دوازدە (١٢) کتێبدا چاپ دەکرێتەوە، لە پێشەکییەکەیدا گوتوومە، هەموو ئەو دوازدە (١٢) کتێبەی ئەم (موسوعة)یەم بە کورتیی لەبەر ڕۆشنایی سوورەتی (الفاتحة)دا هەڵهێنجاوە و، درێژییەکەشی لەبەر ڕۆشنایی ئایەتەکانی دیکەی قورئاندا[٢].

بەڵێ ئەم قورئانە وەحیی و فەرموودەی خوایە (سبحانه وتعالى) بۆ پێغەمبەری خاتەم محمد(صلى الله عليه وسلم) وەك دەفەرموێ:

﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ ﴾ الشعراء.

واتە: ڕووحی ئەمیندار (جبريل) دایبەزاندۆتە سەر دڵی تۆ، تاکو لە وریاکەرەوان و هۆشیارەکەرەوان بی، بە زمانێکی عەرەبی ڕۆشن.

٢-) ئەم قورئانە هەمووی سەد و چواردە (١١٤) سوورەتە، بە سوورەتی (الفاتحة) دەست پێدەکات و بە سوورەتی (الناس) کۆتایی دێ، هەمووشی زانراو و دیارە و، تەنانەت وشەیەك و پیتێکیشی تێدانیە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە هی خۆی بزانێ و، لێی زیاد کرد بێ، کە وەك (پەیمانی کۆن) و (پەیمانی نوێ) یاداشت و بیرەوەریی چەند نووسەرێك بێ و، بە چەندان زمان و لە ماوەی هەزار (١٠٠٠) ساڵدا، نووسرا بێ[٣]، یان وەك (ئاڤێستا)ی

---

(١) واتە: کتێبی (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام).

(٢) لە چاپی دووەمی دا هەر دوازدە کتێبەکەی، چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕە زیاترن.

(٣) وەك کاتی خۆی لە زاری شوێنکەوتووانی ئەو دوو کتێبەوە باسمان کرد.

زەردەشتایەتیی، لە ماوەی حەوتسەد (٧٠٠)ساڵدا، کۆ کرابێتەوە، یان وەك هی صابیئەی میندائیی، کە نازانین لە ماوەی چەند ساڵدا و، کێ نووسیویەتەوە؟ ئەوانە لە کوێ و، ئەو قورئانە بەرز و مەزنە، لە کوێ!

٣-) ژمارەی ئایەتەکانی قورئان: (٦٢٣٦) ئایەتە، بە ژماردنێك و، بە هەندێکیشیان (٦٢٠٤) یان (٦٢١٩) یان (٦٢٢٥) یان (٦٢٢٦) ئایەتە.

لێرەدا دەمەوێ شتێك ڕوون بکەمەوە:

ڕەنگە کەسانێك بڵێن: ئایا ئەوە چۆنە؟ بە پێی سەرژمێرێك: (٦٢٠٤) ئایەت، ئەو ژمارەیە لە کوێ و ژمارەی: (٦٢٣٦) لە کوێ، کە سی و دوو ئایەتی (٣٢) لەو سەرژمێرییەی دیکە زیاترە؟!

وەڵامەکەی ئەوەیە: ئەوانەی دەڵێن: قورئان (٦٢٠٤) ئایەتە، لەگەڵ ئەوانەدا کە دەڵێن: (٦٢٣٦) ئایەتە، هیچیان وشەیەك و پیتێکی بە زیاد لەوی دیکە ناڵێن، بەڵام جیاوازییەکە لە کورتیی و درێژیی ئایەتەکان دایە.

بۆ وێنە: خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمۡ غَيرِ ٱلمَغضُوبِ عَلَيهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧ ﴾ الفاتحة.

هەندێکیان لێرە: ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمۡ ﴾ وەستاون و ئەوەیان کردوە بە ئایەت، بەڵام هەندێکیان: ﴿ غَيرِ ٱلمَغضُوبِ عَلَيهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧ ﴾ ئەوەشیان لەگەڵ وی حیساب کردوە، هەمووی بووەتە یەك ئایەت، کەواتە: لە وەستانەکان (وقوف)دا، هەندێکیان ئایەتێکیان کردوە بە دوو ئایەت، یان ڕستەیەکی درێژیان کردوە بە سێ ئایەت، لێرەدا ژمارەی ئایەتەکان زیاد بووە، ئەگەرنا پیت و وشەکانی قورئان، چەسپاو و نەگۆڕن، وەك ئێستا باسی دەکەین.

٤-) ژمارەی وشەکانی قورئان، نەگۆڕن و بریتیە لە: حەفتاو حەوت هەزار و چوار سەدو سی و نۆ (٧٧٤٣٩) وشە (كلمة)، کەواتە: ژمارەی ئایەتەکان کە کەم و زیاد دەکات، لەبەر کورتیی و درێژیی ڕستەکانە.

٥-) هەروەها ژمارەی پیتەکانی قورئانیش دیارە، سێ سەدو بیست و یەك هەزارو سەدو هەشتا (٣٢١,١٨٠) پیت (حرف)ە.

٦-) قورئان چوار ناوی سەرەکیی بۆ بەکارهێنراون، کە ئەمەیان هەڵهێنجانی خۆمە: (١- قرآن، ٢- کتاب، ٣- ذکر، ٤- فرقان).

هەرکام لەو چوار ناوەش ڕوویێکی گەورە و گرنگ و جەوهەریی، ئەو کتێبە مەزنە دەردەخات:

١- ناوی (قرآن)ی بۆ بەکارهێنراوە، لەبەر ئەوەی دەخوێنرێتەوە، (قرآن) واتە: خوێنراوە، یان خوێندنەوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾ القيامة.

٢- هەروەها ئەو پەیامە ناویشی (کتاب)ە، چونکە: وێڕای ئەوەی کە دەخوێنرێتەوە بە زارەکیی، نووسراویشەتەوە، واتە: هەم خوێنراوەیە، هەم نووسراوەیە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ الٓر ۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ وَقُرْءَانٍ مُّبِينٍ ﴿١﴾ ﴾ الحجر.

٣- ناوی سێیەمی قورئان بریتییە لە (ذکر) لەبەر ئەوەی بیر خەرەوەیە، ڕاستییەکان بیر مرۆڤ دەخاتەوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ ۖ وَسَوْفَ تُسْـَٔلُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ الزخرف.

٤- ناوی چوارەم (الفُرقان)ە، لەبەر ئەوەی لێك جیاکەرەوەیە: هەق و ناهەق، حەڵاڵ و حەڕام، چاك و خراپ، دۆست و دوژمن، ڕاست و چەوت، لێك جیا دەکاتەوە و بەرچاوی مرۆڤ ڕۆشن دەکاتەوە، وەك خوای میهرەبان فەرموویەتی:

﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴿١﴾ ﴾ الفرقان.

﴿ نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٣﴾ مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ ٱلْفُرْقَانَ ۗ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٤﴾ ﴾ آل عمران.

**٧-)** قورئان هەمووی بە شێوازی تەواتور (تواتر)[١] بە ئێمە گەیشتوە لە زاری موبارەکی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەدەوە (صلی الله علیه وسلم)، هەم بە زارەکیی (شَفَاهَةً)، هەم بە نووسین (كِتَابَةً)، تەواتور(التواتُر)یش، ئەوەیە: کۆمەڵێکی زۆر شتێك لە کەسێك ببیستن، یان ببینن و بیگەیەنن بە کۆمەڵێکی زۆری دوای خۆیان، ئەوانیش بیگەیەنن بە کۆمەڵێکی زۆری دوای خۆیان، کە هیچ عەقڵێك بڕوا نەکات کە ئەو کۆمەڵە زۆرە لەسەر درۆ کۆببنەوە.

بۆ وێنە:

ئێستا ئێمە لێرە دانیشتووین، ئەگەر کەسێك هات، گوتی: ئەوە فڵان شتە قەوما لە هەولێرێ، لە بازاڕی (شێخەڵڵا)یان: لە فڵان بازاڕ، دیارە ئەگەر زۆر ڕاستگۆ بێت، متمانەی پێ دەکەین، بەڵام ئەوە لە کوێ و ئەوە لە کوێ کە دوایی یەکێکی دیکە بێ و، دوایی چواری دیکەش بێن و، دوایی دە پازدە (١٠ - ١٥)ی دیکەش بێن؟! ئەو هەواڵە دەبێتە جێی دڵنیایی و هیچ گومانمان نامێنێ.

ئەم قورئانەش هەمووی بە تەواتور بە ئێمە گەیشتوە: هەزاران کەس لە هاوەڵان هەم بە زارەکیی (شَفَاهَةً) دوای ئەوەی لەبەریان کردوە، هەم بە نووسین (کتابة)یش و، وێڕای ئەوەی کە لەلایەن هەزاران کەسەوە هەمووی یان بەشێکی، لەبەرکراوە و، لە سینەکاندا تۆمارکراوە، نووسراویشەتەوە، هەردووکیشیان لە سەردەمی خودی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دا و بە ئاڕاستە کردن و فێرکردن و فەرمانکردنی خودی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، کەواتە: قورئان لە دوو ڕێگاوە بە ئێمەوە گەیشتوە: هەم لە ڕێی لەبەر کردن و زارەکیی، هەم لە ڕێی نووسینەوە[٢].

------------------------------

(١) المتواتر: هو الذي يرويه جمع يُحيلُ العقل في العادة تواطُؤهم على الكذب، من أول السند وَوَسَطِهِ وآخره. علم الحديث ومصطلحه، ص١٤٥ -١٥٠، د. صبحي الصالح.

(٢) لە کتێبی: (با لە خزمەت قورئاندا بین!)دا بەدرێژیی ئەو بابەتەمان توێژیوەتەوە.

٨-) مسوڵمانان هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، تاكو ئێستا، نەك لەسەر ئایەت و بڕگەو ڕستەیەك، تەنانەت لەسەر وشەیەك و بگرە پیتێكی قورئانیش ڕا جیاییان نەبووە، مشت و مڕیان نەبووە، یەكیان بڵێ: ئەو وشەیە یان ئەو پیتە هەیە، یەكێكیان بڵێ: نیە، چونكە ژمارەی پیتەكانی قورئان و وشەكانی دیاریی كراوە: (٣٢١١٨٠) پیت و، (٧٧٤٣٩)، وشەیە، ئیدی براوەتەوە: نە پیتێكی لێ كەم دەكرێ، نە زیاد دەكرێ.

٩-) بەبێ هیچ دوو دڵییەك هەردوو كتێبی (پەیمانی كۆن) و (پەیمانی نوێ) بەڵكو هەموو كتێبەكانی دیكەش، كە باسمان كردن، دەستكاریی كراون و گۆڕدراون شێوێنراون، با سەرنجی قورئان بدەین لەوبارەوە چی فەرمووە:

**یەكەم: پەیمانی كۆن:**

خوا (سبحانه وتعالى) زۆر بە ڕوونیی و ڕاشكاویی فەرموویەتی: جوولەكەكان فەرمایشتی خوایان گۆڕیوەو دەستكارییان كردوە، بۆ وێنە دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ .... ﴾ المائدة: ١٢.

دوایی لە درێژەی ئایەتەكاندا دەفەرموێ: ﴿ فَبِمَا نَقۡضِهِم مِّيثَٰقَهُمۡ لَعَنَّٰهُمۡ وَجَعَلۡنَا قُلُوبَهُمۡ قَٰسِيَةٗۖ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ....(١٣) ﴾ المائدة.

واتە: بە هۆی پەیمان شكاندنیانەوە، نەفرینمان لێكردن و دڵیانمان ڕەق كرد، وشەكان لە شوێنی خۆیان لا دەدەن و، بەشێك لەوەی كە پێی ئامۆژگاریی كرابوون لە بیریان چوو.

یانی: هەم بە ئانقەست وشەكانیان دەگۆڕی و، هەم هەندێكیشیان لە بیرچوو و فەرامۆشیان كرد، چونكە لە ئەسڵدا - جگە لە تەوڕات - نووسراو نەبووە و، هەمووی بەزارەكیی نەقڵ كراوە، بە تایبەت دوای ئەوەی كە ئاشوورییەكان و بابلییەكان، جوولەكەیان ڕاگواست و بڵاویان كردنەوە بە دنیادا، بە تایبەت هێنایانن بۆ

عێراق، ئەوەی نووسرابۆوەش، فەوتا و دوایی نووسرایەوە، وەك بۆ خۆیان دەڵێن: لە ماوەی هەزار (١٠٠٠) ساڵدا نووسراوەتەوە!

**دووەم: پەیمانی نوێ:**

بە نسبەت نەصرانییەکانیشەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ ﴿١٤﴾﴾ المائدة.

واتە: ئەوانەش کە گوتیان: ئێمە نەصرانیین، پەیمانمان لێ وەرگرتبوون، بەڵام بەشێك لەوەی پێی ئامۆژگاریی کرابوون، لە بیریان چوو، فەرامۆشیان کرد.

هی ئەوان خوا (سبحانه وتعالى) باسی بە ئانقسەت گۆڕین ناکات، بەڵام دەفەرموێ: لە بیریان چوو، فەرامۆشیان کرد.

ئەوەشم بۆیە لێرەدا باسکرد، کە پێشتریش باسمان کردوە، چونکە یەکێك لە ئەرکەکانی قورئان ڕاستکردنەوەی هەڵەو لادانەکانی خاوەن کتێبەکانە، خوا (سبحانه وتعالى) فەرموویەتی:

﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِ ﴿٤٨﴾﴾ المائدة.

واتە: کتێبمان بە هەق بۆ تۆ دابەزاندوە، کتێبەکانی پێش خۆی بە ڕاست دەزانێ (وەك ئەسڵەکەیان)، بەڵام بەسەریشیانەوە چاودێرە (هەڵەو لادانێکیان تێدا کرابێ، ئەگەر بە پێویستیی بزانێ ڕاستی دەکاتەوە)، وەك لە سووڕەتی (النمل)دا خوا دەفەرموێ:

﴿إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَكۡثَرَ ٱلَّذِي هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾ وَإِنَّهُۥ لَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٧٧﴾﴾.

واتە: ئەم قورئانە زۆربەی ئەوەی کە تێیدا کەوتوونەتە ڕاجیایی، بەسەر نەوەی ئیسرائیلدا دەیخوێنێتەوە، بەدڵنیایی ڕێنمایی و ڕەحمەتیشە بۆ بڕواداران.

واتە: ئەوەی کە بە پێویستی بزانیّ، بەسەریاندا دەخوێنێتەوە کە: هەواڵە ڕاستەکە، ئاوابووە.

لێرەدا نموونەیەکی بچووك دێنم: لە پەیمانی کۆندا کە باسی پادشای میسر دەکات، لە سەردەمی یوسوفدا، هەر دەڵێ: فیرعەون، بەڵام لە قورئاندا دەفەرمویّ: پادشا (ملك)، ئنجا دیارە نازناوی پادشایەکانی میسر، فیرعەون بووە، ئەدی بۆچی قورئان وشەی مەلیك بەکاردێنیّ؟

وەڵامەکەی ئەوەیە کە: ئێستا مێژوو دەریخستوە، گەلی هەکسۆس چەند سەدەیەك میسریان خستۆتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان و، ئەو کاتەی یوسوف (علیه السلام) لە میسر گیراوە، سەردەمی حوکمی هەکسۆس بووە، کە بە حوکمڕانەکانی خۆیانیان گوتوە: مەلیك، نەك فیرعەون، میسرییەکان بە حوکمڕانی خۆیانیان گوتوە: فیرعەون و نازناوی پادشاکانی (قبطي) یەکان فیرعەون بووە، بەڵام هی هەکسۆس: مەلیك بووە، ئنجا قورئان وشەی مەلیك بەکاردێنیّ، بەڵام لە پەیمانی کۆندا هەر وشەی: فیرعەون بەکاردێنیّ، لە حاڵێکدا کە لە پەیمانی کۆنیشدا دەڵێ: هەکسۆس حوکمی میسریان گرتۆتە دەست لەو کاتەدا! بەڵێ قورئان هەموو ئەو شتانەی کە لە تەورات و ئینجیلدا (ئەو تەورات و ئینجیلە ڕاستەقینەی کە خوا بە مووساو عیسای دابوون، نەك ئەوەی ئێستا هەن)، هەر شتێك کە خوا بە پێویستی زانیبیّ، بۆی ڕاست کردوونەوە.

١٠-) لە کاتێکدا کە هەرکام لە (پەیمانی کۆن) و (پەیمانی نویّ)ی ئێستای بەردەستی جوولەکەو نەصرانییەکان، چ جای کتێبی صابیئەو مەجووسییەکان، دەیان و، بگرە سەدان شتیان تێدایە کە دژو پێچەوانەی عەقڵ و زانست و مێژوو واقیعە، قورئانی بە پێز، یەك تاکە وشەشی تێدانیە کە لەگەڵ عەقڵ و زانست و مێژوو و واقیعدا دژ بوەستیّ، بەڵکو زیاد لەوەش: قورئان لە هەموو ڕووێکەوە، دەستەوسانکەر(مُعجز)ە، بە تایبەت لەم دە (١٠) بوارەدا:

١- ڕووحیی.

٢- زگماکیی.

٣- عەقڵیی.

٤- مەعریفیی.

٥- تەزكیەی نەفس.

٦- ڕەوشت و ئاكار.

٧- كۆمەڵایەتیی.

٨- مێژوویی.

٩- زانستیی.

١٠- بەیانیی.

وەك لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)، (الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله تعالى)دا لە باسی دەستەوسانكەریی قوڕئاندا، بە تەفصیل باسمان كردوە، هەروەها (مۆریس بۆكای) لە كتێبی: (القُرْآنُ والتوراة والإنجيل والعلم)دا باسی كردوە، بە ناوونیشانی: (دراسة الكتب المقدَّسَة في ضوء المعارف الحديثة)، ئەویش بە تەفصیل باسی كردوە و، زانایانی دیكەش زۆریان باس كردوە.

١١-) لە قوڕئاندا بەرنامەیەكی گشتگیرو تێرو تەواو و هەمەلایەنەی ژیانی تاك و خێزان و كۆمەڵگا هەیە، لە هەموو بوارەكانی: بوونناسیی و تێڕوانین و، ئیمان و عەقیدەو، فیكرو ڕۆشنبیریی و، پەرستشەكان و، ڕەوشت و ئاكاریی كۆمەڵایەتیی و، ئابووریی و، حوكم و سیاسەت و، جەنگ و ئاشتیی، .. هتددا.

وەك خوا (سبحانه وتعالى) لە سووڕەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴿١١٥﴾ ﴾.

واتە: وشەی پەروەردگارت تەواوی كردوە، لە ڕاستیی و لە دادگەریی دا.

هەروەها لە سووڕەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ﴿٣﴾ ﴾.

ئەمڕۆ {واتە: لە حەجی ماڵئاوایی}دا بەرنامەکەتانم بۆ تەواو کردن و، چاکەی خۆمم بە تەواویی لەگەڵ کردن، ئیسلامیشم بە بەرنامەی ژیان بۆ پەسند کردن.

یانی: جگە لە ئیسلام، شتێکی دیکە لە لای خوا پەسند نیە، کە بەرنامەی ژیانی مرۆڤەکان بێ، ئنجا مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) دا، بەڵگەیەکی سەلمێنەری گشتگیریی و هەمەلایەنەیی و تێر و تەواویی قورئان و ئیسلامە، چونکە هەموو ئەو مەوسووعەیە کە دوازدە (١٢) کتێبە لە زیاتر لە چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕەدا، لەبەر ڕۆشنایی قورئاندا، نووسیومە و هەوڵمداوە هەموو لایەن و بوارو ڕەهەندەکانی ئیسلامی تێدا بخەمەڕوو.

١٢-) بێگومان بەس ئەوەش، لە حیکمەت و زانیاریی و بەزەیی بێ سنووری خوا، چاوەڕوان دەکرا، کە قورئانێك کە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتیی و، بە کۆتا پێغەمبەری دادەبنێری، هەر بەو شێوەیە بێ: وەڵامگۆی سەرجەم پرسیارەکانی مرۆڤایەتیی بێت، بە درێژایی زەمان و بە پانایی زەمین، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ٢٧ لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ٢٨﴾ التكوير.

واتە: ئەم قورئانە تەنیا بیر خەرەوەیە بۆ هەموو جیهانییان، بۆ هەر کامێك لە ئێوە کە بیەوێ ڕاست بێ.

کێ دەیەوێ ڕاست بێ، ئەمە قورئان، با لە خزمەت قورئان دابێ، ئەو کاتە: لەگەڵ خوادا ڕاست دەبێ، لەگەڵ خۆی دا ڕاست دەبێ، لەگەڵ خەڵکدا ڕاست دەبێ، دەروونی ڕاست دەبێ، دەری ڕاست دەبێ، لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی دا ڕاست و ڕێك و پێك دەبێ، بەڵێ قورئانێك خوا بۆ هەموو مرۆڤایەتیی بینێرێ، هەر دەبێ وابێ، بەڵام کتێبەکانی دیکەی خوا (سبحانه وتعالى) ئەگەر گریمان نەشگۆڕابانایەو، دەستکارییش نەکرابانەو نەشێوێنرابانایەش، هەر نە دەگونجا گرفت و کێشەکانی ئێستای بەشەریان چارەسەر بکردایە، چونکە خوا هەر کامێکیانی بۆ گەل و هۆزێکی تایبەت و

بۆ قۆناغ و ڕۆژگارێکی دیاریکراو، ناردوە، بۆ وێنە: تەوڕات بۆ وەچەی ئیسرائیل، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ .... ﴾ المائدة: ٤٤.

واتە: ئێمە تەوڕاتمان دابەزاندبوو ڕێنمایی و ڕووناکیی تێدا بوو، پێغەمبەرانێك کە (بۆ خوا) ملکەچ بوو بوون، حوکمڕانیی جوولەکەیان پێدەکرد....

هەروەها ئینجیل بەهەمان شێوە، وەك عیسا دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُم ﴿٦﴾ ﴾ الصف.

واتە: ئەی نەوەی ئیسڕائیل! من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لای ئێوە.

بەڵێ: ئینجیل هاتبوو کە تەواوکەری تەوڕات بێ، بەو واتایە: ئەو لادانانەی کە جوولەکە لە تەوڕاتدا کردبوویانن و، ئەو شێوێنران و دەستکاریی کرانانە، ڕاستیان بکاتەوە و، ئەو سزا درانانەی جوولەکەکان بەهۆی ستەم و لادانیانەوەو، ئەو بارە قورسانەیان لەسەر لابەرێ، وەك عیسا (علیه السلام) فەرموویەتی:

﴿ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعۡضَ ٱلَّذِي حُرِّمَ عَلَيۡكُمۡ ﴿٥٠﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: هەروەها هاتووم - ئەی گەلی جوولەکە! - کە هەندێك لەو شتانەی لێتان قەدەغەکراون، بۆتان ڕەوا بکەمەوە.

کەواتە: تەوڕاتیش و ئنجیلیش بۆ گەلی جوولەکە، بۆ وەچەی ئیسڕائیل هاتوون، هەروەها کتێبەکانی دیکەش هەرکام بۆ شوێنێکی جوگڕافیی دیاریی کراو و، بۆ گەل و هۆزێکی دیاریی کراو، لە هەل و مەرجێکی دیاریی کراودا، هاتوون، بۆیە ئەگەر گریمان دەستکارییش نەکرابانایە، هەر نەیاندەتوانی گرفت و کێشەکانی ئەم مرۆڤایەتییەی ئێستا و دوای ئێستا چارەسەر بکەن، لەسۆنگەی ئەوەوە کە خوا (سبحانه وتعالی) بۆ ئەوەی نەناردبوون، گرفت و کێشەکانی

ئێستا چارەسەر بکەن، بەڵکو ناردبوونی، گرفت و کێشەی کۆمەڵگایەکی دیاریی کراو، لە هەل و مەرجێکی دیاریی کراودا، چارەسەر بکەن.

١٣-) هەر لێرەشدا حیکمەتی خوای کارزانمان بۆ دەردەکەوێ، کە بۆچی خۆی قورئانی پاراستوە؟ وەك لە سوورەتی (الحجر)دا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ۝٩ ﴾.

واتە: ئێمە خۆمان (ذکر)[1]مان دابەزاندوە و خۆشمان پارێزەرییینی، خوا خۆی قورئانی پاراستوە لە دەستکاریی کران و شێوێنران و گۆڕان، بەڵام پاراستنی کتێبەکانی دیکەی بە مرۆڤان سپارد بوو، وەك لە سوورەتی (المائدة) دا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ۚ فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ۝٤٤ ﴾.

واتە: ئێمە تەوراتمان دابەزاندبوو ڕێنمایی و ڕووناکیی تێدا بوو، پێغەمبەرانێك کە ملکەچ بوون بۆ خوا، حوکمڕانییان پێدەکرد بۆ جوولەکەکان، هەروەها ڕەببانیی و ئەحبار، {دوو جۆر بوون لە زانا و شارەزایان لە نێو گەلی جوولەکەدا} حوکمیان بە تەورات دەکرد، ﴿ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ ﴾ بە هۆی ئەوەوە کە پارێزرانی کتێبی خوایان پێ سپێردرابوو[2]، هەروەها بەسەریشیەوە چاودێر بوون.

---

(١) چونکە "ذکر" یەکێکە لە ناوەکانی قورئان، واتە: بیر خەرەوە.

(٢) ﴿ ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ ﴾: [وُكِّل حِفْظُ كِتَابِ اللهِ إليهم: أُو وُكِّلُوا بحِفْظِ كِتَابِ الله]، واتە: پاراستنی کتێبی خوایان پێ سپێردرابوو.





بەڵام شتێك بە مرۆڤان بسپێردرێ، بە قەدەر توانای مرۆڤان پارێزراو دەبێ و، شتێکیش خوا بۆ خۆی بیپارێزێ و پارێزراوەکەی عایدی خوا بێ، بە قەدەر پاراستنی خوا پارێزراو دەبێ، خوا بیەوێ شتێك بپارێزێ دەیپارێزێ، بەڵام مرۆڤ لە قەدەر خۆیان شت دەپارێزن، بۆیەش تەوڕات ئێستا خۆمان دەزانین چی لێهات، وەك پێشتر باسمان کرد.

بەڵێ ئەوەی خوا بیپارێزێ، پارێزراو دەبێ، بەڵام هی مرۆڤان، لە قەدەر خۆیان دەبێ، حیکمەتەکەشی ئاشکرایە: کتێبەکانی دیکە، بۆ قۆناغ و هەل و مەرجێکی دیارییکراو بوون، بەڵام قوڕئان بۆ گشتی و سەرتاسەرییە و، دوایی ویش کتێبێکی دیکە نایەت، دوای قوڕئان کتێبێکی دیکە نایەت، ئەگەر گریمان دەستکارییکراو شێوێنرا، ڕاستی بکاتەوە، بەڵام قوڕئان لە دوای کتێبەکانی دیکە هاتوە: ﴿وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِ ٤٨﴾ المائدة، بەسەریانەوە چاودێرە، لە هەر شوێنێك دەستکاریی کران و شێوێنران ڕوویدابێ، قوڕئان ڕاستی دەکاتەوە، بەڵام قوڕئان دوایین کتێبی خوایە و، موحەممەدیش دوایین پێغەمبەری خوایە:

﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمۡ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ٤٠﴾ الأحزاب.

واتە: نە لە دوای موحەممەد پێغەمبەرێکی دیکە دێ و، نە لە دوای قوڕئانیش کتێبێکی دیکە دێ، تاکو ئەگەر دەستکاریی کران و گۆڕدران ڕوویدا، لە شەریعەتێکدا کە موحەممەد لە خواوە هێناویەتی و، لە کتێبێکدا کە خوا بۆ موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)ی دابەزاندوە، ئەو کتێب و شەریعەتە ڕاستی بکاتەوە، ئەگەرنا خوا (سبحانه وتعالی) دەیتوانی کتێبەکانی دیکەش بپارێزێ، بەڵام چونکە بۆ کاتێکی دیارییکراوی ناردوون و بۆ کۆمەڵگایەکی دیارییکراو، بە پێویستی نەزانیوە خۆی بیانپارێزێ.

١٤-) قورئان چوار تایبەتمەندیی هەن، کە تەنیا هی قورئانن:

**تایبەتمەندیی یەکەم:**

قورئانی مەزن بەرنامەشەو موعجیزەشە لە یەك کاتدا، قورئان موعجیزەیە، موعجیزەی ڕاستیی خۆیەتی و، لە هەمان کاتدا بەرنامەشە، کتێبەکانی دیکە وا نەبوون، مووسا (علیه السلام) تەوراتی بۆ هاتبوو وەك بەرنامە، بەڵام موعجیزەکەی بریتی بوو لە گۆچان و لە دەستی و لە چەند شتێکی دیکە، عیسا (علیه السلام) ئینجیلی بۆ هاتبوو وەك بەرنامە، وێڕای تەورات، بەڵام چەند موعجیزەیەکی دیکەی هەبوون، هەروەها صالح موعجیزەی هەبووە، هەموو پێغەمبەران موعجیزەیان هەبوون، بەڵام پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) قورئان: هەم بەرنامەکەیەتی و هەم موعجیزەکەشیەتی، هەڵبەتە هیچ پێغەمبەرێك نەهاتوە، موعجیزەیەکی نەبێ، خەڵك لەسەر بناغەی ئەو موعجیزەیە، متمانە بەو پێغەمبەرە بکات، کە ڕاست دەکات، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: {مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ نَبِيٌّ إِلاَّ قَدْ أُعْطِيَ مِنَ الآيَاتِ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ، وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِي أُوتِيتُهُ وَحْياً أَوْحَاهُ اللهُ إِلَيَّ، فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ}، (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيّ برقم: (٤٩٨١)، وَمُسْلِم برقم: (٣٨٣) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ).

واتە: هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران نەبووە (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ) مەگەر بەڵگەیەکی پێدراوە، کە مرۆڤەکان لەسەر بناغەی وی بڕوای پێ بێنن، بەڵام ئەوەی بە من دراوە، سروشێکە خوا بۆی سروش کردوم، بۆیە ئومێدم وایە کە لە ڕۆژی دواییدا، لە هەموویان شوێنکەوتووم زیاتر بن.

چونکە موعجیزەکەی دەمێنێتەوە، ئێستا چۆن دەزانین مووسا ئەو موعجیزانەی بوون و، عیسا ئەو موعجیزانەی بوون و، پێغەمبەرانی دیکە ئەو موعجیزانەیان بوون؟ بێگومان بە هۆی قورئانەوە دەزانین، قورئان بۆمان دەگێڕێتەوە، ئەگەرنا موعجیزەکانیان لەبەردەستمان نین، بەس موعجیزەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) و ئیسلام هەر لەبەردەستە، وەك خوای بەرزی مەزن فەرموویەتی:

﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ البقرة.

واتە: ئەی خەڵکینە! ئەگەر لە دوو دڵییدان لەوەی دامانبەزاندۆتە سەر بەندەی خۆمان، ئەوە سوورەتێکی وەك ئەو بێنن، (پێشیٚ فەرمووی: قورئانێك بێنن، دوایی فەرمووی دە (١٠) سوورەت بێنن)، ئنجا ئەگەر نەتانتوانی سوورەتێك بێنن، لە حاڵێکدا کە هەرچی بەردەستیشتان دەکەوێت لە شایەدییدەران و هاوکارتان دەبن، لە ئینس و جند، کۆیان بکەنەوە، ئەگەر ڕاست دەکەن (کە قورئان فەرمایشت و سروشی نێرراوی خوا نیە) بە دڵنیایی هەرگیزیش بۆتان ناکریٚ، ئەو کاتە خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن، کە سووتەمەنییەکەی بەردو مرۆڤە بۆ کافران ئامادەکراوە.

بەچی خۆیانی لیٚ بپارێزن؟ بە هۆی ئیمان هێنانەوە بە قورئان و بە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم).

**تایبەتمەندیی دووەم:**

تایبەتمەندی دووەمی قورئان بریتیە لەوەی کە قورئان بەرنامەی هەمیشەیی خوایە بۆ تێکڕای مرۆڤ و جند، ئەمەش تایبەتمەندییەکی دیکەی قورئانە، چونکە کتێبەکانی دیکە، وەك گوتمان: لە هەل و مەرجێکی تایبەتدا بۆ کۆمەڵگایەکی دیارییکراو و قۆناغێکی دیارییکراو بوون، بەڵام قورئان خوا لە چەندان ئایەتدا ئەو ڕاستییەی دووپات کردۆتەوە، کە بۆ هەموو مرۆڤایەتییە، بۆ وێنە:

١- ﴿ تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا ﴿١﴾ ﴾ الفرقان.

واتە: بەرزیی و مەزنیی بۆ ئەو زاتەی کە فورقانی (واتە: لێکجیاکەرەوەی) دابەزاندە سەر بەندەکەی خۆی، تاکو وشیارکەرەوە بیٚ بۆ هەموو جیهانییان.

٢- هەروەها دەفەرمویٚ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَـٰكَ إِلَّا رَحۡمَةً لِّلۡعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ الأنبياء.

واتە: تۆمان نەناردوە، مەگەر وەك بەزەیی خوا، بۆ هەموو مرۆڤەکان، بۆ هەموو جیهانییان.

٣- لە سوورەتی (التكوير)یشدا دەفەرمویٚ: ﴿ وَمَا هُوَ بِقَوۡلِ شَيۡطَـٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿٢٥﴾ فَأَيۡنَ تَذۡهَبُونَ ﴿٢٦﴾ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٌ لِّلۡعَـٰلَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ ﴾.

واتە: ئەم قورئانە قسەی شەیتانێکی دوورخراوە نیە، بۆ کویٚ دەچن؟ بەڵکو بیرخەرەوەیەکە بۆ هەموو جیهانییان، بۆ هەر کام لە ئیٚوە کە بیەویٚ: ڕاست بیٚ.

**تایبەتمەندیی سێیەم:**

قورئان بە پاراستنی خوا پارێزراوە، وەك پێشتریش باسمان کرد، خوا فەرموویەتی:

﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجر.

واتە: ئێمە خۆمان زیکرمان دابەزاندوە و، بە دڵنیایی هەر خۆشمان پارێزەرینی.

هەڵبەتە شتێك خوا بیپارێزیٚ، سەلامەت دەبیٚ، ئنجا پێشتر باسمان کرد: کە ئێستا ژمارەی وشەکان و بگرە پیتەکانی قورئان لەلای هەموو زانایانی ئیسلام یەکە[1]، ئنجا ئەوە لە کویٚ و، ئەوە لە کویٚ، کە من هەر لە (کتێبی پیرۆز - الكتاب المقدس) (پەیمانی کۆن) و (پەیمانی نویٚ)، سیٚ نوسخەم لەلان، یان: سیٚ چاپیم لەلان، کە تازەش چاپکراون، هەرسێکیان لێك جیان؟! هەروەها ئەوە لە کویٚ: کە مسوڵمانێك لە هیند و چین، مسوڵمانێك لە مەڕاکیش و مەغریب، مسوڵمانێك لە قەفقاسیا، یەکێك لە باشووری ئەفریقیا، تەماشایان بکە! لەسەر وشەیەکی قورئان، بگرە لەسەر پیتێکی قورئان ڕا جیاییان نیە، بەڵام جوولەکە و نەصرانییەکان، هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیان زەویی و ئاسمانیان بەینە؟!

---

(١) وشەکانی قورئان: ٧٧٤٣٩ پیتەکانی قورئان: ٣٢١١٨٠.

**تایبەتمەندیی چوارەم و کۆتایی:**

ئەوەیە کە قورئان وێڕای ئەوەی کە کتێبەکانی پێش خۆی بە ڕاست دەزانێ، وەك ئەسڵەکەیان، بەڵام بە سەریشیانەوە چاودێرە، بەسەریانەوە چاودێرە، واتە: ئەگەر کەم و کوڕیی و لادان و شێوێنرانێك لە یەکێك لە کتێبەکانی خوادا ڕوویدابێ، قورئان ڕاستی کردۆتەوەو ڕاستی دەکاتەوە.

**١٥-)** قورئان تاکە پێناسەی ڕاست و شایستە بە خوا (سبحانه وتعالى) دەخاتە ڕوو و، بێگومان هەمیشە وێنا کردن (تصوُّر) بناغەی هەڵس و کەوت کردن (تعامل)ە، تەصەووڕ بناغەی تەصەڕڕوفە.

ئنجا با سێ (٣) نموونان لەو بارەوە بێنینەوە[١]:

**یەکەم:** با تەماشای ئایەتی (کورسیی) بکەین، کە لە دە (١٠) ڕستە پێکهاتوە، ئایەتی ژمارە (٢٥٥)ی سوورەتی (البقرة):

﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ۚ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا ۚ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ ﴾.

لەم دە (١٠) ڕستەیەدا خوا پێناسەی خۆیمان بۆ دەکات، کە من بە کورتیی مانای ئەم ئایەتە موبارەکە دەکەم، کە بە (آية الكرسي) ناسراوە و، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: گەورەترین ئایەتە لە قورئاندا[٢]، واتە: لە

---

(١) پێشتریش بەبۆنەیەکی دیکەوە (آية الكرسي) و (سورة الإخلاص)مان لەو بارەوە بە نموونە هێناونەوە.

(٢) {عن أبي بن كعب قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): يا أبا المنذر! أتدري أي آية من كتاب الله معك أعظم؟ قلت: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ﴾، فَضَرَبَ صَدري وقال:







ڕووی شکۆو پێگەوە، لەبەر ئەوەی باسی سیفەتەکانی خواو، پێناسەی خوای پەروەردگار دەکات:

**یەکەم:** ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، خوا جگە لەو هیچ پەرستراو نین.

**دووەم:** ﴿ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴾، هەمیشە ژیاوی سەرپەرشتیارە.

**سێیەم:** ﴿ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞ ﴾، نە وەنەوز دەیگرێ، نە خەو.

**چوارەم:** ﴿ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدایە هی ئەوە.

**پێنجەم:** ﴿ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦ ﴾، کێ لە لای وی تکا دەکات، مەگەر بە مۆڵەتی وی! یانی: نەك کەس هیچی بە دەست نیە، بەڵکو تکا کردنیشیان لە لای خوا بەدەست نیە، مەگەر خوا مۆڵەت بدات.

**شەشەم:** ﴿ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ ﴾، (خوا) ئەوەی لە پێشیانەوەیەو ئەوەی لە دوایانەوەیە، هەمووی دەزانێ، یانی: خوا لە بارەی دروستکراوەکانەوە، هەموو شتێك دەزانێ.

**حەوتەم:** ﴿ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ﴾، (دروستکراوەکان) هیچ شتێك لە زانیاریی خوا نازانن، مەگەر ئەوەی خوا خۆی مۆڵەتی لەسەر بێ.

**هەشتەم:** ﴿ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ ﴾، حوکمڕانیی خوا، دەسەڵاتی خوا، زانیاریی خوا ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە.

**نۆیەم:** ﴿ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَا ﴾، پاراستنی ئاسمانەکان و زەوی، خوا ماندوو ناکات.

**دەیەم:** ﴿ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴾ خوا بەرزی مەزنە!

ئنجا ئەم پێناسەیە لە کوێ و، هی تەوڕات و ئینجیل لە کوێ؟!

---

لِيَهنِكَ العلم أبا المنذر} رواه مسلم: ٨١٠.

**دووەم:** هەروەها با سەرنجی سوورەتی (الإخلاص) بدەین:

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ اللَّهُ الصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ ﴿٤﴾﴾.

واتە: بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. بڵێ: خوا تاکە، جێی نیازو بێنیازە (هەموو دروستکراوەکان پێویستییان پێی هەیە و ئەو حەوجێی کەس نیە)، کەسی لێ نەبووەو، لە کەسیش نەبووەو، هیچ کەس هاوتای وی نیە[1].

ئنجا ئەو پێناسەیە لە کوێ و، ئەوەی لە کتێبەکانی دیکەدا ئاماژەمان پێدا، لە کوێ؟!

**سێیەم:** هەروەها خــوا دەفەرمــوێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى.

واتە: هیچ شتێك وەك وێنەی خوا نیە و، ئەو (خوا) خوا بینەری بیسەرە.

واتە: خوا هەرچی سیفەتی تەواوە هەیەتی، بەڵام هیچ شتێك وەك خوا نیە.

**١٦-)** هەروەها قورئان وەك بۆ پایەی بەرزو ناوازەی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) شایستەیە، باسی پێغەمبەران دەكات، بۆ وێنە:

١- خوا عزوجل فەرموویەتی: ﴿إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَىٰ نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ ۚ وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ ۚ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ۚ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ

---

(١) {عَن أَبي سَعيد الخدري أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَال في ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾، والَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنَّهَا لَتَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ} رواه البخاري: ٥٠١٣.

تَكۡلِيمٗا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ
ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿١٦٥﴾ ﴾ النساء.



واتە: ئێمە سروشمان بۆ تۆ کردوە، وەك چۆن سروشمان بۆ نووح و پێغەمبەرانی دوای وی کردوە و، وەحییمان بۆ لای ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و ئەسباط و عیسا و ئەییوب و یونوس و هاروون و سولەیمان ناردوە و، زەبوورمان بە داوود داوە.

پێغەمبەرانێك کە پێشتر بەسەرهاتیانمان بەسەرتدا خوێندۆتەوەو، پێغەمبەرانێك کە بەسەرهاتیانمان بەسەرتدا نەخوێندۆتەوە و، خوا بە قسە کردن، فەرمایشتی لەگەڵ مووسادا کردوە. پێغەمبەرانێکی موژدەدەرو ترسێنەر (دڵخۆشکەرو وریاکەرەوە)ن، تاکو دوای هاتنی پێغەمبەران، خەڵك بەڵگەی لەسەر خوا نەبێ و، خوا زاڵی کاربەجێیە.

تاکو خەڵك لە دوای پێغەمبەران (علیه السلام) بەڵگەی نەبێ لەسەر خوا، بیانووی نەبێ بڵێ: خوایە! نەمزانی چۆن بتپەرستم، نەمزانی تۆ چیت پێ چاکەو چیت پێ خراپە! لە دوای پێغەمبەران (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت) و پەیامێك کە خوا بە پێغەمبەرانیدا دەینێرێ، خەڵك بیانووی نامێنێ، کە نەزانێ چۆن خوا بپەرستێ، بەڵام بە مەرجێك ئەو پەیامەی کە خوا بە پێغەمبەراندا ناردوویەتی، دەستکاریی نەکرابێ و نە شێوێنرابێ و نە گۆڕابێ، ئنجا تاکە پەیامێك کە خوا ناردوویەتی بە پێغەمبەراندا (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت)، کە پارێزراو بێ و نە شێوێنراو بێ و دەستکاریی نەکرا بێ، تەنیا پەیامی پێغەمبەری کۆتاییە کە قورئانە، کە ئەویش پەیامی هەموو پێغەمبەرانی پێش خۆی بە ڕاست دەزانێ، وەك خوای زانا و شارەزا لە وەسفی مسوڵمانانی شوێنکەوتووی قورئاندا فەرموویەتی:

﴿ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ ﴿٢٨٥﴾ ﴾ البقرة.

واتە: جیاوازیی ناخەینە نێوان هیچ کام لە پێغەمبەرانەوە.

هەروەها لە وەسفی قورئاندا فەرموویەتی:

﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٤٨﴾﴾ المائدة.

واتە: کتێبەکانی پێش خۆی هەموویان بە ڕاست دەزانێ، هەروەك پێغەمبەرانی پێش خۆی هەموویان بەڕاست دەزانێ و، ڕێز لە هەمووشیان دەگرێ، بۆیەش قورئان جەوهەر و کاکڵی سەرجەم کتێبەکانی خوای، لە نێو خۆیدا کۆکردۆتەوە و، ئەزموونی بەشەریشی بۆ گێڕاوینەوە و، ئەزموونی هەموو پێغەمبەرانی بۆ کۆکردووینەوە.

٢- هەروەها خوا لە وەسفی پێغەمبەرانی خۆیدا دەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ﴿٥٩﴾﴾ النمل.

واتە: بڵێ: ستایش بۆ خواو سەلام لەو بەندانەی کە (خوا) هەڵیبژاردوون.

خوا عزوجل پێغەمبەرانی خۆی، بە بەندە هەڵبژاردەکانی وەسف دەکات.

٣- دیسان لە سوورەتی (الحج)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ يَصْطَفِى مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ ﴿٧٥﴾﴾.

واتە: خوا لە فریشتەکان و لە خەڵکیش نوێنەرانێك هەڵدەبژێرێ، گوڵبژێریان دەکات.

کەواتە: پێغەمبەران (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ) وەك قورئان باسیان دەکات، هەڵبژێردراون، گوڵبژێرکراون و هەڵبژاردەی مرۆڤایەتیین.

ئنجا ئەوە لە کوێ و، ئەوە لە کوێ کە لە (پەیمانی کۆن) و (پەیمانی نوێ) و لە کتێبەکانی دیکەشدا باسیان کراوە و، چەندان هەڵە و پەڵە بگرە گوناە و تاوانی گەورە و قێزەونیان پاڵدراونەلا، کە پێشتر لە کاتی هەڵسەنگاندنی ئەو کتێبە بە وەحیی و فەرمایشتی خوا حیساب کراوانەدا، هەندێکیانمان خستنە ڕوو؟!

بەڵێ کەسێك بیەوێ بە دڵنیایی فەرمایشتی خوا ببیستێ و بزانێ، جگە لە قورئان، شتێکی دیکەی چنگ ناکەوێ، لێی دڵنیابێ کە ئەوە فەرمایشتی







خوایە، چونکە کتێبەکانی دیکە هیچ کامیان سەلامەت نەماون، ئەگەر گریمان پەیام و وەحیی خواش بوو بن.

١٧-) هەڵبەتە ئێمە ناشڵێین: ئەو چوار کتێبانەی دیکە، هیچ شتێکی بە کەڵکیان تێدانیە، بەڵکو لە (پەیمانی کۆن)دا زۆر قسەی بە سوودو پەندو ئامۆژگاریی و بەسەرهاتی گرنگ هەن و، من لە تەفسیرە کوردییەکەی خۆمدا، جار جار دەگەڕێمەوە بۆ (پەیمانی کۆن)، هەروەها (پەیمانی نوێ)یش، وەك بەرچاوڕوونیی زیاتر، بەڵام ئەوەی کە لەگەڵ قورئاندا دژ ناوەستێ، چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: {حَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلا حَرَجَ}، (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٤٨٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٢٧٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٨٤١)، وَالتِّرمذِيُّ برقم: (٢٦٦٩)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٢٥٦) عَنْ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرٍو(رضي الله عنه)).

واتە: قسان لە بەنی ئیسرائیل بگێڕنەوەو سەغڵەتییتان لەسەر نیە.

واتە: ئەو شتانە بگێڕنەوە کە لەگەڵ قورئان و سوننەتدا دەگونجێن، بەڵام شتێك کە پێچەوانەی قورئان و سوننەتە، مەگەر وەك دەرس و پەند وەرگرتن، یان وەك دەرخستنی کەم و کوڕییەکان، ئەگەرنا ناگونجێ بەبەڵگە بهێنرێتەوە.

هەروەها لە کتێبەکانی دیکەشدا: چ (ئاڤێستا) چ دوو کتێبەکەی صابیئەکان: أ- (كَنْزَا رَبَّا)، ب- (دراشە أَديها)، بە تەئکید شتی باش و بە سوود هەیە، بەڵام هی ئەوە نین پشتیان پێ ببەسترێ، بە تایبەت لە کاتێکدا کە باسی خوا دەکەن و، باسی پێغەمبەران دەکەن، غەڵەت و پەڵەتی زۆر چۆتە نێو ئەو کتێبانەوەو، دەستکاریی کران و شێوێنرانی زۆر یان ئاوێتە بووە، کە وامان لێ دەکەن متمانەیان پێ نەکەین و، کەسێك بیەوێ بە دڵنیایی و بە متمانەی تەواوەوە، دەستی لە فەرمایشتی خوا گیر بێ، تەنیا قورئانی لە بەردەست دایە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی هیدایەتمان بدات کە زیاتر لەگەڵ قورئاندا ئاشنا بین، پێیدا قووڵ بینەوەو، زیاتر تێیدا شارەزا بین، بۆ ئەوەی خواناسییەکی ڕاستترو چاکتر و، خواپەرستییەکی باشتر و، دینداریییەکی ڕەسەنترو هاوسەنگترمان، بۆ دەستەبەر ببێت.




## هۆکاری پێنجەم: پشت نەبەستن بە وەحیی ڕاست و دروست و دەستکاریی نەکراوی خوا: لە بواری تێڕوانین و توێژینەوەدا، لە بارەی خوای بەرزو مەزنەوە:

بەڕێـــــزان!

ئەمیش هۆکارێکی دیکەی کاریگەری بەرەو ئیلحادچوونی زۆرێك لە خوانەناسەکانە، چونکە پێشتر باسمان کرد کە تاکە وەحیی ڕاست و ساغ و دەستکاریی نەکراوو نەشێوێنراو، کە لەبەر دەستی مرۆڤدا هەبێ، تاکە نوسخەی ساغی وەحیی، بریتیە لە وەحیی بەرجەستە لە قورئانی بەرزو بە پێز، هەروەها ڕێ و شوێن و ڕێبازی پێغەمبەری بەڕێزدا (صلی الله علیه وسلم)، ئنجا وەك زۆرجاری دیکەش گوتوومانە و، لێرەش دووبارەی دەکەینەوە: ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) (سُّنَّة النَّبي) بریتیە لە پڕاکتیزە کردنی قورئان و بەرجەستە کردنی لەسەر ئەرزی واقیع، لەلایەن پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) لە هەموو بوارەکانی ژیاندا: تاکیی، خێزانیی، کۆمەڵایەتیی، سیاسیی، بە هەموو ڕەهەندەکانی ژیانەوە:

١- ڕووحیی و مەعنەویی.

٢- بوونناسیی و ئیمان و عەقیدە.

٣- پەرستشەکان.

٤- هەڵسوکەوتە کەسیی و کۆمەڵایەتییەکان.

٥- ئابووریی ژیان و گوزەران.

٦- حوکم و سیاسەت.

٧- جەنگ و ئاشتیی .. هتد.







بەڵێ سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تەنیا بەرجەستە کردنی قورئانە.

بەڵام بێگومان ئەوە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەڵساوە بە بەرجەستە کردنی قورئان، لە ژیانی گشتگیرو هەمەلایەنەی خۆی و هاوەڵانی بەرێزیدا، خوازیاری ئەوە بووە کە خوا (سبحانه وتعالى) جاروبار بە وەحیی تایبەتیی، بەرچاوی ڕۆشن بکاتەوە، بۆ چۆنیەتی جێبەجێ کردنی قورئان، کە وەك زۆرجار باسکراوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جبریل بۆ لای هاتوە و پێشنوێژی بۆ کردوە بۆ دیارییکردنی کاتی پێنج نوێژە فەرزەکان، هەم کاتی دروست بوون و ڕەوا بوونیان، هەم کاتی پەسند و هەڵبژاردەیان، هەروەها هەر شتێکی دیکە بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ڕۆشن نەبووبێ چۆن جێبەجێی بکات؟ جبریل دابەزیوە و بۆی ڕوون کردۆتەوە و پێشانی داوە، یان خوای پەروەردگار بە شێوەیەك لە شێوەکانی وەحیی خستوویەتە دڵیەوە و، بەرچاوی ڕۆشن کردۆتەوە.

بەڵێ هۆکارێکی دیکەی سەرلێشێوان و لە ڕێی ڕاست دووركەوتنەوە و، کەوتنە گێژاوی ئیلحاد، بۆ هەندێك کەس، بریتیە لە نەگەڕانەوەیان بۆ ئەو تاکە سەرچاوە ڕوون و بێ چەند و چوونەی وەحیی و پشت پێ نەبەستنی، بۆ خواناسییەکی ڕاست و دروست، پاشان دینداریيەکی ڕاست و ساغ و هاوسەنگ و تێرو تەواو، کە لە ئیسلامەتییدا خۆی دەبینێتەوە.

بێگومان ئەرکی هەر مرۆڤێکیشە کە بە دوای وەحیی خوا دا بگەڕێ، بە دوای دوا پەیامی خوا و دوا نوسخەی هیدایەتی شیفا بەخشی خوادا بگەڕێ، بۆ ڕێ دۆزینەوەی، بەڵام بە پلەی یەکەم ئەوە ئەرکی مسوڵمانانە، کە بە هەموو توانای خۆیان هەوڵبدەن: ئەو سەرچاوە ڕوون و زوڵاڵەی وەحیی خوا، ئەو دوا نوسخەیەی هیدایەتی شیفا بەخشی خوا، بە هەموو مرۆڤەکان بگەیەنن و پێیان بناسێنن و، ئاشنایان بکەن پێی، چونکە خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ:

﴿قُلۡ أَيُّ شَيۡءٍ أَكۡبَرُ شَهَٰدَةٗۖ قُلِ ٱللَّهُۖ شَهِيدُۢ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۚ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَۚ ﴿١٩﴾﴾.

(خوا پێغەمبەری خاتەمی خۆی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) دەدوێنیٚ و دەفەرمویٚ): لێیان بپرسە: چ کەسێك شایەدیی دانەکەی گەورەترە؟ بڵێ: خوا، لە نێوان من و ئێوەدا شایەدە، ئەم قورئانەشم بۆ سروش کراوە، تاکو پێتان ڕابگەیەنم و پێ بترسێنم و هۆشیار بکەمەوە، ﴿وَمَنۢ بَلَغَ﴾، هەروەها هەر کەسێکی دیکەش کە پێی دەگا.

کەواتە: ئەم قورئانە وەك چۆن پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) ئەرکدار (مُكَلَّفْ) کراوە کە بە خەڵکی ڕۆژگاری خۆی بگەیەنیٚ، بە پێی توانای خۆی، بە هەمان شێوە ئۆممەتەکەشی لە دوای خۆی ئەرکدار کراون، کە بیگەیەنن بە هەموو مرۆڤایەتیی، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەکدا دەفەرمویٚ: {بَلِّغُو عَنّي وَلَوْ آيَةً}، (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٤٨٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٢٧٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٦٩)، وَابْنُ حِبَّان برقم: (٦٢٥٦)).

واتە: ئەگەر ئایەتێکیش بووە، لە منەوە بیگەیەنن (بە خەڵکی دیکە).

هەر بۆیەش لەسەر مسوڵمانانی شوێنکەوتووی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) فەرزە کە بە پێی توانایان هەوڵبدەن قورئان بە مرۆڤایەتیی بگەیەنن و، مرۆڤایەتیی بە قورئان ئاشنا بکەن، دیارە ئەویش لە ڕێی تەرجەمە کردنی قورئان بە هەموو زمانەکان و، ڕوونکردنەوەی ماناو مەبەستەکانی، نەك هەر تەرجەمە کردنی دەقاو دەق، هەڵبەتە لەو بارەشەوە کاری باش کراوە و، قورئان بۆ زۆربەی هەرە زۆری زمانەکانی دنیا، یان زمانە زیندووەکان وەرگێڕدراوە، لە نێویشیاندا زمانی کوردیی، چەند وەرگێڕانێك، بەڵکو چەند لێکدانەوەو ڕوون کردنەوەیەك بە زمانی کوردیی بۆ قورئانی کراون، بەڵام جاریٚ زۆری ماوە ئەو ئەرکەی مسوڵمانان بچێتە ئاستی پێویستەوە، ئێستاش خەڵکێکی زۆر لە دنیادا ماوە، لە قورئان و ئیسلام بیٚ ئاگایە، هەر کەسێك بە وڵاتاندا بگەڕیٚ، میللەتان و گەلان ببینیٚ، - من زۆرێك لە وڵاتانی ڕۆژئاوام

بینیوە، هەروەها وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیام بینیوە وەك: پاكستان و ئەفغانستان و مالیزیاو كەمبۆدیا - هەر كەسێك دنیا زیاتر ببینێ، زیاتر دەزانێت كە ئێستاش خەڵكێكی زۆر بەم قورئانە نامۆن، پێی ئاشنا نین و بە كۆی ئیسلامەتیی ئاشنا نین، بەڵكو جاری وا هەیە سەرەوبن و بە هەڵاوگێڕاوەیی لە ئیسلام حاڵی بوون و، بە پێچەوانەوە لە ئیسلام تێگەیشتوون.

نەخشەی ئێستای مرۆڤایەتیی لە ڕووی خواناسییەوە بە شێوەیەكی نیزیك خستنەوە (تقریبي)ی دەتوانین بڵێین: بەم شێوەیە:(١)

١- (١/٤)ی خەڵكی دنیا مسوڵمانان پێكی دەهێنن، كە لە نێوان (ملیارو نیوێك تاكو دوو ملیار) دەبن.

٢- (١/٤)ی خەڵكی دنیا نەصرانییەكان پێكی دەهێنن، ئەوانیش دیسان لە (ملیارو نیوێك تاكو دوو ملیار) دەبن.

٣- (١/٤)یشی (بووذایی)ی و بتپەرستەكان پێكی دەهێنن، ئەوانیش بە هەمان شێوە لە (ملیارو نیوێك و تاكو دوو ملیار) شتێك زیاتر، یان كەمتر دەبن.

٤- (١/٤)ی مرۆڤایەتییش هیندۆسیی و گاپەرست و مولحیدو ئەوانە پێكی دێنن، دیسان ئەوانەش لە (ملیارو نیوێك و تاكو دووملیار) دەبن.

بۆیەش ناتوانین بە شێوەیەكی یەكلاییكەرەوەی دایبنێین، چونكە مرۆڤایەتیی ئێستا بەرەو هەشت (٨)ملیار دەچێ، ئنجا بە بۆ چوونی بەندە و بە سەرنج دانی سەرچاوەكانیش، وام دێتە بەرچاو: كە مرۆڤایەتیی بۆ ئەو چوار بەشە و، ئەو چوار ڕێژەیە دابەش دەكرێ، كەواتە: لە هەر چوار مرۆڤێك، مرۆڤێكیان كەم و زۆر ئیسلامی پێگەیشتوە، ئەوانی دیكەش ناڵێین: هیچیان ئیسلامیان پێ نەگەیشتوە،

---

(١) بەڵام گۆڤاری (ئایدیا دیبلۆماتیك) ژمارە ٣٨ و ٣٩ كانوونی یەكەم / ٢٠١٨ز، ڕێژەكانی بەم جۆرە داناون: جوولەكە: ١٣,٨ ملیۆن، مەسیحی: ٢,١٧ ملیار، مسوڵمان: ١,٥٩ ملیار، مولحید: ١,١٢ ملیار، هیندۆسیی: ١ ملیار، بووذایی: ٤٨٧,٥ ملیۆن، باوەڕە ئایینیەكان: ٤٠٥,١ ملیۆن.





بەڵام گرنگ ئەوەیە نەهاتوونە نێو بازنەی ئیسلامەوە، واتە: (٣/٤)ی مرۆڤایەتیی نامسوڵمانە و، ئەرکی (١/٤)کەی دیکەیە کە مسوڵمانانن، کە ئەو (٣/٤)ش بەرچاو ڕۆشن بکەنەوە و، لە هیدایەتی خوا بەهرەمەندیان بکەن و، بەڵگەیان لەسەر تەواو بکەن، ئنجا ئەو کاتە وەك خوا دەفەرمویٚ:

﴿لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٍ ﴿٤٢﴾﴾ الأنفال.

واتە: تاکو ئەوەی کە دەفەوتیٚ لەبەر ڕۆشناییدا بفەوتیٚ و، ئەوەش کە زیندوو دەبێتەوە، بە هیدایەتی خوا، لەبەر ڕۆشنایی دابیٚ.

بۆیە بەڕاستیی ئەرکی مسوڵمانان لەم ڕۆژگارەدا زۆر قورسە، بۆ گەیاندنی پەیام و ڕاست و ساغی خوا بە خەڵك، چونکە بێگومان زۆرن ئەوانەی کە لەبەر گۆڕین و لادان و، ئەفسانە و ناڕاستیی هەندێك لە کتێبە ئاسمانییەکان، بەرەو ئیلحادو بێ دینیی چوو ون، پێشتر لەو بارەوە چەند جارێك ئاماژەمان بە هەندێك لە قسەکانی (ڕیتشارد داوکینز) کرد، کە چۆن: لە داخ و ڕقی ئەو پێناسەیەدا کە پەیمانی کۆن بۆ خوای دەکات، ئایینی بە گشتی لەبەر چاو بێزراوە، هەڵبەتە هی وەك ویش زۆرن.

بۆیە دەتوانین بەڕاشکاویی بڵێین: ئەمیش واتە: {ئاشنا نەبوون بە وەحیی ڕاست و دروست و نە شێوێنراوو بە تەواویی پارێزراوی خوا، کە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)} هۆکارێکی گرنگی بەرەو ئیلحاد چوونی خەڵکێکە.

## هۆكاری شەشەم: واقیعی پێشكەوتووانەی ئەهلی كوفر و، واقیعی دوا كەوتووانەی ئەهلی ئیسلام:

گوتراوە: (الإِنْصَافُ خَيْرُ الأَوْصَاف)، ئینسان دەبێ بە ویژدان بێ و دادگەرانە دادوەریی بكات، نكوولّیی ناكرێ كە ئێستا: ئەهلی كوفر بە گشتی، واقیعی ژیانی دنیایان، لە ڕووی تەكنۆلۆژیاو پیشەسازییەوە، لە ڕووی ژیانی ئیداریی و سیاسییەوە، لە ڕووی ئابووریی و گوزەرانەوە، پێشكەوتوترن لە زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانان، كە ئەمیش هۆكارێكی دیكەی كاریگەری زەمینە خۆشكردنە بۆ ئیلحادو بێ دینیی، بە تایبەت لە وڵاتانی مسوڵماننیشندا، كە مسوڵمانان سەرسام و موعجەب دەبن بە ئەهلی كوفر، كاتێك تەماشا دەكەن: بۆ هەموو شتێك پێویستییان بەوانە، زۆرجار بۆ ئەو خواردنەی كە دەیخۆن و، بۆ ئەو پۆشاكەی كە دەیپۆشن و، بۆ ئەو كەل و پەلانەی كە بەكاریان دێنن، چ كەل و پەلی ورد، چ كەل و پەلی درشت، بۆ هەموو شتێك پێویستییان بە ئەهلی كوفر هەیە، ئیدی لەوەوە هەندێك لە مسوڵمانان جۆرێك لە پێ سەرسام بوون (إعجاب) دەیانگرێ، ئەوەی كە شارەزای ئایینەكەی خۆی نەبێ و واقیعی پێشكەوتووانەی ئەهلی كوفر ببینێ و، واقیعی دواكەوتووانەی خۆی ببینێ، ڕەنگە لە ئیسلامەكەی خۆی بكەوێتە دوو دڵیی و گومانەوە و، سەرەنجام ئەوەش سەری پێ بكێشێ بەرەو زەلكاوی ئیلحاد!! چونكە كەسانێكی سادەو سەركێڵ، وا دەزانن هۆكاری پێشكەوتنی ماددیی ڕۆژئاواییەكان - بە وڵاتانی ئەورووپاو ئەمریكاشەوە، هەروەها ئەهلی كوفر بە گشتی بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە - پێیان وایە هۆكاری پێشكەوتنی ماددیی ئەوان، ڕوو كردنیانە لە بێ دینیی و ئیلحاد! بەڵام گومانی تێدانیە كە ئەوە بۆ چوونێكی پووچ و هەڵەیە و، ئێمە لەو بارەوە ئەم پێنج ڕاستییە، وەك بەڵگەی پووچەڵكردنەوەی ئەو گومان و بیرو بۆچوونە هەڵەیە، دەخەینەڕوو:





## ڕاستیی یەکەم: پێشکەوتن و دواکەوتنی کۆمەڵگایەکان لە ڕووی ماددییەوە، بەرهەمی چۆنیەتی مامەڵەکردنیانە لەگەڵ یاسا گەردوونییەکانی خوا (سُنَنِ الله الكَوْنِيَّة)دا:

بەڵێ مسوڵمانان لەبەر ئەوەی: سەرنج دانیان لە یاسا گەردوونییەکان هاتۆتە دوا و، پشکنین و گەڕانیان بە دوای یاساکانی خوادا، لە سروشتدا، لە دەورو بەریاندا، لە گەردووندا، هاتۆتە پاش لە ئەنجامی ئەوەدا دواکەوتوون، ئەوانی دیکەش کە پێشکەوتوون، لەبەر ئەوە نیە کە گوایە: ئاینێکەیان ڕاستە! بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە هەوڵیان داوە: یاساکانی خوا لە ژیانی خۆیان و، لە دەوروبەریان و، لە گەردووندا بدۆزنەوە، سەرەنجام: پەیبردن و شارەزا بوون و ئاشنان بوونیان بە یاساکانی خوا، لە گەردووندا، بۆتە هۆی بەرەو پێش چوونی ژیانی ماددییان، هەروەك عەقڵیی خۆ خەواندن و بەکارنەهێنانی هەستەوەرەکان لە لایەنی مسوڵمانانەوە، بۆتە هۆکاری ئەوەی: پەی بە زانستە سروشتییەکان نەبەن، پەی بە یاسا گەردوونییەکانی خوا نەبەن، لە خودی خۆیاندا و، لە ژینگەو دەوروبەریاندا و، لە گەردووندا، لە ڕاستییدا ئەوەیە بۆتە هۆکاری دواکەوتنی مسوڵمانان، ئنجا - وەك پێشتریش باسمان کرد - ئەوەش کە مسوڵمانان وایان کردوە، ڕێك پێچەوانەی ئەوەیە کە خوا فەرمانی پێکردوون چونکە خوا (سبحانه وتعالى) لە چەندان ئایەتدا فەرمان بە مسوڵمانان دەکات، بگرە بەگشتی فەرمان بە مرۆڤەکان دەکات، کە سەرنج بدەن:

١- ﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ﴿٢٠﴾ ﴾ العنكبوت.

واتە: بڵێ: بە زەوی دا بڕۆن و سەرنج بدەن! خوا دروستکراوەکانی چۆن دروست کردوە؟!

٢- هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ﴿١٨﴾ وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ﴿١٩﴾ وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴿٢٠﴾ ﴾ الغاشية.

واتە: ئایا سەرنجی حوشتر نادەن چۆن دروستکراوە و، سەرنجی ئاسمان نادەن چۆن بەرز کراوەتەوە و، سەرنجی چیایەکان نادەن، چۆن داکوتراون و، سەرنجی زەوی نادەن، چۆن پان ڕاخراوە؟!

٣- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ ﴾ عبس.

واتە: هەروەها با مرۆڤ سەرنجی خواردنەکەی خۆی بدات!

٤- دیسان دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ ﴾ الطارق.

واتە: با مرۆڤ سەرنج بدات لە چی دروستکراوە و چۆن دروست کراوە!

٥- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَفِي ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِيٓ أَنفُسِكُمْۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الذاريات.

واتە: لە زەویدا نیشانە زۆرن بۆ کەسانێك کە زانیارییەکی جێ دڵنیاییان هەبێ، هەروەها لە خودی خۆشتاندا، ئایا نابینین، سەرنج نادەن!

٦- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيْءٍ ﴿١٨٥﴾ ﴾ الأعراف.

ئایا سەرنجی موڵکی فراوانی ئاسمانەکان و زەوییان نەداوە، هەروەها هەر شتێك کە خوا دروستی کردوە!

یانی: بۆچی سەرنجیان نادەن، بۆچی لێیان ورد نابنەوە؟! ئەو هەموو فەرمانانەی خوا هەن، کە دەبوایە مسوڵمانان فەرمانەکانی خوا جێبەجێ بکەن، کاتی خۆی مسوڵمانان لە قورئان و سوننەت، لە فەرمایشتی خوا و ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) حاڵی بوون و، جێ بەجێیان کردوون، بەڵام دوایی کە ئەو فەرمانانەی خوایان جێبەجێ نەکردوون و بە دروستکراوانی خوا نامۆن بوون و پێیان ئاشنا نەبوون، لە یاساکانی خوا لە گەردووندا شارەزا نەبوون، ژیانی دونیاییان بەرەو دواوە هاتوە، لە هەموو ڕووەکانەوە.

راستیی دووەم: گرنگیی دانی وڵاتانی کافرستان بە گشتی، بە لێکۆڵینەوە زانستییەکان و خەرجکردن و تەرخانکردنی سەروەت و سامانێکی زۆر بۆ ئەو مەبەستە:

با تەماشای هەندێك سەرژمێر بکەین:

١- لە هەموو جیهانی ئیسلامییدا، بە وڵاتانی عەرەبیی و غەیرە عەرەبییەوە: پێنجسەد (٥٠٠) زانکۆ هەیە[1]، بەڵام تەنیا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا: (٥٧٥٨) زانکۆ هەیە، ئنجا: (٥٠٠) لە کوێ و: (٥٧٥٨) لە کوێ؟! یانی: بەس لە ئەمریکا یازدە (١١) هێندەی هەموو جیهانی ئیسلامیی زانکۆ و خوێندنگای باڵا هەن!

٢- دەوڵەتی جوولەکە (قەوارەی زایۆنیی) ڕێژەی: (١٣٪)ی سەروەتی خۆی (دەخلی قەومیی) تەرخان کردوە بۆ لێکۆڵینەوە زانستییەکان و، بەرەو پێش بردنی لێکۆڵینەوە زانستییەکان، لە حاڵێکدا کە وڵاتێکی وەك میسر، ڕێژەی: (١/١٠٠٠٠)ی (دەخلی قەومیی) سەروەت و سامانێ کە لە وڵاتدا هەیە (بودجەکەی) تەرخان کردوە، بۆ لێکۆڵینەوەی زانستیی، ئنجا لەسەدا سێزدە (١٣٪) لە کوێ و، یەك لەسەر دە هەزار (١/١٠٠٠٠) لە کوێ؟! هەڵبەتە ئەگەر کەم سەرف بکەی، کەمت بەرهەم دەبێ:

﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾ النجم.

واتە: مرۆڤ هیچی نایەتە دەست، مەگەر کۆشش بکات و هەوڵ بدات.

٣- بودجەی لێکۆڵینەوەی زانستیی لە زانکۆی (هار فارد) زیاترە لە بودجەی لێکۆڵینەوەی زانستیی لە هەموو وڵاتانی عەرەبییدا، لە نێویشیاندا دەوڵەتانی کەنداو.

---

(١) بە پێی ئەو سەرچاوەیەی کە من لێم وەرگرتوە، کە کتێبێکی: (د. هيثم طلعت)ە، بەناوی: (الإِلحَاد يسَمِّمُ كُل شيء)، ص٢٣١- ٢٣٢.

سەرەنجام تەماشا دەکەین: لە ماوەی سەد و پێنج (١٠٥) ساڵی ڕابردوودا، سەد و هەشتا (١٨٠) جوولەکە خەڵاتی نۆبڵیان وەرگرتوە، لەسەر لێکۆڵینەوە زانستییەکان، بەڵام لەو ماوەیەدا، تەنیا سێ (٣) مسوڵمان خەڵاتی نۆبڵیان وەرگرتوە! (١٨٠) جوولەکە لە بەرانبەر (٣) مسوڵماندا!!

بۆچی؟! چونکە ئەوان زیاتریان سەرف کردوە و، زیاتریان خۆماندوو کردوە، بە داخەوە دەوڵەتە میراتیی و بنەماڵەیی و دیکتاتۆریی و عەسکەرتارییەکانی کە لە جیهانی ئیسلامییدا حوکم دەکەن، هەر خەریکی ئەوەن، چۆن کورسییە ناشەرعییەکەی خۆیان بپارێزن، دەستەڵاتە زەوتکراو و داگیرکراوەکەی خۆیان زیاتر بپارێزن و، بیکەنە میرات بۆ کوڕەکانیان و نەوەکانیان! چاکەو فەزیلەت لە هەر کەسێکدا هەبێ، دەبێ دانی پێدابێنی، جوولەکە لەو ڕووەوە لە پێش مسوڵمانانەوەن، بۆیە بەرهەمیشیان زیاترە.





## ڕاستی سێیەم: دنیا هەروەك ئێستا نەبووە و، كاتی خۆی مسوڵمانان سەر قافڵەی كاروانی پێشكەوتن و داهێنان و زانست و لێكۆڵینەوە بوون:

هەتا مسوڵمانان لە ئایینەكەیاندا بەرچاوڕوون و سەر ڕاست بوون و، لەگەڵ قورئاندا ئاشنا بوون و، فەرمانەكانی خوای پەروەردگاریان جێبەجێ دەكرد، لە هەموو ڕوویێكەوە سەرقافڵەی دنیا بوون، لەو بارەوە بەسەرهاتێكی سەرسوڕهێنەر هەیە، دەیگێڕینەوە، بەر لەوەی ئاماژە بكەین بە هەندێك لە زانایانی مسوڵمان، كە بناغەی دۆزینەوەو داهێنان و زانستیان دانا:

**بەسەرهاتێكی سەرسووڕهێنەر[1]:**

لە ساڵی (٨٠٧ز)دا، هاڕوونە ڕەشید كە حوكمڕانی مسوڵمانان بووە، كاتژمێر (ساعة)ێك بۆ (شاڕلەمان) پادشای فەڕەنسا دەنێرێ، كە بە ئەندازەی لا دیوارێك بووە و، ئەو سەعاتە بە ئاو ئیشی كردوە و، وا بووە كە لەگەڵ هەر سەعاتێكدا، تۆپێكی كانزایی كەوتۆتە خوار، كەوتۆتە سەر بنكەیەكی مسی گەورە، دەنگێكی لەرینەوەی لێهاتوەو، وەك مۆسیقا، بە ئەندازەی ژمارەی سەعاتەكان (واتە: دوازدە (١٢) سەعات لە ڕۆژێكدا)، ئنجا هەر جارێك ئەو تۆپە كانزایە كەوتۆتە خوار، دەرگایەك بۆتەوە، ڕووی لە كاتژمێرەكە كردوە، سوارێك لێی هاتۆتەدەر، جارێك بە دەوری خۆیدا خولاوەتەوە، دوایی گەڕاوەتەوە شوێنی خۆی، دیارە كە هاڕوونە ڕەشید ئەو سەعاتە بۆ (شاڕڵەمان) دەنێرێ، لە جیهانی ئیسلامییدا ئەو سەعاتانەیان هەبوون، بەڵام ئەوان پێیان شتێكی زۆر جێی سوڕمان بووە، بۆیە (شارلمان) زانایانی لێ كۆ دەكاتەوە، بە تایبەت زانایانی ئایینی نەصڕانیی، سەرەنجام: پاش لێكۆڵینەوە و قسە و باس: قەناعەتیان دێتە سەر ئەوە: مادام ئەو كاتژمێرە مسوڵمانان ناردوویانە، حوكمڕانی مسوڵمانان ناردوویەتی، دیارە شەیتانێكی تێدایە دەیجووڵێنێ، ئەگەرنا چۆن لە خۆڕا دەجووڵێ؟! بۆیە زانایەكانی ئایینی دەرفەت دەبینن و ئەو سەعاتە دەشكێنن،

---

(١) الإلحادُ يُسَمّم كل شيء، تأليف: د. هيثم طلعت، ص٢٢٧.

ئەمە ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانیی (زەغرید هۆنکە) کە ئافرەتێکە، لە کتێبی: (خۆری عەرەب[1] لەسەر ڕۆژئاوا هەڵدێ) (شَمْسُ العَرَبِ تَسطَعُ على الغرب)دا هێناویەتی[2].

ئنجا با ئاماژەیەك بکەین بە ناوی هەندێك لە زانایانی مسوڵمان، کە ڕەنگرێژو بناغەدانەری لێکۆڵینەوەی زانستیی بوون:

١- (أَبو رَيحان محمد البيروني) کە لە ساڵی (١٠٤٨ز)دا مردوە، سەلماندوویەتی کە زەوی خڕە، شێوەی زەوییشی لە زیو دروستکردوە، هەروەها سەلماندوویەتی کە زەوی بە دەوری خۆیدا لە بەرانبەر خۆردا دەخولێتەوە.

٢- (إبْنُ النَّفيس) کە سووڕی گچکەی خوێنی دۆزیوەتەوە، ناوی لە نێو (طبقات الشافعية)دایە و، شافیعیی مەزهەب بووە.

٣- (إبْنُ مَاجَه) فەرمووودەناسی ناودار، ئەمیش ئەوەی دۆزیوەتەوە کە سووڕگەی خڕۆکەکان هێلکەییە، نەك خڕی تەواو.

٤- (الفَارَابي) کە لە ساڵی (٩٠٥ز)دا، کۆچی دوایی کردوە، کە هەموومان دەزانین فەیلەسووف بووە و، لێکۆڵەرەوەیەکی گەورە بووە، کتێبی: (المدينة الفاضلة)، (شاری چاکەکاریی) داناوە و، گوتوویەتی: دەبێ دەوڵەت ئاوا بەڕێوەبچێ.

٥- (جابر بن حيان الكوفي) کە لە ساڵی (٨١٥ز)دا کۆچی دوایی کردوە، ئەمیش کارلێکە گەردیلەکانی کیمیایی دۆزیەوەتەوە، هەروەها ئامێری دڵۆپاندن (التقطير)ی دروستکردوە.

٦- (الحسن بن الهيثم) کە لە ساڵی (١٠٤٠ز)دا مردوە، لە بواری تیشك و بینینی چاودا، پسپۆڕ بووە و کە پێشێ وایانزانیوە: مرۆڤ کە شت دەبینێ، لە چاوەوە تیشك دەنێردرێ، ئەو گوتوویەتی: نەخێر بەڵکو لە شتەکانەوە تیشك وێنە دەنێرێتە نێو چاو، کە ئەوەش شتێکی زانستیی و ڕاستە.

------------------------------

(١) ئەوان لە جیاتی (مسوڵمانان) وشەی (عەرەب)یان بەکارهێناوە لەبەر ئەوەی حوکمڕانەکانی بە پلەی یەك زیاتر عەرەب بوون و، هەستیارییشیان بە وشەی ئیسلام هەبووە!

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ص٢٢٧.

٧- (الخُوَارزِمي) كە لە ساڵی (٨٥٠ز)دا مردوە، زانیاریی جەبرو خەواریزماتی داناوە.

٨- (إبن زكريا الرّازي) كە لە ساڵی (٩٢٣ز)دا مردوە، یەكەمین كەس بووە كە دەزووی عەمەلیاتی لە ڕیخۆڵەی ژیانداران دروست كردوە و، دووسەد (٢٠٠) ئامێری عەمەلیات كردنی دروستكردوە.

٩- (إبْنُ سِينا) كە كتێبی (القانون في الطب)ی داناوە و زۆر ناودارە.

١٠- (إبْنُ رُشد الحَفيد) كە كتێبەكانی تەرجەمەی زمانە بیانییەكان كراون و، ڕوونكەرەوەی فەلسەفەی ئەڕەستۆ و كتێبەكانی بووە و، بۆ خۆیشی زۆری خستۆتە سەر.

١١- (إبْنُ خَلْدُون) كە بە دامەزرێنەری زانستی كۆمەڵناسیی و، فەلسەفەی مێژوو دادەنرێ.

ئنجا با شتێكی دیكە باس بكەم، كە زانایانی مسوڵمانان چۆن زۆر پێش ڕۆژگاری خۆیان كەوتوونەوە؟

أ- (جعفر الصادق) كە لە (١٤٨)ك دا، كۆچی دوایی كردوە و، زانایەكی ناوداری مسوڵمانان بووە.

ب- هەروەها (أبو حامد الغزالي) كە لە ساڵی (٥٠٥)ك دا، كۆچی دوایی كردوە.

ج- هەروەها (إبن تيمية) كە لە ساڵی (٧٢٨)ك دا، كۆچی دوایی كردوە، ئەم سێ زانایە، یەكەمیان لە كتێبێكدا كە بە ناوی: (تَوْحِيدُ المفَضل)[1] و، دووەمیان: (أبو حامد الغزالي) لە كتێبی: (تَهَافُت الفَلاَسِفَة)[2]دا و، سێیەمیان: (إبْنُ تَيمِية) لە كتێبی: (مِنْهَاجُ السُّنَّة)دا، هەر سێكیان دەڵێن:

---

(١) بڕوانە: (حوار ساخن عن الإلحاد) هادي المدرسي، ص٦٤٢.

(٢) ص١١٢.

خۆر لە زەوی گەورەترە، گوتوویانە: بە بەڵگە هەندەسییەکان چەسپاوە کە خۆر سەد و حەفتا (١٧٠) هێندەی زەوی دەبێ، هەڵبەتە خۆر (١،٣٠٠،٠٠٠) هێندەی زەوییە، بەڵام ئەوە گرنگە کە (جعفر الصَّادق) لە ساڵی (١٤٨) کۆچیی دا، واتە: لە نیوەی یەکەمی سەدەی دووەمی کۆچییدا، وەفاتی کردوە، ئەو ڕاستییەی زانیبێ، هەروەها (أبو حامد الغزالي) کە لە سەرەتای سەدەی شەشەمی کۆچییدا وەفاتی کردوە و، (إبن تيمية)ش کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەشتەمی کۆچییدا، وەفاتی کردوە، زۆر پێش کیپلەر و گالیلۆ و کۆپەرنیك، کەوتوونەوە!!

## ڕاستیی چوارەم: پێشکەوتنەکەی ڕۆژئاوا، پێشکەوتنێکی لاسەنگە و لاتەڵە:

وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ يَعْلَمُونَ ظَـٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْـَٔاخِرَةِ هُمْ غَـٰفِلُونَ ۝٧ ﴾ الروم.

واتە: (بێبڕوایان) ڕواڵەتێك لە ژیانی دنیادا دەزانن، بەڵام لە ڕۆژی دوایی بێئاگان.

بەڵێ لە ڕاستییدا پێشکەوتنەکەی ڕۆژئاوا، لاتەڵ و لاسەنگە و، تەنیا پێشکەوتنێکی ڕواڵەتیی و ماددیی و جەستەییەو، پێشکەوتنێکی هاوسەنگ نیە، کە هەموو ڕەهەندو بوارەکانی ژیان و، هەموو پێکهاتەکانی مرۆڤ بە ڕووح و جەستەوە، بە عەقڵ و عاتیفەوە، ببینێ.

ڕاستیی پێنجەم و کۆتایی: وڵاتانی: چین و هیند و یابان: مانگا و مشك و مار و دارو بەرد و پەیکەر دەپەرستن، کەچی زۆر پێشکەوتووشن، ئنجا ئەگەر بە عەقیدەو دینەکەیان هەڵیانسەنگێنی، دەبووایە دواکەوتووترین مرۆڤ بن لەسەر زەوی، چونکە شتی زۆر سادەو بێ مانا دەپەرستن:

لە کۆتایی ساڵی (٢٠١٠ز)دا، چووم بۆ کەمبۆدیاو بۆ مالیزیا، پەرستگایان هەیە بۆ ماری کوبرا، پەیکەری هەیە، پەرستگایان هەیە بۆ جورج و مشك، دایانناوە، مانگا دەپەرستن، زۆرجار هیندۆسەکان مسوڵمانانیان گرتوە لەسەر ئەوەی مانگا سەر دەبڕن، مانگا بە ڕێیەدا دێ، لەسەر جادە ڕیخ دەکات و ترافیك دروست دەکات، سەیارە دەبێت ڕابوەستێ، تاکو مانگایەکە کە سەری لە تەنەکەی زبڵ ناوەو توێکڵە شووتیی دەخوات، بۆ خۆی سەر دەردێنێ، کەس بۆی نیە دەری بکات! ئەو شتانە دەپەرستن، کە چی لە ڕووی پیشەسازیی و تەکنۆلۆژیاوە پێشکەوتووشن!

کەواتە: پێشکەوتن و دوا کەوتنی مرۆڤەکان، لە بواری ژیانی ماددیی دا، مسوڵمانان بن، یان نامسوڵمانان، پەیوەندیی بە ڕاستیی و چەوتی ئایینەکەیانەوە، نیە، بەڵکو پەیوەندیی بەوەوە هەیە: ئایا عەقڵی خۆیان بەکارهێناوە، لە دۆزینەوەی یاسا گەردوونییەکان و نهێنییەکانی سروشتدا - کە خوا (سبحانە وتعالی) لە چەندان ئایەتدا، فەرمانی بە مرۆڤەکان کردوە: سەرنجی دروستکراوەکانی خوا بدەن و، نهێنییەکانی خوا بدۆزنەوە - یان نا؟!

## هۆکاری حەوتەم و کۆتایی: ڕەواج پێدانی ئیلحاد لەلایەن زلهێزە باڵادەست و دەسترۆیشتووەکانەوە:

ئەمیش هۆکارێکی دیکەی تەشەنەکردنی ئیلحادە لە جیهانی ئەمڕۆدا، چونکە (باطیڵێکی خەم لێخوراوو پشتگیریی کراو، بەسەر هەقێکی مشوور لێنەخراو و پشتگوێ خراودا، زاڵ دەبێ).

کە بە داخەوە مسوڵمانان، هەقێکیان لەبەر دەستە، بەڵام وەك پێویست مشووریان لێ نەخواردوە و هەوڵی سەرخستنیان نەداوە، بگرە هەوڵی لێتێگەیشتن و پراکتیزە کردنیشیان نەداوە، نەك هەوڵی گەیاندنیان نەداوە بە خەڵکی دیکە، بەڵکو بۆ خۆشیان باشی لێ تێنەگەیشتوون و تێیدا پێنەگەیشتوون، چ جای خەڵکی دیکەی لێ تێبگەیەنن و پێبگەیەنن! بەڵام خەڵکی دیکە باطیڵ و ناهەقێکی هەیە، بەڵام خەمی لێدەخوات و سەری دەخات و هەوڵی بۆ دەدات، باطیڵێکی خەم لێخوراویش، بەسەر هەقێکی پشتگوێخراودا، زاڵ دەبێ.

ئێستا پارەو سامان و توانایەکی زۆری ماددیی و مەعنەویی خەرج دەکرێ بۆ پەرەپێدانی ئیلحاد، بە گشتیی و دژایەتیی کردنی ئیسلام و تەوژمی ئیسلامیی بە تایبەت، بە تایبەت لە بواری ڕاگەیاندندا، لێرەدا دەمەوێ ئاماژە بکەم بە هەندێك کتێب و بەرهەمی مولحیدەکان، هەندێك لە مولحیدەکانی کە: (سەر قافڵەی شەپۆلی ئیلحادن)، لە وڵاتانی ڕۆژئاوا کە کتێبەکانیان لەلایەن دەزگایەکانی ڕاگەیاندنەوە، مشووری زۆریان لێخوراوە و ڕەواجی زۆریان پێدراوە و، ڕێکلامی زۆریان بۆ کراوە، لەوانە:

١- (سام هارس) - کە پسپۆڕە لە زانستی مێشك و دەماردا، کتێبێکی هەیە بە ناوی: (کۆتایی بڕوا - (نهاية الإيمان)[1]، کە لە ساڵی (٢٠٠٤ز)دا چاپی کردوە، کاتی خۆی زۆر ڕەواجی پێدراو ڕیکلامی بۆ کراوو بانگەشەی بۆ کرا.

---

(١) لەبەر ئەوەی ناوونیشانەکانیان لە تەرجەمەی عەرەبییەوە دێنین، بە عەرەبیی دەیانهێنین، ئەگەرنا بە زمانە بیانییەکان نووسراون و ناونراون.

٢- (ڕیتشارد داوکینز) کتێبێکی هەیە بە ناوی: (The God Delusion) واتە: (خەیاڵی خوا - وَهمُ الإلَه) ئەمیش بابایەکی (داروینیستە) و، ئەو کتێبەی لە ساڵی (٢٠٠٦ز)دا نووسی و کتێبی دیکەشی هەن، بەڵام ئەم کتێبەیان پەنجاو یەك (٥١) هەفتە ڕۆژنامەی (نیویورك تایمز) دایناو، وەك پڕ فرۆشترین کتێب، ڕیکلام و بانگەشەی بۆ دەکرد.

٣- (دانیل دینیت) فەیلەسووفێکی ئەمریکییە، ئەمیش کتێبێکی هەیە، تەرجەمەی عەرەبی کراوە بە ناوی: (كَسْرُ السّحْر... الدِّيْنُ كَظَاهِرَةٍ طَبِيعِيةٍ)، (شکاندنی جادوو .. ئایین وەك دیاردەیەکی سروشتیی)، لە ساڵی (٢٠٠٦ز)دا ئەو کتێبەی نووسیی.

٤- (ڤیکتور ستنگر) بابایەکی فیزیاییە، کتێبێکی داناوە، ناوونیشانێکی زۆر زەق و ڕەقی هەیە: (أللهَ: الفَرَضِيَّة الفَاشِلَة)، (خوا گریمانەیەکی شکست خواردوو)، کە لە ساڵی (٢٠٠٧ز)دا نووسیویەتی.

٥- (کرستیوفر هیتشنز) بابایەکی ڕۆژنامەنووسە و، کتێبێکی نووسی لە ساڵی (٢٠٠٧ز)دا، ناوونیشانەکەی بە عەرەبیی ئاوایە: (أللهُ لَيْسَ عَظِيماً، كَيْفَ يُسَمِّمُ الدِّينُ كُلَّ شيء)، (خوا مەزن نیە، چۆن ئایین هەموو شتێك ژەهراویی دەکات!).

٦- (ستیفن هوکینگ) کە پێشتر مولحید نەبووە، بەڵام دوایی زیاتر ئەگەری ئیلحادی هەڵبژارد، کە لە چەند مانگی ڕابردوودا مرد، فیزیك زانێکی ناودارە، ئەمیش کۆمەڵێك کتێبی هەن:

١- یەکێك لە کتێبەکانی (دیزاینی مەزن) کە تەرجەمەی کوردیش کراوە.

٢- کتێبێکی دیکەی هەیە: (مێژوویەکی کورتی کات).

٣- کتێبێکی دیکەی هەیە: (مێژوویەکی کورتتری کات).

٤- کتێبێکی دیکەی هەیە: (گەردوون لە شێوەی توێکڵی پیوازدا).

بە هەر حاڵ ئەویش یەکێك بووە لەوانەی لەسەر ئیلحاد حیساب دەکرا و، کتێبەکانییان زۆر ڕەواج پێدەدا.

٧- (ئەنتۆنی فلو) کاتی خۆی سی (٣٠) بەرهەمی لە بارەی پشتگیریی کردنی ئیلحادەوە هەبوو، چەندان دیبەیتی هەبوون، کە هەزاران کەس تەماشایان دەکردن، لە ئەمریکاو لە وڵاتانی ئەورووپادا، بەڵام لە ساڵی (٢٠٠٤ز)دا کتێبێکی نووسی بە ناوی: (There's a God)، (خوایەك هەیە)، کە تەرجەمەی عەرەبیی کراوە بە ناوی: (رِحْلَةُ عقلٍ) هەروەها تەرجەمەی کوردیش کراوە بە ناوی: (گەشتی عەقڵ).

ئنجا هەر لەبەر ئەو زۆر خەم لێخواردن و پارەو سامان سەرف کردنەیە، بۆ ڕەواج پێدانی ئیلحاد، کە هەندێك جار وا هەست دەکرێ، ئیلحاد بۆتە تەوژمێکی گەورەو بەهێز، لە حاڵێکدا کە بە پێی ئەوەی لە ئینسکلۆپیدیای بەریتانیی (الموسوعة البريطانية)دا هاتوە، دەڵێ: لە ساڵی (٢٠١٠ز)دا، ڕێژەی ئیلحاد لە جیهاندا: لە (٢٪) بووە، یانی: لە سەد (١٠٠) مرۆڤ دوو (٢)یان لەسەر ئیلحاد حیساب دەکرێن!

هەروەها: (نێوەندی لێکۆڵینەوەی نەصرانیی لە جیهاندا) (مركز دراسة النصرانية العالمية)، دەڵێ: لە ساڵی (١٩٧٠ز)دا، ڕێژەی ئیلحاد (٤،٧٪) بووە، بەڵام لە ساڵی (٢٠١٠ز)دا، دابەزیوە بۆ (٢٪) و، چاوەڕێ دەکرێ لە ساڵی (٢٠٢٠ز)دا، دابەزێ بۆ (١,٨٪).

ئنجا زانایانی خواناس، زۆر لە مولحیدەکان زیاترن، بۆ وێنە: کتێبێك هەیە بە ناوی: (سەد ساڵ لە پاداشتەکانی نۆبڵ) (مِائة سنة من جوائز نوبل)، کە لە ئەسڵ دا بە یەکێك لە زمانە بیانییەکانە و، تەرجەمەی عەرەبی کراوە و، لە ساڵی (١٩٠١ز تاکو ٢٠٠٠ز) هەموو ئەوانەی پاداشتی نۆبڵیان وەرگرتوە، سەرژمێری کردوون، ڕێژەی مولحیدەکان و ئەوانەی کە دوو دڵ (شكّاك - لا أدري)ن، وێڕای ئەوانەی کە خوا ناپەرستن، هەرچەندە دان بە بوونی خوا دادێنن، بە هەموویان (١٠،٥٪) کە مولحیدەکان ڕێژەیان: (٣٪)یە، بەڵام ڕێژەی زانایانێك کە خواناسن و قەناعەتیان بە بوونی خوا هەیە: (٦٥،٤٪)ە[1].

---

(١) ئەم زانیارییانەم لە کتێبی: (الميديا والإلحادِ، السينما واللاّوعي، الخطاب الشعبي للإلحاد) (م. أحمد حسن)، ص٢٤ وەرگرتوون.

**بۆچی وا هەست دەكرێ ئیلحاد زۆر تەشەنەی كردوە و بەربڵاوە؟**

وەڵامەكەی دەبێ لە هۆیەكانی ڕاگەیاندن (وسائل الإعلام)دا، بۆی بگەڕێین، كە هەركام لەم هەشت (٨) شێوازە، دەگیرێنە بەر، بۆ ڕەواج پێدانی ئیلحاد و، پارەو سامانێكی زۆریش بۆ ئەو مەبەستە تەرخانكراوە، لەلایەن زلهێزانی باڵادەستەوە، لەمیانی هەندێك لە نێوەندەكانی لێكۆڵینەوەوە و، هەندێك لە ئەو كەسایەتییانەوە، كە حەزیان لە ئیلحادو خوانەناسییە، ئەو هەشت (٨) شێوازەش ئەمانەن:

**یەكەم:** بەهرەی خراپ وەرگرتن لە كەلێن و درزەكانی عەقڵ و نەفس و خەیاڵ، (واتە: كڵاو لەسەری خەڵك نان).

**دووەم:** ڕانواندنی ئارەزووەكان و، وێنەی ڕووت و وروژێنەری جینسیی و، ڕازاندنەوەی زیناو خیانەت، ئەمە هەم لە كتێباندا، هەم لەفلیمەكاندا، هەم لە گرتە ڤدیۆییەكاندا.

**سێیەم:** وێناكردنی مرۆڤ و ژیان، وەك شتێكی پووچ و بێ ئامانج و بۆش، كە ئەوەش وا دەكات: خەڵك پشت لە خوا بكات، مادام: ژیان هیچ نیە و، مرۆڤ هیچ نیە و، مرۆڤ هەر لە خۆوە پەیدابووە، بێگومان ئەمە وا دەكات، خەڵك بیری نەچێتە سەر ئەوە: ئایا خاوەن و پەروەردگاری وی كێیە؟

**چوارەم:** زێدەڕۆیی كردن لە خەیاڵی زانستییدا، بۆ پەراوێز خستنی دەسەڵاتی خوای بەدیهێنەر، لە میانی هەندێك فیلیمی خەیاڵی زانستییدا: گەردوون وایە، ژیان لەسەر مەرریخ وایەو، ژیان لەسەر فڵان شوێن وایە، وەك كاتی خۆی (میرزا محمد أمین مەنگوڕیی) كتێبێكی نووسی بوو لە بارەی خڕۆكەی (مەرریخ)ەوە[1]، كەچی دوایی دەركەوت، (مەرریخ) نە ژیانی لەسەرەو نە هیچ!

---

(١) بە ناوی {گەشتی ئەستێرەی مەریخ} لە ساڵانی: كۆتایی شەستەكانی سەدەی ڕابردوو و سەرەتای حەفتایەكاندا.

**پێنجەم:** بەهرە وەرگرتن لە ئەفسانەکان و لە ناماقوڵییەکانی نەصرانییەت و ئایینە تێکدراوەکانی دیکە، واتە: ئایینەکانی جوولەکە، صابیئە، مەجووسیی و، ئەو ئایینانەی دیکە کە بە ئایین لە قەڵەم دەدرێن، بەڵام مەرج نیە ئایینی خوایی و ئاسمانیی بن، وەك: (بووذایی) و (کۆنفۆشیۆسیی)، تەنانەت ئەوانە زۆرجاران مێژووش هەڵدەکۆڵن، (ڕیتشارد داوکینز) وا دەکات، مێژوو هەڵدەکۆڵێ: مێژووی میزۆپۆتامیا و مێژووی میسرو، مێژووی یۆنان و، مێژووی چین، دەڵێ: تەماشا بکەن! خەڵك چی پەرستوە؟ ئەها تەماشا بکەن! خەڵك چۆن ئەفسانەی پەرستوە! ئەها یۆنانییەکان ئەو هەموو پەرستراوانەیان هەبوون، ئەها گەلانی میزۆپۆتامیا ئەو هەموو پەرستراوانەیان هەبوون!! کە زۆرجاران ئەو پەرستراوانە، وەك مێژوونووسان دەڵێن: قیددیس و کەسە خواناس و دیندارەکان بوون، دوایی خەڵك بە پاك و پەرستراویان گرتوون و، ناوی پەرستراویان بەسەردا بڕیون.

**شەشەم:** وێناکردنی خوا بە شێوەیەکی ناشایستە، بۆ پاساودانەوەی ئیلحاد، ئەویش بە پەنابردنە بەر مێژوو و، ئەفسانەکانی فیکری بەشەر، کە پێشتر ئاماژەمان پێیانداوە.

**حەوتەم:** بەکارهێنانی درۆو دەلەسەو ساختەکارییەکانی گەشە کردن (تَطوُّر)، بەگشتیی و داروینزم، بە تایبەت وەك دەروازەیەك بۆ ئیلحاد، کە پێشتر باسمان کرد: چەند فێڵ و ساختەکاریی لەو بارەوە کراوە!!

**هەشتەم** و کۆتایی: وێنا کردنی زیرەکیی کۆمپیوتەریی، وەك عەقڵ و هۆشی مرۆڤ و بگرە زیاتریش، لە حاڵێکدا کە پێشتر قسەی ئەو کەسەمان هێنا، کە خاوەنی مایکرۆسۆفتە، کە دەڵێ: ئەگەر هەرچی ئامێر مرۆڤ دروستی کردوە، هەموویان بێنی، بە قەدەر مێشکی مرۆڤ ئاڵۆزیی و وردەکارییان تێدانیە، ئەویش هەر ئەوەندەی کە تاکو ئێستا لە مێشکی مرۆڤ بۆیان دەرکەوتوە، چونکە گەلێك گۆشەی پەنهان و لایەنی تاریکی هەن، تاکو ئێستا بۆ مرۆڤ ئاشکرا نەبوون.



**لە کۆتایی دا دەڵێین:**

هەر کام لەم هەشت (٨) شێوازە، بە ئامرازە جۆراو جۆرەکان بەکاردەهێنرێن، بە تایبەت لە شێوەی فیلم، یان گرتەی ڤیدیۆیی، چونکە ئەوانە کاریگەرییان لەسەر مرۆڤ، بە تایبەتی چینی گەنج و تازە پێگەیشتوو، زیاترە.

بەڵێ، بەڕێـــــزان!

ئەم حەوت هۆکارە، هۆکارە ڕاستەقینەکانی بەرەو ئیلحاد پەلکێشکرانی ئەو جۆرە کەسانەن، کە لێرە و لەوێ، کەم و زۆر دەکەونە نێو تەڵەوداوی ئیلحادەوەو، دەکەونە نێو زەلکاوی ئیلحادەوە و، دواتریش بە هۆی گرفتار بوونیانەوە بە لادانە ڕەوشتییەکان و بیرو بۆ چوونە ڕازێنراوە بۆشەکانی ئەهلی ئیلحادەوە، بە زەحمەت خۆیان بۆ دەگێڕدرێتەوە بەرەو ڕاستە شەقامی خواو، بۆ دەوری چرای ڕۆشنی وەحیی خوای بەرزو مەزن.

# دەستپێك

بەرێـــزان!

ئێمە پێشتر باسی بیانووە پووچەڵەکانی ئیلحادمان کرد، بەڵام لەم بەشەدا هەوڵدەدەین دوازدە (١٢) جۆر ئیشکال و گومان کە مولحیدەکان پەنایان پێدەبەن، بپووکێنینەوە و هەڵیانوەشێنینەوە، بەڵام بە کورتیی و گوشراویی، چونکە هەندێك لەو ئیشکال و گومانانە، بە جۆرێك لە جۆرەکان، لە ئاڵقەکانی پێشوودا، کەم و زۆر قسەیان لەبارەوە کراوە:







## گومانی یەکەم



## گەردوون زۆر فراوانە و، زەوی نشینگەی مرۆڤ زۆر بچووکە و، مرۆڤیش هەر زۆر زۆر گچکەیە!

مولحیدەکان ئەمە دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوە: کە ئەو مرۆڤە بێ خاوەنە و، ئەم گۆی زەوییە، کە ژیانی مرۆڤی لەسەر دروست بووە، خوایەك و، پەروەردگارێك مشووری لێ نەخواردوە، چونکە شتێکی زۆر بچووك و نابووتە!!

ئنجا ئێمە بۆ دەرخستنی پووچەڵیی ئەو گومانە، حەوت (٧) کورتە خاڵان دەخەینە ڕوو:

١- دەڵێین: ڕاستە گەردووناسانی ئێستا دەڵێن: زیاتر لە دوو سەد ملیار (٢٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) و هەندێکیش دەڵێن: یەك تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) کەهکەشان، واتە: یەك توان دوازدە (١^(١٢)) کەهکەشان لە گەردووندا هەن[1]، کە کاکێشانی خۆمان، دەوری یەك (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) تریلیۆن، واتە: یەك توان دوازدە (١^(١٢)) ئەستێرەی تێدا هەن.

ئنجا کاکێشانی ئێمە بە خێراییی سێ سەد (٣٠٠) تاکو چوار سەد (٤٠٠) کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا بەرەو کەهکەشانی کچ (العَذراء)[2] دەڕوات.

---

(١) بڕوانە: (الكون بين العلم والقرآن)، ص٣٦.

(٢) گەردووناسان ئەو ناوەیان لێناوە.

ئنجا گەردوونی ئێستا، هەندێکیان تیرە (قطر)کەی بە سێزدە (١٣) تاکو پازدە (١٥) ملیار (١٣٠٠٠٠٠٠٠٠٠ - ١٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵی تیشکیی مەزندە دەکەن، هەندێکیش بە بیست (٢٠) ملیار ساڵی تیشکیی مەزندەی دەکەن، ئەوەش تەنیا ئەو بەشەیە کە لە گەردوون دەبینرێ بە تەلیسکۆبەکان[1].



وێنەی (٥١) گەردوون

٢- بەڵام ئەو گەردوونە فراوانەی ئێستا، کە لە تۆویلکەیەکەوە، یان لە هێلکۆکەیەکەوە، کە بە ئینگلیزیی: (سینگلارتی - Singularity)ی پێ دەڵێن، واتە: تاکی پێکهاتەی گەردوونیی، لەوەوە هاتوە، کە ملیۆنان جار لە پرۆتۆن بچووکترە و لە ئەلیکترۆنیش زۆر بچووکترە.

لە ڕووی گەرمیی و، کات و، قەبارەوە، (الحرارة والزمن والمسافة)، بە پێی نەگۆڕی بلانك، (ثابت بلانك) بووە، کە لەوە گەرمتر و، لەوە کاتی کەمتر و، لەوە قەبارە بچووکتر نیە، کە بریتیە لە:

---

(١) الكون بين القرآن والعلم، ص ١٣٦.

أ- دە توان سی و دوو ($١٠^{(٣٢)}$) کاڵڤن بۆ گەرمیی، یەك پلەی کاڵڤن، بریتیە لە دوو سەد و حەفتا و سێ پۆینت شازدە (-٢٧٣،١٦) لە ژێر سفرەوە، ئنجا گەرمیی ئەو (سینگلارتی - Singularity) دە توان سی و دوو ($١٠^{(٣٢)}$) پلەی کاڵڤن بۆ گەرمیی، بوە.

ب- تەقینەوەی ئەو تاکی گەردوونییە، لە ماوەیەکی هێندە کەمدا بووە، کە بریتیە لە: دە توان چل و سێ سالیب ($١٠^{(-٤٣)}$) چرکە، واتە: چرکەیەك بکەی بە ژمارەیەك، کە چل و سێ (٤٣) سفری هەبێ، ئنجا لە یەك بەشیدا ئەو (Singularity) تاکی گەردوونییە، تەقیوەتەوە.

ج- قەبارەکەشی بریتی بووە لە: دە توان سی و پێنج سالیب ($١٠^{(-٣٥)}$) مەتر، واتە: مەترێك بکەی بە ژمارەیەك، کە سی و پێنج (٣٥) سفری هەبێ، یەك بەش لەو ژمارەیە، قەبارەی ئەو تاکی گەردوونییە (بذرة الكون)، (بيضة الكون)ە بووە.

٣- بەڵام لە ڕاستییدا ئەوە قیاس کردنی خوایە لەسەر مرۆڤ، چونکە لەلای مرۆڤ، هەتا شت گەورەتر بێ، زیاتر شایانی گرنگیی پێدانە، بەڵام بێگومان فیل و مێشوولە، یان نەهەنگی شین و ڤایرۆس، چونکە فیل گەورەترین ژیانداریی وشکانییە و، نەهەنگی شین (الحوت الأزرق) گەورەترین ژیانداری دەریایە، بەڵێ فیل و مێشوولە، یان نەهەنگی شین و ڤایرۆس، بۆ بەدیهێنەریان، وەك یەکن، بەڵکو ئەو ژیاندارە بچووکانە، ئنجا ئەگەر مێشولەیەك بێ، ئەگەر ڤایرۆسێك بێ، مادام هەموو پێداویستییەکانی هەن، هەمان ئەو شتەی لە ڤایرۆس و بەکتریا و میکرۆبێکدا هەیە، هەر هەمان شت لە فیل و نەهەنگیشدا هەیە.

٤- قەبارەکان ڕێژەیین، بۆ نموونە: ئەگەر کۆمەڵەی خۆر، خۆر و هەر نۆ خڕۆکەکەی، ببێتە کونێکی ڕەش (ثقب أسود)، قەبارەکەی هێندەی بەردێکی گچکەی لێ دێ و، قەبارەی زەوی دەبێتە (٩، ٠٪)سم.

٥- ئەو ئامادەسازییەی لە زەویدا کراوە بۆ ژیان، لە هیچ شوێنێکی گەردووندا، ئەو جۆرە ئامادەسازییە نیە بۆ ژیان، زانایانی گەردووناس زۆر لێیان

کۆڵیوەتەوەو زۆر لێدەکۆڵنەوە، دەڵێن: لە خڕۆکەکانی کۆمەڵەی خۆر، جگە لە زەوی هیچیان بە کەڵکی ژیان نایەن، هەروەها لە کەهکەشانەکەمان و لە دەرەوەی کەهکەشانەکەمان، هیچ ئاماژەیەکیان پێنەگەیشتوە، هەرچەندە بە چەندان ملیۆن دۆلار تەرخان کراوە بۆ ئەوەی بگەن بەوەی ئاماژەیەك هەبێ، لە کەنار و گۆشەیەکی گەردووندا، کە ژیانێکی دیکەی لێبێ، وەك ژیانی مرۆڤ، بەڵام تاکو ئێستا هیچ شتێك نەگەیشتوە.

٦- قەبارەی مرۆڤ بە نسبەت کەهکەشانەکان و، گەردیلە و، کوارکەکانی پێکهاتەی گەردیلەوە، سنوورێکی میانجیی هەیە، نە زۆر بچووکە و، نە زۆریش گەورەیە:

أ/ لەلایەکەوە: زەویی و خڕۆکەکانی کۆمەڵەی خۆر و، خۆر کە ملیۆنێك و سێ سەد هەزار (١٣٠٠٠٠٠) هێندەی زەوییە، پاشان کەهکەشانەکەمان (ڕێی کاکێشان) یەك تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ئەستێرەی وەك خۆری ئێمەی تێدان، ئنجا کەهکەشانەکان هەموویان، کە ژمارەیان بە دوو سەد ملیار (٢٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) تاکو یەك (١) تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) کەهکەشان مەزندە دەکرێ، ئەو قەبارە گەورەرانە هەن.

ب/ لەلایەکی دیکەشەوە: لە خوار مرۆڤەوە، قەبارەی زۆر بچووك هەن، لە گەردیلەکان و، لە گەردیلەکان گچکەتریش، کەواتە: مرۆڤ ئاستێکی میانجیی هەیە: لە خوار خۆیەوە: شتی زۆر وردیلە و بچووك هەیە و، لە سەرەوەی خۆیشی شتی زۆر گەورە و زەبەلاح هەیە، کەواتە: مرۆڤ ئاستێکی میانجیی هەیە لە گەردووندا، ڕاست نیە، زۆر گچکە و نابووت بێ تەنانەت لە ڕووی جەستە و قەبارەشەوە، بەڵام لە ڕووی دیوی مەعنەوییەوە، ئەوە مرۆڤ شتێکی دەگمەن و ناوازەیە، چونکە تاکە دروستکراو و ژیانداری خاوەن ڕووحە!

٧- تەنیا مرۆڤ توانای لە یەك جیاکردنەوەی ئەو جیاوازییانەی هەیە، کەواتە: مرۆڤ چەقی گەردوونە، هەم لە ڕووی فیزیایی و، هەم لە ڕووی سایکۆلۆژیی و، هەم لە ڕووی عەقڵیی و، هەم لە ڕووی ئایینیشەوە، بەڵێ مرۆڤ چەقی گەردوونە و، ئەگەر مرۆڤ نەبووایە، کێ دەرکی ئەوەی دەکرد: ئەو گەردوونە

چۆن پێکهاتوە؟ کێ ئەو هەموو نهێنییانەی لە گەردووندا دەدۆزینەوە؟ کێ دەیزانی خوای زاناو شارەزا، ئەو هەموو دروستکراوە وردانەی بەدیهێناون؟ ئەو هەموو شتە زەبەلاحانەی بەدیهێناون؟ تەنیا مرۆڤ دەرکی ئەوانە دەکات، دیارە ئەگەر مرۆڤیش نەبووایە، حەقیقەتەکان نەگۆڕ بوون، بەڵام تەنیا مرۆڤ دەرکی ئەو شتانە دەکات[1].

کەواتە: مرۆڤ وەك مولحیدەکان دەڵێن: چونکە گچکەیە شتێکی بێ بایەخ نیە و، ئەو خڕۆکەی زەوییەی ئێمەش، هەرچەندە شتێکی بچووکە، بەڵام لە ڕووی نیوەڕۆك و جەوهەرەوە، زۆر گرنگە، چونکە ئەو بارودۆخەی کە لە زەویدا هەڵخراوە، بۆ ئەوەی ژیان دروست ببێ و، سەرەنجام مرۆڤ بتوانێ لەسەری بژی تەنیا لەسەر زەوی ڕەخسێنراوە، لەلایەن خوای پەروەردگارەوە و، لە هیچ گۆشە و کەنارێکی دیکەی گەردووندا، تا ئێستا هیچ شوێنێکی دیکەمان پێ شك نایەت، ئەو زەمینە سازییەی لە زەویدا کراوە بۆ دروستبوونی ژیان و مرۆڤ، تێیدا هەبێت.

کەواتە: ئەوە کە گەردوون زۆر فراوانە و، نشینگەی مرۆڤ کە زەوییە، زۆر بچووکە و، مرۆڤیش هەر زۆر بچووکە، ئەمە لە ڕاستییدا، مەگەر ڕاکردن بێ لە خواناسیی و دینداریی، ئەگەرنا، بە هیچ جۆرێك نابێتە بەڵگە و پاساوی ئیلحاد، بەڵێ مرۆڤ بچووکە، بەڵام زۆر لەو بچووکتریش هەیە و، بەڵێ زەوی بچووکە، بەڵام بە نیوەڕۆك لە هەموو ئەو گەردوونە کە تێیدا دەژین، گرنگترە، چونکە ئەوەی کە تێیدایە، لە هیچ شوێنێکی دیکەی گەردووندا نیە.

لێرەشەوە لەو ئایەتەی خوای پەروەردگار تێدەگەین، کە لە سوڕەتی (هود)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ...﴿٧﴾ ﴾.

---

(١) بەپێی زانیاریی و تێگەیشتنی ئێمە.

واتە: خوا ئەو زاتەیە، کە ئاسمانەکان و زەوی، بە شەش ڕۆژان (واتە: بە شەش قۆناغ)، هێناونە دی و، بارەگای خوا لەسەر ئاو بوو، تاکو تاقیتان بکاتەوە، کامەتان کردەوەتان باشترە!

بە پێی ئەم ئایەتە - وەك لە هەندێك لە کتێبەکانی خۆمدا باسم کردوە - ئەم گەردوونە هەمووی پەیوەستە بە ژیانی مرۆڤەوە و، هەمووی شانۆیەکە، کە مرۆڤی تێدا کراوە بە ئەکتەر، بۆ تاقیکرانەوە و، بۆ هەڵگرتنی ئەمانەتی خوا و، بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکی جێنشینایەتیی خوا لەسەر زەوی.

## گومانی دووەم

## ئایا ماقووڵە، تەنیا مسوڵمانان بچنە بەهەشت و، خەڵکی دیکە هەمووی بچن بۆ دۆزەخ؟!

ئەوەش گومانێکی دیکەی هەندێك لەوانەیە، کە بەرەو ئیلحاد چوو ون، ئێمە لە وەڵامی ئەو قسەیەشدا، سێ ڕاستییان دەخەینە ڕوو:

**یەکەم:** دەڵێین: ئەوە ڕاست نیە، کە تەنیا مسوڵمانان بچنە بەهەشت، ئەوە لە جێگای خۆیدا نیە، بەڵکو: هەموو ئەوانەی کە کاتی خۆی، شوێن ئەو پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) کەوتوون، کە خوا ناردوونی، ئەوانە هەموویان بە سەرفراز و، بە ئەهلی بەهەشت دادەنرێن، ئەوانەی بەر لە هاتنی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، بە دوای پێغەمبەرانی خۆیان کەوتوون، چونکە پێغەمبەری ئێمە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەری کۆتاییە، لە نێو سەد و بیست و چوار هەزار (١٢٤٠٠٠) پێغەمبەردا[1]، واتە: لە پێش ئەودا، ئەو هەموو پێغەمبەرانەی دیکە ڕابردوون، کە ژمارەیان: (١٢٣٩٩٩)یە، ئنجا ئەوانە هەموویان شوێنکەوتوویان هەبوون و هەموو ئەوانەی بە دوای ئەو (١٢٣٩٩٩) پێغەمبەرە کەوتوون، هەموویان سەرفرازن و بەهەشتیین.

-----

(١) {عن أبي أمامة قال أبوذر: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ! كَمْ وَفَّى عِدَّةُ الْأَنْبِيَاءِ؟ قَالَ: مِائَةُ أَلْفٍ وَأَرْبَعَةٌ وَعِشْرُونَ أَلْفًا الرُّسُلُ مِنْ ذَلِكَ ثَلَاثُ مِائَةٍ وَخَمْسَةَ عَشَرَ جَمًّا غَفِيرًا}، رواه أحمد: ٢٢٣٤٢، والطبراني: ٧٨٧١، والحاكم: ٣٠٣٩، وقال: صحيح على شرط مسلم وصحّحه الألباني.

**دووەم:** بەڵام دوای هاتنی پێغەمبەری کۆتایی و، دابەزینی دوایین پەڕتووکی خوا، کە قورئانە، سەرجەم بەرنامە ئاسمانییەکانی دیکە، بە کات بەسەرچوو و لابراو (منسوخ) دادەنرێن، با لەو بارەوە چوار بەڵگان وەك نموونە بێنینەوە:

١- خوای پاك و بێگەرد فەرموویەتی: ﴿ فَإِنۡ حَآجُّوكَ فَقُلۡ أَسۡلَمۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِۗ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسۡلَمۡتُمۡۚ فَإِنۡ أَسۡلَمُواْ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٢٠﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: ئنجا ئەگەر نەیارەکانت (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)!) شەڕە قسە و، وتوویژیان لەگەڵدا کردی، بڵێ: خۆم و ئەوانەی شوێنم کەوتوون، ڕووی خۆمان بۆ خوا ملکەچ کردوە و بەوانەش بڵێ، کە کتێبیان پێدراوە و، بە نەشارەزاکانیش (یانی: کە نەشارەزا بوون بە کتێبەکانی خوا)، ئایا ملکەچن بۆ (فەرمانەکانی) خوا؟ ئنجا ئەگەر ملکەچ بوون بۆ خوا، ئەوە ڕێی ڕاستیان گرتوە، بەڵام ئەگەر پشتیان هەڵکرد، بێگومان تۆ تەنیا گەیاندنت لەسەرە و، خواش بینەری بەندەکانیەتی.

٢- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لاَ يَسْمَعُ بِي أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الأُمَّةِ، يَهُودِيّ، ولاَ نَصْرَانِيّ، ثُمَّ يَمُوتُ وَلَمْ يؤْمِن بالَّذِي أُرسِلْتُ بهِ، إلاَّ كَانَ مِن أَصْحَابِ النَّارِ} (رَوَاهُ مُسْلِم برقم: (٣٨٤)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه)).

واتە: سوێند بەو کەسەی کە گیانی موحەممەدی بەدەستە (سوێندی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە زۆریی ئاوا بووە)، لەم ئۆممەتە هیچ کەسێکی جوولەکەو هیچ کەسێکی نەصرانیی، هەواڵی ڕەوانەکرانی من نابیستێ، پاشان ئیمان بەوە ناهێنێ کە پێم دا ڕەوانەکراوە، مەگەر مسۆگەر دەچێتە دۆزەخ و هاوەڵی دۆزەخە.

لەم فەرموودەیە وەردەگیرێ کە وشەی (أُمَّةِ) دوو چەمك و واتای هەن:

أ- ئەوانەی کە ئیماندارن پێیان دەگوترێ: ئۆممەتی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم).




ب- بەشەرییەتیش بەگشتی هەر پێی دەگوترێ: ئۆممەتی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، ئەدی جیاوازییان چییە؟

جیاوازییان ئەوەیە کە ئەوانەی ئیمانیان بە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) هێناوە، پێیان دەگوترێ: (ئۆممەتی وەڵامدەرەوە) (الأُمَّة المُستَجيبة) چونکە ئێمە وەڵاممان داوەتەوەو گوتوومانە: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە خزمەتت داین و بە دوات دەکەوین و لە خزمەت ڕێبازەکەت داین، بەڵام ئەوانی دیکە (ئۆممەتی بانگکراون)، (الأُمَّة المدْعُوَّة)، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بانگی کردوون، بەڵام جوابیان نەداوەتەوە، ئەگەرنا ئەوانیش هەر لەسەر میلاکی پێغەمبەرن (صلى الله عليه وسلم)، چونکە ئەگەر هەزار (١٠٠٠) ساڵ بە دوای مووساو عیساو ئیبراهیم و، بە دوای زەردەشت و بە دوای هەر کەسێك بکەون، کە بە پێغەمبەری دەزانن، ئنجا لەلای خوا پێغەمبەر بووبێ، یان پێغەمبەر نەبووبێ، مادام بەدوای موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) نەکەون، بۆیان حیساب ناکرێ، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وا دەفەرموێ.

٣- هەروەها خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ:

﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴿١٥٨﴾ ﴾.

واتە: بڵێ: ئەی خەڵکینە! من پێغەمبەری خوام، ڕەوانەکراوی خوام بۆ هەمووتان، بەبێ هەڵاواردن، واتە: دەبێ هەمووتان بەدوام بکەون، چونکە لە دوای هاتنی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) هەموو ئەو بەرنامانەی کە بۆ کۆمەڵگایەکی دیارییکراو و، لە قۆناغێکی دیارییکراودا هاتوون، ئەگەر گریمان مابیشن، گۆڕاون و دەستکاریی کراون و، ئەگەر گریمان نەشگۆڕرابن، چونکە بۆ قۆناغ و کۆمەڵگایەکی تایبەت و دیارییکراو نێرراون، ئاساییە کە بۆ کۆمەڵگاو قۆناغێکی دیکە نەشێن، کە بۆ چارەسەری کێشەو گرفتەکانی وان نەنێرراون، بەڵام تاکە بەرنامەیەك کە بۆ هەموو بەشەر هاتوە، بە درێژایی زەمان بە پانایی زەمین، ئەو شەریعەتەیە کە بۆ پێغەمبەری کۆتایی هاتوە، کە لە ئیسلام دا بەرجەستەیە.

٤- هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {كَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً، وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً} (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ برقم: (٣٣٥٠)، وَمُسْلِم برقم: (٣٧٠)).

واتە: لە پێش مندا هەر پێغەمبەرێك بۆ گەلەكەی بە تایبەت ڕەوان دەكرا، بەڵام من بۆ تێكڕای مرۆڤایەتیی، بە گشتیی ڕەوانە كراوم.

**سێیەم:** بەڵام كەسێك بێئەوەی كەمتەرخەم بووبێ، پەیامی پێغەمبەری خاتەم (محمد)ی پێ نەگەیشتبێ، یان بە شێوەیەكی ڕاست و ساغ پەیامی پێغەمبەری ئاخیر زەمانی پێنەگەیشتبێ، هەرچەندە ناوی قورئان و، ئیسلام و، موحەممەدی بیستبێ، بەڵام پەیامی خوا كە پێغەمبەری كۆتایی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پێی ڕەوانە كراوە، بە شێوەیەكی ڕاست و ساغ، پێی نەگەیشتبێ، ئەوە بە كافر لە قەڵەم نادرێ، چونكە وشەی (كافر)، لەسەر كێشی (فاعل)ە، كە (اسم فاعل)ە، واتە: داپۆشەر، ئەو كەسەش كە پەیامی پێغەمبەری كۆتایی بە ڕاست و دروستیی، پێنەگەیشتبێ، هەقی پێنەگەیشتوە، تاكو داپیۆشێ، بۆیە ناوی (كافر)ی بۆ بەكار نایەت، چونكە هەقی پێنەگەیشتوە، تاكو داپیۆشیبێ و ڕەفزی كردبێ!

هەر بۆیەش خوای پاك و بێگەرد، لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ:

﴿ مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ ﴾.

واتە: هەر كەسێك ڕێی ڕاستی گرت، سوودەكەی بۆ خۆیەتی و هەر كەسێك گومڕا بوو، گومڕا بوونەكەی بە زیانی خۆی تەواو دەبێ و، هیچ خاوەن گوناهێك، گوناهی كەسێكی دیكە هەڵناگرێ و، ئێمەش سزادەر نین (نە لە دنیا و، نە لە دوا ڕۆژدا)، تاكو پێغەمبەر ڕەوانە نەكەین.

كەواتە: كەسێك بێ ئەوەی كەمتەرخەم بوو بێ: پێغەمبەری كۆتایی نەناسیبێ، وەك خۆی و پەیامی پێغەمبەری كۆتایی بە شێوەیەكی ڕاست و ساغ





پێنەگەیشتبێ، ئەوە بە پێی ئەم ئایەتەی خوای دادگەرو کارزان، شایستەی سزادان نابێ، نە لە دنیا و، نە لە دوا ڕۆژدا.

چونکە خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرمویٚ:

﴿فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٥﴾﴾.

واتە: ئایا پێغەمبەران تەنیا گەیاندنی ڕوون و ئاشکرایان لەسەر نیە! کەواتە: دەبێ بە ڕوون و ئاشکرایی ئەو پەیامەی پێغەمبەری کۆتایی (صلى الله عليه وسلم)، کە لە قورئان و، سوننەتدا بەرجەستەیە، بەو مرۆڤە گەیشتبێ و، ئەویش ڕەفزی کردبێ و پشتی تێ کردبێ، ئنجا وشەی (کافر)ی بۆ بەکاردێ و بەو کەسە لە قەڵەم دەدرێ، کە شایستەی سزای خوا بێ.

ئەم فەرموودەیەش لەو بارەوە شتێکی ڕوونە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویٚ: {أَرْبَعَةٌ يحتجُّون يَوْمَ الْقِيَامَةِ: رَجُلٌ أَصَمٌّ لا يَسْمَعُ شَيْئَاً وَرَجُلٌ أَحْمَقُ، وَرَجُلٌ هَرِمٌ، وَرَجُلٌ مَاتَ فِي فَتْرَةٍ، فَأَمَّا الأَصَمُّ فَيَقُولُ: رَبِّ قَدْ جَاءَ الإِسْلامُ وَمَا أَسْمَعُ شَيْئَاً، وَأَمَّا الأَحْمَقُ فَيَقُولُ: رَبِّ لَقَدْ جَاءَ الإِسْلامُ وَالصِّبْيَانُ يَحْذِفُونَنِي بِالْبَعَرِ، وَأَمَّا الْهَرِمُ فَيَقُولُ: رَبِّ لَقَدْ جَاءَ الإِسْلامُ وَمَا أَعْقِلُ شَيْئَاً، وَأَمَّا الَّذِي مَاتَ فِي فَتْرَةٍ فَيَقُولُ: رَبِّ مَا أَتَانِي لك رَسُولٌ، فَيَأْخُذُ مَوَاثِيقَهُمْ لِيُطِيعنَّهُ، وَيُرْسِلُ إِلَيْهِمْ أَنِ ادْخُلُوا النَّارَ، فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَوْ دَخَلُوهَا مَا كَانَتْ عَلَيْهِمْ إِلا بَرْدَاً وَسَلامَاً، وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: ( إقرءوا إن شئتم: وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً}[1].

واتە: لە ڕۆژی هەڵسانەوە و، زیندوو کردنەوەدا، چوار کەس بەڵگەیان دەبێ (لە بەرانبەر خوادا، کە بۆچی بە دوای پەیامی خوا نەکەوتوون؟ کۆڕەکەش کۆڕی پیاوان بووە، بۆیە باسی پیاوان دەکات):

---

(١) رواه أحمد في "المسند" ج٤، ص٢٤، ورواه إسحاق ابن راهويه عن معاذ بني هشام، والطبراني ج١، ص٢٨١، ورواه البيهقي في كتاب الإعتقاد، وقال: هذا إسناد صحيح، ورواه ابن جرير من حديث معمر بن همام عن أبي هريرة، انظر: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير) ص٧٦١، ٧٦٢.

پیاوێکی کەڕ، کە هیچ شتێك نابیستێ، (بێگومان ئافرەتی کەڕیش هەروایە)، هەروەها پیاوێکی کەودەن (بێ عەقڵ) هەروەها پیاوێکی زۆر بە تەمەن، هەروەها پیاوێك کە لە کاتی (فترة)دا[1]، مردوە.

کەڕەکە دەڵێ: پەروەردگارم! ئیسلام هات و من هیچم نەدەبیست.

کەودەنەکە (بێ عەقڵەکە)ش، دەڵێ: پەروەردگارم! ئیسلام هات و منداڵ قشپل و تەپاڵەیان تێدەگرتم. (واتە: گێل و حۆل بووم).

پیرەکەش دەڵێ: پەروەردگارم! ئیسلام هات و (لەبەر بە تەمەنیی و پیریی)، هیچ حاڵی نەدەبووم.

ئەوەش کە لە کاتی (فَـــتْـرَة)دا، مردوە، (واتە: کاتێك دابڕان بووە لە ناردنی پێغەمبەراندا و، لەو کاتەدا هیچ پێغەمبەرێك نەهاتوە، یاخود ئەو هیچی پێنەگەیشتوە)، دەڵێ: پەروەردگارم! هیچ ڕەوانەکراوێکی تۆم بۆ لا نەهاتوە.

خواش پەیمانیان لێوەردەگرێ، کە دەبێ فەرمانبەرداریی بۆ بکەن و، بە قسەی بکەن، (ئنجا تاقیکردنەوەیەکیان دەکات)، پەیامیان بۆ دەنێرێ، کە بچنە نێو ئاگری دۆزەخ، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بە دەستە، ئەگەر بچنە نێو ئەو ئاگری دۆزەخە، بۆیان سارد و سەلامەت دەبێ، (خوا دەیانباتە بەهەشت، لەبەر ئەوەی لەو تاقیکردنەوەی خوادا دەرچوون).

واتە: نەیانتوانیوە لە تاقیکردنەوەی خوا، لە دنیادا بەشدار بن و، خوای دادگەر لەوێ ئەوەیان بۆ قەرەبوو دەکاتەوە و، ئەو تاقیکردنەوەیان دەکات.

---

(١) (الفَتْرَة) واتە: "انقطاع": واتە: لەو ماوەیەدا کە هیچ پێغەمبەر ڕەوان نەکراون، یان ئەو هیچی پێنەگەیشتوە، وەك خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ عَلَىٰ فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُواْ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٖ وَلَا نَذِيرٖۖ فَقَدۡ جَآءَكُم بَشِيرٞ وَنَذِيرٞۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٩﴾ ﴾ المائدة.

مادام خوا بفەرموێ: بچۆ نێو ئاگر، مرۆڤ ئەگەر بە ڕاستیی خواناس و بڕوادار بێ، بە قسەی خوا دەکات، مادام خوا بفەرموێ: قازانجی تۆی تێدایە، بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، ئەگەر بە قسەی خوا بکەن و فەرمانبەریی خوا بکەن، ئاگرەکە بۆیان سارد و، سەلامەت دەبێ، واتە: دەچنە بەهەشت.

# گومانی سێیەم

## دەڵێن: کوا تەمەنی مرۆڤ بەشی هەڵسەنگاندنی ئەو هەموو ئایینانە دەکات، تاکو سەرەنجام ئایینی هەق و ڕاست هەڵبژێرێ؟

هەندێك لەو مولحیدانە، بەئانقەست سەر لە خۆیان دەشێوێنن، یان شەیتان سەری لێ شێواندوون! دەچن دەگەڕێن: لە یۆنانی کۆندا و لە ڕۆمانی کۆندا، چەند پەرستراو هەبوون؟ لە میسری کۆن، چەند پەرستراو هەبوون؟ لە هیند و، چین و، یابان چەند پەرستراو هەبوون؟ لە ئێرانی کۆن و لە میزۆپۆتامیا و لە شام، لە ئەمپەڕو ئەوپەڕی دنیا، چەند پەرستراو هەبوون؟ چەند جۆرە ئایین و، بەرنامە هەبوون؟ هەموویان دێنن، ئایین و بیر و بڕوای سەیرو عەجائیب، کە بەشێك لەوانەش ڕەمز و هێمان، بۆ وێنە:

لە میزۆپۆتامیا بەسەرهاتی گڵگامێش هەیە و، باسی (عەشتارووت) و (تەمووز) کراوە، کە ئەوانە پەرستراوەکانی ئەوێ بوون، هەروەها (بەعل) هەبووە لە شام و، (ئوزوریس) لە میسر، ئنجا دەڵێن: ئێمە چۆن فریا دەکەوین لەو هەموو عەقیدە و، ئایینانە بکۆڵینەوە و، لە نێویاندا ئەوەی ڕاست و چاکە هەڵیبژێرین، کە بە هۆیەوە بگەین بە خواناسیی و، خواپەرستیی ڕاست و دروست؟!

لە وەڵامی ئەو گومانەیاندا، سێ ڕاستیی دەخەینە ڕوو:





**یەکەم:** ئێستا لە جیهاندا سێ ئایین هەن، کە شوێنکەوتووانیان نیوە (٥٠٪) یان (٦٥٪)[١]ی خەڵکی سەر زەوی پێك دێنن، کە ئەمانەن لە ڕووی ڕیزبەندیی مێژووییەوە:

١- ئایینی جوولەکایەتیی.

٢- ئایینی نەصرانیی.

٣- ئایینی ئیسلام.

هەڵبەتە خەڵکێکی کەمیش هەیە لە صابیئە و، مەجووسیی، بەڵام وەك پێشتر باسمان کرد: صابیئە ناگەنە نیو ملیۆن (٥٠٠٠٠٠) کەس و، مەجووسییەکانیش، ئەگەر بگەنە نیو ملیۆن، واتە: بە هەردووکیان ملیۆنێك مرۆڤ لێیان کۆنەبوونەتەوە.

هەروەها هەندێك ڕێبازی لادەرانەی دیکەش هەن، بۆ وێنە: لە کوردستانی خۆماندا:

أ- یەزیدییەکان هەن..

ب- کاکەییەکان هەن، هەرچەندە هەندێك لە کاکەییەکان خۆیان بە مسوڵمان دەزانن

ج- لە ئێران ئەهلی هەق هەن.

لە هەندێك شوێنی دیکەش، هەندێك کۆمەڵە خەڵکی دیکە هەن، خۆیان پاڵدەدەنە لای خواو، لای ئایینی ئاسمانیی، کە ژمارەیان زۆر سنووردارە، کەواتە: دەوری نیوە (٥٠٪)ی مرۆڤایەتیی، بە دوای ئەو سێ ئایینە سەرەکییە کەوتوون[٢]، ئایینەکانی: مووسا (علیه السلام)، عیسا (علیه السلام)، موحەممەد (صلی الله علیه وسلم).

---

(١) ئەوەڕا و مەزەنەی ئەو سەرچاوەیە کە من زانیارییەکەم لێوەرگرتوە، بەڵام من ڕام وایە شوێنکەوتووانی هەرسێك ئایینەکە، دەوری نیوەی مرۆڤایەتیی پێك دێنن.

(٢) موسوعة الأديان في العالم، ج١، ص٢٥٤ تا ٢٦٧.

**دووەم:** تەنیا ئەو پێنجە ئایینەی پێشتر باسمان کردن و، کتێبەکانیانمان هەڵسەنگاند، خۆیان بە هەڵگری کتێبی ئاسمانی دەزانن، ئایین و ڕێبازەکانی دیکە هەموویان دەڵێن: ئێمە دەستکردی مرۆڤین و ئایینی بەشەرییین، وەك: ئایینی (بووذایی) و، ئایینی (کۆنفوشیۆسیی)، کە ئەوانە شوێنکەوتوویان زۆرن، بەڵام ئەوانە خۆیان بە ئایینی زەمینیی و مرۆڤکرد دادەنێن، یانی: لەسەر زەوی هەڵقوڵاون و پەیوەندییان بە خواوە نیە، خۆیان وا ئەژمار دەکەن.

کەواتە: بەو شێوەیە نیە کە ئایینی هەق، مرۆڤ نەتوانێ بەئاسانیی بەدوایدا بگەڕێ و لێیبکۆڵێتەوە، نیوەی مرۆڤایەتیی بە دوای ئەو پەڕتووکە ئاسمانییانە کەوتوون، کە بریتین لە:

١- تەورات، کە ئێستا خراوەتە نێو کۆمەڵێك کتێبی دیکەوە و، پەیمانی کۆنیان پێ دەگوترێ.

٢- چوار ئنجیلەکان، کە خراونەتە نێو کۆمەڵێك کتێبی دیکەوە و، پەیمانی نوێیان پێ دەگوترێ.

٣- قورئان.

ئنجا کاتێك سەرنجی ئەو پێنج (٥) ئایینە دەدەین، دەبینین:

**١- ئایینی جوولەکایەتیی:** جوولەکە خۆیان دەڵێن: ئایینێکی نەتەوەییە و داخراوە و کتێبەکەشیان بە ئیعتیرافی خۆیان، دەستکاریی کراوە و، کتێبەکەیان لە ماوەی هەزار (١٠٠٠) ساڵدا بە سێ (٣) زمانان، لەلایەن کۆمەڵێك نووسەرەوە نووسراوەتەوە، ئەمە لە پێشەکیی پەیمانی کۆندا هاتوە.

ئنجا هیچ کەس بۆی نیە لە خۆڕا ببێتە جوولەکە، مەگەر دایکی جوولەکە بووبێ و، جوولەکەش بانگەشە ناکەن، کەس بکەن بە جوولەکە!

**٣- ئایینی نەصڕانیی:** ئەو ئایینەی ئێستا هەیە، کە هەر ئایینەکەی عیسایە، بەڵام شێوێنراوە، چونکە لە ئێستادا بە فەرمیی، سێکوچکە (ثالوث)ی باب و،

کوڕ و، گیانی پیرۆز (الأب، والإبن، والروح القدس)یان تەبەنیی کردوە، کە پێیان دەڵێن: (الأقانیم الثلاثة) سێ پێکهاتەکان، هەروەها کۆمەڵێك ئەفسانەی دیکەشیان خستوونە نێوی، وەك:

١)- لە سێدارەدانی عیسا.

٢)- ئێوارە خوانێکی پەروەردگاریی (العَشاءُ الربَّاني).

٣)- دان بە هەڵەی خۆدا داهێنانی مرۆڤ.

٤)- لێخۆشبوون لەلایەن ئەوانەوە کە بە حیساب وەکیلی خوان!

٥)- ئنجا کتێبەکەشیان یەك بووە و ئێستا بووە بە چوار (٤)، ئنجیلەکانی: (متی، مرقس، لوقا، یوحنا)، وێڕای چەندان کتێبی دیکە، کە خراونە پاڵیان.

ئەوەش ئایینی نەصرانیی!

**٣- ئایینی مەجووسیی:** بە ڕەسمیی دووانەتیی: (ثنوية - Dualism)ی تەبەنیی کردوە و دەڵێن: دوو پەرستراو (إله) هەن، (ئاهوڕامەزدا و ئەهریمان)، وەك پێشتر باسمان کرد[1]، ئنجا وێڕای ئەوەش کتێبی ئایینی زەردەشتایەتیی یان مەجووسیی: (ئاڤێستا) زۆر گۆڕدراوە و لە ڕاستییدا نەك زۆر گۆڕدراوە، بەڵکو ئەوەی ئێستا هەیە بە ناوی (ئاڤێستا)، کە گوایە کتێبێکە، خوا بە وەحیی بۆ (زەردەشت) یان (زەڕادەشت)ی ناردوە، هەمووی گێڕراوەی زارەکیی دەماودەمە و، لە ماوەی حەوتسەد (٧٠٠) ساڵدا، سەدان ساڵ دوای (زەڕادەشت) کۆکراوەتەوە و هیچ بناغەیەکی پتەوی نیە، کە لێی دڵنیابی، ئەوە فەرمایشتی خوایە، یان چەندەی فەرمایشتی خوایە و چەندەی دەستکاریی کراوە، لە حاڵێکدا ئەوان خۆیان دەڵێن: کاتی خۆی لەسەر دوازدە هەزار (١٢٠٠٠) چەرم و پێستی ڕەشە وڵاخ نووسراوەتەوە، بەڵام ئەسکەندەری مەقدۆنیی، لە سەدەی چوارەم (٤)ی پێش زایین (٣٣٠ پ.ز)دا، هاتوە ئێرانی گرتوە[2]، لە سەردەمی

---

(١) الموسوعة الميسرة، ص٢٧٤.

(٢) بڕوانە: (الزرادشتيه: الفجر - الغروب) ر، س زيهنير، ص٣٢، ترجمة: د.سهيل زكّار، ط١/

(دارا)، پادشای فارسەکانداو، ئاڤێستای هەموو سووتاندوە، ئنجا سەدان ساڵ دوای ئەوە کۆکراوەتەوە!!

**٤- ئایینی صابیئە:** کە هەردوو کتێبی: (كَنْزَا رَبَّا) و (دِرَاشَة أَدِيهيا)ی هەن و، وەك پێشتر باسمان کرد: ئەگەر گریمان کتێبی ئاسمانییش بووبن، ئێستا پڕ کراون لە بتپەرستیی و ئەفسانە و بیروڕای سەیر و سەمەرە و، وەك واقیعی ئێستایان شایستەی ناوی: (کتێبی خوا)نین.

**٥- ماوەتەوە: ئیسلام:** کە کتێبێکی هەبێ، سەدا سەد (١٠٠٪) پارێزراو بێ و لێشی دڵنیا بین کە فەرمایشتی خوایە و نەك هەر ڕستە و ئایەتەکانی، بگرە وشەکانی و پیتەکانی (کلمات وحروف)یشی زانراوبن و، مسوڵمانانیش لەوپەڕی دنیا، بۆ ئەوپەڕی دنیا، لە باکوور تاکو باشوور و، لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا، لەسەر پیتێکیشی ڕاجیاییان نیە، کەواتە: ئەگەر کەسێك بە دوای هەقدا بگەڕێ، لەبەر دەستیەتی، کە قوڕئانە، بەڵام کتێبەکانی دیکە، تەنانەت خاوەنان و پەیڕەوانیشیان - ئەوانەی بەویژدانن - دەڵێن: دەستکاریی کراون و گۆڕراون.

**سێیەم:** ئیسلام بە گشتی دان دێنێ بە پێغەمبەرانی خوا و، سەرجەم کتێبەکانی دا و، ڕێز لە هەموویان دەگرێ و، ئەو هەڵە و پەڵانەی تێشیان خراون، ئەوەی پێویست بێ، ڕاستی کردۆتەوە، واتە: کاتێك قوڕئان دەگری، وەك هەر کام لە صوحوفی ئیبراهیم و، تەوراتی مووسا و، زەبووری داوود و، ئینجیلی عیسا و، هەر کتێبێکی دیکە کە خوا بۆ هەر پێغەمبەرێکی دیکەی ناردوە، هەموویت گرتبێ، هەروەها کاتێك ئیمان بە موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) دێنی، مانای وایە ئیمانت بە هەموو پێغەمبەران هێناوە، هەر لە ئادەمەوە هەتا دەگاتەوە عیسا (علیهم الصلاة والسلام)، چونکە ئەم قوڕئانە، پەیامی هەموویانی کۆکردۆتەوە و، ڕێزیش لە هەموو پێغەمبەران دەگرێ و، دان بە هەموو کتێبەکانیشیان دادێنێ.

---

٢٠٠٥، کە گوتوویەتی: زەردەشت لە نێوان: ٦٢٨- ٥٥١و پ. ز دا ژیاوە.





با بزانین چـــۆن؟

أ- لە سوورەتی (البقرة)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ ﴾.

واتە: پێغەمبەر و بڕواداران بڕوایان هێنا بەوە کە بۆی (بۆ پێغەمبەری کۆتایی) دابەزێنراوە (کە قورئانە)، هەر کام لە پێغەمبەر و (صلى الله عليه وسلم)، بڕوادارانیش، بڕوایان هێنا بە خوا و بە فریشتەکانی و بە کتێبەکانی و بە پێغەمبەرانی، (دەڵێن:) جیاوازیی ناخەینە نێوان هیچ کام لە پێغەمبەران.

لەو ڕووەوە کە پێغەمبەری خوان، هەموویان ڕێز لێگیراون و هەڵبژاردەی نێو مرۆڤایەتیین، تەنیا کاتێك ئیمان دێنی بە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، کە ئیمان بە هەموو پێغەمبەران بێنی و، کاتێك ئیمان بە قورئان دێنی، کە ئیمان بە هەموو کتێبە ئاسمانییەکانی دیکە بێنی، بەڵام وەك ئەسڵەکەیان کە هەبوون، نەك واقیعی ئێستایان کە دەستکاریی کراون و، پڕکراون لە ئەفسانە.

ب- لە سوورەتی (البقرة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿١٣٦﴾ ﴾.

واتە: بڵێن: بڕوامان هێنا بە خوا و بەوەی بۆ لامان دابەزێنراوە (کە ئەم قورئانە مەزنەیە)[1] و، بەوەی کە بۆ لای ئیبراهیم دابەزیوە و بۆ ئیسماعیل و بۆ ئیسحاق و بۆ یەعقووب و ئەسباط بۆ پێغەمبەرانی دیکەی کە لە یەعقووب پەیدا بوون، هەروەها ئەوەی دراوە بە مووسا و عیسا و، دراوە بە پێغەمبەران بە گشتی، لەلایەن پەروەردگاریانەوە، جیاوازیی ناخەینە نێوان هیچ کامیان (هەموویان جێگای ڕێز و حورمەتن) و ئێمە مسوڵمان و ملکەچین بۆ خوا.

---

(١) لە کاتی قسەکردنەکەدا موصحەفی موبارەکم بە دەستەوە بوو، ئاماژەم بۆ دەکرد.

ج- لە سوورەتی (المائدة)دا، خوای زاڵی پایەدار، دوای ئەوەی باسی تەورات دەكات كە بۆ مووسای دابەزاندوە و، باسی ئنجیل دەكات كە بۆ عیسای دابەزاندوە، دەفەرمویٚ:

﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ .. ﴿٤٨﴾ ﴾.

واتە: (ئەی موحەممەد!) كتێبمان بۆ تۆش دابەزاند بە هەق (یەكێك لە ناوەكانی قورئان كتێب "الكتاب"ە)، كتێبەكانی پێش خۆی، هەموویان بە ڕاست دەزانیٚ (وەك ئەسڵەكەیان) و بە سەریشیانەوە چاودێرە.

لە هەر شوێنێك لادان و دەستكاریی كران و شێوێنران ڕوویدا بیٚ، ئەگەر بە پێویستی زانیبیٚ، ڕاستی كردۆتەوە، وەك لە سوورەتی (النمل)دا خوای پەنهانزان دەفەرمویٚ:

﴿ إِنَّ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾ ﴾.

واتە: ئەم قورئانە، زۆربەی ئەوەی بەنو ئیسرائیل تێیدا كەوتوونە ڕاجیاییەوە، بۆیان باس دەكات (دادوەرییان لە نێواندا دەكات).

ئنجا بێگومان كەسێك تۆزێك عەقڵ و ویژدانی بەكاربێنیٚ، ئیسلام لەگەڵ هیچ كام لە ئایینەكانی دیكەدا كە خۆیان نادەنە پاڵ خوای پەروەردگارو ئاسمان، ئیسلام لەگەڵ هیچیان ناچێتە تەرازووەوە، چونكە: هەندێكیان مشك دەپەرستن، مار دەپەرستن، ڕووەك دەپەرستن، مرۆڤ دەپەرستن، پەیكەر دەپەرستن، خرۆكە و، ئەستێرەكان و، مانگ دەپەرستن، ئنجا ئیسلامێك كە باسمان كرد، چۆن باسی خوا دەكات! چۆن لەگەڵ ئەوانە دەخرێتە تەرازووەوە؟!

كۆتایی هەڵوەشاندنەوەی ئەم گومانە، بە قسەیەكی (فرانسیس فوكویاما) دێنین، كە لە كتێبەكەی خۆی: (نِهَايَةُ التأريخ وخاتَمُ البَشر)، (كۆتایی مێژوو و

کۆتایی مرۆڤ، یان سوپەرمان)[1]، کە فەیلەسووفێکی بە جینسییە ئەمریکیی و بە ڕەگەز یابانییە، ئەو کتێبە کاتی خۆی سەرو سەدایەکی زۆری بوو، تەرجەمەی عەرەبیی کراوە، ئەوەش دەقە عەرەبییەکەیەتی، دەڵێ:

(الإِسْلَامِ يُشَكِّلُ أيولُوجيةً مُتَّسِقَةً وَمُتَمَاسِكَةً، وَلَهُ مَعَايِيرُهُ الأَخْلَاقِيَّةِ الخَاصَّةُ بِهِ، وَنَظرِيتهُ المُتَّصِلَة بالعَدَالَةِ السِّياسَيةِ وَالإِجْتِمَاعِيَّة، كَذَلِكَ فَإِنَّ للإِسْلاَمِ جَاذِبِيَّةٌ يُمْكِنُ أَنْ تكُونَ عَالَمِيَّةً، فَهُوَ يَدْعُو إِلَيْهِ البَشَرَ كَافَّة باعْتِبَارِهِم بَشَراً لاَ مُجَرَّدَ أَعْضَاءٍ فِي جَمَاعَةِ عِرقِيَّةٍ أَوْ قَوْمِيَّةٍ مُعَيَّنَة).

ئەمە وەك گوتراوە: (وَالفَضْلُ مَا شَهِدت بِهِ الأَعْدَاءُ)، چاكە ئەوەیە ناحەزو نەیارانیش دانی پێدابێنن.

واتە: ئیسلام بەرنامەیەکی فیکریی گشتگیرە، کە پێکەوە تەبا ڕێکە و، پێکەوە چەسپاوە و، پێوەرە ڕەوشتیی و ئاکارییە تایبەتییەکانی خۆی هەن، هەروەها بیردۆزەی تایبەتیی خۆی هەیە، کە پەیوەستە بە دادگەریی سیاسیی و، کۆمەڵایەتییەوە، هەروەها ئیسلام ڕاکێشانی تایبەتیی خۆی هەیە، کە دەگونجێ ببێتە ئایینی هەموو جیهان، چونکە تێکڕای مرۆڤەکان بۆ لای خۆی بانگ دەکات، وەك مرۆڤ، نەك وەك ئەندامانێك لە کۆمەڵێکی نەژادیی، یان نەتەوەیەکی نەتەوەیی دیارییکراو.

بۆ وێنە: وەك کەسانێکی ڕەش پێست، یان سپی پێست، یان زەرد پێست، یان ڕەگەزی ئاریی، یان سامیی، یان وەك نەتەوەی عەرەب، یان کورد ...هتد، بەڵکو وەك مرۆڤ سەیری مرۆڤ دەکات، هەر ڕەگەزێکی هەبێ، یان خاوەنی هەر ڕەنگ و زمانێك بێ، بۆیە دەڵێ: ئەو ئیسلامە لە توانایدا هەیە، کە ببێتە ئایین و، بەرنامەیەکی گشتگیری مرۆڤایەتیی.

---

(١) بڕوانە: ص٥٦، الطبعة الأولى.

# گومانی چوارەم

## دەڵێن: ئەگەر ڕاستە یەکتاپەرستیی (توحید) ئەسڵی ئایینی خوایی بووە، بۆچی بە پێی زانیاریی شوێنەوارناسیی (علم الآثار- أركيولوجي) بە پێچەوانەوەیە؟

لە وەڵامی ئەو گومانەدا چوار ڕاستییان دەخەینە ڕوو:

١- خواپەرستانی خوا بەیەکگر (موحِّد)، هەرگیز بت و پەیکەرو .. هتد یان دروست نەکردوون، چونکە خوا پەرست بوون، هەڵبەتە ئەگەر بت و پەیکەریان دروست کردبان، شوێنەواریان لێ بە جێدەمان، بەڵام ئەوە عادەتی بتپەرستەکان بووە.

٢- دەستەڵاتداران هەرگیز کەیفیان بە پێغەمبەران و بانگەوازە تەوحیدییەکان نەهاتوە، تاکو شوێنەوارەکەیان و هەواڵەکانیان پارێزراو بن.

٣- مێژووزانانی ناوداری وەك: (لانج، باسكال، شميث، بروس، كوبرز) دەڵێن: ئەسڵ لە دینداریی دا، خوا بە یەکگرتن (توحيد) بووە و، بتپەرستیی (وثنية) ی بەسەردا هاتوە، لە ئەنجامی ئەوەدا کە مرۆڤەکان لایان داوە.

٤- لە (صحيح البخاري)دا هاتوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە گێڕدراوەتەوە، خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، کە لە بارەی (وَدّ) و، (سُواع) و، (يَغوث) و، (يعوق) و، (نسر)ەوە، ئەو پێنج (٥) پەرستراوەی گەلی نووح، گوتوویەتی:

(هِيَ أَسْمَاءُ رِجَالٍ صَالِحِينَ مِنْ قَوْمِ نُوحٍ، فَلَمَّا هَلَكُوا أَوْحَى الشَّيْطَانُ إِلَى قَوْمِهِمْ أَنْ انْصِبُوا إِلَى مَجَالِسِهِمْ الَّتِي كَانُوا يَجْلِسُونَ أَنْصَابًا وَسَمُّوهَا بِأَسْمَائِهِمْ، فَفَعَلُوا، فَلَمْ تُعْبَدْ حَتَّى إِذَا هَلَكَ أُولَئِكَ وَتَنَسَّخَ الْعِلْمُ، عُبِدَتْ)(١).

واتە: ئەوانە ناوی پیاوانی باش بوون لە گەلی نووح، دوای ئەوەی کە مردوون، شەیتان خوتخوتەی کردوە بۆ خەڵکەکە، کە لە کۆڕ و مەجلیسی ئەوانەدا، پەیکەرەکانیان دابنێن و بە ناوی ئەوانەوە بانگیان بکەن، بۆ ئەوەی خوا پەرستیی و دینداریی ئەوانتان هەمیشە لە یاد بێ، بەڵام کاتێك ئەوان مردن، نەوەکانی دوایی (ئەوەیان فەرامۆش کردوە، کە ئەوانە پەیکەرو وێنەی خوا پەرستەکان بوون، تاکو خواپەرستییان بێننەوە یاد)، پاش نەمانی زانست، ئەوانەیان پەرستوە.



---

(١) صحيح البخاري برقم: ٤٦٣٦، هەروەها (فَتحُ الباري)، ج٥، ص٥٣٥.

# گومانی پێنجەم

## دەڵێن: هەتا زیاتر زانست بەرەو پێش بچێ و، نهێنییەکانی گەردوون پتر ئاشکرا بن، زیاتر جێ بە ئیمان لێژ دەبێ! چونکە (إِذَا ظَهَرَ السَّبَب بَطَلَ العَجَب)[1]

(کاتی خۆی چونکە خەڵك هۆکاری ڕوودانی دیاردە سروشتییەکانیان نەزانیوە، بۆیە مرۆڤەکان پاڵیان داونە لای خوا)، ئەمەش قسەیەکی دیکەی مولحیدەکانە و گومان و ئیشکالێکی دیکەیانە، ئنجا ئەوان تەعبیرێکی دیکەش بەکاردێنن: خوای بۆشاییەکان، خوای کەلێنەکان (إله الفجوات)، واتە: مرۆڤەکان هەندێك دیاردەی سروشتییان دیون، نەیانزانیوە هۆی ڕوودانیان چییە؟ ئنجا بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییانە، یان ئەو نەزانییانە، پەنایان بردۆتە بەر خوا!

ئێمە لە وەڵامی ئەو گومانەدا، شەش ڕاستییان دەخەینە ڕوو:

١- خواناسیی کە هەر کام لە زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی پاڵپشتینی، زۆر لەوە بەهێزترە، بەو گومانانە تەفسیر بکرێ.

٢- بێگومان دەرکەوتنی ڕێك و پێکیی (نظام) وردەکاریی و یاساداریی، بەڵگەی هەبوونی یاسادانەر و خاوەن سیستمە، نەك بە پێچەوانەوە.

---

(١) واتە: هەر کات هۆکار زانرا، سەرسووڕمان نامێنێ.

٣- ئایا كاركردنی سەیارەیەكی ئۆتۆماتیك، یان هەر ئامێرێكی دیكە، كە خۆی كار دەكات، بەڵگەیە لەسەر نەبوونی دروستكەر (صانع)ێك؟ یان بە پێچەوانەوە؟ یانی: مادام ئامێرێكمان هەیە، كار دەكات، سەعاتێك قوڕمیش كراوە و كار دەكات، یان بە پاتری كار دەكات، ئایا ئەوە بێنیازمان دەكات لەوەی بڵێین: كەسێك دروستی كردوەو سازی كردوە؟ یان بە پێچەوانەوە: ناچارمان دەكات، بڵێین: كەسێك ئەو ئامێرەی دروستكردوە، وەك زۆرجار گوتوومانە:

بە بیابانێكدا دەڕۆی، شوێن پێیەك دەبینی، ئەو شوێن پێیە، ئەگەر هی ئاژەڵ بێ، ئەگەر هی دڕندە بێ، ئەگەر هی مرۆڤ بێ، هی هەر شتێك بێ، دەڵێی: ئەو شتە بێرەدا هاتوە، یان جوتیارێك كە زەوییەكەی دەكێڵێ، ئەگەر لەتكە گۆزەیەك، یان كانزایەكی دراو بدۆزێتەوە، بە پێی سروشتی ئەو شتە، كە دۆزیویەتەوە، ئەنجامگیریی دەكات و، هەڵدەهێنجێ كە ئەو شوێنە، شوێنەواری فلان گەل و نەتەوەیە، فلان دەوڵەتەیە.

٤- زاراوەی خوای بۆشاییەكان (إله الفجوات)، ئەگەر لەگەڵ واقیعی ڕۆژئاوا و ئایینی شێوێنراوی جوولەكە و نەصرانییدا بگونجێ، كە دژی زانست و زانیاریی بوون، ئەوەی كە پێی دەڵێن: (كتێبی پیرۆز)، (الكتاب المقدس)، باسمان كرد و هەڵمان سەنگاند، كە چەندان شتی تێدان: لەگەڵ عەقڵ و واقیع و زانستدا تێكدەگیرێن، بەڵێ ئەگەر ئەو زاراوەیە (خوای بۆشاییەكان) لەگەڵ ئەوێدا بگونجێ، بە هیچ جۆرێك لەگەڵ ئیسلامدا سازگار نیە.

٥- ئەگەر ڕاستە خواناسیی زادەی نەزانینە، ئەدی بۆچی هەتا زیاتر زانست بەرەو پێشەوە دەچێ، بیری خواناسیی، بە تایبەتی ئسلام، زیاتر گەشە دەكات و، بۆچی ڕۆژانە خەڵكی زانا و شارەزا و خاوەن بڕوانامەی بەرز، لە بوارە جۆرا و جۆرەكانی زانستدا، لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای دنیادا، مسوڵمان دەبن؟

٦- بە پێچەوانەوە ئێمە دەڵێین: هەتا زیاتر زانست پەردە لەسەر نهێنییەكانی ژیان و گەردوون و خەڵك هەڵبداتەوە، خواناسیی زیاتر خۆری دەدرەوشێتەوە، وەك خوا (سبحانه وتعالى) فەرمویەتی:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت.

واتە: لەمەودوا نیشانەکانی خۆمانیان پێشان دەدەین، لە ئاسۆیەکاندا و لە خودی خۆشیاندا، تاکو بۆیان دەربکەوێ کە هەقە (واتە: کە قورئان هەقە، یان بۆیان دەربکەوێ کە خوا هەقە، چونکە نیشانەکانی زیاتر دەرکەوتوون)، ئایا بەس نیە بۆ پەروەردگارت، کە چاودێرە بەسەر هەموو شتێکەوە.

ئەگەر تەماشای واقیعیش بکەین، دەبینین هەتا زیاتر زانست بەرەو پێشەوە دەچێ و، دیزاین (تصمیم) و ڕێك و پێکیی و وردەکارییەك، کە لە دروستکراوەکانی خوا دا هەیە، زیاتر دەردەکەوێ، زیاتر ئێمە ناچار دەکا خوابناسین، هەروەك ئێستا لە ڕۆژئاوا تەوژمێکی بەهێز هەیە، بە ناوی: (تەوژمی دیزاین)، (تیار التصميم)، ئەوانەی وردەکاریی گەردوون و بوونەوەر دەکەنە بەڵگە، لەسەر هەبوونی ڕێکخەرێك و پەروەردگارێك و دیزاینکارێك، کە خوای مەزنە (سبحانه وتعالى).

ئنجا با نموونەیەك بێنینەوە لەو بارەوە، کە پێشتریش باسمان کردوە:

نەخشەی جینۆم، یان شریتی (DNA) کە لە نێو هەر خانەیەکی جەستەی مرۆڤ دا هەیە، کە ژمارەی خانەکانەکانی جەستەی هەر مرۆڤێك بە سەد (١٠٠) تریلیۆن مەزندە دەکرێ، واتە: سەد هەزار ملیار، ئنجا ئەو شریتی (DNA) یان نەخشەی جینۆم، لە هەر خانەیەکدا هەیە، کە لە شێوەی کەتەلۆکێك دایە و ئەو کەتەلۆکە لە شێوەی کتێبێك دایە، بە شێوەی کۆد (cod) سەرجەم زانیارییەکانی تێدا دانراون و، ئەو زانیارییانەی لە شریتی بۆ ماوەیی کڕۆمۆسۆمەکانی هەر خانەیەك دا هەن، مەزندە دەکرێن بە هەزار (١٠٠٠) بەرگ، هەر بەرگی پێنج سەد (٥٠٠) لاپەڕ، کە لە هەر بەرگەدا سێ ملیار (٣٠٠٠٠٠٠٠٠٠) پیتی تێدا بێ، ئنجا هەموو ئەو زانیارییانە کە لە هەر خانەیەك دا هەن، لەسەر پانتایی یەك لەسەر هەزاری میللمەتر (١/١٠٠٠ ملم)، واتە: یەك مایکرۆ جێگایان بۆتەوە و، ئەو شریتەش سەد هەزار (١٠٠٠٠٠) جار بە دەوری خۆیدا پێچی خواردوە و، ئەگەر ئەو




شریتانەی نێو ئەو سەد تریلیۆن خانەیەی جەستەی مرۆڤێك، بخرێنەوە سەر یەك، درێژییەکەیان هێندە دەبێ کە پێنج ملیۆن (٥٠٠٠٠٠٠) جار نێوان زەوی و خۆر ڕایەڵە دەکات، کە دەزانین خۆر سەد و پەنجا ملیۆن (١٥٠٠٠٠٠٠٠) کیلۆمەتر لە زەوییەوە دوورە!!

ئنجا هەموو ئەو زانیارییانە بە سیستمی چواریی، واتە: (CGTA) دانراون، زۆر لە کتێبەکان ئەو زانیارییانەیان تێدا باسکراوە، بە تایبەت کتێبی (There's a God)[1] (خوایەك هەیە) بە وردیی باسی ئەو زانیارییەی کردوە و، ئەویش لە سەرچاوە متمانە پێکراوەکانەوە، وەریگرتوە.



---

(١) هی ئەنتونی فلو (Antony flew)یە.

# گومانی شەشەم

## دەڵێن: وزەی سالیب و موجیبی گەردوون، یەکسانن، کەواتە: گەردوون لە هیچەوەیە

(لورانس کراوس - Lawrence M.krauss) کتێبێکی هەیە بە ناوی (گەردوون لە نەبوونەوە)، (کون من لا شيء)، ئەوە دەکاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە گەردوون لە نەبوونەوە پەیدا بووە، بەبێ پەیداکەرێك، دەڵێ: وزەی نێو گەردوون (وزەی موجیبی) و (وزەی سالیبی)، گەرمیی و ساردیی، یەکسانن، واتە: وزەی موجیبی گەردوون لەگەڵ وزەی سالیبی گەردوون کۆبکەیەوە، دەکاتە سفر! کەواتە: گەردوون لە نەبوونەوە هاتوە و گەردوون نەبوویە.

ئنجا (ستیفن هوکینگ)یش پشتگیریی ئەو قسەیەی دەکات و دەڵێ: ئەوە ڕاستییەکی زانستییە! بەڵام ئەو دوو مولحیدە، دوو شتیان لێك تێکەڵ بوون: نەبوونی بوون (عَدَمُ الوُجُود) و بوونی ئیعتیباریی (الوجود الإعتباري) یان لێ تێکەڵ بوون.

وەك کەسێك کە بیرێك لێ دەدات، بێگومان ئەو گڵ و خۆڵەی لە بیرەکە هێنراوەتە دەرێ، لەگەڵ چاڵایی بیرەکەدا یەکسانە و، ئەگەر کۆیان بکەیەوە دەبێتەوە بە هیچ، بەڵام ئایا لە واقیعدا، وایە؟ بەڵێ ئەو گڵەی هێنراوەتە دەر لە بیرەکە، یەکسانە لەگەڵ ئەو چاڵییەی دروست کراوە و، چاڵایی و بیرەکە، گڵەکەی بخەیەوە نێو، پڕدەبێتەوە، وەك خۆی لێدێتەوە، بەڵام ئایا کە لە ڕووی

ماتماتیکییەوە، ئەو گڵە یەکسانە بە چاڵایی نێو بیرەکە، مانای وایە: دەکاتە هیچ؟ نەخێر لە واقیعدا گڵێك هێنراوەتە دەر و، بیرێکیش لێدراوە، دوو واقیعی بەرجەستەی تازە هاتوونە دی.

ئنجا وزەی نێو گەردوونیش: کە نیوەی موجیبە و، نیوەی سالیبە، مانای وانیە: سفرە، بەڵام خوا (سبحانه وتعالى) هاوسەنگیی ڕاگرتوە، کە وزەی سالیب و موجیبی گەردوونی بە یەکسانیی خوڵقاندوە و، هەم وزە سالیبەکە بوونی هەیە و، هەم وزە موجیبەکەش بوونی هەیە، هیچیان نەبوون (عدم) نین، ئنجا کە بوونیان هەیە، وەك پێشتر گوتوومانە: بوون (وجود) هەرگیز بەبێ هۆکار لە نەبوون (عدم)ەوە پەیدا نابێ، بەڵێ، ئێمەش دەڵێین: ماددەی گەردوون و گەردوون لە نەبوونەوە هاتوون، بەڵام بە بێ پەیداکەر (موجِد)ێك، بوون لە نەبوونەوە پەیدا نابێ.

# گومانی حەوتەم

## دەڵێن: هەبوونی هێزی كێشندە، بێنیازمان دەكات لە بوونی خوا

ئەمەش قسەیەكی (ستیڤن هوكینگ)ە، لە كتێبی (The grand design)[1]، كە ئەمە دەقە عەرەبییەكەیەتی: (وبسَبَب وجُود قانونٍ، كَقَانون الجاذبية، فَإِنَّ الكَوْنَ يُمْكِن، وَسَوْفَ يُحْدِث نَفْسَهُ بنَفْسِهِ من لا شَيء)!

واتە: بەهۆی یاسایەك وەك یاسای ڕاكێشانەوە، دەگونجێ گەردوون لە نەبوونەوە خۆی بێنێتە دی.

بۆیە داوا لە خوێنەرانی بەڕێز دەكەم:

هەر لە خۆوە سەرسام نەبن، بە ناوی زل، زۆر كەس هەیە، ڕواڵەت جوانی نێوەڕۆك وێرانە، دوور كوژی نیزیك خەسارە، سەرقۆزی بن ئاڵۆزە، ئەم (ستیڤن هوكینگ)ە، كە هەندێك بردوویانەتە ئاستێكی زۆر بەرز، ئەو قسە بێسەر و بەرە دەكات، دەڵێ:

بە هۆی هەبوونی یاسایەك وەك یاسای كێشكردن، گەردوون دەتوانێ و، بە تەئكید دەتوانێ خۆی خۆی دروست بكات لە نەبوون!!

---

(١) ص٢٢٧.





لە وەڵامی ئەو قسەیەدا، سێ ڕاستیی گرنگ دەخەینە ڕوو:

**یەکەم:** شتێکی ئاشکرایە بۆ بابای ڕاماو (متأمِّل) کە هەموو یاساکانی کە لە گەردووندا هەن، بوونێکی خودییان نیە، بەڵکو بوونێکی داڕنرا و (منتزع)یان هەیە، چونکە تەنەکانن کە یەکدی کێش دەکەن، واتە: هێزی کێشکردن، شتێکی جیا نیە لەگەڵ تەنەکان، بۆ وێنە: ئەگەر خۆر نەبێ و، زەوی نەبێ و، یەکدی کێش نەکەن و، خۆر زەوی بە دەوری خۆیدا و، بە دەوری خۆریشدا نەخولێنێتەوە، ئەو کاتە هێزی کێشکردن بوونی نابێ، کەواتە: بەبێ هەبوونی خۆر و زەوی، هێزی کێشکردن بوونی نیە، واتە: هێزی کێشکردن، شتێکی زیاد نیە لە تەنەکان.

**دووەم:** کاتێك یاسای کێشکردن لە نێوان خۆر و زەویدا پەیدا بووە، کە خۆر هەبووە و زەوی هەبووە، هەروەها کەهکەشانەکان پەیدا کراون، ئنجا یاسا و هێزی کێشکردن لە نێوانیاندا پەیدا کراوە و، هێزی کێشکردن بەرهەمی هەبوونی کەهکەشانەکان و ئەستێرەکان و خڕۆکەکانە.

**سێیەم:** پێشتر باسمان کرد لە باسی قوناغەکانی پەیدابوونی مادده و گەردووندا، کە سەرەتا نە هێزی کێشکردن هەبووە، نە هیچ کام لە چوار (٤) هێزە سەرەکییەکە:

١- هێزی نێوکیی بەهێز.

٢- هێزی نێوکیی بێهێز.

٣- هێزی کەهرۆموگناتیسیی.

٤- هێزی کێشکردن.

تاکی پێکهێنەری گەردوونیی (Singularity) (المفردة)، تاکو ئەوە نەتەقیبۆوە، هیچ شتێك نەبوو، نە کات هەبوو، نە شوێن هەبوو، نە کێشکردن هەبوو.

کەواتە: شتێکی زۆر بێ جێیە، بگوترێ: لەبەر ئەوەی هێزی کێشکردن هەیە، پێویستییمان بەوە نیە بڵێین: ئەو گەردوونە خوا هێناویەتە دی! هێزی کێشکردن یەکێکە لەو هێز و یاسایانەی کە بەدیهێنەری گەردوون لە نێو

گەردووندا دایناون و، کاتێك گەردوون نەبووە، هێزی کێشکردن نەبووە، کەواتە: چۆن گەردوون پاڵ دەدەیە لای شتێك، کە دەرهاویشتەی خودی گەردوونە؟! ئەمە وەك ئەوە وایە، کەسێك کتێبێکی نووسیبێ، ئنجا بڵێی: ئەو کتێبە ئەو مرۆڤەی هێناوەتە دی! ئاخر ئەو کتێبە دەرهاویشتەی عەقڵ و هۆش و بیرکردنەوەی ئەو مرۆڤەیە و، تاکو مرۆڤەکە نەبووە، کتێبەکە نەبووە، ئەدی چۆن وەدیهاتنی مرۆڤەکە، پاڵدەدەیە لای بەرهەمێکی خۆی؟ بە هەمان شێوەش: چۆن گەردوون پاڵ دەدرێتە لای هێزی کێشکردن، کە تاکو گەردوون نەبووە و، تەنەکان یەکدییان کێش نەکردوە، هێزی کێشکردن پەیدا نەبووە؟! ئایا هەبوونی یاسا، ئێمە بێ نیاز دەکات لە یاسادانەر؟

بۆیە بیرمەندی ئیرلەندیی (کلیف لویس) دەڵێ:

یاسای کۆکردنەوە لە ماتماتیکدا، لە ژماردندا، ئەو ئەندازەیەی کە هەتە، بۆت باس دەکات، دەڵێی: دوو هەزار کۆ دوو هەزار، دەکات چوار هەزار (٢٠٠٠+٢٠٠٠=٤٠٠٠)، بەڵام ئەو یاسایە، هیچ شتێکت ناخاتە دەست، کە تۆ دەڵێی: ئەو یاسایە هەیە، ئەو یاسایە وەسفی حاڵەتەکەت بۆ دەکات، بەڵام هیچ لە حاڵەتەکە ناگۆڕێ، ڕێك وەك ئەوە وایە، تۆ پارەی خۆت لە بانکدا دانابێ، دوایی بڵێی: ئەوەندەم لە بانکدا داناوە، دوایی ئەوەندەی دیکەشم دانا، ئەوەندە کۆ ئەوەندە دەکاتە ئەوەندە (-- + -- = --)، ئایا هیچ دەکەوێتە گیرفانت، تاکو ڕاینەکێشی؟ بە تەئکید نەخێر، ئەو یاسایەنەش کە هەن، نابنە هۆی پەیدابوونی هیچ شتێك، بەڵکو یاسا پێویستیی بە یاسادانەر هەیە، هەروەها پێویستییشی بە جێبەجێکار هەیە.







## گومانی هەشتەم



## دەڵێن: دوای سەرهەڵدانی زانستی (میکانیکی کوانتۆم)، یاسای هۆکاریی (قَانون السَّبَبيَّة) کە بەهێزترین بەڵگەی بوونی خوایە، هەڵوەشاوەتەوە

بۆ دەرخستنی پووچەڵیی ئەم گومانەش، سێ ڕاستییان دەخەینە ڕوو:

**یەك:** ئیسپاتی بوونی خوا - وەك لە بەشی دووەمی ئەم بابەتەدا باسمان کرد - بەڵگەکانی ناژمێردرێن و هەمووشیان بەهێزن و، هەر کامیان لە بواری خۆیدا، بۆ خەڵکی خۆی دڵنیاکەرە، کە ئەم گەردوونە و ئەم ژیانە و ئەم مرۆڤە، خاوەنێکیان هەیە و، پەیداکەرێکیان هەیە و، مشوورخۆرێکیان هەیە.

**دوو:** ئەوە ڕاست نیە، کە زانستی (کوانتۆم) (میکانیکا الکم)، یاسای هۆکاریی هەڵوەشاندبێتەوە، چونکە:

ئەوە کە بەهۆی تایبەتمەندیی دووانەتیی (مثنوية)، لە ئەلیکترۆن و فۆتۆنەکاندا، کە دوو حاڵەتی: شەپۆل و تەن (الـمَوْجَة والجسم)یان، هەن و، لە سۆنگەی ئەو حاڵەتی دووانەتییەوە، ناگونجێ بە وردیی کات و شوێن، بۆ تەنۆلکەکان (جُسَیمات) دیاریی بکرێن، وەك (هایزنبیرغ) زانای فیزیایی ئەڵمانیی گەورە گوتوویەتی و یاسای: نادڵنیایی (اللَّایقین)ی بۆ داناوە، دەڵێ:







(يستحيل أن نقيس الكميات المقترنة "مثل الحركة والموقع" في الوقت نفسه بدقة كاملة)[١].

واتە: ئەستەمە بتوانین بە وردیی و بە تەواویی، چەندێتییە پێکەوەکان (جووتەکان) پێکەوە قیاس بکەین، وەك جووڵەو شوێن لە یەك کاتدا.

بەڵکو یان جووڵەکەی دیاریی دەکەین و، دەڵێین: بە خێرایی ئەوەندە دەڕوات، بۆ وێنە: ئەلیکترۆن بە خێرایی هەزار (١٠٠٠) کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا، بە دەوری نێوکدا دەخولێتەوە و، هەزار (١٠٠٠) کیلۆمەتر لە چرکەیەك دا دەبڕێ بە دەوری نێوك دا، ئنجا ئێمە دەبێ یان جووڵەکەی دیاریی بکەین، یان شوێنەکەی دیاریی بکەین و، لە یەك کاتدا هەردووکیانمان بۆ دیاریی ناکرێن.

ئنجا ئەمە پەیوەستە بە سروشتی تەنۆلکە خوار گەردیلەییەکانەوە و، هیچ تێکگیرانێکی لەگەڵ یاسای هۆکارییدا نیە.

سێ:

أ/ (ماکس بورن) کە یەکێکە لە دامەزرێنەرانی (میکانیکی کوانتۆم) و خاوەنی خەڵاتی (نۆبڵ)ە، لە فیزیادا، بە تەفصیل باسی ئەوەی کردوە، دەڵێ: (القَوْلُ بأنَّ الفِيزِيَاء قَدْ تَخَلَّت عَنِ السَّبَبِيَّة، هُوَ قَوْلٌ لاَ أَسَاسَ لَهُ مِنَ الصحَّة، صَحِيحٌ أَنَّ الفِيزِيَاء الحَدِيثَة قَدْ تَخَلَّت عَنْ بَعْضِ الأَفْكَارِ التقليديّة وَعدَّلت فِيهَا، لَكِن لووقَفَتِ الفِيزِيَاءُ عَنِ البَحْثِ عَنْ أَسبَابِ الظواهِر، فَلَنْ تُصبحَ حِيْنَهَا عِلْماً... الحَتْمِيَّة لَيْسَتْ هِيَ السَّببية، وَالحَتْمِيَّة هِيَ الَّتِي هَدَمَتْهَا مِيْكَانِيكا الكَمْ، لأَنَّ السَّببية هِيَ البَحْث بِإِعْتِمَاد الأَشْيَاء فِي وُجُودِهَا عَلَى أَشْيَاء أَو شُروطِ مُعَيَّنَة، وَهَذَا مَا زَالَ صَحِيْحَاً فِي فِيزيَاء الكَمْ)[٢].

واتە: ئەو قسەیەی گوایە: فیزیا دەستبەرداری یاسای هۆکاریی بووە، قسەیەکە هیچ بنەمایەکی ڕاستی نیە، بەڵێ، فیزیای تازە دەستبەرداری

---

(١) بڕوانە: إختراق عقل، س٧٠- ٩٢، هەڵبەتە ئێمە لە تەرجەمەی عەرەبییەوە قسەکانیمان هێناوە، ئەگەرنا ئەو بە زمانێکی دیکە گوتوویەتی.

(٢) إختراق عقل، ص٧٠- ٩٢.

هەندێك لە بیرۆكە كلاسیكییەكان بووە و هەندێكیانی هەموار كردۆتەوە، بەڵام ئەگەر فیزیا دەستبەرداری لێكۆڵینەوە لە هۆكاری دیاردەكان ببێ، ئەو كاتە بە زانست دانانرێ... {یاسای هۆكاریی هەمیشە هەر هەیە، یاسایەكی ئەزەلیی و ئەبەدییە، هەموو پەیدابووێك پەیداكەرێكی هەیە، هەموو مشوور لێخوراوێك مشوورخۆرێكی هەیە، هەموو ڕێكخراوێك ڕێكخەرێكی هەیە، ئەمە یاسایەكە و بەڵگە نەویستێكی عەقڵییە}[1].

.. حەتمیی بوون، كە دەبێ ئەو شتە هەر ببێ، ئەوەیە كە (میكانیكی كوانتۆم) لایبردوە، بەڵام هۆكاریی، بریتیە لەوە كە شتەكان بۆ بوونیان، پشت بە شتێكی دیكە، یان بە چەند مەرجێكی دیارییكراو دەبەستن، ئەوە هەر بەردەوامە لە فیزیای كوانتۆم دا و، گۆڕانی بەسەردا نەهاتوە.

ب- هەروەها هەر لەو بارەوە (ستیفن هوكینگ) لە كتێبەكەی خۆی: (التصمیم العظیم) (The Grand Design)، (دیزاینی مەزن)دا[2]، دەڵێ:

(قَدْ یَبْدو أَنَّ الفِیزِیَاء الكُوانْتِیَّة تُقَوِّضُ فِكْرَةَ أَنَّ الطبیعَة تَخْضَعُ للقَوَانِیْن، وَلَكِنْ هَذَا لَیْسَ صَحِیْحَاً..).

واتە: وا دێتە بەرچاو كە فیزیای كوانتیی، بیرۆكەی ئەوە كە سروشت ملكەچە بۆ یاساكان، دەیرووخێنێ، بەڵام ئەوە ڕاست نیە (یاساكان هەر وەك خۆیانن، بە تایبەت یاسای هۆكاریی).

---

(١) نێوان كەوانەكان زیادەی خۆمە.

(٢) ص٧٢.

# گومانی نۆیەم

## دەڵێن: گەردوونە زۆرەکان (الأَكْوَان المُتَعَدِّدَة) جێگرەوەی بەدیهێنرانی گەردوونە لە لایەن بەدیهێنەرێکەوە

ئەمیش کۆمەڵێك لە مولحیدەکان، بە تایبەت ئەوانەی کە لە بواری فیزیادا شارەزاییان هەیە، ئەم بیرۆکەو گومانەیان خستۆتە ڕوو، بە تایبەت (ستیفن هوکینگ)، بەڵام ئێمە لە وەڵامیاندا پێنج ڕاستیی پووچەڵکەرەوەی ئەو ئەفسانەیە دەخەینەڕوو:

**یەکەم:** لە ڕاستییدا ئەو بیردۆزەیە کە یەکێك لەوانەی تەبەننیی کردوە، مولحیدی ناودار: (ستیفن هۆکینگ)ە، لە کتێبەکەی خۆی (دیزاینی مەزن)دا، هەروەها لە وتوویژەکەی لەگەڵ (ستیفن واینبرغ)دا گوتوویەتی: (إِذْا اكْتَشَفْتَ هَذَا الكَوْن المُدْهِش المُعَدَّ فِعْلِيَاً بعِنَاية، أَعْتَقِد لَيْسَ أَمَامَك سِوَى تَفْسِيرَين اثْنَيْن: إِمَّا خَالِق عَظِيم، أَو أَكْوَانٌ مُتَعَدِّدَة)[1].

واتە: ئەگەر بۆت دەرکەوت ئەم گەردوونە سەرسوڕهێنەرە کە زۆر بە وردەکاریی ئامادەکراوە، (ئەگەر ئەوەت بۆ دەرکەوت)، پێم وایە تەنیا دوو ڕێت لە پێشن: یان بەدیهێنەرێکی مەزن، یاخود گەردوونانێکی زۆری بێ ژمارە.

---

(١) موسوعة: الرد على الملحدين العرب، د. هيثم طلعت، ص٣٤٢.





بەڵام بێگومان ئەو بیردۆزەیە جگە لە خەیاڵێکی پووچ و بۆش، هیچی دیکە نیە، ئنجا جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کە بڕوا پێبووان (معتقدین)ی ئەو بیردۆزەیە دەڵێن:

ئەو گەردوونانە دەبێ ژمارەیەکی یەکجار زۆربن، دە توان پێنج سەد (١٠[٥٠٠])، یانی: ژمارە (١٠)، پێنج سەد سفری لەپێشەوە بێ، ئەوەندە گەردوونە دەبێ هەبن، وەك (ئەڵتەر ناتیف)و بە دیلی ئەوەی دان بە بوونی بەدیهێنەرێك دابێنین، بۆ ئەو گەردوونەی دەیبینین! ئنجا ئەو هەموو گەردوونانە، کە هەموویان بە خەیاڵ دروستمان کردوون و، کوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (کەس بە خەیاڵ نەبووە بە ماڵ)، لە نێو ئەو هەموو گەردوونانەدا، دەگونجێ بە ڕێکەوت (صُدفة) ئەم گەردوونەی ئێستامان دروست بووبێ، وەك (ستیفن هوکینگ) لە کتێبی ناوبراودا گوتوویەتی!![1]

کە بە ڕاستیی ئەمە ڕاکردنێکی هەر زۆر عەیبدارکەرانە (هروب مُعیب)یە، لە دان هێنان بە بوونی خوادا، چونکە: ئەم گەردوونە، ئەوە هەیە و دەیبینین و مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین، پڕە لە یاسا و سیستماتیکەو لێوانلێوە لە وردەکاریی و مرۆڤ ناچار دەکات بڵێ: دیزاینکارێك و، بەڕێوەبەرێك و، ڕێکخەرێك و، بەدیهێنەرێکی هەیە، بەڵام جەنابی ستیفن هۆکینگ! ئەو هەموو گەردوونانەی کە تۆ بە خەیاڵ پلاو دروستیان دەکەی، بەڵگەت چییە؟

**دووەم:** بۆیە دەڵێین: بە ڕاستیی شتێکی زۆر نا ماقووڵە: هەر بۆ ئەوەی دان بە بوونی خوای بەدیهێنەردا نەهێنی، هەر بە خەیاڵ تریلیۆنان گەردوونی دیکە دروست بکەی، ئنجا بڵێی: مادام ئەو گەردوونانە هێندە زۆرو زەوەندن، ڕێی تێدەچێ بە ڕێکەوت گەردوونێکی بۆ ژیان شیاوی وەك ئەوەی ئێستای ئێمەیان لێ پەیدا بووبێ!

ئنجا ئایا بڕواهێنان بە خوای تاك و تەنیای بەدیهێنەری هەموو شتێك، لە لای عەقڵ ئاسانترە، یان داتاشینی تریلیۆنان گەردوونی خەیاڵیی؟

---

(١) بڕوانە: التصمیم العظیم، ص ٩٨.

ئایا ئەمە وەك (ئەنتۆنی فلۆ)، لە كتێبەكەی خۆیدا (There is a God)، (خوایەك هەیە)[1]، دەڵێ: ئەمە وەك ئەوە وایە، كە قوتابییەكی تەمبەڵ بۆ پۆزش هێنانەوە بۆ مامۆستایەكەی، كە دەرسەكەی ئامادە نەكردوە و ئەوەی پێویست بووە، بینووسێتەوە، نەینووسیبێتەوە، بڵێ: مامۆستا! دەرسەكەم نووسیبۆوە، بەڵام سەگێك لە ڕێگا تووشم بوو، ئەو پەڕەی نووسیبوومەوە لە دەفتەرەكەم، دڕاندی و خواردی! ئنجا كاتێك مامۆستاكەی بڵێ: بڕوا ناكەم شتی وا ڕوویدابێ! ئاخر چۆن سەگ پەڕی دەفتەر لێدەكاتەوەو دەیخوات؟! قوتابییەكە بۆ پاساو دانەوەی پۆزشەكەی خۆی و ڕازیی كردنی مامۆستاكەی بڵێ: ئاخر مامۆستا! سەگەكان هێندە زۆر بوون، ژمارەیان نەدەزانرا و، پەڕی دەفتەرەكەمیان خوارد، ئنجا مامۆستاكەی بڵێ: هەر بڕوا ناكەم و، قوتابییەكەش بڵێ: مامۆستا! چۆن بڕوا ناكەی؟ ئایا لە نێو ژمارەیەكی نەزانراوی سەگاندا، یەكێكی كاغەز خۆریان تێدا پەیدا نابێ؟!

(ستیفن هوكینگ) یش دەڵێ: یان دەبێ دان بە بوونی خوا دابێنین، یان دەبێ بڵێین: دە (١٠) توان پێنجسەد (٥٠٠) (١٠^(٥٠٠)) گەردوون هەیە، (بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەك هەبێ)، دواییش دەڵێ: ئایا لە نێو ئەو هەموو تریلیۆنان، تریلیۆنان گەردوونەدا، یەكێكی وەك هی ئێمەیان تێدا هەڵناكەوێ؟! كە لە ڕاستییدا وەك گوتمان: ئەمە تەنیا خەیاڵە، پێشینانیش گوتوویانە: (كەس بە خەیاڵ نەبووە بە ماڵ)!.

**سێیەم:** (لیونارد سوسكایند) دەڵێ: دۆزینەوەی گەردوونێكی دیكە، موستەحیلە، جگە لەو گەردوونەی خۆمان، ئەستەمە لە ڕووی زانستیی و لۆژیكییەوە، پەی بە گەردوونێكی دیكە ببەین، ئەویش بە هۆی (تەنۆلكەی ئاسۆ)، (The Partical Horizon)، (أفق الجُسَيم)ەوە، كە بریتیە لە دوورترین ماوەی كە ئەو تەنۆلكانەی زانیاریی لێوە بە ئێمە دەگەیەنن، دەبێ بیبڕن، یانی: ئەو تیشك و تەنۆلكەیەی لەو پەڕی گەردوونەوە بۆ ئێمە دێ و، ئێمە بە هۆی

---

(١) (عمرو شریف) لە ژێر ناوونیشانی: (رحلة عقل)دا وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبیی.

ئەو فۆتۆنانەوە، زانیارییمان پێدەگات، کە دەبێ ملیاران ساڵی تیشکیی بەڕێوە بێ و، لەو پەڕی گەردوونەوە بێ، ئنجا ئەو تیشکە بە ئێمە دەگات، کە وەك پێشتر باسمان کرد: تیرە (قطر)ی گەردوون، یان ئەو پەڕو ئەوپەڕی گەردوون، هەندێکیان بە سێزدە (١٣) ملیار ساڵی تیشکیی و، هەندێ بە پازدە (١٥) ملیار و، هەندێ بە (٢٠) ملیار ساڵی تیشکیشی دادەنێن، ئنجا ئەگەر گریمان گەردوونێکی دیکە هەبێ، دەبێ لە پشت ئەو ئاسۆیەشەوە بێ، کە بە پازدە بیست ملیار ساڵ تیشکەکەی دەگاتە ئێمە!

**چوارەم:** هەر بۆیەش زانای گەردوونناس (جورج ئیلیس - George Ellis) گوتوویەتی: گریمانەی گەردوونە زۆرەکان (الأكوان المتَعَدِّدة)، هیچ پەیوەندیی بە زانست و مەنتیقەوە نیە و، لە نێو بازنەی زانیارییدا نیە، بەڵکو لە جوغزی فەلسەفە دایە.

بەڵام من دەڵێم: لە جوغزی فەلسەفەش دا نیە، بەڵکو لە جوغزی خەیاڵ دایە، خەیاڵ و ئەندێشە، چونکە هەر شتێك تۆ بەڵگەی زانستییت لەسەری نەبێ و، بەڵگەی لۆژیکییت لەسەری نەبێ و، بەڵگەی وەحییشی لەسەر نەبێ، کەواتە: خەیاڵ و ئەندێشەیەکی ڕووتەو وەك گوتیشمان: (کەس بە خەیاڵ نەبووە بە ماڵ).

**پێنجەم:** گەردوونەکان ژمارەیان هەرچەندە زۆر بێ، هەر پێویستییان بە بەدیهێنەر هەیە، ئنجا ئەگەر گەردوونێك پێویستیی بە بەدیهێنەرێك هەبێ، ئەدی دە (١٠) توان پێنجسەد (٥٠٠) ($١٠^{(٥٠٠)}$) گەردوون! ئایا ئەوانیش پێویستییان بە بەدیهێنەر نیە؟!

بۆیە وەك گوتمان: ئەمە ڕاکردنێکی زۆر عەیبدارکەرانەیە، لە دانهێنان بە بوونی خوای تاك و تەنیادا سبحانه وتعالى.

## گومانی دەیەم

### دەڵێن: گەردوون حاڵەتی لەرەلەر (تَذبْذب)ی هەیە و، بەردەوام دێتەوە یەك و، پاشان دەتەقێتەوە:

هەندێکیان بەو حاڵەتە گریمانە کراو (حالة مفترضة)ە، دەڵێن: حاڵەتی دەوریی، گوایە: تاکی گەردوونیی (Singularity - المفردة)، کە زۆر زۆر لە ئەلیکترۆنیش بچووکتر بووە و بچووکییەکەی لەو پەڕی دابووە، هەروەها گەرمییەکەی لەو پەڕی دا بووە و، لەو پەڕی کەمیی کاتیشدا تەقیوەتەوە (بە پێی نەگۆڕی بلانك (ثابت بلانك)، کە پێشتر باسمان کردوە)، ئنجا بە پێی ئەو قسەیە: جارێکی دیکە گەردوون دێتەوە یەك و دەبێتەوە بە سینگلارتی و، دووبارە دەتەقێتەوە و، دوایی دێتەوە یەك و، دواتر دەتەقێتەوە و...هتد! دەڵێین: بە داخەوە زۆر لەوانەی ئەهلی ئیلحادن، بانگەشەی ئەوە دەکەن کە قسەی زانستییانە و لۆژیکییانە دەکەن!! ئنجا دەڵێین: ئەمەتان لە کوێ هێنا و لە چ تاقیگایەکدا تاقیکراوەتەوە و، چ عەقڵ و لۆژیکێك ئەوە پەسند دەکات؟!!

ئەگەر بڵێن: زانست ئێمەی ناچار کرد بمانباتەوە سەر (سینگلارتی)، بەڵام چ بەڵگەیەك هەیە کە پێش ئەو (Singularity)یە گەردوونێك هەبووە و، بۆتەوە بە سینگلارتی و دووبارە تەقیوەتەوە، لە کوێدا شتی وا هەیە؟!

بۆیە دەڵێین:

**یەکەم:** ئەم بیردۆزەیەش وەك هاوەڵە پێشووەکەی، جگە لە گریمانەیەکی خەیاڵیی دوور لە زانست و لۆژیك، شتێکی دیکە نیە و، هیچ زانایەکی موعتەبەر باسی نەکردوە و هیچ زانایەکی موعتەبەریش کە ڕێزی زانستەکەی خۆی بگرێ، شتی وا باس ناکات.

**دووەم:** ئەم بیردۆزەیەش وەك هاوەڵە پێشووەکەی ئەگەر گریمان ڕاستیش بوو، هەر نابێتە بە دیل بۆ پێویستبوونی بەدیهێنەر (خالق)، چونکە: ئایا کێ ئەم گەردوونە بە لەرەلەرەی هێناوەتە بوون؟ کێ ئەم گەردوونەی لەو تاکی گەردوونییەوە دروستکردوە؟ دوایی کێ ئەو گەردوونە بچووك دەکاتەوەو دووبارە دەیتەقێنێتەوە؟ ئەوە پێویستیی بە بەدیهێنەرێکە، چونکە مادده بۆ خۆی هیچ گۆڕانێك بەسەر خۆیدا ناهێنێ و، بە پێی سێ یاسایەکەی (نیوتن):

١- هیچ تەنێکی وەستاو ناجووڵێ، تاکو نە جووڵێنرێ.

٢- تەنێك کە جووڵا، ناوەستێ لە خۆوە، تاکو وەستێنەرێك نەیوەستێنێ.

٣- گەرمیی لە تەنە گەرمەکانەوە بۆ تەنە ساردەکان دەچێ، تاکو یەکسان دەبن و، پێچەوانەش نابێتەوە.

**سێیەم:** بە پێی یاسای دووەمی دینامیکای گەرمیی، کە پێشتریش باسمان کرد، ئەم بیردۆزەیە هەڵەیە، چونکە ئێستا پلەی گەرمیی گەردوون، سێ و نیو (٣،٥) پلەی ڕەهایە، واتە: سێ و نیو (٣،٥) پلەی (کاڵڤن)ە[1].

ئنجا ئەگەر ئەو قسەیە ڕاست بووایە، ئەو حاڵەتەی گەردوون، (واتە: هاتنەوە یەك و تەقینەوە (الإنكماش والإنفجار))، هەبووایە لە ئەزەلەوە، دەبووایە ئێستا پلەی گەرمیی گەردوون بێ سنور و ڕەها (لانهائي ومطلق) بووایە، چونکە ڕێژەی (ئەنترۆپیا - پیربوون) لەگەڵ هەر دروست بوونێکی گەردووندا، زیاد دەکات.

---

(١) پێشتر باسمان کردوە کە پلەی گەرمیی (کاڵڤن) کە پلەی ڕەها (مطلق)شی پێدەڵێن، بریتیە لە: (- ٢٧٣،١٦) دووسەد و حەفتا و سێ پوینت شازدە سالیب، یانی: (٢٧٣/١٦) لە ژێر سفرەوە، کە لەوە ساردتر تەصەووڕ ناکرێ.

ئنجا ئەگەر لە ئەزەلەوەو بەبێ سەرەتا، ئەو گەردوونە هەر دروست بووبایەوەو تەقیبایەوە، هاتباوە یەك و دووبارە لێك بڵاوبووبایەوە، ئنجا بەپێی ئەو گریمانە و خەیاڵە دەبووایە: تریلیۆنان تریلیۆنان .. هتد، جار گەردوون ئەو حاڵەتەی دووبارە بووبایەوەو، سەرەنجام: دەبوو ئێستا پلەی گەرمیی گەردوون، ڕەها و بێ سنوور بووایە، نەك (٣،٥) پلەی كاڵڤن! كەواتە: ئەو قسەیە ڕاست نیە چونكە: حاڵی گەردوون بەو شێوەیە نیە.

پوختەی مەبەست: ئەو بیردۆزەیەش لە خەیاڵێكی پووچ بەو لاوە، شتێكی دیكە نیە[1].



---

(١) بڕوانە: موسوعة: الرد على الملحدين العرب، ص٣٤٢.





## گومانی یازدەیەم



## دەڵێن: بۆچی خوا نامەیەکی تایبەتی بۆ هەرکام لە مرۆڤەکان نەناردوە؟!

بلْقی ئەو گومانەش بەخستنەڕووی سێ ڕاستییان، دەتەقێنین:

**یەکەم:** حیکمەتی خوای کاربەجێ لە دروستکردنی مرۆڤ و دانانی لەسەر زەوی و، ژیانی دنیادا، وەك بۆ خۆی فەرموویەتی، ئەوەیە کە مرۆڤ تاقی بکاتەوە، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۗ وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ ﴾ هود.

واتە: خوا ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژاندا، (واتە: بە شەش قۆناغ) هێنانە دی، ئەو کاتە عەرشی خوا لەسەر ئاو بوو، تاکو تاقیتان بکاتەوە، کامەتان کردەوەی باشترە!...

هەر هەمان مەبەست لە سووڕەتی (الکهف) - ٧ -، هەروەها لە سووڕەتی (الملك) - ٢-ش دا، هاتوە.

ئنجا ئەگەر خوا (سبحانه وتعالى) نامەی تایبەتیی بۆ هەر کەسێك ناردبایە، مانایەك بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤ نەدەمایەوە و، ئازایەتیی نەدەبوو ئەو کاتە مرۆڤ ئیمان بێنێ، چونکە ناچار دەبوو، لەبەر ئەوەی نامەی خوای بۆ هاتوە!

**دووەم:** ئەم جۆرە قسانە، نە خواناسێکی ڕاستەقینە دەیانکات، نە مولحیدێکی ڕاستەقینە، کەسێك بەڕاستیی خوا بناسێ، دەزانێ پایەو مەقامی خوا چەند بەرزە، ڕێ بە خۆی نادات، ناماقووڵیی وا بەرانبەر بە خوا بکات و بڵێ: دەبێ نامەم بۆ بنێری! ئەدی نابینی ئەی مرۆڤ! تۆی هێناوەتە دی، بەو هەمەوو ڕێك و پێکییە، ئەو هەمەوو نازو نیعمەتەی بۆ داناوی، ئاسمانێك بەسەرتدا دراوە، زەوییەك بۆت ڕاخراوە، چیاییەکان وەك گوڵمیخ داکوتراون، بەرگە هەوا (الغلاف الجوي)، بەرگە ئاویی (الغلاف المائي)، ئەو هەمەوو ڕووەك و دار و درەخت و دانەوێڵە و سەوزەو میوە جۆرا و جۆرانە، ئەو هەمەوو ژیاندارە دەریایی و هەوایی و زەمینییانە، بەو هەمەوو ڕێك و پێکییەوە، ئەو هەمەوو کانزا و وزانەی بۆی خستوویە زەوییەوە، ئایا ئەوانە هەموویان نامەی خوا نین بۆی ناردووی؟! ئەدی خوا بۆ خۆی نافەرموێ:

﴿وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُۚ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴿٣٤﴾﴾ إبراهيم.

واتە: هەرچی داواتان کردوە پێی داون و، ئەگەر چاکەکانی خوا بژمێرن، بۆتان سەرژمێر ناکرێن؟! بۆیە خواناسێکی ڕاستەقینە قسەی وا ناکات، هەروەها مولحیدێکی ڕاستەقینەش قسەی وا ناکات، کەسێك بڕوای بە خوا نەبێ، خوا نەناسێ، چۆن دەڵێ: دەبێ نامەم بۆ بنێرێ؟!

**سێیەم:** ئەو جۆرە قسانە ڕەگ و ڕیشەکەیان خۆنەناسین و خوانەناسینە، هەروەها خۆ پێ زۆر بوون و، لە کەوڵی خۆ دەرچوون و بوغڕابوونە، وەك خوای پەنهانزان کە هەر خۆی دەزانێ ناخی بەندەکان چۆنەو چی تێدایە؟ دەفەرموێ:

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا ۗ لَقَدِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ وَعَتَوْ عُتُوًّا كَبِيرًا ﴿٢١﴾ يَوْمَ يَرَوْنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ لَا بُشْرَىٰ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ وَيَقُولُونَ حِجْرًا مَّحْجُورًا ﴿٢٢﴾﴾ الفرقان.

واتە: ئەوانەی بە ئومێدی دیداری ئێمە نین، گوتیان: دەبووایە فریشتە دابەزنە سەرمان، یان پەروەردگارمان ببینین! (یانی: یان فریشتە بێن بڵێن: ئێمە نوێنەری خواین، یاخود پەروەردگارمان ببینین، ئنجا بڕوای پێ دێنین!)، (خوا دەفەرموێ:) بەڕاستیی لە دەروونی خۆیاندا، خۆیان زۆر پێ زلە و زۆر لە خوا یاخی بوون، ئەو ڕۆژە کە فریشتەکان دەبینن، ئەو ڕۆژە دڵخۆشیی و مژدە نیە بۆ تاوانباران و دەڵێن: با (ئێمە ئەو فریشتانە نەبینین) پەردە بکەوێتە نێوانمانەوە و یەکدی نەبینین. (چونکە دەزانن فریشتەکان بۆ سزادانیان هاتوون).

# گومانی دوازدەیەم و کۆتایی

## بۆچی خوا سزایەکی نەبڕاوەی کافران دەدات، لەسەر ماوەیەکی سنووورداری کافر بوونیان؟

بەڕێــــــزان!

ئەمە دوا ئیشکال و گومانە، کە بە پێویستم زانی باسی بکەم، ئەگەرنا وردە گومان و ئیشکال و قسەی سەقەت و پەقەتی مولحیدەکان نابڕێن، زۆرن، وەك پێشینان گوتوویانە: (ئەگەر بە تۆبزیی کەسێك بنێری بۆ مازووان، لە داریَ هەڵناڕوانیَ)، کەسێکیش کە نەیەویَ ئیمان بێنیَ، ئیمان ناهێنیَ، هەروەها پێشینان گوتوویانە: (ئەگەر دز دزبیَ، تاریکە شەو زۆرە)، هەروەها گوتوویانە: (ئەگەر تەشی ڕێس تەشی ڕێسبیَ، بە کلکی کەرێش دەڕێسیَ) یانی: ئەگەر ئینسان لە بیانوو بگەڕیَ، بیانوو نابڕێن.

ئنجا ئێمە لە وەڵامی ئەم گومان و بیانووەدا، چوار ڕاستیی ئیقناعکەر و بیَ قسەکەر ڕادەگەیەنین:

**یەکەم:** پەیوەندیی نێوان تاوان و سزایەکەی، پەیوەندیی نێوان هۆکارو ئەنجامە، نەك یەکسان بوونی کاتەکانیان، چەند نموونەیەك دێنینەوە بۆ زیاتر بەرچاو ڕوونیی:





**یەك/** بابایەکی جگەرەکێش، بە هۆی جگەرە کێشانەوە، سییەکانی تووشی شێرپەنجە دەبن و هەموو تەمەنەکەی دەسووتێ، نەك لەبەر ئەوەی بەس دوو ساڵان جگەرەی کێشاوە، تەنیا دوو ساڵانیش نەخۆش بێت!

جاری وایە کەسێك مانگێك جگەرە دەکێشێت، بەڵام سییەکانی تووشی شێرپەنجە دەبن و هەموو تەمەنەکەی دەفەوتێ.

**دوو/** بابایەك کە لە ماوەی چەند خولەکێکدا دزیی دەکات، ئایا دەگونجێ تەنیا چەند خولەکێك سجن بکرێ، کە ڕەنگە بەو چەند خولەکە، ملیۆنان دینارو دۆلاری دزی بێ؟!

**سێ/** کەسێك لە ماوەی چەند چرکەیەکدا ژەهر دەخواتەوەو دەمرێ، هیچ کەس دەڵێ: تەنیا لە ماوەی چەند چرکەیەکدا ژەهری خواردۆتەوە، بۆچی مردوە و، هەق وا بوو تەنیا چەند چرکەیەك نەخۆش بکەوێ؟ نەخێر شتی وانیە.

کەواتە: تاوان و سزا، پەیوەندیی هۆکاریی (علاقة سببية)یان پێکەوە هەیە، نەك پەیوەندیی یەکسان.

**دووەم:** بابای تاوانبارو خراپەکار پێویستە ئەو سەرەنجامە لەبەرچاو بگرێ، کە بە هۆی کوفرەکەیەوە چاوەڕێی دەکات، بەتایبەت کە خوای کارزان و دادگەر بە جیددیی ئاگاداری کردۆتەوە و، هۆشداریی داوەتێ و ترساندوویەتی، وەك فەرموویەتی:

﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ قَالُواْ شَهِدۡنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَاۖ وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ١٣٠ ﴾ الأنعام.

واتە: ئەی کۆمەڵی جند و مرۆڤ! ئەدی لە خۆتان پێغەمبەرانێکتان نەهاتنەلا، ئایەتەکانمیان بەسەردا دەخوێندنەوە و لە دیداری ئەمرۆتان هۆشیاریان دەکردنەوە (دەیانترساندن)؟ گوتیان: شایەدییمان لەسەر خۆمان داو، ژیانی دنیا فریوی دان و، گەواهییان لەسەر خۆیاندا، کە بێبڕوابوون.

**سێیەم:** لە نێوان دۆزەخ و کەسایەتیی و دەروون و ناخی بابای بێبڕوادا، جۆرێك لە پێکەوە گونجان و تەبایی هەیە و، یەکدی دەخوازن، وەك زانایانی تەصەووف و تەزکییە باسی دەکەن، دەڵێن: وەك چۆن موگناتیس ئاسن بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ، دۆزەخیش ئاوا ئەوانە بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ و، ئەوانە حاڵەتی دەروونیی و ناخیان وایە، کە لەگەڵ دۆزەخدا دەگونجێن، ئەوێ ژینگەیەکی گەنجاوو لەبارە بۆیان!!

**چوارەم:** بابای بێبڕوا، تەمەنەکەی هەرچەندە زۆر بووایە، هەر بە بێبڕوایی بەڕێی دەکرد و، عەزمی لەسەر ئەوە جەزم کردبوو، بەڵگەمان لەو بارەوە ئەوەیە، کە خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ:

﴿ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢٧﴾ قُلۡ أَيُّ شَيۡءٍ أَكۡبَرُ شَهَٰدَةٗۖ قُلِ ٱللَّهُۖ شَهِيدُۢ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۚ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ لِأُنذِرَكُم ﴾ الأنعام.

واتە: ئەگەر تۆ ببینی کاتێك لەسەر ئاگر ڕانوێنراون و، وەستێنراون (واتە: دۆزەخییەکان) دەڵێن: خۆزگە گێڕدرابایینەوە بۆ دنیا و، ئەو کاتە ئایەتەکانی خوامان بە درۆ دانەدەنا و، لە بڕواداران دەبووین، (خوا دەفەرموێ:) بەڵکو ئەوەی کە پێشتر پەنهانیان دەکرد (کە کوفرەکەیانە) بۆیان ئاشکرا بووە و ئەگەر (گریمان) بگێڕدرێنەوەش، دەگەڕێنەوە سەر ئەوەی کە لێی قەدەغە کرابوون و، بە تەئکید ئەوان درۆ دەکەن.

لە کۆتایی ئەم بەشی چوارەمەدا، کە تەرخانمان کردبوو بۆ بەرپەرچدانەوەو پووچەڵکردنەوەی دوازدە (١٢) گومان و ئیشکال، دەڵێین:

زۆر لە مولحیدەکان، کۆمەڵێك وردە گومان و ئیشکالی دیکە باس دەکەن، بەڵام هەموویان پەیوەندییان هەیە بە کتێبە تێکدراوەکانی خوای پەروەردگارەوە، بە تایبەت تەوڕات و ئینجیل، هەروەها بە ئایین و بەرنامە ئەفسانەییەکانەوە، کە لە مێژووی کۆندا بوو ون، یاخود لە واقیعی ئێستای هەندێ لە گەل و نەتەوەکان،

بە تایبەت لە ڕۆژئاوای ئاسیا، لە ئەفریقیادا، هەن، زۆیشیان پەیوەستن بەو هەڵەو پەڵەو لادان و کەم و کوڕییانەی، کە شوێنکەوتووی ئایینەکان دەیکەن، بە جوولەکە و نەصڕانییەوە و، بە مسوڵمانانیشەوە و، بە غەیری ئەوانیشەوە.

کە لە ڕاستییدا ئەوانە هیچیان بەڵگەو پاساو نین بۆ ڕووکردنە ئیلحاد، بەڵێ، هەڵە، هەڵەیە، هی هەر کەسێك بێت، پێشتریش باسمان کرد، کە یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکان بەرەو خوانەناسیی چوونی زۆرێك لە مولحیدەکان، بریتیە لە شێوێنران و گۆڕدران و دەستکاریی کرانی کتێبەکان و بەرنامەکانی خوا، بەڵام کەسێك لە بیانوو نەبێ و عەوداڵ و شەیدای هەق بێت، کتێب و بەرنامەیەکی ڕاست و دروست و ساغ و دەستکاریی نەکراو هەیە، کە لەو کاتەوەی خوا بۆ پێغەمبەری خاتەمی دابەزاندوە، مسوڵمانان لەسەر نەك ئایەتێك و وشەیەکی، بەڵکو لەسەر پیتێکیشی ناکۆك نین، هەموویان لەسەری یەك دەنگن، کە ئەوە فەرمایشتی خوایە و کەسێك لە هیدایەت بگەڕێ، بیەوێ بەرەو خوا بچێ و، خوا بناسێ و بیپەرستێ، ئەوە قوڕئان لەبەر دەستی دایە و، ڕێبازی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) وەك پڕاکتیزە کردنی قوڕئان، لەبەر دەستی دایە.

## دەســتپێك

بەڕێـــــــزان!

خواناسین (مَعْرِفَةُ الله) و دانهێنان بە بوونی خوای بەرز و مەزن و تاك و پاك و بێ وێنە و بێ هاوەڵدا، کۆمەڵێك داخوازیی هەن، کە وەك چەند ئەنجامێکی سروشتیی و لۆژیکییانە پەلکێشیان دەکات، بۆ هەر کەسێك کە خاوەنی عەقڵ و هۆشێکی ساغ و سەلیم بێ و، پابەند بێ بە بڕیارو حوکمی عەقڵ و لۆژیکەوە، کە بە بڕوای بەندە ئەو چوارەیان سەرەکیی و بنەڕەتیین، کە ئێمە هەر کامێکیان لە باسێکی سەربەخۆدا، بە کورتیی و گوشراویی دەخەینە ڕوو، بەڵێ ئەو چوار دەرەنجام و بەرهەمە، هەر کامیان خواناسیی پەلکێشیان دەکات و پەیدایان دەکات لە کەسێکدا، کە ڕێز لە بڕیارەکانی عەقڵ و لۆژیك دەگرێ:

١)- ئیمان بەخواهێنان و بەندایەتیی کردن بۆ خوا.

٢)- گەڕان بە دوای ئایین و بەرنامەیەکی ڕاست و دروستی خوادا، بۆ ئەنجامدانی بەندایەتیی.

٣)- بڕواهێنان بەفریشتەکانی خوا و، کتێبەکانی و، پێغەمبەرەکانی و، ڕۆژی دوایی و، نەخشە و ئەندازەگیریی خوا.

٤)- ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی ژیان و گوزەران، لەسەر ئاستی تاك و خێزان و کۆمەڵگا و دەوڵەت، بەپێی ئایین و بەرنامەی خوا.





## باسی یەکەم



# ئیمــان بە خــوا هـێنان و، بەندایەتیی کردن بۆ خــوا

گرنگترین و یەکەمین ئەنجام و بەرهەمی خواناسیی، کە عەقڵ و لۆژیك دەیخوازێ، بریتیە لەوە: کە کەسێك دەڵێ: من خوا دەناسم:

١- لە هەموو کەس و لە هەموو شتێك، خوا لە لای خۆشەویستتر بێ.

٢- لە هەموو کەس و لە هەموو شتێك، خوا لە لای مەزنتر و، گەورەترو، بەرزترو، بەڕێزتر بێ.

٣- ئەوپەڕی پشت پێ بەستن و، خۆ تەسلیم کردن و کار پێسپاردنی، بۆ خوا هەبێ.

٤- ئەو پەڕی ملکەچیی و فەرمانبەریی و گوێ بۆ گرتن و، بە قسەکردن (السمع والطاعة)ی بۆ خوا هەبێ.

کە ئەمە پێی دەگوترێ: ئیمان بە خوا و بەندایەتیی کردن بۆ خوا (الإيمان بالله والعبودية لِله)، بەڵێ: ئیمان بە خوا و بەندایەتیی بۆ خوا (سبحانه وتعالى) بریتیە لە: ئەوپەڕی خۆشویستن و، ئەوپەڕیی بە گەورە گرتن و، بەمەزن گرتن و، بەبەرز گرتن و، ئەوپەڕی پشت پێ بەستن و، متمانە و، باوەڕ پێ بوون و، ئەو پەڕی ملکەچیی و فەرمانبەریی بۆ کردن، بۆ خوا تبارك وتعالى.

با تەماشای چەند ئایەتێکی قورئان بکەین، هەڵبەتە فەرمایشتی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لەو بارەوە زۆر زۆرن، بەڵام ئایەتەکان هێندە ڕوونن و هێندەش زۆرن، کە بێ نیازمان دەکەن لەوەی بەڵگە بە دەقەکانی سوننەت بێنینەوە:

١)- لە سوورەتی (الفاتحة)دا، کە خوای پەروەردگار لەسەر زمانی بەندەکانی فەرمووویەتی و تەعبیری کردوە لە قووڵایی ناخ و دەروون و ڕووح و کەسایەتییان، دوای ئەوەی خوا دەفەرمویٚ:

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿١﴾ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٢﴾ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴿٤﴾﴾.

واتە: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان، (خوا) بە بەزەیی بەخشندەیە، خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشتە.

دوای ئەوە یەکسەر:

لە ئایەتی پێنجەم (٥)دا دەفەرمویٚ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾﴾.

دوایی لە ئایەتی شەشەم (٦)دا دەفەرمویٚ: ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾﴾.

ئنجا لە ئایەتی حەوتەم (٧)یشدا دەفەرمویٚ: ﴿صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ﴿٧﴾﴾.

واتە: تەنیا تۆ دەپەرستین و، تەنیا یارمەتیی لە تۆ دەخوازین، بمانخە سەر ڕێگای ڕاست، ڕێگای ئەوانەی چاکەت لەگەڵدا کردوون، نەك ڕێی لێ تووڕەبووان و نەك ڕێی گومڕابووان.

کەواتە: بەندایەتیی بۆ خوا کردن، بەرهەمی ڕاستەوخۆی خواناسینە، کە چوار ئایەتی یەکەم: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿١﴾ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٢﴾ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴿٤﴾﴾:





هەموویان خواناسیی دەگرنە خۆیان، ئنجا دوای ئەوە یەکسەر گوتراوە:

﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٥﴾، چونکە: خواپەرستیی دیوارێکە لەسەر بناغەی خواناسین هەڵدەچنرێ.

دواییش خواپەرستیی بەبێ گرتنی ڕێیەکی ڕاست و دروست، مەیسەر نابێ، بۆیە دوایی گوتراوە: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦﴾.

ئنجا ڕێی ڕاستیش ڕێی ئەوانەیە کە لە ژیانی خۆیاندا، شەریعەت و بەرنامەی خوایان بەرجەستە کردوە، بۆیە گوتراوە: ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ٧﴾، هەڵبەتە ڕێی ڕاستیش جیایە لەڕێی ئەوانەی خوای کارزان لێیان تووڕەبووە، لەسەر ئەوەی هەقیان ناسیوە و شوێنی نەکەوتوون، یان ئەسڵەن هەر هەقیان نەناسیوە: ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧﴾.

٢- هەروەها لە سوورەتی (غافر)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ
ٱلَّيۡلَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ
أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ٦١ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ لَّآ
إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ٦٢ كَذَٰلِكَ يُؤۡفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ ٦٣
ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ قَرَارٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَصَوَّرَكُمۡ فَأَحۡسَنَ
صُوَرَكُمۡ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡۖ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ
ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦٤ هُوَ ٱلۡحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۗ
ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦٥﴾.

کە بە کورتیی واتاکەیان دەقا و دەق ئاوایە:

خوا ئەو زاتەیە کە شەوگاری بۆ گێڕاون، کە تێیدا پشوو بدەن و، ڕۆژگاریشی بۆ ڕۆشن کردوونەتەوە (کەسابەتی تێدا بکەن)، بە دڵنیایی خوا خاوەن بەخششە بەسەر خەڵکەوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی سوپاسگوزار نین، ئا ئەو

خوایە پەروەردگارتانە، بەدیهێنەری هەموو شتێکە، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، بۆ کوێ لادەدرێن! (بۆچی جگە لە خوا دەپەرستن؟)، هەر بەو شێوەیە ئەوانەی کە نکوولیی لە ئایەتەکانی ئێمە دەکەن (بە هەقیان دەزانن، بەڵام دانیان پێدانانێن) ئاوا لادەدرێن. خوا ئەو زاتەیە کە زەوی بۆ کردوون بە نشینگەیەکی سەقامگیر و، ئاسمانی بۆ کردوونە سەربانێك و، وێنەی کێشاون و بە باشترین شێوە، وێنەی کێشاون و لە بژیوە خۆشە بە تام و بە سوودەکان بەشی داون، ئا ئەو خوایەتان پەروەردگارتانە، بەرزیی و، بەردەوامیی و، شکۆمەندیی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان. خوا هەمیشە ژیاوە، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، تەنیا لەوی بپاڕێنەوە و، ملکەچیی خۆتانی بۆ ساغ بکەنەوە، ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان.

٣- لافلێدانی خواناسین و بڕوا بە خوابوون، بەبێ پەرستنی خواو بەندایەتیی بۆ کردنی، هیچ مانایەکی نیە و، شتێکی زۆر بێ جێ و نالۆژیکییە، بۆیەش خوای کارزان فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ هَلۡ مِنۡ خَٰلِقٍ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ٣ ﴾ فاطر.

واتە: ئەی خەڵکینە! یادی چاکەی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە، ئایا جگە لە خوا بەدیهێنەرێکی دیکە، هەیە لە ئاسمان و زەوی (سەرێ و خوارێ) بژیوتان بدات؟! جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، بۆ کوێ لادەدرێن؟!

یانی: کۆنترۆڵی خۆتان لە دەست داوە، ئەی بێبڕوایەکان! ئیرادەو ڕێشمەتان کەوتۆتە دەستی هێزێکی پەنهانی نەبینرا و، کە مەبەست پێی شەیتانە، بۆ کوێ لادەدرێن؟!

٤- هەروەها خوا (سبحانە وتعالى) دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ مَن يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أَمَّن يَمۡلِكُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَمَن يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَيُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ



﴿ٱلْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾ فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَمَاذَا
بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ
فَسَقُوٓا۟ أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾﴾ یونس.

واتە: (لێیان بپرسە:) بڵێ: کێ بژیوتان دەدات لە ئاسمان و زەوییەوە، {بژیوی ئاسمان: تیشك و، باران و، هەواو، .. هتد، بژیوی زەویش: دانەوێڵە و سەوزە و میوە و ژیاندارانی هەوایی و دەریایی و وشکانیی و .. هتد}، یان کێ بینینەکان و بیستنەکانی بە دەستن، هەروەها کێ زیندوو لە مردوو دەردێنێ و، مردوو لە زیندوو دەردینێ و، کێ سەرپەرشتیی کاروبارەکان دەکات؟ دەڵین: خوا، بڵێ: ئەدی بۆچی پارێزی لێ ناکەن، ئا ئەو خوایەتان پەروەردگاری بە هەقتانە، لە دوای هەق جگە لە گومڕایی چی دیکە هەیە! بۆ کوێ لادەدرین؟ (بۆ کوێ ڕووتان پێوەر دەگێڕدرێ)، هەر بەو شێوەیە فەرمایشتی پەروەردگارت چەسپاوە لەسەر ئەوانەی کە لایانداوە، (لەبەر ئەوەی کە بڕوا ناهێنن، بڕیاری خوایان بەسەردا چەسپیوە).

ئنجا هەر لێرەوەش دڵسۆزانە لە ڕووی پەرۆشیی و بە تەنگەوە بوونەوە، ڕوو دەکەمە هەموو ئەوانەی کە خوا دەناسن، یان خۆیان بە خواناس دەزانن، بەڵام پەرستن و بەندایەتییان نیە بۆ خوا، بە تایبەت لە چینی سیاسیی و، ڕۆشنبیر و، نووسەری گەلەکەمان و، هەر کەسێکی دیکەش کە قسەی ئێمەی دەگاتێ، دەڵێم: بەڕێزینە! (با چی دیکە شەیتان فریوتان نەدات و کڵاوتان لەسەر نەنێ، خۆتان لە دوو فلیقانەیی دەرباز بکەن، دوو فلیقانەیی: ئیددیعای ئیمان و نەبوونی پەرستشەکان).

یەکێکتان بە زمانی حاڵ دەڵێ:

خوا دەناسم، بەڵام بە قسەی ناکەم، هاوەڵێکت پێت بڵێ: زۆرم خۆشم دەوێی و لەلام بەڕێزی، بەڵام جارێك بانگی بکەی، دووجار بانگی بکەی، سێ جار بانگی بکەی، بە دەنگتەوە نەیەت، بێگومان متمانەت پێی نامێنێ، کە دەڵێ: خۆشم دەوێی و لەلام بەڕێزی!

کەچی خوا (سبحانە وتعالى) ڕۆژێ پێنج (٥) جاران دەفەرموێ: (حَيَّ عَلَى الصَّلاَة)، (حَيَّ عَلَى الفَلاح)، وەرن بۆ نوێژ، وەرن بۆ سەرفرازیی، بەڵام تەنانەت یەکجاریش وەڵامی خوا نەدەیەوە، چۆن دەتوانی بڵێی: خوایە! دەتناسم و لە لام بەڕێزی، لە لام گەورەی؟! بێگومان ئەوە فریودانی شەیتانە، لە کاتێکدا کە خوا ئەو هەمووە بە جەختکردنەوە، باسی گەورەیی و گرنگیی نوێژ دەکات! هەروەها خوا (سبحانە وتعالى) کە باسی بێبڕوایان دەکات، دەفەرموێ:

﴿ قَالُواْ لَمۡ نَكُ مِنَ ٱلۡمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ ﴾ المدثر.

واتە: گوتیان: ئێمە لە نوێژکەران نەبووین (بۆیە ئێستا تووشی دۆزەخ بووین).

ئنجا هەندێ کەس شەیتان بە جۆرێکی دیکە فریوی دەدا، دەڵێ: خوا چ پێویستیی بە نوێژی ئێمەیە، خوا ئەوەندە مەزنە، ئەوەندە بەرزە، ئەوەندە دەوڵەمەندە، ئەوەندە بێ نیازە، چ پێویستیی بە خواپەرستیی ئێمە هەیە؟! بێگومان هیچ، بەڵام ئەوە تۆی پێویستییت بەوە هەیە کە بەندەی خوا بی، بۆ ئەوەی کۆیلەی نەفس و شەیتان و هەواو ئارەزووەکانی خۆت و، خەڵکی دیکە نەبی، تۆی پێویستییت بە خوا پەرستیی هەیە، ئەگەرنا، ڕاستە:

﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾ ﴾ آل عمران.

خوا دەوڵەمەندو بێنیازە لە هەموو جیهانییان، بەڵام تۆ حەوجێت بە نوێژەکەت و، ڕۆژووەکەت و، حەج و، زەکات و، بە یادی خواو، بە خۆ پاراستن لە قەدەغەکراوەکان و، بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خواو، بە ڕێکخستنی ژیانی تاکیی و، خێزانیی و، کۆمەڵایەتیی و، سیاسیی هەیە، بە پێی شەریعەتی خوا، تۆ پێویستییت پێی هەیە، بۆ ئەوەی چاك و پاك و، ڕاست و ساغ بی، لە دنیادا و، بەختەوەرو سەرفرازبی، لە دوا ڕۆژدا.

ئنجا بێگومان ئیمان بە خوا هێنان (الإيمان بالله) لەگەڵ بەندایەتیی کردن بۆ خوا: (العبادة لله) زۆر لە یەك نیزیك و تێکهەڵکێشن، چونکە بێگومان خواناسیی (معرفة الله) جیایە لە ئیمان بە خوا: هەر کام لە: ئیبلیس و،

فیرعەون و، ئەبو جەهل، خوایان ناسیوە، بەڵام ئیمانیان بە خوا نەبووە و، ئیماندار و خواپەرست نەبوون، هەرچەندە بێگومان: ئیمان نەهێنان و خواپەرست نەبوون، لەگەڵ خواناسیندا دژ دەوەستێ و تێکدەگیرێ، چونکە: ئیمان بە خوا هێنان و بەندایەتیی بۆ خوا کردن و خواپەرستن، ئەنجامی لۆژیکیی و ئاسایی و سروشتیی خواناسینە، هەر بۆیە هەر کام لە: ئیبلیس و فیرعەون و ئەبو جەهل و هاوێنەکانیان، خوا نەفرینی لێکردوون و سزایان دەدات، لەبەر ئەوەی بە ئەنجامە لۆژیکیی و عەقڵانیی و ئاسایی و سروشتییەکانی خوا ناسینەکەیانەوە، پابەند نەبوون.

کەواتە: با شەیتان فریومان نەدات: پێمان وابێ لەبەر ئەوەی خوا دەناسین، ئیمانیشمان هەیە! ئیبلیسیش خوای ناسیوەو خوا دەناسێ، فیرعەونیش خوای ناسیوەو خوای دەناسی، هەروەها ئەبو جەهل و هاوێنەکانیشیان، چونکە خواناسین، بریتیە لەوەی بزانی خوا هەیە، بەڵام خوا دەفەرموێ: کە تۆ دەزانی خوا هەیە، کەواتە: دەبێ بەندایەتیی بۆ بکەی و بیپەرستی و ئیمانی پێبهێنی.

## باسی دووەم

## گەڕان بە دوای ئایین و بەرنامەیەکی ڕاست و دروستی خوادا، بۆ ئەنجامدانی بەندایەتیی بۆ خوا

بەڕێـــزان!

گەورەترین و گرنگترین دوو ئەنجامی خواناسیی، بریتین لە:

**ئەنجامی یەکەم:** ئەوەیە کە مادام مرۆڤ خوا دەناسێ، دەبێ بیپەرستێ، ئیمانی پێبهێنێ و، بەندایەتیی بۆ بکات.

**ئەنجامی دووەم:** ئەوەیە کە لە ئەنجامی خواناسیندا، مرۆڤ مادام بە حوکمی عەقڵ و لۆژیك ڕازی بێ، مشووری پەرستنی خواو بەندایەتیی بۆ خوا کردن دەخوا، کە بێگومان پەرستنی خواو بەندایەتیی بۆ کردنیشی، بە هەڕەمەکیی و گۆترەکاریی نابێ، بۆیە ئەوە هانی دەدا، وادارو ناچاری دەکات، کە بە دوای ڕێیەکی ڕاست و ئاچووغی خواپەرستیی دا بگەڕێ، هەر بۆیەش دوای ئەوەی مرۆڤەکان بڕیاری پەرستنی خوای تاك و پاك دەدەن:

﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥﴾.

واتە: هەر تۆ دەپەرستین، پشت هەر بە تۆ دەبەستین.

دوای ئەوە یەکسەر دەڵێن: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦﴾.

بمانخه سەر ڕێی ڕاست، ڕێی ڕاستمان پێشانده، چونکه بەبێ ڕێی ڕاستگرتن، خواپەرستن و ڕوو له خوا کردن، بۆ مرۆڤ مەیسەر نابێ.

دیاره ئێمه پێشتر وەڵامی ئەوەمان دایەوه که: شوێن کام ئایین و بەرنامه بکەوین و، کام پەرستراو بپەرستین؟ به تەفصیل باسمان کرد[١]، بۆیه لێره پێویست به دووباره بوونەوه ناکات و، هەر به کورتی دەڵێین: لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، تاکه کتێبێکی خوا، که لێی دڵنیابین فەرمایشتی خوایه و لەبەر دەستی مرۆڤدابێ، تەنیا ئەم قورئانەیه، ئەم قورئانه بەرزو به پێزو بەڕێزه، تاکه فەرمایشتی خوایه لەبەر دەستی مرۆڤدابێ، که سەلامەت بووبێ و پارێزرابێ له شێوێنران و گۆڕدران و دەستکاریی کران، سەرجەم کتێبەکانی دیکەی خوا گۆڕراون و شێوێنراون، هەم به بەڵگەی عەقڵ و واقیع، هەم به بەڵگەی ئەم قورئانه، که دەفەرموێ:

﴿يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ ﴿١٣﴾﴾ المائدة.

واته: فەرمایشتەکانی خوا له شوێنی خۆیان دەگۆڕن و، بەشێك لەوەی که پێی ئامۆژگاریی کراون، فەرامۆشیان کردوه، واته: هەندێکیان به ئانقەست گۆڕیوه و، هەندێکیشیان بەبێ ئەوەی مەبەستیان بووبێ، له بیریان چووه و فەرامۆشیان کردوه.

ئنجا ئێمه له ڕابردوودا - له بەشی سێیەم: باسی چوارەم: هۆکاره ڕاستەقینەکانی ئیلحاد -[٢]، هەم باسی تەوڕاتمان کرد، هەم باسی (ئاڤێستا)ی زەردەشتییمان کرد، هەم باسی (کنزا ربا) و (مواعظ وتعالیم - يحيى بن زكريا)ی صابیئەمان کرد، هەروەها باسی ئینجیل یان ئینجیلەکانی نەصرانییمان کرد، که حاڵی حازرو وەك واقیعی ئێستایان هیچ کامیان شایستەی ئەوەنین پێیان بگوترێ:

-----------------------------

(١) بڕوانه: بەشی سێیەم: باسی سێیەم: بیانووه پووچەڵەکانی ئیلحاد، بیانووی دەیەم: شوێن کام ئایین و بەرنامەی خوا بکەوین و کام خواپەرستین؟!

(٢) هۆکاری چوارەم: تێکدران و شێوێنرانی کتێب و بەرنامەکانی خوا.







کتێبی خوا، چونکە شتی وایان تێدایە دژو پێچەوانەی عەقڵ و وەحیی و زانست و واقیعە.

کەواتە:

١- تاکە کتێبێك کە لەبەر دەستی مرۆڤدا هەبێ، لێی دڵنیا بی کە فەرمایشتی خوایە، ئەم قورئانەیە.

٢- ئنجا ئەم قورئانە لەگەڵ ناخ و زگماك و عەقڵدا و، لەگەڵ زانستدا و، لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ژیان و گوزەرانی دنیای مرۆڤدا، دەگونجێ، نەك هەر دەگونجێ، بەڵکو بەرژەوەندییەکانی دنیاو دوارۆژی بۆ دابین دەکات.

٣- مرۆڤ پێویستە تەنیا خوا بپەرستێ و، تەنیا بەو شێوەیەش بیپەرستێ کە جێگای ڕەزامەندیی خوایە، ئەویش ئەو شێوەیە کە خوا ڕوونی کردۆتەوە، لە دوا پەیام و کتێبی خۆیدا، کە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتیی ناردوویەتی بە پێغەمبەری کۆتایی دا (موحەممەد (صلی الله علیه وسلم))، ئنجا بە شوێن پێی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)یشدا نەبێ لەم ڕۆژگارەدا، هیچ کەس، هەرگیز ناتوانێ بەندایەتییەکی ڕاست و ساغ و بێخڵتە بۆ خوا (سبحانه وتعالى) بکات.

٤- کاتێك بە شوێن پێی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)یش دا دەڕۆین و، ئەو قورئانە کە خوا بۆ موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) دایبەزاندوە، تێیدەگەین و تێیدا پێدەگەین و، ڕێبازی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) دەگرین، کە ڕێبازەکەشی، سوننەتەکەشی بریتیە لە: پراکتیزەکردنی ئەم قورئانە، ئەو کاتە ئێمە سەرجەم پێغەمبەرانی خوامان خۆش دەوێ و، ڕێز لە هەموویان دەگرین و، بڕوا بە هەموویان دێنین، هەروەها سەرجەم کتێبەکانی خوامان بە کتێبی خۆمان قبووڵ دەبێ، وەك ئەسڵەکەیان.

٥- تەنیا بە هۆی قورئانیشەوە دەزانین کام لە پێغەمبەرانی خوا و کتێبەکانی خوا، ڕێبازەکانیان دەستکاریی کراون و شێوێنراون، قورئان ئەوەشمان بۆ دەکات کە هەڵەو کەم و کوڕییەکانی کتێب و ئایین و بەرنامە پێشووەکان دەخاتە بەرچاو، ئەوەی کە خوا بە پێویستی زانیبێ.

## باسی سێیەم

# بڕواهێنان بە فریشتەكانی خوا و، كتێبەكانی و، پێغەمبەرەكانی و، بە ڕۆژی دوایی و نەخشەو ئەندازەگیریی خوا (القدر والقضاء)

ئەمیش ئەنجام و بەرهەمێكی دیكەی سروشتیی و لۆژیكیی خواناسییەو، بۆیەش كردمانە بەرهەم و ئەنجامی سێیەم، هەرچەندە لە ڕووی ڕیزبەندیی گرنگییەوە، لە پێشترە، لە سۆنگەی ئەوەوە كە مرۆڤ بەبێ دەستگیر بوونی لە شەریعەتی خوا و، دوو سەرچاوە ڕوون و زوڵاڵەكانی وەحیی، ناتوانێ هەڵوێستی ڕاست و دروست لە بەرانبەر فریشتەكانی خواو كتێبەكانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی، هەروەها قەزاو قەدەردا بنوێنێ، وەك خوای زاناو شارەزا بە پێغەمبەری كۆتایی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویٚ:

﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥٣﴾﴾ الشورى.

واتە: بەو شێوەیە (كە بۆ پێغەمبەرانی دیكە سروشمان كردووەو وەحییمان بۆ ناردوون)، بەو شێوەیەش ڕووحێكمان لە لایەن خۆمانەوە بۆ تۆ نارد، كە

تۆ نەتدەزانی نە کتێب چییە؟! (کتێب واتە: بەرنامە) و نە ئیمانیش چییە؟! بەڵام ئێمە ئەم (ڕووحە، ئەم قورئان)ەمان کردە ڕۆشناییەك کە هەر کەسێك لە بەندەکانمان بمانەوێ، پێی دەخەینەسەر ڕێی ڕاست.

بەدڵنیاییش تۆ خەڵك دەخەیە سەر ڕێی ڕاست، ڕێی ئەو خوایەی کە ئاسمانەکان و زەوی و، هەرچی تێیدایە، هی ئەوە، ئاگاداربن! کاروبارەکانیش هەر بۆ لای خوا دەچنەوە.

هەڵبەتە هەڵوێست نواندنی هەڵەی خاوەن کتێبەکان، بەرانبەر هەر کام لە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا، ڕۆژی دوایی، سەرچاوەی زۆربەی هەرە زۆری لادان و هەڵەو پەڵە کوشندەکانیان بووە، بۆیەش پێویستە لەسەر بناغەی وەحیی پارێزراوی خوا و، لەبەر تیشکی ویدا نەبێ، بە هیچ جۆرێك مرۆڤ باز نەداتە دیوی ئەو جیهانە نادیارەی، کە جگە لە وەحیی: هیچ ئامرازو هۆکارێکی ڕاست و متمانەپێکراوی لەبەر دەست دا نیە، بۆ مامەڵە لەگەڵدا کردنی:

١- چۆن مامەڵە لەگەڵ فریشتەکاندا بکەین؟ فریشتەکان چەندن؟ کێن؟ چۆنن؟ کاریان چییە؟

٢- کتێبەکانی خوا چەند بوون؟ بۆچی هاتوون؟ ئامانج لێیان چییە؟ نێوەڕۆکەکەیان بریتی بووە لە چی؟

٣- پێغەمبەران کێ بوون؟ چەند بوون؟ بۆچی هاتوون؟

٤- هەروەها ڕۆژی دوایی بەهەشت و دۆزەخ، قۆناغەکانی ڕۆژی دوایی، ئاخرزەمان، هەڵسانەوە، چین؟ چۆنن؟

٥- هەروەها ئیمان بە قەدەر - کە دیارە ئیمان بە قەدەریش هەردەچێتەوە نێو بازنەی ئیمان بە خواو سیفەتەکانی خوا، چونکە ئیمان بە قەدەر، واتە: ئیمان بە زانیاریی بێسنووری خوا و ویستی ڕەهای خوا و دەستەڵاتی ڕەهای خوا و، حیکمەتی خوا و، میهرەبانیی خوا - ئەمیش بەبێ وەحیی و پەیامی خوا چۆن دەستمان دەیگاتێ؟!

بەڵێ بەبێ وەحیی، ناتوانین ئیمانێکی ڕاست و دروست، بەو شەش شتانە بێنین، کە شەش پایەکانی ئیمانیان لێ پێکدێن، کە بریتین لە: خوا و ڕۆژی دوایی و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و قەزاو قەدەر.

هەڵبەتە پایەکانی ئیمان لە قورئاندا پێنجن و، پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) لە سوننەتدا، پایەی شەشەمی خستۆتە پاڵیان، کە بریتیە لە: ئیمان بە قەدەر، وەك لەم ئایەت و فەرمایشتانەدا دەردەکەوێ:

١- خوا لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا ۖ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ ۗ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾﴾.

واتە: چاکەکاریی ئەوە نیە کە ڕووبکەنە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بەڵکو چاکەکاریی سیفەتی کەسێکە کە ئیمان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی و بە فریشتەکان و بە کتێبەکان و بە پێغەمبەران بێنێ...

بەڵام لە سوننەتدا، پایەی شەشەمیش خراوەتە گەڵ ئەو پێنجانە، لەبەر گرنگیی، ئەگەرنا، ئیمان بە قەدەر، یانی: ئیمان بەوە کە خوا ئەندازەگیریی و نەخشەی ئەم گەردوونەی داناوە، پێش ئەوەی دروستی بکات و، پاشان بڕیار دەدا لە کاتی خۆیدا، بۆ هەر کام لە شتەکان، ئەوەیە ئیمان بە قەزاو قەدەر، کە وشەی: (قَدَر)[1] واتە: نەخشەدانان و ئەندازەگیریی و، وشەی: (قَضاء)یش واتە: بڕیاردان و جێبەجێ کردن[2]، هەرچەندە وشەکە وا هاتوە، (قَضاء) پێش (قَدَر) دێ، لە ڕووی عورفییەوە، بەڵام لە ئەسڵدا (قَدَر) لە پێش (قَضاء)وەیە.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص٤١١- ٤١٢، ط٢٠١٢م، المطبعة العصرية.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص٤٢٣، ٤٢٤.

٢- لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یشدا بەس باسی قەدەر دەکریٚ: {قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِيمَانِ؟ قَالَ: أَنْ تُؤْمِنَ باللهِ، وَمَلائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَاليَوْمِ الآخِرِ، وتُؤْمِنَ بالقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ}، (أخرجه مسلم برقم: (١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٩٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦١٠)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٥٠٠٥).

فەرموودەکە درێژە، کە عومەر خوا لێی ڕازی بیٚ دەیگێڕێتەوە و بە (حَدِيث جُبريل) (فەرموودەی جوبریل) ناسراوە، لە سیاقی فەرموودەکەدا هاتوە، کە جبریل لە شێوەی پیاوێکدا هاتوە، بەرگێکی سپی لەبەر بووە و، مووەکانی ڕەش بوون و، شوینەواری ڕێی پێوە دیار نەبووە، واتە: تۆزو خۆڵ و ئارەقەی پێوە دیار نەبووە، ئەژنۆی لە نزیك ئەژنۆی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) داناون، هاوەڵانیش بە دەوریەوە بوون لە جەنگی تەبووکدا، چەند پرسیارێکی لیٚ دەکات، یەکێك لەوانە: دەڵیٚ: هەواڵم پیٚ بدە دەربارەی ئیمان! پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویٚ: ئیمان ئەوەیە بڕوا بێنی بە: خوا و بە فریشتەکانی و بە کتێبەکانی و بە پێغەمبەرانی و بە ڕۆژی دوایی و، بڕوا بێنی بە قەدەر، خۆش و ناخۆشی، یاخود ئەوەی کە پێت چاکەو، ئەوەی پێت خراپە، هەمووی لە خواوەیە.





## باسی چوارەم و کۆتایی



## ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی ژیان و گوزەران، لەسەر ئاستی تاك و خێزان و کۆمەڵگا و دەوڵەت، بە پێی ئایین و بەرنامەی خوا

ئەمیش بەرهەم و دەرەنجامی چوارەمی لۆژیکیی و ئاسایی و سروشتیی، خواناسینە، دوای ئەو سێ ئەنجامەی پێشێ:

**یەك:** هەر کەسێك خوای ناسی، ئیمان بە خوا دێنێ و خوا دەپەرستێ.

**دوو:** هەروەها کەسێك خوای ناسی و بڕیاریدا خوا بپەرستێ و ئیمانی بە خوا هێنا، دەگەڕێ بە دوای ئەو بەرنامە و ڕێبازەدا، کە بەرنامە و ڕێبازێکی ڕاست و دروستە و، بەپێی ئەو بەرنامە و ڕێبازە دەتوانێ ئیمانێکی چاك بە خوا بێنێ و، بەندایەتییەکی باش و، دینداریيەکی ڕاست و ساغ بۆ خوا بکات.

**سێ:** هەروەها کەسێك خوا بناسێ، دوای ئەوەی دەستی لە بەرنامە و هیدایەتی خوا، لە وەحیی خوا گیردەبێ، ئنجا بڕوا دێنێ: بە فریشتەکانی خوا، بە کتێبەکانی خوا، بە پێغەمبەرانی خوا، بەڕۆژی دوایی، بە قەدەر.

**چوار:** هەروەها کەسێك خوا بناسێ، هەوڵدەدا ژیانی خۆی لە ڕووی تاکیی، لە ڕووی خێزانیی، لە ڕووی کۆمەڵایەتیی، لە ڕووی سیاسیی، لەسەر هەموو

ئاستەكاندا و لە هەموو بوارو ڕەهەندەكاندا، بەپێی ئایین و بەرنامەی خوا، ڕێك بخات و بەڕێوەببات و بگوزەرێنێ.

بەڵێ، مرۆڤی خواناس و كۆمەڵگایەكی خواناس، دەبێ هەوڵبدەن: سەرجەم هەڵس و كەوت و ڕەفتارو ئاكارە ماددیی و مەعنەویی و تاكیی و خێزانیی و كۆمەڵایەتیی و سیاسییەكانیان، لەبەر ڕۆشنایی وەحیی دا، كە لە قوڕئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، بەڕێوە ببەن، وەك خوا دەفەرموێ:

١- ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾﴾ النور.

واتە: قسەی بڕواداران كاتێك بانگ دەكرێن بۆ لای خواو پێغەمبەرەكەی، تاكو دادوەرییان لە نێواندا بكات، تەنیا ئەوەیە كە بڵێن: بیستمان و فەرمانبەریین، ئەو كەسانە ئەوانەن كە سەرفرازن، تەنیا ئەوانەن كە بەختەوەرن.

٢- ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَأُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَـٰزَعْتُمْ فِى شَىْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٥٩﴾﴾ النساء.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بكەن و، فەرمانبەریی پێغەمبەر بكەن و، هی كاربەدەستانێك كە لە خۆتانن {خۆتان داتانناون و پەسندتان كردوون و، پابەندن بەو بەرنامە و شەریعەتەوە، كە لەلایەن كۆمەڵگای مسوڵمانەوە تەبەننیی كراوە}، ئنجا ئەگەر لە شتێكدا كەوتنە ناكۆكییەوە، بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر(ی خوا)، ئەگەر بڕواتان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، ئا ئەوە (لە دنیادا) بۆ ئێوە چاكترە و (لە دوا ڕۆژدا) دەرەنجامی خێرترە.

٣- هەروەها لە سووڕەتی (الأحزاب)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾.

واتە: هیچ پیاوێكی بڕوادار و هیچ ئافرەتێكی بڕوادار، كاتێك خوا و پێغەمبەرەكەی بڕیارێك دەدەن، بۆیان نیە مافی سەرپشك بوون بەخۆیان بدەن {كە ئایا ئەو بڕیارەی خواو پێغەمبەری خوا، جێبەجی بكەن، یان جێبەجێی نەكەن؟} و، هەر كەسێكیش سەرپێچیی لە خواو پێغەمبەرەكەی بكات، بە گومڕابوونێكی ئاشكراو ڕوون، گومڕا بووە.

ئنجا هیچ گومانی تێدانیە كەسێك و كۆمەڵگایەك، ژیان و گوزەرانی بە پێی شەریعەت و بەرنامەی خوا بەڕێوە ببات، بەختەوەریی ئەم ژیانە دنیاییە و، سەرفرازیی ڕۆژی دوایی بۆ خۆی دەستەبەرو مسۆگەر دەكات، چونكە خوا (سبحانه وتعالى) بۆیە ئەو هەموو پێغەمبەرانەی ڕەوانەكردوون و ئەو هەموو كتێبانەی دابەزاندوون، بە فریشتەكانیدا بۆ پێغەمبەرانی هەڵبژێردراوی خۆی، تاكو مرۆڤەكان بزانن چۆن بەندایەتیی بۆ خوا بكەن و بیپەرستن و، چۆن ئەو ژیانە دنیاییەیان بەجۆرێك بگوزەرێنن كە شایستەی مرۆڤ بێ و ڕەزامەندیی خوای تێدابێ، تاكو سەرەنجام ئەو تاقیكرنەوەی ژیانی دنیاییە، سەربەرزانە تێپەڕێنن و، لە تاقیكردنەوەی خوا دەربچن و، ئەو حیكمەتەی كە خوا مرۆڤ و جندی بۆ دروستكردوون، بیهێننە دی، كە بریتیە لە: بەندایەتیی كردن بۆ خوا، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات.

ئنجا ئێمە ئێستا بواری ئەوەمان نیە بچینە نێو وردەكارییەكانی چۆنیەتی ڕێكخستن و بەڕێوەبردنی كۆمەڵگای ئیسلامیی، بەڵام بۆ بەرچاوڕوونیی لەبارەی سروشتی سیاسیی ئیسلامەوە و، چۆنیەتی ڕێكخستن و بەڕێوە بردنی كۆمەڵگا، بە پەسندی دەزانم ئاماژە بكەم بە دە (١٠) بنەما سەرەكییەكەی سیستمی حوكمڕانیی لە ئیسلامدا[١]:

---

(١) ئێمە لە مەوسووعەی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی دا) كە چوار بەرگە، بەرگی دووەممان بە ناوونیشانی: (بنەماكانی سیستمی حوكمڕانیی لە ئیسلامدا) بۆ ئەو بابەتە تەرخان كردوون و، بە درێژیی لە بارەی هەر كام لەو دە (١٠) بنەمایەوە دواوین، كە ئێستا بەخێرایی چاوێكیان پێدادەخشێنین، هەروەها لە كتێبی یازدەیەم (الكتاب الحادي عشر)ی مەوسووعەی (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) بە درێژیی لەوبارەوە دواوین.

# دە بنەما سەرەكییەكەی
# سیستمی حوكمڕانیی لە ئیسلامدا

## بنەمای یەكەم: سەروەریی باڵاو ڕەها، هی خواو شەریعەتەكەیەتی:

مەبەستمان ئەوەیە كە دەبێ: لە لای مرۆڤی مسوڵمان و، لە لای كۆمەڵگای مسوڵمان، مەرجیعی هەرە باڵا و سەرچاوەی هەرە باڵا، بۆ وەرگرتنی تەعلیمات و ئاڕاستەو یاسا و ڕێكخستن و بەڕێوەبردنی ژیان، تەنیا خوای زاناو شارەزا و، ئەو شەریعەتەی خوا (سبحانه وتعالى) بێ، كە دایناوە.

## بنەمای دووەم: دەسەڵات هی خەڵكە:

ئەگەر سەروەریی باڵاو ڕەها هی خواو شەریعەتەكەیەتی، دەستەڵاتیش هی خەڵكە، واتە: ئەوە خەڵكە ئەو شەریعەتەی خوا بە ویستی ئازادانەی خۆیان، لە كۆمەڵگای خۆیاندا جێبەجێ دەكەن و، بەرپرسانی خۆیان دادەنێن و، هەڵدەبژێرن و لێیان دەپێچنەوە و چاودێرییان دەكەن و، ئەگەر پێویست بوو سزایان دەدەن و، لایان دەدەن، هەموو ئەو دەستەڵاتانە بە ڕەهایی هی خەڵكن، لە چوار چێوەی پرەنسیپەكانی وەحیی و شەریعەتی خوادا.

## بنەمای سێیەم: ملكەچیی هەموو لایەك بۆ دەستوورو یاسا:

تاك تاكی كۆمەڵگایەكی مسوڵمان و، هەموو پێكهاتەكانی و وردو درشتی و، سەرجەم دامەزراوەكان، دەبێ ملكەچ بن بۆ دەستوور، واتە: یاسا سەرەكییەكان،




هەروەها بۆ وردە یاسایەكانی دیكەی، كە لەو یاسا سەرەكییانە وەردەگیرێن و هەڵدەهێنجرێن.

## بنەمای چوارەم: ڕاوێژ بنەمای هەموو كارەكانە:

كە خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾﴾ الشورى.

واتە: كاروباری بڕواداران بە ڕاوێژە، كەواتە: ڕاوێژ بنەمای كاروبار بەڕێوەبردنە، لە كۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی دا.

## بنەمای پێنجەم: دادگەریی گشتگیر:

دەبێ دادگەریی گشتگیر لە كۆمەڵگایەكی مسوڵماندا بچەسپێنرێ، دادگەرییەك، كە كەسی لێ هەڵنەوێردرێ و، بەسەر هەموو كەسێكدا دەچەسپێنرێ و، بۆ هەموو كەس وەك یەك دەبێ.

## بنەمای شەشەم: یەكسانیی ڕەها:

یانی: بە یەك چاو، تەماشای هەموو هاوڵاتییان و، هەموو پێكهاتەكان و تاكەكان دەكرێ.

## بنەمای حەوتەم: دابینكردنی ماف و ئازادییەكان بۆ هەموو تاكەكان:

نابێ جیاوازیی و هەڵاواردن، بە هۆی دینەوە، بە هۆی ڕەنگ و زمانەوە، بە هۆی پێگەی كۆمەڵایەتیی و پێگەی سیاسییەوە، بە هۆی هیچ شتێكەوە، بخرێتە نێوان تاكەكان، لە دابین كردنی ماف و ئازادییەكاندا، بۆ هەمووان.





## بنەمای هەشتەم: فەرمانبەریی بۆ بەرپرسان لە سنووری پەسند (معروف)دا:

فەرمانبەریی (طاعة) لە سنووری بە پەسند زانراودایە و، هەرکاتێك فەرمانی بەرپرسان لەگەڵ شەریعەتدا تێکگیرا، بە دڵنیاییەوە بە قسەیان ناکرێ، بەڵکو دەبێ بەرهەڵستییشیان بکرێ.

## بنەمای نۆیەم: چاودێریی کردنی بەرپرسان و، ڕاستکردنەوەیان و لێپرسینەوەیان:

چاودێریی و لێپرسینەوەی حوکمڕان و بەرپرسان، ئەرکی کۆمەڵگایە بە گشتی و، نەك تەنیا ئەوەندەش، بەڵکو تەنانەت لادان و دوورخستنەوەیان لە کاتی پێویستدا، چونکە ئەسڵی حوکم و دەستەڵات هی خەڵکە، بەرپرسیارێتیی سپاردە (أمانة)ی خەڵکە، دەیسپێرێ بە و بەرپرسانەی کە دایاندەنێ، کەواتە: کاتێك خیانەتیان بەو ئەمانەتە کرد، دەبێ ئەو ئەمانەتەیان لێوەر بگیرێتەوە، چونکە خاوەنە ڕاستەقینەکەی دەستەڵات، خەڵکە.

## بنەمای دەیەم: پابەندیی بە ئەدەب و ڕەوشت و بەها بەرزەکانەوە، لەلایەن کاربەدەستان و خەڵك و کۆمەڵگاشەوە بە گشتی:

کۆمەڵگای مسوڵمان بەسەر و خوارەوە:

هەموویان دەبێ خۆ بڕازێننەوە بە ئەدەب و ڕەوشتە بەرزو جوانەکان و، خۆشیان دوور بگرن لە ڕەفتار و خووە ناپەسند و ناتەواوەکان، بەرپرسان بە پلەی یەکەم و، خەڵك و کۆمەڵگاش بە گشتی.




بەڕێـــــــزان!

ئەمانە داخوازیی و ئەنجامە سروشتیی و چاوەڕوانکراوەکانی خواناسیی و بڕوا بە خوا بوونن، هەڵبەتە ئێمە لە کۆی ئەم پەنجا (٥٠) ئاڵقەیەدا[١]، وشەی ئیمان (إِيمان)مان لە جیاتی خواناسیی (معرفة الله)، بەکارهێناوە، ئەگەرنا، خواناسیی خاڵی هاوبەشی نێوان ئەهلی ئیمان و، هەموو ئەوانەیە کە خوا دەناسن و بە شێوەیەك لە شێوەکان، دان بە بوونی خوا دادێنن، ئنجا جوولەکە و نەصرانیین، بووذایی و صابیئەن، زەردەشتیی و مەجووسیین، بتپەرستەکانی دیکەن، یان ئەوانەن کە پێیان دەگوترێ: پەروەردگاریی (رُبوبِي) کە دان بە بوونی خوادا دێنن، بەڵام دان بە پێغەمبەرایەتیی و وەحیی دا ناهێنن، خواناسیی خاڵی هاوبەشی ئەهلی ئیمان و هەموو ئەوانەیە، بەڵام ئیمان تایبەتە بە ئیماندارانەوە، ئەگەرنا، فیرعەون و ئەبو جەهل و ئیبلیسیش خواناس بوون، بەڵام بە دڵنیاییەوە بە ئیماندار لە قەڵەم نەدراون، بەڵام بۆیە ئێمە وشەی ئیمانمان لە بەرانبەر ئیلحاددا بەکارهێنا، چونکە ئیمان زیاتر دژی ئیلحادە، ئەگەرنا پێچەوانەی ئیلحاد بریتیە لە: خواناسیی، بەڵام ئێمە تەنیا مەدارمان بە خواناسیی ساز نابێ، تەنیا مەدارمان بەوە ساز نابێ: خوابناسین، بەڵکو دەبێ وێڕای ئەوەی خوادەناسین، ئیمانیشی پێ بێنین و بیشیپەرستین، بەندایەتیشیی بۆ بکەین، شوێن شەریعەتەکەشی بکەوین، هەڵبەتە (ئیمان)یش هەموو ئەوانە دەگرێتە نێو خۆی، بۆیە وشەی (ئیمان)مان بەکارهێنا.

قسەی کۆتاییم:

هیوادارم هەموولایەکمان، چ ئەوانەی خۆمان بە خواناس و مسوڵمان زانیوە، چ ئەوانەش کە لەمەودوا ئەو بڕیارە دەدەن، ئەگەر دەمانەوێ خواناسییەکەمان و ئیمانەکەمان، لە دنیاو دواڕۆژدا، جێگامان بۆ بگرێ و، خوای کارزان و میهرەبان لێمان وەربگرێ، زۆر بە جیدیی قۆڵی هیممەتی لێ هەڵماڵین و، هەر کام لەو چوار داخوازیی و دەرەنجامە گەورەو گرنگەی خواناسیی و ئیمان، لە

---

(١) ئەم بابەتە لە ئەسڵدا، بە پەنجا (٥٠) ئاڵقە لە شێوەی دەرس و وتاردا پێشکەشکراوە.







ژیان و گوزەرانی تاكیی و خێزانیی و كۆمەڵایەتیی و سیاسییماندا، بەرجەستە بكەین و بچەسپێنین.

خوای بەخشەرو بەبەزەیش فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ۝٦٩ ﴾ العنكبوت.

واتە: بەدڵنیاییی ئەوانەی لە پێناوی ئێمەدا تێدەكۆشن، ڕێیەكانی خۆمانیان پیشان دەدەین و، بە دڵنیاییی خوا لەگەڵ چاكەكاراندایە.

خوا بە لوتف و كەرەمی خۆی پشتمان بگرێ، لەگەڵمان بێ، زیاتر هیدایەتمان بدات و، ئیمان لە دڵماندا بچەسپێنێ و، بمانكات بە هۆكاری هیدایەتدران و بەرچاوڕوونكردنەوەی كەسانێكیش، كە تینوو و عەودالْ و شەیدای هەقن و لە هەق دەخەفتێن.

لێرەشدا كۆتایی بە بابەتی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد لەبەر تیشكی: زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی دا)، دێنین و دەڵێین:

سُبحانَ رَّبك رب العزَّة عَمَّا يَصِفون، وسلام على المرسلين، والحمدلله رب العالمين.

١٠/ ربيع الثـانـي/ ١٤٤٠ك

١٧/ كانوونی یەكەم / ٢٠١٨ز

هـــــــــــــــــــــــەولێر

دواپێداچوونەوە بۆ چاپی یەكەم

١٤٤٠/٦/٢٤ك

٢٠١٩/٣/١ز





# سەرچاوەکان


| ژ | کتێب | نووسەر | شوێنی بڵاوکردنەوە | ژمارەی چاپ | مێژووی چاپ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | مفردات ألفاظ القرآن | راغب الأصفهاني<br>تحقيق: صفوان عدنان داوودي | دار القلم<br>دمشق | ط٣ | ٢٠٠٢ |
| ٢ | مختار الصحاح | محمد بن أبي بكر عبدالقادر الرازي | دار الكتب العربي | | ١٩٨١ |
| ٣ | المصباح المنير، معجم عربي - عربي | أحمد بن محمد بن علي الفيومي المقريء | المكتبة العصرية<br>بيروت | ط٢ | ٢٠١٠ |
| ٤ | لسان العرب | ابن منظور | دار إحياء التراث العربي | ط٣ | ١٩٩٩ |
| ٥ | التعريفات | للجرجاني محمد علي محمد | دار الطلائع | ط١ | ٢٠٠٩ |
| ٦ | المعجم الوسيط | قام بإخراجه:-<br>إبراهيم مصطفى<br>أحمد حسن الزّيات<br>حامد عبدالقادر<br>محمد علي النجار | بيروت لبنان<br>دار الدعوة للنشر<br>والتوزيع والطباعة | | ١٩٨٩ |
| ٧ | المنجد في اللغة<br>الإعلام الطبعة<br>المئوية الأولى | | دار المشرق<br>بيروت | ط٤٣ | ٢٠٠٨ |
| ٨ | موسوعة الأديان في العالم ج١٠ | أشرف عليه: د.جمال بن مدكور | ترجمة: دار كريس انترناشيونال | | |
| ٩ | معجم المؤلفات السياسية | ترجمة:محمد عرب صاصيلا<br>تأليف: فرنسو شاتلية اوليفيه<br>دوها ميل إيفلين بيزية | المؤسسة الجامعية<br>للدراسات والنشر<br>والتوزيع<br>بيروت - الحمراء | ط٣ | ٢٠٠١ |
| ١٠ | موسوعة الأديان الحية في العالم | عبدالرحيم مارديني | دار المحبة<br>دمشق | | ٢٠٠٩ |
| ١١ | الموسوعة الميُسَّرة<br>في الفكر الفلسفي<br>والإجتماعي<br>عربي-ئينجليزي | د.كميل الحاج | مكتبة ناشرون<br>بيروت | ط١ | ٢٠٠٠ |
| ١٢ | الموسوعة العلمليةالشاملة | إعداد: شفيق الخطيب يوسف<br>سليمان خيرالله | مكتبة لبنان ناشرون<br>بيروت | ط٢ | ٢٠٠٢ |
| ١٣ | الموسوعة العربية | الجمهورية السورية العربية | | ط١ | ٢٠٠٧ |

| ژ | کتێب | نووسەر | شوێنی بڵاوکردنەوە | ژمارەی چاپ | مێژووی چاپ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٤ | فەرهەنگی بایۆلۆژیی بۆماوەیی خانە | ئەکرەم قەرەداغیی | لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی زانیار - سلێمانی | | ٢٠١٣ |
| ١٥ | فەرهەنگی تۆیکاریی مرۆڤ ئینگلیزیی- عەرەبی - کوردی | د.ئومێد فایەق<br>د.هادی محەمەد | لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی زانیار | | ٢٠١٣ |
| ١٦ | فەرهەنگی کیمیای ئەندامیی ئینگلیزیی- عەرەبی - کوردی | جەمال عەبدول | لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی زانیار | | ٢٠١٣ |
| ١٧ | التفسير التطبيقي للكتاب المقدس | | شركة ماستر ميديا | ط١ | ٢٠٠٣م |
| ١٨ | الكتاب المقدس قراءة رعائية | | جمعية الكتاب المقدس لبنان | ط٣ | ٢٠١٥ م |
| ١٩ | إنجيل برنابا | ترجمة من الانجليزية<br>الدكتور خليل سعادة | مكتبة ومطبعة محمد علي صبيح وأولاده | ط٢ | ٢٠١٥ |
| ٢٠ | نصوص أفستا وقراءة في النص الأفستاني | ابراهيم محمود | تموزه رند طباعة نشر . توزيع<br>دمشق - سوريا | ط١ | ٢٠١٣ م |
| ٢١ | الزرادشتية- الفجر، الغروب | د.س. زيهنير<br>أستاذ الديانات الشرقية في جامعة أكسفورد<br>ترجمة: د. سهيل زمار | دار التلوين | ط١ | ٢٠٠٦م |
| ٢٢ | كنزا ربّا، الكتاب المقدس للصائبة المندائيين | ترجمة: د.يوسف متى قوزى<br>صبيح مدلول السهري | مطبعة جعفر العصامي | ط٥ | ٢٠١٠ م |
| ٢٣ | دراسة اديهيا مواعظ وتعاليم يحيى بن زكريا عليه السلام | ترجمة امين فعيل مطاب | المطبعة النظامية | ط١ | ٢٠١٢ م |
| ٢٤ | الديانة الأيزيدية بين السائل والمجيب | أمين فرح جيجو | منشورات ديوان أوقاف المسيحين بغداد | ط١ | ٢٠١٢م |
| ٢٥ | العقيدة والقانون في فلسفة زرادشت | كارزان مراد عباس | تموز رند طباعة نشر - توزيع<br>دمشق - سوريا | ط١ | ٢٠١١ |



| ژ | کتێب | نووسەر | شوێنی بڵاوکردنەوە | ژمارەی چاپ | مێژووی چاپ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢٦ | عيادة الملحدين أسئلة حائرة وأجوبة شافية | د.هيثم طلعت | دار الكتب المصرية القاهرة مصر العربية | ط١ | ٢٠١٧ م ١٤٣٨ هـ |
| ٢٧ | العودة إلى الإيمان | د. هيثم طلعت | دار الكتاب للنشر والتوزيع الاسماعيلية - مصر | ط١ | ٢٠١٤ م |
| ٢٨ | الرد على الملحدين العرب | د.هيثم طلعت | دار المكتب للنشر والتوزيع الاسماعلية – مصر | ط١ | ٢٠١٤ م |
| ٢٩ | الإلحاد يسمم كل شيء | د.هيثم طلعت | نيوبوك للنشر والتوزيع القاهرة – مصر | ط١ | ٢٠١٥ م |
| ٣٠ | كهنة الإلحاد، كيف تحولت دعاوى اللادينين إلى ديانة كهنوتية؟! | د. هيثم طلعت | دار الكتاب للنشر والتوزيع الاسماعيلية – مصر | ط١ | ٢٠١٤ م |
| ٣١ | نفسية الإلحاد، إيمان فاقد الأب | بول فيتز ترجمة: مركز دلائل | مركز دلائل الرياض - السعودية | ط١ | ١٤٣٧ هـ |
| ٣٢ | إنك على الحق المبين رؤى تأصيلية في تفكيك ظاهرة الإلحاد | محسن حسين عبدالله العواجي | السعودية - الرياض | ط١ | ٢٠١٦ م ١٤٣٧ هـ |
| ٣٣ | فمن خلق الله؟ نقد الشبهة الإحادية: في ضوء التحقيق الفلسفي والنقد الكوسمولوجي | د.سامي عامري | السعودية - الخبر | ط١ | ٢٠١٦ م ١٤٣٧ هـ |
| ٣٤ | الإلحاد الديني في مجتمعات المسلمين ومذاهبه المعاصرة | د.صابر عبدالرحمن طعيمة | دار الجيل للنشر والطباعة والتوزيع – القاهرة | ط١ | ٢٠٠٤ م ١٤٢٥ هـ |
| ٣٥ | الرجل والسروال الأحمر حوار عقلاني من الإلحاد واللادينية إلى الإسلام | عبدالرحيم جرين ترجمة: مركز الدلائل | مركز الدلائل الرياض- السعوية | ط٣ | ١٤٣٧ هـ |

| ژ | كتێب | نووسەر | شوێنی بڵاوكردنەوە | ژمارەی چاپ | مێژووی چاپ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٣٦ | الإلحاد بين قصورين حقيقة الإلحاد بين القصور العقلاني والقصور المعرفي | ترجمة وتعليق د.مؤمن الحسن د. عبدالله الشهري | مركز الدلائل الرياض- السعوية | ط٢ | ١٤٣٧ هـ |
| ٣٧ | الميديا والإلحاد، السينما واللاوعي | م.أحمد حسن | مركز الدلائل الرياض- السعوية | ط٢ | ١٤٣٧ هـ |
| ٣٨ | الإلحاد للمبتدئين دليلك المختصر في الحوار بين الإيمان والإلحاد | د.هاشم عزمي | دار الكتب للنشر والتوزيع – مصر | ط١ | ٢٠١٤ م |
| ٣٩ | الإلحادُ وثوقية التوهم وخواء العدم | د. حسام الدين حامد | مركز التفكر للبحوث والدراسات دار العصرية للنشر والتوزيع | ط١ | ٢٠١٥ م ١٤٣٦ هـ |
| ٤٠ | الإلحاد في الغرب | د.رمسيس عوض | سينا للنشر القاهرة - مصر | ط١ | ١٩٩٧ م |
| ٤١ | إختراق عقل، دلائل الايمان في مواجهة الملحدين والمتشككين | د.احمد إبراهيم | مركز دلائل الرياض – السعودية | ط٢ | ٢٠١١ م |
| ٤٢ | عزيزي الملحد! اسئلة الملحدين أمام العقل والعلم | د.محمد محمد داود | دار نهضة مصر للنشر | ط١ | ٢٠١٥ م |
| ٤٣ | قطيع القطط الضالة | سامي احمد الزين | مركز دلائل الرياض السعودية | ط٢ | ١٤٣٧ هـ |
| ٤٤ | وهم الشيطان، الإلحاد ومزاعمه العلمية | ديفيد بيرلنسكي ترجمة: عبدالله الشهري | مركز دلائل | ط٢ | ١٤٣٧ هـ |
| ٤٥ | ثلاث رسائل في الإلحاد والعلم والإيمان | عبدالله بن سعيد الشهري | مركز نماء للبحوث والدراسات مطابع الشبانات العولية بيروت – لبنان | ط١ | ٢٠١٤ م |
| ٤٦ | ميليشيا الإلحاد | عبدالله بن صالح العجيري | تكوين للدراسات والأبحاث | ط٢ | ٢٠١٤ م |
| ٤٧ | شموع النهار | عبدالله بن صالح العجيري | تكوين للدراسات والأبحاث | ط١ | |





| ژ | کتێب | نووسەر | شوێنی بڵاوکردنەوە | ژمارەی چاپ | مێژووی چاپ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٤٨ | حوارساخن عن الإلحاد | هادي المدرسي | دار القارئ للطباعة والنشر والتوزيع لبنان | ط١ | ٢٠١٧ م |
| ٤٩ | خرافة الإلحاد | عمرو شريف | مكتبة شروق الدولية | ط١ | ٢٠١٤ |
| ٥٠ | رحلة العقل | أنطوني فلو<br>ترجمة: عمرو شريف | | | |
| ٥١ | وهم الإلحاد | عمرو شريف | دار الفكر | ط١ | ١٤٣٥ |
| ٥٢ | بناء الكون ومصير الإنسان | هشام الطالب | دار المعرفة<br>بيروت | ط١ | ٢٠٠٦ |
| ٥٣ | الكواكب البعيدة، رحلة عبر الكون | سلسلة كتب<br>تايم لايف<br>ترجمة: المهندس والسيد عبدالكريم<br>مراجعة: د.عماد مصطفى | دار طلاس للدراسات والترجمة والنشر<br>دمشق- سوريا | ط١ | ٢٠٠٠ |
| ٥٤ | التصميم في الطبيعة | هارون يحيى | مؤسسة الرسالة ناشرون للطباعة والنشر بيروت- لبنان | ط١ | ٢٠٠٣ م<br>١٤٢٤ هـ |
| ٥٥ | العظمة في كل مكان | هارون يحيى | مؤسسة الرسالة ناشرون للطباعة والنشر بيروت- لبنان | ط١ | ٢٠٠٣ م<br>١٤٢٤ هـ |
| ٥٦ | الإقتراب من الله بحث في أصل الكون وكيف بدأ | بول ديفيز<br>ترجمة: منير شريف<br>مراجعة: عبدالرحمن الشيخ | المركز القومي للترجمة<br>القاهرة – شارع الجزيرة | ط١ | ٢٠١٠ م |
| ٥٧ | الله والفيزياء الحديثة | بول دافيز<br>ترجمة: هالة العوري | صفحات سوريا | ط١ | ٢٠١٣ م |
| ٥٨ | العلم ودليل التصميم في الكون | د. مايكل بيهي<br>د.وليم ديمبسكي<br>د.ستيفن ماير<br>ترجمة: رضا زيدان | السعودية- الخبر | ط١ | ٢٠١٦ م<br>١٤٣٧ هـ |
| ٥٩ | استكشاف و مقدمة في علم الفلك | توماس ت-آرني<br>ترجمة: د.احمد محمود المصري<br>الاستاذ. سعيد محمد | دار طلاس للدراسات والترجمة والنشر<br>دمشق- سوريا | ط١ | ١٩٩٨ م |
| ٦٠ | السَماء في القرآن الكريم | د. زغلول راغب محمد بن النجار | دار المعرفة<br>بيروت – لبنان | ط٣ | ٢٠٠٥ م |
| ٦١ | الأرض في القرآن الكريم | د. زغلول راغب محمد بن النجار | دار المعرفة<br>بريوت – لبنان | ط٢ | ٢٠٠٦ م<br>١٤٢٧ هـ |

| ژ | کتێب | نووسەر | شوێنی بڵاوکردنەوە | ژمارەی چاپ | مێژووی چاپ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٦٢ | مبادىء علم الفلك الحديث | أ.د.عبدالعزيز بكري أحمد | مكتبة الدار العربية للكتاب القاهرة | ط٢ | ٢٠١٣ م |
| ٦٣ | معجزة الذرة | هارون يحيى | مؤسسة الرسالة بيروت – لبنان | ط١ | ٢٠٠٤ م |
| ٦٤ | التصميم العظيم، إجابات جديدة على اسئلة الكون الكبرى | ستفين هوكيخ ليونارد مولدينوو ترجمة: أيمن احمد عياد | دار التنوير للطباعة والنشر لبنان – بيروت | ط١ | ٢٠١٣ |
| ٦٥ | تأريخ موجز للزمان من الانفجار الكبير حتى الثقوب السوداء | ستفين هوكيخ ليونارد ترجمة: مصطفى ابراهيم فهمي | الهيئة المصرية العامة للكتاب | | ٢٠٠٦ م |
| ٦٦ | تأريخ أكثر ايجازاً للزمن | ستفين هوكيخ و ليونرد ملوندينوف | | | |
| ٦٧ | الكون في قشرة جوز | ستيفن هوكنج ترجمة: د. مصطفى إبراهيم فهمي | عالم المعرفة الكويت | | ٢٠٠٣ م |
| ٦٨ | الفيزياء و وجود الخالق | أ.د. جعفر شيخ ادريس | مركز البيان للبحوث والدراسات مكتبة مجلة البيان الرياض | | |
| ٦٩ | الكون بين القرآن والعلم | م.محمد عصام قصاب | دار الفكر دمشق دار الفكر المعاصر بيروت | ط١ | ٢٠١٥ م |
| ٧٠ | التطور: نظرة تاريخية وعلمية وقضات من ذاكرة نشأة التطور وإلى اليوم | محمد صالح الهبيلي | مركز دلائل الرياض السعودية | ط٢ | ١٤٣٧ هـ |
| ٧١ | بيولوجيا الإنسان | د,حميد أحمد الحاج | دار المسيرة للنشر والتوزيع والطباعة عمان | ط٣ | ٢٠١٧ م ١٤٣٤ هـ |
| ٧٢ | الإعجاز الرّباني في جسم الإنسان | د.الطيب علي فؤاد علي مخيمر | دار النفائس بيروت لبنان | ط١ | ٢٠١٣ م ١٤٣٤ هـ |
| ٧٣ | معجزة الهرمون | هارون يحيى | مؤسسة الرسالة ناشرون | ط١ | ٢٠٠٤ م |
| ٧٤ | معجزة خلق الإنسان | هارون يحيى | مكتبة دار المنهاج القويم للنشر والتوزيع دمشق- سوريا | ط١ | ٢٠٠٩ م |





| ژ | کتێب | نووسەر | شوێنی بڵاوکردنەوە | ژمارەی چاپ | مێژووی چاپ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٧٥ | أصل الحياة | بول ديفيز<br>ترجمة: منير شريف | المركز القومي للترجمة<br>الجيزة القاهرة | ط١ | ٢٠١٠ م |
| ٧٦ | خلق الإنسان في القرآن الكريم | د. زغلول راغب محمد بن النجار | دار المعرفة<br>بيروت – لبنان | | |
| ٧٧ | إبداع الرحمن في جسم الإنسان | د.منصور أبو شريعة العبادي | مطابع الدستور التجارية | ط١ | ٢٠١٢ م<br>١٤٣٣ هـ |
| ٧٨ | التطور نظرية علمية أم أيديولوجيا ؟ | أ.د. عرفان يلماز<br>ترجمة: رشا حسن محسن هويدي | دار النيل للطباعة والنشر | ط١ | ٢٠١٣ م |
| ٧٩ | الطب محراب للإيمان ج١وج٢ | د.خالص جَلبي | مؤسسة الرسالة | | ١٩٨٧ |
| ٨٠ | الإنسان ذلك المجهول | ألكيسس كاريل<br>ترجمة: عادل شفيق | القاهرة/ بيروت<br>الهيئة العامة للكتاب | | ١٩٧٣ |
| ٨١ | الإنسان من الميلاد ألى البعث في القرآن الكريم | د. زغلول النجار | دار المعرفة<br>بيروت-لبنان | ط٢ | ٢٠٠٨ |
| ٨٢ | إعجاز القرآن في ما تخفيه الأرحام | كريم نجيب الأغر | دار المعرفة<br>بيروت-لبنان | ط١ | ٢٠٠٥ |
| ٨٣ | مدخل جديد الى الفلسفة | د.عبدالرحمن بدوي | الكويت | | ١٩٧٩ م |
| ٨٤ | مشكلة الشر و وجود الله | د.سامي عامري | المؤسسة العلمية الدعوية<br>السعودية – الخبر | ط٢ | ٢٠١٦ م |
| ٨٥ | لماذا فرض الله عبادته على الناس؟! | د. سامي عامري<br>بحث على الإنترنيت | | ط١ | ٢٠١٦ م |
| ٨٦ | كبرى اليقينيات الكونية، وجود الخالق و وظيفة المخلوق | محمد سعيد رمضان البوطي | دمشق<br>دار الفكر | ط٣٥ | ٢٠١٥ م |
| ٨٧ | القرآن و الفلسفة | محمد يوسف موسى | دار الكتاب القاهرة<br>دار الكتاب اللبناني-بيروت | ط١ | ٢٠١٢ |

| ژ | کتێب | نووسەر | شوێنی بڵاوکردنەوە | ژمارەی چاپ | مێژووی چاپ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٨٨ | الفلسفة الإسلامية دراسة نقدية منتخبة | د. سعدون محمود الساموك | الأكاديميون للنشر والتوزيع الأردن | ط١ | ٢٠١٤ م<br>١٤٣٥ هـ |
| ٨٩ | البحث عن الحقيقة الكبرى | المهندس عصام قصاب | شباب العصر المعرفة | ط١ | ٢٠١٠ م |
| ٩٠ | تأريخ الفلسفة من قبل سقراط إلى ما بعد الحداثة | إبراهيم الزيني | كنوز للنشر والتوزيع | | |
| ٩١ | الإجابة، القرآن وأسئلتك الوجودية | د.مهاب السعيد | دار الكتاب للنشر والتوزيع الاسماعيلية – مصر | ط١ | ٢٠١٦ م |
| ٩٢ | الموسوعة الفلسفية المختصرة | جوناثان ري<br>و.ج.أد أرمسون<br>ترجمة: فؤاد كامل وجلال العشرى<br>وعبدالرشيد الصادق محمودي | المركز القومي للترجمة الجزيرة - القاهرة | ط١ | ٢٠١٣ م |
| ٩٣ | مقدمة إبن خلدون | عبدالرحمن محمد بن خلدون | دار العودة بيروت | | |
| ٩٤ | قصة الإيمان | نديم الجسر | توزيع العربية | ط٣ | ١٩٦٩ |
| ٩٥ | تهافت الفلاسفة | أبو حامد (محمد بن محمد بن محمد) الغزالي<br>تحقيق د.سليمان | | | ١٩٦٦ |
| ٩٦ | الفلسفة المادية وتفكيك الإنسان | عبدالوهاب المسيري | دار الفكر | ط٦ | ٢٠١٦ م |
| ٩٧ | البرهان الفسيولوجي الواقعي على وجود الله | يوسف سايفرت | | ط٢ | ٢٠٠٠ م |
| ٩٨ | شروح وحواشي العقائد النسفية | | | ط١ | ١٩٧١ |
| ٩٩ | درء التعارض بين العقل والنقل | ابن تيمية | تحقيق محمد رشاد بن محمد | ط١ | ١٩٧٩م |
| ١٠٠ | القرآن والتوراة والإنجيل والعلم، دراسة الكتب المقدسة في ضوء المعارف الحديثة | موريس بوكاي | مؤسسة اقرأ للنشر والتوزيع والترجمة القاهر-مصر | ط١ | ٢٠١٤ م |





| ژ | کتێب | نووسەر | شوێنی بڵاوکردنەوە | ژمارەی چاپ | مێژووی چاپ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٠١ | محاضرات في الفكر والدعوة، ج١،ج٢،ج٣ | أبو الحسن الندْوي | دار ابن كثير | ط٢ | ٢٠١٣ م |
| ١٠٢ | مجموع الفتاوى | ابن تيمية | مكتبة العبيكان/ السعودية | ط١ | ١٩٩٧م |
| ١٠٣ | منهاج السنة النبوية | ابن تيمية | تحقيق محمد رشاد بن محمد | ط١ | ١٩٨٦م |
| ١٠٤ | مدارج السالكين | لابن القيم | المحقق محمد محي الدين عبدالحميد | ط١ | ١٣٧٥ك |
| ١٠٥ | الموسوعة الذهبية في إعجاز القرآن الكريم والسنة النبوية | د. أحمد مصطفى متولّي | دار الجوزي - القاهرة | ط١ | ٢٠٠٥م |

# بەرهەمەکانی دانەر

## أ - کتێبە کوردییەکان :

| تێبینی | بەروار و چاپ | کتێبەکان | ژ |
|---|---|---|---|
| | | قــورئــان و ســونــنـەت | |
| | چاپی یەك/١٩٨٤ چاپی دوو/٢٠٠٦ | پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | ١ |
| | چاپی یەك/٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٥ | با لە خزمەت قوڕئاندا بین، {کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لە قوڕئان بەهرەمەند دەبین؟)و (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قوڕئان)ە} | ٢ |
| | چاپی یەك/٢٠١٢ | تەفسیری قوڕئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەکەم: سووڕەتەکانی: (الفاتحة) و (البقرة) | ٣ |
| | چاپی یەك/٢٠١٢ | تەفسیری قوڕئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سووڕەتی: (آل عمران) | ٤ |
| | چاپی یەك/٢٠١٣ | تەفسیری قوڕئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سووڕەتی: (النساء) | ٥ |
| | چاپی یەك/٢٠١٤ | تەفسیری قوڕئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سووڕەتی: (المائدة) | ٦ |
| | چاپی یەك/٢٠١٥ | تەفسیری قوڕئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سووڕەتی: (الأنعام) | ٧ |
| | چاپی یەك/٢٠١٦ | تەفسیری قوڕئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم : سووڕەتی: (الأعراف) | ٨ |
| | چاپی یەك/٢٠١٦ | تەفسیری قوڕئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سووڕەتی: (الأنفال) | ٩ |





| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٠ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| ١١ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی نۆیەم: سوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٢ | بەرگی دەیەم سوورەتی: (هود) | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ١٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یازدەیەم: سوورەتی: (یوسف) | چاپی یەك / ٢٠١٩ | |
| ١٤ | شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەنێوان کەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١٥ | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسەو گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| | بیروبڕواو فیکری ئیسلامیی | | |
| ١٦ | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان | چاپی یەك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| ١٧ | پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ١٨ | بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |
| ١٩ | چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم، سەرنجێکی واقیعییانەو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی شەش / ٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و تورکیی و فارسییش |
| ٢٠ | خواناسیی، ئایین، ئیمان (ڕاستییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوەو ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە) | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٢١ | ناوە هەرە جوانەکانی خوا سبحان وتعالی | چاپی یەکەم ٢٠١٣ | |
| | مەوسووعەی : ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، (٦ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ | |
| ٢٢ | بەرگی یەکەم: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٢٣ | بەرگی دووەم: خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا | | |
| ٢٤ | بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناو و سیفەت و لەپەرستراوێتییدا | | |
| ٢٥ | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |
| ٢٦ | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر | | |
| ٢٧ | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | | |
| ٢٨ | ڕێبــازی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کامەیە ؟! | چاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو کتێبی (مسـولْمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروباوەڕی مسـولْمان) |
| ٢٩ | مسـولْمانی کـامڵ : بەشی یەکـەم : بیـروباوەڕی مسـولْمان | چاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا) |
| ٣٠ | تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقــە لە هەفتەنـامەی (هـاووڵاتیی)و، ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ٣١ | ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٣٢ | تەرجەمەی کوردیی عەقیدەی طــەحاویی | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٣٣ | ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحــاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ٣٤ | سیکۆلاریزم و دیموکڕاسیی لەئەزموونی کوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |





| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامی لەنێوان وەحیی و واقیع دا | | |
| ٣٥ | کتێبی یەکەم: پێناسەو چییەت و سەرگوزشتەو سەرچاوەکان و گرنگیی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ٣٦ | کتێبی دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ٣٧ | کتێبی سێیەم: تەوژمە فیکرییە سەرەکییەکانی مێژووی مسوڵمانان | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ٣٨ | کتێبی چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامی | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ٣٩ | کتێبی پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر | چاپی یەك / ٢٠١٩ | |
| | فیقهی ئیسلامیی | | |
| | مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسلامیی (٤ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٠ چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٤٠ | بەرگی یەکەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەکان، پاکء خاوێنیی | | |
| ٤١ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاکردن یەکەمین دروشمی خواپەرستیی | | |
| ٤٢ | بەرگی سێیەم: زەکات و ماڵ بەخشین | | |
| ٤٣ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەج و عومرەکردن، زیکری خواکردن | | |
| ٤٤ | بنچینە گرنگەکانی هەڵسەکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە |
| ٤٥ | جەژن و یادو بۆنەکان و هەڵسەنگاندنێك | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٤٦ | چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٩ چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە کراوە |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٤٧ | چەند بنەمایەکی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| | تەزکیەی نەفس و ڕەوشت و ئاکار | | |
| ٤٨ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |
| ٤٩ | ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی پێنج/٢٠١٢ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و فارسییش |
| ٥٠ | مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |
| ٥١ | گەڕانەوە بۆ لای خوا (سبحانه وتعالى)، بەرەو خوا وەرچەرخان و وازهێنان لە گوناهو سەرپێچیی و گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی پێنج/٢٠١٠ | |
| ٥٢ | شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |
| ٥٣ | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دواڕۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٥٤ | گیانی ژیان، باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك کردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٥٥ | مەوسووعەی: ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | بانگەوازو کاری ئیسلامیی | | |
| ٥٦ | کۆمەڵی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٥٧ | پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨<br>چاپی سێ/١٩٩٨ | |
| ٥٨ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٥٩ | بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مان و نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٣ | |





| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٦٠ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| ٦١ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| ٦٢ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون، بنەما شەرعی یەکان و بنچینە ئەخلاقی یەکان | چاپی ١ / ١٩٩٧ | |
| ٦٣ | ئیسلام و کێشە هەنووکەیی یەکان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٦٤ | زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٦٥ | کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەکانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٦ | چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٦٧ | چۆن لە جیهاد بگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٦٨ | جیهاد لە ڕێی خوداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٩ | بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٧٠ | جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٧١ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٧٢ | ئیسلام و مسوڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |
| ٧٣ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٧٤ | بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەکەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز کراوە، بەم شێوەیە:<br>ئاڵقەی یەکەم: بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان.<br>ئاڵقەی دووەم : بەڵگەکانی رەوایی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |
| ٧٥ | هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو رەفتارە پەرگیرانەکانی رێکخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٧٦ | با لادان و تاوانی پەڕگیران، بەرانبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان | چاپی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٧٧ | پەڕگیریی: پێناسەی، نیشانەکانی پەڕگیران، هۆکارەکانی پەڕگیریی، شوێنەوارو دەرهاویشتەکانی، چارەسەری | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٧٨ | بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | | |
| ٧٩ | چاوپێداگێڕانەوەیەکی کاری ئیسلامیی | چاپی یەکەم ٢٠١٩ | |
| | زنجیرەی بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | | |
| ٨٠ | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٨١ | ئاڵقەی دووەم و سێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەستانی مسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٨٢ | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| | وتاری کۆنگرەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان | | |
| ٨٣ | کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ٨٤ | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان (وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| ٨٥ | چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | نەتەوایەتیی و مەسەلەی کورد | | |
| ٨٦ | کوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ٨٧ | حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ٨٨ | سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠، چاپی دوو/ ١٩٩٨، چاپی سێ/٢٠٠٥، چاپی چوار/ ٢٠١٨ | |
| ٨٩ | چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| | سیاسەت و حوکمڕانیی | | |
| ٩٠ | چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵـەتداریی، (٤ بەرگ) | چاپی یەك / ٢٠١٤-٢٠١٦ | |
| ٩١ | بەرگی یەكەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەكانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت و بناغەی فیكریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| ٩٢ | بەرگی دووەم: بنەمایەكانی سیستمی حوكمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ٩٣ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەكان):<br>یاسادانان<br>جێبەجێكردن<br>دادوەریی | | |
| ٩٤ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ٩٥ | ڕوانینێكی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/ ٢٠١٧ | |
| ٩٦ | قوڕئان و پاكسازیی و چاكسازیی لە هەرێمی كوردستاندا | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ٩٧ | گرنگیی ڕەوشت لە سیاسەتدا. | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| | **ئافرەت و خێزان** | | |
| ٩٨ | ئافرەتی مسـوڵمانی كورد، مافە شەرعییەكانی و ئەركە گرنگەكانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣ | |
| ٩٩ | مەوسـووعەی : ئـافرەت و خێزان لە سـایەی شــەریعـەتدا | بەرگی یەكەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چـاپی سێ/٢٠١٣ | |
| | **مـێـــژوو** | | |
| ١٠٠ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەرس و پەندەكانی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| ١٠١ | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەكانم)، بەشی یەكەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |





| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٠٢ | بەرکوڵێکی کاروچالاکیی و ڕووداو و وێستگەکانی ژیانم | چاپی یەکەم/٢٠١٨ | |
| | **دیدارو گفتوگۆ** | | |
| ١٠٣ | سنووره قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی دوو/٢٠٠٤ | |
| ١٠٤ | ئەشکەنجەو زیندان، پێشمەرگەیەك بیست و دوو مانگ لە زیندانی داگیرکەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە |
| ١٠٥ | گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا | چاپی یەك/ ٢٠١٠ | |
| | **زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان** | | |
| ١٠٦ | گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٠٧ | با وریا بین ! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ١٠٨ | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٩ | چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١١٠ | سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١١١ | چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١١٢ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١١٣ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١١٤ | بانگەواز بۆ لای خودا، چی یەو چۆنەو بە کێ دەکرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١١٥ | قوتابیان لەم هەل و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن و چی بکەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١١٦ | واقیعی هەرێمی کوردستان، دیدێکی ئیسلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١١٧ | سروشت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵدا (١٢) | چاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ١١٨ | کاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١١٩ | حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| ١٢٠ | مەلای گەورەی کۆیەو تەفسیرەکەی و چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٢١ | لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٢٢ | تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١٢٣ | ڕەوەندی کورد لە هەندەران و ئەرکی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٢٤ | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٢٥ | گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١٢٦ | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەکان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |



| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | ب- کتێبە عەرەبییەکان | | |
| ١٢٧ | موسوعة : الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله | ط الأولى/٢٠١٥ | کە لە چاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: |
| ١٢٥ | الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلق | ط الثانية/٢٠١٦ | |
| ١٢٦ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط االثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٧ | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٨ | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٩ | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٣٠ | الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٣١ | الكتاب السابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوّته ط الثانية / ٢٠١٨ | | |
| ١٣٢ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر ط الثانية / ٢٠١٨ | | |
| ١٣٣ | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | | |
| ١٣٤ | الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى | | |
| ١٣٥ | الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام | | |
| ١٣٦ | الكتاب الثاني عشر: الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم | | |
| ١٣٧ | نقض فكرة التطرف | "ط الأولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين)" | |
| ١٣٨ | ضيف و قضية (مقابلة مع قناة العربية) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٣٩ | لقاء خاص (مقابلة مع قناة العالم) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٤٠ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الأولى /٢٠١٦ | |

